# فەرهەنگی شیکاری
# زاراوەکانی کۆمەڵناسی

ئامادە کردنی:
فەخرەدین ئامیدیان

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | آمیدیان (ترکی)، فخرالدین، ۱۳۵۶ - |
| عنوان و نام پدیدآور | : | فه رهه نگی شیکاری زاراوه‌کانی کومه‌لناسی/نووسه‌ر فه‌خره‌دین ئامیدیان. |
| مشخصات نشر | : | سنندج: شمیم، ۱۳۹۰. |
| مشخصات ظاهری | : | ۶۰۰ص. |
| شابک | : | 978-600-91690-5-4 |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| موضوع | : | جامعه‌شناسی -- واژه‌نامه‌ها-- انگلیسی |
| موضوع | : | جامعه‌شناسی -- اصطلاح‌ها و تعبیرها |
| موضوع | : | زبان انگلیسی -- واژه‌نامه‌ها -- کردی |
| موضوع | : | کردی -- واژه‌نامه‌ها -- انگلیسی |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶/ آ۲۳آ۸ ۱۳۸۹ |
| رده بندی دیویی | : | ۴۲۳/فا۹ک |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۲۲۳۴۸۹۶ |

**ناوی کتێب:** فەرهەنگی شیکاری زاراوەکانی کۆمەڵناسی

**کۆکردنەوە و نووسین:** فەخرەدین ئامێدیان

**ناوەندی چاپ:** شەمیمی سنە

**تیراژ:** ۱۰۰۰ دانە

**ژمارەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ۲۰۱۳/۱۳۹۱

**نرخ:** ۱۸۰۰۰تمە ن





**ناوەندی بڵاوکردنەوە: سنە- شەقامی شوهەدا- پاساژی ئاویەر- کتێبی نیشتمان**

**تەلەفوون: ۹۸-۸۷۱-۲۲۷۲۱۱۵+**

سالّەهایە ئەم شۆڕەکاتەت بەجێ
هێشتووە کەچی، هێشتا دەنگی گەرم و
بزەی نەرمت تەلی گیانم دەبزوێنێ.

بەیادی یاری کۆچکردووم:

**هووشمەند موفاخری (شەعەف)**

آب دریا را اگر نتوان کشید
هم به قدر تشنگی بتوان چشید
(مولانا جلال‌الدین رومی)

**دەسپێک**

هەرچەند ناتوانین بڵێین کۆمەڵناسی زانستێکی نوێیە، بەڵام بێشک بە زمانی کوردی تازە خەریکە پێڕۆکە دەبێ و هەنووکە لە سەرەتای ڕێگای پڕ لە هەوراز و نشێوی خۆیدایە. لەم ساڵانەدا کاری زۆر لە سەر زانستە رامیارییەکان بە گشتی و دانانی فەرهەنگی سیاسی بەتایبەت کراوە. هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کەش‌وهەوایەکی سیاسی زاڵ بە سەر کوردستاندا. سەدەی نۆزدە و بیست و بیست و یەک بۆ ئێمەی کورد پڕ لە کارەسات و رووداوی جۆراوجۆر و زۆرجار دڵتەزێن و هەندێ جاریش دڵخۆشکەر بووە. زۆربەی هەرە زۆری شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا بووە و یەکێک لە گرینگترین دەرەنجامەکانی — واتە رووخانی حکوومەتی بەعس و دامەزراندنی عەراقی فیدراڵ- کە لە سەرەتای سەدەی بیست‌و یەکدا هاتۆتە دی، هاتی کوردی تێدا بووە. کورد ئێستا خۆی لە پاگەی حکوومەت و دەوڵەتدا دەبینێ؛ بۆیە زۆر ئاساییە کە زۆربەی کۆشەوەکانی لەم بەستێنەدا بێ.

هەروەک بێژرا، هاوکات لە گەڵ ئەوەی کە ئێمەی کورد خەریکین جێگە پایەک بۆ خۆمان لەنێو پێوەندییە نێو نەتەوەییەکاندا دەکەینەوە، پیویستە کە بە هۆکارێکی زانستی و ئاکادێمی، چەندوچوونی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و رامیاری و کولتووری خۆمان بناسین و بە پاڵ دانەوە بە لێهاتوویەکانی خۆمان، ڕێگایەکی ئەقڵانی بۆ گەیشتن بە دۆزە سەرەکییەکانمان ببینینەوە. بێشک کۆمەڵناسی بۆ گەیشتن بەم

## دەسپێک

مەبەستە، تەنیا ئامراز نییە، بەڵام بۆ ئێمە دەتوانێ ئامراز و هۆکارێکی کاریگەر و گرینگ بێ بۆ سەرکەوتن لەم ڕێگا هەڵەمووتەدا.

هەرچەند ئەم دەسپێکە جێگایەکی گونجاو بۆ ئەم باسە نییە، بەڵام بە پێویستی دەزانم بۆ ڕوون بوونەوەی گرینگی کۆمەڵناسی و کاریگەری ئەم زانستە بە سەر ڕەوتی گەشە سەندنی ئابووری-کۆمەڵایەتی وڵاتانی ڕۆژاوا و هەروەها نسکۆی ئەم زانستە لە دەیەکانی پاش حەفتاکان و بووژانەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستو یەکدا، سووکە ئاوڕێک لە ڕەوتی ئەم زانستە بدەمەوە.

هەروەک دەزانین کۆمەڵناسی، بەوجۆرەی کە ئێستا دەیناسین، لە سەر بنەمای زانستە سروشتییەکان داڕێژراوە. سەرکەوتنی زانستە سروشتیەکان لە بواری جۆراوجۆر بە تایبەتی لە فیزیا و ژینەوەرناسیدا هاندەرێک بوو بۆ ئەوەی بیرمەندانی زانستە مرۆییەکان بۆ دیتنەوەی یاسایەکی گشتگیر کە بتوانێ بە تەکووزی هەموو جڤاکە مرۆییەکان پێناسە بکات و لە هەمان کاتدا ڕێگای بەختەوەرییان مسۆگەر بکات، هانا بەرنە بەر ئەم زانستانە. کۆنت بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا دەستی دایە دانانی «فیزیکی کۆمەڵایەتی»؛ پاشان دەستی دا بە گۆڕانی ئەم زاراوە و دانانی زاراوەی سۆسیۆلۆجی یا هەمان کۆمەڵناسی. ئەوەی لە بیری کۆنتدا بوو، دانانی شێوازێک بوو بۆ پێناسە کردنی کۆمەڵناسی. بۆیە شێوازی تۆژینەوە لە سەر پێوەری زانستە سروشتییەکانی بە شێوازێکی گونجاو بۆ ئەم کارە دەزانی.

ئاگۆست کۆنت لە فەلسەفەی پازیتیڤیسمی خۆیدا ڕەوتی گەشەی هزری مرۆڤی بە سێ قۆناغ دابەش دەکرد: قۆناغی ئیلاهی؛ قۆناغی میتافیزیکی و قۆناغی **پازیتیڤیسم** (بڕوانە پازیتیڤیسم لەم کتێبەدا). ئەم کارەی کۆنت دەسکەوتی زۆری لەم بەستێنەدا بوو و پاش ئەو دوورکایم وەک میراتبەری کۆنت درێژەی بەم پرۆسەیەدا و لە سەر هەمان ڕێچکەی کۆنت خەریکی پەرە دان بە کۆمەڵناسی بوو. دوورکایم بە جەخت کردن لە سەر بیردۆزی ئەرکخوازی، ڕەهەندێکی کۆنی بە شێوازێکی نوێ ئاوەڵا کرد و ڕێگای بۆ شرۆڤە و وردبوونەوە و وەرددانەوەی کۆمەڵگا کردەوە. بۆیە دەڵێم ڕێگایەکی کۆن، چونکە بەر لە دوورکایم زۆر لە بیرمەندانی دونیای ئیسلامی و دونیای مەسیحی ئەم بیردۆزەیان بە وردی باس لێ کردبوو؛

واتە، بۆ شرۆڤەی کۆمەڵگا لە تیۆری **ئەرکخوازی** (*functionalism*) کەڵکیان وەرگرتبوو (بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە: ئەرکخوازی). بەڵام دوورکایم بە راڤەی زۆرتری ئەم بیردۆزە و دانانی دوو جۆرە **یەکگرتوویی میکانیکی و ئۆرگانیکی**، زۆر باسی نەبێژراوی لە تویێ پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەرهێنا و خستیە بەر نەشتەرگەری.

هاوکات لە گەڵ شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی و قەیرانەکانی سەدەی بیستەم، کۆمەڵناسی کە وەکوو زانستێکی مرۆڤی کە بە گوێرەی فاکتەرەکانی زانستە ئەزموونییەکان دەجووڵایەوە و قسەی نەبێژراو و رێگەچارەی نادیاری زۆری لە ژێر داوێندا بوو، زۆرتر کەوتە بەر سەرنج و ئاوڕلێدانەوە. هەندێ پێش‌بینی وەکوو سەرهەڵدانی حکوومەتێکی فاشیستی و تووتالیتر لە ئاڵمانیا[1] و داهاتووی پڕ لە سەرکەوتنی ئەمریکا[2] و قەومانی قەیرانی نێو نەتەوەیی، رێگای بۆ رێزگرتن لەم زانستە خۆش کرد.

دەسپێکرانی شەڕی جیهانی دووەم و کۆچی زۆربەی کۆمەڵناسان بۆ ئەمریکا و سەرهەڵدانی رێبازی شیکاگۆ و تۆژینەوە لە تەوەرگەلی جۆراوجۆری کۆمەڵناسی ورد، ئەم زانستەی وەکوو کیمیایەکی کارامە و لێهاتوو -کە دەتوانێ پەرسڤەدەری بەشی هەرە زۆری کێشە کۆمەڵایەتیەکان بێ- ناساند. هەندێ کۆمەڵناسی وەکوو سپێنسێر، سامنێر، کوولی، گیدینگز، ئێدڤارد راس، زینانسکی، رابێرت پارک، پارسۆنز، سۆرۆکین و زۆر کۆمەڵناسی‌تر کە زۆربەیان یا خەڵکی ئەورووپا بوون، یاخۆ لە ئەورووپا خوێندبوویان ئەمریکایان کردە تاقیگەیەک بۆ سەلماندن و چەسپاندنی تیۆرییەکانی کۆمەڵناسی. ئەم هاتە تا حەفتاکانی زایینی بەردەوام بوو. پاش ئەوە سەرهەڵدانی هەندێ کێشەی نوێ کە باسی فیمینیزم لە سەرووی

---

[1] - توێژینەوەکەی ئادرنۆ سەبارەت بە رادەی سەرنەوی کردنی خەڵکی ئاڵمانیا لە بەرانبەر ئۆتۆریتە.

[2] - رای ڤیبێر پاش سەردانی ئەمریکا؛ دیمۆکراسی لە ئەمریکادا، نووسینی ئەلکسی دۆتۆکڤیل ١٨٤٠ و ... .

هەموویانەوە بوو (شەپۆلی دووەمی فیمینیزم)، نسکۆیەکی بۆ ئەم زانستە هێنایە کایەوە. هەرچەند پاش ئەوە سەرنجدان بەم پرسە، دیسان گرینگی و بایەخی کۆمەڵناسی گەڕاندەوە.

لە سەدەی بیستو یەکدا بەجیهانی بوون باس و کێشەیەکی نوێی هێنایە ئاراوە کە هەنووکەش بەردەوامە و هێشتا وەلامێکی تێرو تەسەل و گونجاوی بۆ نەدۆزراوەتەوە. لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا باسی گەشە و نوێسازی و بووژاندنەوەی ولاتە دواکەوتووەکان و هەروەها بە پیشەسازی کردنی ئەم ولاتانە هێشتا گەرم و گوڕە و هەر ولاتێکی جێهانی سێیەم بە گوێرەی لێهاتوویەکانی خۆی توانیویە تا رادەیەک لە گۆڕەپانی جیهانیدا پاگەیەک بۆ خۆی ببینێتەوە. هەندێ ولاتی وەکوو کووریای باشوور، چین، مالزی، برازیل و تورکیا توانیویانە لانی کەم داهاتی سەرانەیان لەژێر ٥٠٠ دۆلارەوە بێننە سەرتر لە ٢٥٠٠ دۆلار.

لە لایەکیترەوە سەرهەڵدانی تیۆریگەلی فرەکولتووری، کە بایەخی زۆرتر دەدەنە وردە کولتوورەکان و هەروەها باسی فیمینیزم و «پێوەندیگەلی نائاسایی جنسی»[٣] و کێشەی ژنانی سەربە وردە کولتوورەکان، بۆتە باسێکی گرینگ و سەرەکی لە کۆمەڵناسی ئەم سەدەیەدا.[٤]

بەگشتی کۆمەڵناسی لە سەرەتای بەدیهاتنیەوە -کە گەرمەی پیشەسازی بوو- تا ئێستا -کە خولی پاشپیشەسازی و سیستەمی خزمەتگوزارییە- هەورازو نشێوی زۆری بڕیوە و دەسکەوتی زۆری بەدەست هانیوە. لە ولاتی خۆشماندا کە خەریکی تاقی کردنەوەی حکوومەتین، خەریکە بایەخ و گرینگی شیاوی پێ دەدرێ و بەرە بەرە پاگەی خۆی دەبینێتەوە. بەلام ناکۆکییەک کە لە نێو نووسەرانی ئەم بوارە لە زمانی کوردیدا هەیە، بۆتە هۆی ئاژاوەیەک لە نووسین لەم بەستێنە و پێکهێنانی کێشە بۆ تێگەیشتنی خەڵکی بە تایبەت قوتابیانی کورد لەم زانستە. بێگومان هەر زانستێکی نوێ، ئەدەبیاتێکی تایبەت بە خۆی هەیە و تا ئەو ئەدەبیاتە لە نێو

---

[3] Queer.
[4] - Ritzer, George (2007). *Contemporary Sociological theory and its classical roots*: the basics.

## دەسپێک

هۆگرانی ئەو زانستەدا سەقامگیر نەبێ، هیوای هیچ دەروویەکی لێ ناکرێ و هەموو کۆششەکان مشت بە سەر سندان کوتانە و هیچی‌تر.

ئەو هۆوە و چەن هۆی لە وتن‌نەهاتگی‌تر پاڵیان پێوەنام بۆ نووسینی فەرهەنگێکی شیکاری کۆمەڵناسی. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە سەرەتا تێکۆشام کە سەرچاوە و کتێبی کۆن و نوێی نووسراو و وەرگێڕدراو کۆوە بکەم و لە ماوەی نزیک بە دوو ساڵدا هەموو ئەو سەرچاوانەم تاوتوێ کرد. کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوانەش گیرو گرفتی تایبەت بە خۆیان هەبوو؛ هەندێکیان چاپی زوو بوون و دیتنەوەیان کارێکی گران بوو. بۆیە ناچار چەن جار سەفەری تاران و پیشانگای کتێبم کرد و لە ئەنجامدا توانیم ئەم کتێبانەی کە لە کۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەم پێکردوون، ببینمەوە و هەندێکیشان کە بە راستی نایاب بوون، لە کتێبخانە و دۆست و ناسراو بە ئەمانەتم هێنان.

لەم بەرهەمەدا هەر زاراوەیەکم بە گوێرەی گرینگی و پاگەیەک کە لە کۆمەڵناسیدا هەیەتی، راڤە کردووە و بۆ هەندێ لە زاراوەکان وتاری تێرو تەسەلم نووسیوە. رەنگە هەندێ لەم زاراوانە باس و لێدوانی زۆرتری بوێت، بەلام بە سەرنجدان بەوەی کە ئەم بەرهەمە فەرهەنگە، راڤەی هەر زاراوەیەکم بە جۆرێک نووسیوە کە گرینگترین باسەکانی ئەو زاراوەیەی تێدا بێ. ئەگەریش خوێنەری هێژا راڤەی زۆرتری پێویست بوو، بۆ ئەو مەبەستەش ئاماژەم داوە بە سەرچاوەکان، تا خوێنەر بۆ خۆی راستەوخۆ ئاو لە سەرچاوە هەڵینجنێ.

لە شیکردنەوەی هەر زاراوەیەکدا ئەگەر زاراوەیەک کە لەم کتێبەدا وەکوو لێما باسی لێ کرابێ، هاتبێت، ئەوە بە رەنگی رەش (Bold) دیاریم کردووە تا خوێنەر ئەگەر پێویستی بوو هەر لەم کتێبەدا زانیاری زۆرتر سەبارەت بەو زاراوەیە بەدەست بێنێ.

هەروەها لە کۆتایی کتێبەکەدا دوو فەرهەنگی ئینگلیزی-کوردی و کوردی-ئینگلیزیم داناوە تا ئەگەر خوێنەرێک بە دووی زاراوەیەکدا گەڕا و واتا ئینگلیزیەکانی زانی، بتوانی بەرانبەرە کوردیەکەشی ببینێتەوە و راڤەکەی بخوێنێتەوە. هەروەها بە پێچەوانەی ئەوە، ئەگەر خوێنەر مانا کوردیەکەی زانی و

## دەسپێک

ویستی بزانێ بەرانبەرە ئینگلیزیەکەی چییە، بە بێ ئەوەی ناچار بە پشکنینی کتێبەکە بێ، هەر لە کۆتایی کتێبەکەدا ئەوەش ببینێتەوە.

هەموو زاراوەکانم بە گوێرەی ئەلفوبێتکەی کوردی بەڕیز چنیوە تا دیتنەوەیان خوێنەر تووشی سەرئێشە نەکات.

بۆ زۆربەی زاراوەکان، بە گوێرەی سەرچاوە و زانیاریەک کە لە بەر دەستمدا بوو و واتایەک کە هەیبوو، وێنەی کوردی یان ئێرانیم هێناوەتەوە، تا خوێنەر زۆرتر هەستی پێ بکات و باشتر تێیبگات. هەروەها شایانی باسە کە لە دوو سەرچاوەی «دەروازەکانی کۆمەڵناسی» و «کۆمەڵناسی گشتی» نووسینی د.مەنووچیهر موحسنی کە لە لایەن چەن وەرگێڕی کوردەوە وەرگێڕدراوە، بۆ دەرهێنانی زاراوە کوردییەکان کەڵکی زۆرم وەرگرتووە. هەر زاراوەیەکی ئەو کتێبانەش کە لە گەڵیان نەبووبێتم، ئەوەی کە خۆم بە دروستم زانیبێ، دامناوە.

بەگشتی هیوام ئەوەیە کە ئەم کتێبە بتوانێ کەلێنێک لە زمانی کوردی پڕبکاتەوە و ئاسۆیەکی نوێ بۆ خوێنەران و توێژەران و نووسەران بکاتەوە. دەبێ ئەوەش بڵێم کە قەد وابیر ناکەمەوە کە ئەم کتێبە بێ گرێ و گۆڵ و بێ کەم و کووڕییە؛ بە پێچەوانە، چاک دەزانم کە وەکوو منداڵێکی تازە پێرۆکەیە و هێشتا زۆری ماوە کە لە کرچ و کاڵی دەربێ، بەڵام بەختەوەرم کە یەکەم کاری پسپۆڕانەیە لەم بوارەدا (تا ئەو جێگا کە من ئاگەدارم)؛ چونکە هەموو کارێک کە نوێ و تازە بوو، ئەوە زۆر دەکەوێتە بەر رەخنە و پلار؛ بە واتایەکی تر، ئەو کارە دەبێتە بەرپەڵ. بەش بە حاڵی خۆم بۆ بەرپەڵ بوون ئامادەم و هیوام ئەوەیە کە لەم بوارەدا ئەوەندە کاری گرینگ و بەنرخ ئەنجام بدرێ کە کەس ئاوڕ لەم کارەی من نەداتەوە.

چاوی نووسەری ئەم دێڕانە لە ئاسۆیەکی دوورە؛ ئاسۆیەک کە تێیدا منداڵان و نەوەکانی داهاتوومان بە ئازادی و سەربەستی و سەربەرزی بژین؛ ئاسۆیەک کە بندەستی و هەژاری و نەداری و دەسندەخۆری تێیدا باربکات و خەڵکەکەم لە سەرووی هەمووانەوە بێ و سەری ڕێز -نەک ترس-ی بۆ نەوی بکرێ؛ ئاسۆیەک کە جێگە پەنجەی نەوەکانی داهاتوومان تێیدا بە راشکاوی خۆی بنوێنێ.

## دەسپێک

لە کۆتاییدا پێویستە سپاسی ئەو دۆست و برادەرانەی بکەم کە بۆ ئامادە کردنی ئەم کتێبە یارمەتییان داوم. رەنگە نەکرێ سپاسی هەموویان بکەم، بەلام ئەو ئازیزانەی کە راستەوخۆ پێوەندیم لە گەلیان بوو ئەم خۆشەویستانەن:

وەکوو کارەکانی‌ترم ئەمجارەش برای خۆشەویستم رەئووفی مەلایی بوو کە بۆ ئەم کارەم سەرمایەی دانا و گەر یارمەتی مالی ئەو ئازیزە نەبایە، بێ‌شک ئەم کارە وەکوو ئاواتێک لە دلمدا دەنێژرا و قەد بەرگی کتێبی نەدەکردە بەر. ئاواتم تەمەنی درێژ و پڕخێرو بەرەکەتە بۆی و هیوادارم پێتی ژینی بە پیت بێ.

دۆستی ئازیزم مامۆستا د.موسلیح ئیروانی کە هەرچەند زۆر سەری قال بوو، کەچی وەکوو برایەکی دلسۆز رێنوێنی کردم و زۆر خالی گرینگ و بەجێی، ئاماژە پێکرد و هەرجار کە لە رێی ئیمەیلەوە پێوەندیم لە گەل دەگرت، بە خێرایی وەلامی دەدامەوە. لە خوا داواکارم کە وێنەی ئەم مامۆستا دلسۆزەمان زۆر بێ و ئەم بەڕێزەش بە تەمەنی درێژو پڕخێر بتوانێ خزمەتی نەتەوەی بکات.

دۆستی خۆشەویستم د. ئێحسان رۆحانی کە بە راستیدا لاوێکی شارەزا و پسپۆڕ و لێزانە و زۆر خالی گرینگی پێ گوتم و لە هێلی لار دەربازی کردم و پێشنیاری بەنرخ و ژیرانەی بۆ باشتر بوونی ئەم کتێبە پێ کردم. هیوادارم ژینی پڕ بێ لە سەرکەوتن بە سەر کۆسپ و هەورازەکانی ژیندا و بەردەوام لە هەلکشاندا بێ.

برای هێژام کاک جەبار رەحمانی کە ئەرکی هەلەگری بەشی زۆری ئەم کتێبەی لە ئەستۆ گرت و دلسۆزانە ئەوەی پێی کرا درێخی نەکرد. هیوادارم سەربەرز و سەرکەوتوو بێ.

هەروەها سپاسی هەموو ئەو دۆستانەی دەکەم کە دوور و نزیک یارمەتییان دام.

لە کۆتاییدا هیوادارم خوێنەرانی هێژا ئەم دیاری شوانەم بە سنگ‌فراوانیەوە لێ وەربگرن.

فەخرەدین ئامێدیان-سنە-٢٠١١

Faxre_amedyan@yahoo.com

## ئابووری / economy

له راستیدا رانانی پێناسەیەک له ئابووری که هەمووان پەسەندی بکەن کارێکی زۆر دژوارە. ئابووری ١) تۆژینەوەیە لە سەر سەرقالی و ژیانی ئاسایی: ئەو بەشە لە کردەی کۆمەلایەتی لێک دەداتەوە کە پێوەندی بە گەیشتن بە ئاسانکاری و دابین کردنی هەل و مەرجی ماددی بۆ ژیانێکی ئاسوودە هەیە. ٢) ئابووری زانستێکە کە هەلس‌وکەوتی مرۆڤ لە روانگەی پێوەندی نێوان ئامانج و هەل‌ومەرج و توانایی و ناتوانییەکانی مرۆڤ، دەخاتە بەر لێکدانەوە و وردبوونەوە؛ ٣) هەروەها ئابووری زانستێکە کە دیاردەکان دەنرخێنێ و لێکیان دەداتەوە.

بە گوێرەی ئەو پێناسانەی ئاماژەیان پێکرا، دەتوانین بەم چەشنە ئابووری پێناسە بکەین: زانستی ئابووری هەلس‌وکەوتی مرۆڤ لە پێوەندی لە گەل ئەو شتمەکانەی کە رادەیان کەمە و بە شێوەگەلی جۆراوجۆر کەلکیان لێ وەردەگیرێ، بۆ گەیشتن بە دۆزێکی رەچاو کراو –وەکوو زۆرتر کردنی داهات– دەخاتە بەر لێکدانەوە(گولد؛ ١٣٨٤).

لە باری کۆمەلناسیەوە ئابووری بریتیە لە دامەزراوەیەک کە کاری رێکخستنی پرۆسەی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکار هێنانی کالا و خزمەتگوزارییەکانە. هۆی ئەوەی کە کۆمەلناسان ئابووری بە «دامەزراوە» دەزانن، ئەوەیە کە کاری ئەم بەشە وەکوو دامەزراوەرەسمییەکانی‌تر تا رادەیەکی سەرنجراکێش پێش بینی دەکرێ. ئەمە بەو واتایە نییە کە ئابووری لە سەر رێبازی هێنانە دی ئاواتەکانی تاکەکاندا دەڕوا.

هەموو ئابوورییەکان (ناوخۆیی و دەرەکی) لە سێ بەشی سەرەکی پێک هاتوون: سەرەتایی، دووەمین و سێیەمین. بەشی سەرەتایی ئابووری مەوادی کاڵ لە کانەکان دەردێنێ. ئەم بەشە بریتیە لە کشت‌وکاڵ، ماسی‌گری، هەلێنجانی کانەکان، جەنگەل و لێڕەوارەکان و ئاژەلداری. هەرچەن ئەم

بەشە لە وڵاتانی پیشەسازی و پێشکەوتوودا زۆر بەنرخە، بەڵام گرینگترین بەشی ئابووری نییە. بۆ وێنە تەنیا پێنج لە سەتی هێزی کاری ئەمریکا لەم بەشەدا خەریکی چالاکین، کەچی لە وڵاتێکی وەکوو کنیادا نزیک بە ٨٠% هێزی کاریان لەم بەشەدا کار دەکەن.

بەشی دووەمی ئابووری، مەوادە کاڵەکان دەکاتە ئەو کەل و پەلەی خەڵک پێویستیان پێیە و زۆرتر ئەم بەشە لە وڵاتانی پیشەسازیدا -کە خاوەن کارخانەگەلی بەرهەمهێنانی ترۆمبیل و ئاسن و کۆمپیۆتەر و...- دێتە ئەنجام. ئەم بەشە کاریگەرییەکی زۆری بە سەر گەشەی ئابووری جیهانیدا هەیە و چالاکی ئابووری نێوان وڵاتەجیاوازەکان دیاری دەکا ( *Porter, M. E; 1990*).

لە بەشی سێهەمدا ئابووری کاری دابین کردنی خزمەتگوزارییە نەک کالای پێویست. ئەم شێوازە، تایبەت بە وڵاتانی پیشەسازی زۆر پێشکەوتووە کە خەریکی بگار لە کۆمەڵگای پیشەسازی بۆ پاش پیشەسازین. ئەم شێوازە بە تایبەت لە وڵاتی ئەمریکادا دیارە. نزیک بە ٦٠% خەڵکی ئەمریکا لەم بوارەدا چالاکیان هەیە. ئەم کەرتە -کە کەرتی ئابووری خزمەتگوزاریشی پێ دەڵێن- بریتیە لە بەڕێوەبردنی کارو باری ماڵی، زانیاری، گواستنەوە، ڕاگەیاندن، پەروەردە، فرۆش، بیمە، تووریسم و خزمەتگوزاریگەلی تر. بەڕای پۆرتێر ئەم بەشە نە تەنیا لە وڵاتانی پێشەسازی زۆر پێشکەوتوودا خەریکی گەشەسەندنە، بەڵکوو بە ڕاشکاوی دەبینین کە پیشەی خزمەتگوزاری خەریکی بەجیهانی بوونە.

**ئابووری بازاڕە پێشکەوتووەکان/ advanced market economics**

ئەم زاراوە باس لە نەزمێک دەکا کە لە پانتای جیهانیدا هان دەدا تا هەلی کاری یەکسان بۆ ژنان و پیاوانی کۆمەڵگا دابین بکات. هەرچەن دابین

کردنی هەلومەرجی یەکسان بۆ کاری ژن و پیاو تەنانەت لە ولاتە پێشکەوتووەکانیشدا رێگایەکی دوور و درێژی لە پێشە، بەلام وادیارە کە لە ولاتانی رۆژاوای ئەورووپا و ئەمریکای باکووردا بۆ گەیشتن بەم مەبەستە کۆشەوەی زۆر کراوە (عضدانلو؛ ١٣٨۴).

## ئابووری پاش پیشەسازی / postindustrial economy

پیشەسازی پرۆسەیەکە کە بەردەوام لە گەڕایە. پاش بە پیشەسازی بوون لە ئەورووپا و ئەمریکای باکوور، کرێکاران بەرەبەرە یەکیەتیگەلی کرێکارییان دامەزراند تا بەو بۆنەوە لە گەل کارخانەدار و سەرمایەدارەکان چەقە و وتو وێژ بکەن و بگەن بەداخوازەکانیان. لە درێژایی سەدەی بیستەمدا لە زۆربەی ولاتە ئەورووپییەکاندا یاسای بەرگری لە کار کردنی مندالانی کەم تەمەنیان دانا و مووچەی کرێکارانیان زۆرتر کرد و بەختی ژیانێکی لەبارتریان بۆ کرێکاران و بنەمالەکانیان هێنایە دی (وەکوو خوێندنی بالا و مافی کۆمەلایەتی). لەم پرۆسەی گۆڕانکارییەدا زات و سروشتی بەرهەمهێنانیش گۆڕانی بە سەردا هات. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا ئابووری زۆربەی ولاتە ئەورووپییەکان تووشی گۆڕان هات و ئەم ولاتانە رۆیشتنە نێو قۆناغێکی نوێوە کە ناوی «ئابووری پاش پیشەسازی»یان لە سەری دانا. ئابووری پاش پیشەسازی بریتیە لەو سیستەمە بەرهەمهێنەرانە کە بنەمای کاریان لە سەر کارگەلی خزمەتگوزاری و تیکنۆلۆجیگەلی ئاست بەرز دانراوە. هاوکات لە گەل بەکارهێنانی مەکینە ئۆتۆماتیکەکان کە دەوری مرۆڤیان لە کاری پیشەسازیدا کەمتر دەکردەوە، سیستەمی بیرۆکراسی و کاری ئیداری گەشەی سەند. لە سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا ژمارەی بەڕێوەبەران زۆر کەم بوو؛ بەلام هەنووکە پتر لە سێ یەکی هێزی کاری ئەم ولاتانە پێک دێنن (*Heilbroner, R. L. 1985*). هەروەها کارگەلی

خزمەتگوزاری وەکوو راگەیاندن، پەروەردە، پڕوپاگەندە، بانکەکـان و فـرۆتنی کاڵا، بەشی زۆر لە هێـزی کاریـان گرتۆتـە خـۆ. کـەواتـە، لـە خـولی پـاش پیشەسازیدا زۆربەی کارە پیشەسازییەکان جێگا بۆ کارگەلی خزمـەتگـوزاری چۆڵ دەکەن.

## ئابووری جیهانی / global economy

ئەم واتایە ئەو کردە ئابووریانە دەگرێتەوە کە لە زۆربەی وڵاتـانی جیهانـدا بەبێ گوێدان بـە سـنووورە جوگرافیاییـەکـان، ئـەنجـام دەدرێـن. زۆرن ئـەو کۆمەڵناسانەی کە رایان وایە کە ئیدی جیهان ئاوێتـەیـەک لـە ئابووریگـەلی نەتەوەیی لێک جیاواز نییە (*Chirot.D,1977 ; Wallerstein, I. 1980*). بـە پێچەوانەی ئەوە، کۆمپانیاگەلێکی گەورەی وەکـوو ئـەمریکـەن تووریسـتێر و شەریکە گەورەکانی ترۆمبیل‌سازی، هەلی کـار، شـێوازی کـار و سـتانداردی ژیانی سەرجەمی خەڵکی دونیا دابین دەکەن. لە جیهانی مودێڕندا رێکخراوە فرەنەتەوەییەکان بایەخێکی زۆریان هەیە. هەندێ لـەم رێکخراوانـە گـەڕانی ماڵییان زۆرتر لە سەرجەمی داهاتی وڵاتێکی مامناوەندییـە. بـۆ وێنـە بـاری ئابووری کۆمپانیای جێنێراڵز ماتۆر پتر لە زۆربەی وڵاتانی ئـەفریقـا، ئاسـیا و ئەمریکای لاتینە.

وڵاتانی رۆژاوا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا راستەوخۆ یان ناڕاسـتەوخـۆ بە سەر زۆربەی وڵاتـانی جیهانـدا حوکمـڕانییان دەکـرد. کـەمتـر وڵاتێکـی ئەورووپی بوو کە لە دوورترین شـوێنەکـانی دونیـادا خـاوەن چـەن کۆلـۆنی نەبێ. هەرچەن ژمارەی کۆلۆنییەکانی ئەمریکا لە چاو وڵاتانی‌تـردا زۆر کـەم بوو، بەڵام ئەمریکا تـوانی بـە دانی وام و یارمـەتی و لایـەنگـری سـەربـازی، بەشێکی زۆر لە وڵاتان ناڕاسـتەوخـۆ بێنێتـە ژێـر رکێفـی خـۆ. بـە گشـتی دەتوانین بڵێین کە کۆلۆنیالیزم جۆرێک دابەشکاری و چین‌بەنـدی جیهـانی

هێنایە دی (*Chirot, D;1977*). لەم دابەشکاری و چین‌بەندیە جیهانییەدا وڵاتانی پیشەسازی پێشکەوتوو، بوون بە چینی سەرمایەدار و وڵاتانی هەژاری ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای باشوور بوون بە چینی هەژاری جیهانی. وڵاتانێ وەکوو سپانیا و ئیتالی و ژاپۆن چینی مامناوەندی جیهانییان پێک دێنا.

سیستەمی کۆلۆنیالیزم لە راستیدا سیستەمێکی کشتوکاڵی بوو. واتە وڵاتانی ژێر دەست، مەوادی کاڵیان بۆ وڵاتانی ئەرووپی دابین دەکرد و لەم ناوەدا زۆرترین قازانجیش بۆ ئۆرووپییەکان بوو. هەرچەند زۆربەی وڵاتە کۆلۆنییەکان بەرە بەرە سەربەخۆیی رامیاری خۆیان بە دەست هێنا، بەڵام هەنووکە لە باری ئابوورییەوە سەربەخۆ نین. ئەمڕۆکە تەنانەت وڵاتە پێشکەوتووەکانیش لە باری ئابوورییەوە سەربەخۆ نین. چونکە سیستەمی دابەشکاری و چین‌بەندی جیهانی هیشتا بەردەوامە. تەنیا جیاوازی ئەم سیستەمە ئەوەیە کە ئەمڕۆ ئەو وڵاتانەی کە خەریکی گەشە سەندنن، نە تەنیا مەوادی کاڵ، بەڵکوو هێزی کاری هەرزانیشیان لە بەرانبەر کۆمپانیا گەورە جیهانییەکاندا رادەنێن (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## ئابووری خزمەتگوزاری / service economy

زۆربەی خەڵکی، کاتێ پێیان دەڵێن واتای «کرێکار» پێناسە بکەن، پێناسەی کەسێک دەکەن کە دەستی پینەبەسراوە و کڵاوی کار لە سەرە و ئاستی خوێندنی زۆر نزمە. لە راستیدا هەنووکە زۆربەی کرێکارانی وڵاتە پیشەسازی و مۆدێڕنەکان، کرێکاری نووسینگەیین. گۆڕانی شێوازی کاری دژوار لە کان و کارخانەکانی کۆمەڵگا پیشەسازییەکان بە کاری نووسینگەیی، ئاکامی پرۆسەی بە پیشەسازی بوونی خێرای کۆمەڵگاکانە. هەندێ لە کۆمەڵناسان ئەم پرۆسە بە پرۆسەی پیشە لابەری ناو لێ دەبەن.

بە بۆنەی بەمەکینەیی کردنی بەرهەمهێنانەوە، پیشەی زۆر لەناو چوون (ئەو کارانەی کە بە دەست دەکران). بە هۆی گەشەی کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکانەوە، هەندێ ئیش و کاری نوێ داهاتن کە راستەوخۆ پێوەندییەکیان لە گەڵ پرۆسەی بەرهەمهێنان نەبوو، بەلام ئەم کارانە بۆ کاری باشتر و قازانجی زۆرتر داهاتبوون، وەکوو: فرۆش، پروپاگەندە، کارگێڕێ، حیسابداری، بریکاری (بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی نێوان شەریکە و دەوڵەت، بەشدارانی کۆمپانیا و کرێکاران و کارمەندەکان). بەم جۆرە شێوازی کاری دەستی بۆ کاری نووسینگەیی گۆڕانی بە سەردا هات، واتە ئابووری کارخانەیی بوو بە ئابووری خزمەتگوزاری. واتای ئابووری خزمەتگوزاری ئەوەیە کە زۆربەی کرێکاران راستەوخۆ لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی کالادا بەشدار نین. بەڵکوو لە گەڵ خەڵکی و بۆچوونە نوێکان پێوەندیان هەیە. ئامارەکان واپیشان دەدەن کە لە ماوەی دە ساڵی رابردوودا ژمارەی کارە خزمەتگوزارییەکان زۆرترین گەشەیان بووە ( *Statistical Abstract of the United States, 1992*).

بەلام ئەمڕۆکە کارە نووسینگەییەکان بەها و بایەخی رابردوویان نییە. لە رابردوودا کارە نووسینگەییەکان بایەخێکی زۆریان بوو و **پاگەی** کۆمەلایەتی چینی ناونجییان مسۆگەر دەکرد. هەرچەن ئێستاش ئەم بایەخە لە بیری گشتی کۆمەڵگادا هەیە، بەلام ئەم کارانە ئاوێتەیەکن لە مووچەی زۆر و مووچەی کەم، بایەخی کۆمەلایەتی زۆر و کەم و شارەزایی زۆر و شارەزایی کەم. نزیک بە نیوەی ئەم کارانە، بریتین لە کاری فرۆش یاخۆ کارگەلی نووسینگەیی کەم بایەخ کە مووچەیان تەنانەت کەمتر لە کرێکارانی مۆنتاجی کارخانەکانە. نیوەی‌تر تایبەت بە کاری پسپۆڕی و بەڕێوەبەرایەتیە. بەلام ئەم کارانەش جۆراوجۆرن و زۆربەیان پێویستیان بە شارەزاییەکی زۆر نییە و بەختی پێشکەوت و گەشەیان تێدا زۆر کەمە.

## ئابووری دەستووری / command economy

ئادام سمیت بنیاتنەری ئابووری سەرمایەداری بە راشکاوی دەیزانی کە ئەم چەشنە سیستەمە دەبێتە هۆی نابەرانبەری ئابووری لە نێو چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا؛ بەڵام ئەو خۆی ئەم نابەرانبەرییەی بە دادوەرانە دەزانی (عضدانلو، ١٣٨٤). سمیت بڕوای وابوو کە لە نێو چالاکییە ئابوورییەکاندا بەهرە و قازانجی زۆرتر بە کەسانێک دەگات کە لێهاتوویی و شارەزایی زۆرتریان بێ، واتە کەسانێک سەرکەوتوون کە بتوانن کالایەکی لەبارتر بە نرخێکی هەرزانتر بخەنە نێو بازاڕەوە. بە ڕای سمیت کۆمەڵگا بە دەستێوەردانی دەوڵەت لە نێو کارو بارە ئابوورییەکاندا ناگاتە بەختەوەری و ئاسوودەیی، بەڵکوو ئەوە هەل و مەرج و تایبەتمەندیگەلی رکەبەریی نێو بازاڕن کە بەختەوەری گشتی بۆ کۆمەڵگا لە گەڵ خۆیان دێنن (تفضلی، ١٣٨۶).

ئابووری دەستووری دەکەوێتە بەرانبەری ئابووری سەرمایەدارییەوە. سەرەتای ئەم ئابوورییە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم؛ کاتێک ئاڵمانیا تووشی شەڕەکانی ناپلئۆن هات و دابەش کراو بوو بە سی و نۆ پارێزگای جیاواز کە لە باری رامیارییەوە نیوە سەربەخۆ بوون و لە باری ئابوورییەوە بە تەواوی سەربەخۆ بوون و لە نێوان خۆیاندا لەمپەری گومرۆکی زۆر توند و تۆڵیان هەڵچنیبوو. زۆر لە بیرمەندان و ئابووریزانانی ئەو سەردەمە –بە تایبەت فردریش لیست- خولیای یەکیەتی و یەکگرتوویی ئاڵمانی پێشوویان لە مێشکدا بوو. بەم بۆنەوە لیست دەستی دا بە بلاو کردنەوەی کتێبێک لە ژێر ناوی سیستەمی *نەتەوەیی ئابووری رامیاری* و ڕێبازی مێژوویی بنیات نا. بریتانیا لەو سەردەمەدا دەتوانین بڵێین کە بە هۆی کالای رێک و پێک و هەرزانەوە چەتری دەسەلاتی خۆی بە سەر ولاتانیتردا کێشابوو. لیست دەیزانی کە ئاڵمانیا بە ئابووری سەرمایەداری و

بازاڕی ئازادەوە ناتوانێ دەروستی کاڵا بریتانیەکان بێ؛ بۆیە هەندێ لە خاوەنانی پیشەسازی ئاڵمانیا بە گوێرەی بیرو ڕاکانی لیست داوایان لە حکوومەت کرد کە بە دانانی هەندێ یاسای گومرۆکی، بەر بە هاتنی کاڵا هەرزانەکانی بریتانیا بگرێ و لایەنگری و پشتگیری لە پیشەسازی ناوخۆ بکات(تفضلی، ۱۳۸۶).

ئەم سیستەمە لە وڵاتە کۆمۆنیستی و سووشیالیستییەکاندا درێژەی پێ درا و دەوڵەت بوو بە خاوەنی هەموو جۆرە کاڵا و پیشەیەک لەوڵاتانی مارکسیستیدا. لەم وڵاتانەدا دەوڵەت گەلاڵە بۆ سەرمایەکان دادەڕێژێ و بڕیار دەدا کە لە کوێدا خەرج بکرێن؛ تەنانەت سەرچاوەگەلی نەتەوەیی (وەکوو سەرچاوەمرۆییەکان) لە کوێ (کشتوکاڵ، پیشەسازی و ...) خەرج بکرێن. زۆربەی خەڵکی بۆ دەوڵەت کار دەکەن. لە بەرانبەردا دەوڵەت دەستەبەر دەبێ کە بۆ ئەندامانی کۆمەڵگا کار، خانوو، تەندروستی و پێداویستییەکانیتر دابین بکا. دۆزی سەرەکی سووشیالیستەکان دابەش کردنی بەرانبەر و دادوەرانەی سامان و سەرمایەی کۆمەڵگایە. بە وتەیەکیتر لە دووی ئەو شتەن کە مارکس کۆمەڵگای بێچینایەتی پێی دەگوت (عضدانلو، ۱۳۸۴).

بەڵام کێشەی ویست و ئەنگێزەی کرێکاران و گەندەڵی بەربڵاو و لە ڕادەبەدەری بەرپرسان و بەڕێوەبەران لە جڤاکە سووشیالیستیەکاندا تەنیا لە سۆنگەی بیرو بۆچوونی هەڵەی ئەم کەسانە لەمەڕ چۆنییەتی مرۆڤەوە نەبوو؛ بەڵکوو بەڕێوەبردنی ناتەواو و پڕلە هەڵە-کە لە بیچمی ئابووری دەستووریدا جێ بە جێ دەکرا- دەوری سەرەکی لە هەڵوەشاندنی ڕشتەی کارەکاندا بوو. نەبوونی کۆنترۆڵی زاتی —کە لە تایبەتمەندییەکانی ئابووری بازاڕی ئازادە- دەست و باڵی بەڕێوەبەرانی دەزگا و بنکەکانی بۆ ئەوەی بە ویستی خۆیان ئاڵ و گۆڕی بە سەردا بێنن، ئاوەڵا هێشتبوو و قەد ئاسەواری کارەکانی

خۆیان نەدەدییەوە (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

## ئابووریدەڤەری / peripheral economy

مەبەست لەم زاراوەیە ئەو ولاتە هەژارانەن کە تەنیا داهاتیان هێزی کاریانە و ئابوورییەکی یەک دەستیان هەیە. کار لەم ولاتانەدا داهاتی کەمەو پێویستی بە شارەزاییەکی زۆر نییە. کۆمەڵگا دەڤەرییەکان بە چەشنێکی نائاسایی بەندیوارن بە یەک بەرهەم (وەکوو قاوە، بادام یان تەماکۆ) یاخۆ یەک مادەی کانزایی وەکوو مس، رۆح و ژریژە. سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی ئەم ولاتانە کەمتر لە سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی یەکیەتی ئەورووپایە (*Van Evera, S;1990*). ئابوورییە دەڤەرییەکان بە زۆری بەندیوارن بە ئابوورییە ناوەندییەکانەوە. هۆی ئەم بەندیوارییە دەبێ لە سەردەمی کۆلۆنیالیسمدا پەیدۆزی بکرێ. ئابووری دەڤەری لە پەنای ئابووری جیهانیدا کار دەکا. شتێک کە لەم ولاتانەدا زۆر سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کە لە تەنیشت ئەو هەژارییە درێژخایەنەدا لە پڕونەکاو چالاکییەکی ئابووری زۆر گەورە (وەکوو کارخانەگەلی گەورەی بەرهەمهێنان) دەست پێدەکا. هۆی ئەم رووداوە ئەوەیە کە مووچەی خەڵکی ئەم ولاتانە زۆر کەمەو بەم بۆنەوە **ئابوورییە ناوەندی و نیوە دەڤەرەییەکان** کەڵکی ناڕەوایان لێ دەگرن.

## ئابووری ناوکی/ core economy

ئابووری ناوکی تایبەت بە ولاتانی دەوڵەمەند و پیشەسازییە کە خاوەنی حکوومەتگەلی بەهێزو بە دەسەلاتن. ولاتانی دەوڵەمەندی پیشەسازی، نزیک بە ٢/٣ بەرهەمی ئەو ولاتانەی خەریکی گەشانەوەن دەخەنە لای خۆیانەوە. ئەم ولاتانە بە کەڵک وەرگرتن لە ناوچەگەلی ئازادی بازرگانی،

ماکە سەرەکییەکان بە نرخێکی زۆر کـەم لـە ولاتـانی جیهـانی سـێیەم کـە پشتیان تەنیا بە هێزی کاریانەوە بەستراوە، دەکڕن (عضدانلو، ١٣٨٤).

## ئابووری نیوەدەڤەری / semi peripheral economy

ئەم واتایە ئەو ولاتانە دەگرێتەوە کە باری ئابوورییـان لـە نێـوان **نـاوکی و دەڤەریدایە**. ئەم ولاتانە تا رادەیەک سامانیان زۆرە و جۆراوجۆری ئـابووری و کۆمەلایەتیان بە رێژەی ولاتە دەڤەرییەکان زۆرترە. سامان زۆر نایەکسان لەم ولاتانەدا دابەش کراوە. ولاتانی تایوان، برازیل، کووریای باشوور و مکزیک لـە ریزی ئەم ولاتانەن. ئەم ولاتانە، ولاتە دەڤەرییەکان دەچەوسێننەوە و ولاتانی ناوەندیش ئەمان دەچەوسێننەوە. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە، ولاتانی عەراق و کوەیتی بەر لە شەڕی کەنداو لە ١٩٩١دا لـە ریـزی ولاتـانی نیـوەدەڤـەریـدا بوون. ئابووری ناوکی پشتی بـە نـەوتی هـەرزانی ئـەم ولاتانـە بـەسـتبوو و ئەمانیش پالبەستووی کرێکارانی هەرزانی ولاتە دەڤەرییەکـان بـوون. رادە و ئاستی ئەم پشت بەستن و پال پێوەدانە، پاش هێرشی عەراق بۆ سەر کوەیت ئاشکرا بوو. لەو دەمەدا میلیۆنها کرێکاری کۆچەر (حەفتا هـەزار ئێـرانی، دوو میلیۆن و دووسەد هەزار عەراقی، چل و پێنج هەزار یەمەنی، بیسـت و یـەک هەزارو هەشتسەد سوودانی، حەوتسـەد هـەزار میسـری، دووسـەد و بیسـت هەزار ئۆردۆنی، سی هەزار فەلەستینی) لە کوەیت هەلاتن. هاوکات لە گـەل ئەوە شەست و حەوت هەزار و شەشسـەد پاکسـتانی، سـەدو پـەنجـا هـەزار هیندی، هەشتاو پێنج هەزار بەنگلادێشی، سەد و شەست هـەزار ڤـیتنامی و سی هەزار فیلیپینی لە عەراق هەلاتن (*Miller, J. E;1991*).

بە رای ڤالرشـتاین، ولاتـانی نیـوە دەڤـەری دەوری زۆریـان لـە ئـابووری جیهانیدا هەیە، چونکە گەیشتوونەتە ئاستێک لە دەسەلات کە هەلومەرجـی پێویست بۆ سەرمایەگوزاری لە ولاتی خۆیاندا دابین بکەن. بە رای ئەو، ئـەم

هەڵومەرجە لە وڵاتانی نـاوەندیـدا نییـە (Wallerstein, I .1984؛ عضـدانلو، ١٣٨٤).

## ئاپارتاید/ apartheid

پارتی نـەتـەوەیـی ئـەفریقـای باشـوور پـاش ئـەوەی لـە ساڵـی ١٩٤٨دا دەسەڵاتی گرتە دەسـتەوە، دەسـتی دابـە تۆمـاری یاسـاگەلی دووچـاوەکـی رەچەڵەکـی. ئـەم یاسـایانە لـە سـەر زوڵـم و نابـەرانبـەری و دووچـاوەکـی دارێژرابوون و هەموو خەڵکی ئەفریقا بە چـوار پـاژ دابـەش کرابـوون: سـپی (بەرەی سپی پێستە کۆچەرە ئەورووپییەکان)، رەنگین پێستەکان (ئـەوانـەی کە رەچەڵەکیان لە دوو یان چەند تۆرەمەی جیاواز بوو)، ئاسیاییەکان و رەش پێستەکان. کەمینەی سپی پێست کە سـێزدە لـە سـەدی(١٣%) خـەڵـکی ئەفریقایان پێک دێنا، بە سەر هەموو ئەفریقادا دەسەڵاتیان هەبوو. ئـەوانـەی کە سپی پێست نەبوون، مافی دەنگدان و ناردنی نوێنەریان بـۆ پـەرلـەمـان نەبوو. دووچاوەکی رەچەڵەکی لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگادا بەڕێوە دەبـرا: وەکوو جیاکردنەوەی ئاودەستەکان، واگۆنی شەمەنـدەفـەر، قوتابخانـەکـان و پارک و سەیرانگاکان. میلیۆنها رەشپێست لە ناوچەگەلێکدا کە زاگەیان پـێ دەگوتن و لە دەرەوەی شـاردا بـوون جـێگیر کرابـوون. زۆربـەی زۆری ئـەم رەشپێستانە کرێکاری کانی زێڕو ئەڵماس بوون و ژینێکی زۆر ئەسـتەمیـان بوو.

سیستەمی ئاپارتاید بۆ بەڕێوەبردنی سیاسـەتـەکـانی خـۆی کـەڵـکی لـە پـۆلیس و دەزگـا حکوومییـەکـان وەردەگـرت و هـەرچـەنـد خـەڵـکی زۆر بەرهەڵستی ئەم سیاسەتانە دەبوون، بەڵام کـەمتـرین رەخنـە و بـەرەنگـاری دەبووە شەڕو کوشتارێکی خوێناوی. پاش ساڵەها سەرکۆنـە و لۆمـەو پـاوانی ئابووری و کولتووری و بـەرەنگـاری خـەڵـکی نـاوخۆ، سیسـتەمـی ئاپارتایـد

بـەرەبـەرە لاواز كـەوت. كاتێـك لـە سالـی ١٩٨٩دا F. W. Clark بـوو بـە سەرۆک‌کۆماری ئەفریقای باشوور، ئـەم وڵاتـە تووشـی قـەیـران و کۆسـپ و تەگەرەیەکی گورچکبڕ هاتبوو. بۆیە لە سالـی ١٩٩٠ دا دەسـتی ئاشـتی بـۆ کۆنگرەی نەتەوەیی ئافریقا –گرینگترین پـارتی دژ بـە ئاپارتایـد- راکێشـا و نێلسۆن ماندێلا –رێبەری ئـەم پارتـەی- پـاش بیسـت‌و حـەوت سـاڵ لـە گرتووخانە رزگار کرد. پـاش ئـەوەی وتـووێژێکی دوورو دێـژو ئـەسـتەم لـە نێوانیاندا رووی دا، تا لە ٢٧ ئاپڕیلی ١٩٩٤دا کۆنگرەی نـەتـەوەیـی ئـەفریقـا زۆرترین بەشی دەنگەکانی (٦٢%) بەدەست هێنا و ماندێلا بوو بە یەکەمین سەرۆک‌کۆماری رەش‌پێستی ئافریقای باشوور کە پاش ئاپارتاید هاتبووە سەر کار.

لە سیستەمی ئاپارتایددا منداڵێک کە لە دایک دەبوو، نە وەکوو مرۆڤـێک، بەڵکوو وەکوو سپی پێست، رەش‌پێست یاخۆ رەنگێکـی‌تـر دەهاتـە دونیـاوە. هەموو هەل‌ومەرج و ئاسانکارییەکانی کۆمەڵگا تایبەت بە تاقمی ١٣% سـپی پیست بوو و خەڵکی‌تر لە زۆربەی ئـەو هـەل‌ومـەرجانـەو تـەنانـەت لـە زۆر پێداویستی سەرەتاییش بێ‌بەش بوون. رەنگی پێست دەورێکی گرینگـی لـە شێوازی خوێندن لە قوتابخانە، یاری و خۆراک و پۆشەن و زۆر رەهەنـدی‌تـر دەبینی.

## ئاپۆره / crowd

بە سەرنجدان بە جیاوازییەک کە زانایانی زانستە کۆمەڵایـەتییـەکـان لـە سەر پێناسەکردنی ئەم زاراوە هەیانە، گەیشتن بە پێناسەیەک کە لـە لایـەن هەمووانـەوە پـەسـند بکـرێ، زۆر ئاسـتەمـە. بـە وردبوونـەوە لـە سـەر ئـەو تایبـەتمـەندییانـەی کـە لـە سـەر هـاودەنگـی هـەیـە و بـە لابـردنی ئـەم تایبەتمەندییانە کـە بۆچـوونی جۆراوجۆریـان لـە سـەرە، دەتـوانین ئـاوەهـا

پێناسەیەک پێشکەش بکەین:

ئاپۆره بریتیە لە جەماوەرێک کە لە شوێنێکدا کۆمایان بەستووە و ئەنگێزەو پێوەندییەکی زۆر پتەو و راستەوخۆ و کاتییان پێکەوە هەیە. ئەو گرووپانەی کە لە باری جەستەییەوە نین لە نزیک یەکەوە و هەروەها جەماوەرێکی ترساو کە هیچ جۆرە وێکچوونێک بێجگە لە ترسەکەیان بۆ پێوەندی نێوانیان بەدی ناکرێ، دەتوانین لە نێو بازنەی ئەم پێناسەیە بخەینە دەرەوە. ئاپۆرەکان رەنگە بە هۆی هۆکارێکەوە یاخۆ بە بێ هیچ هۆکارێک بێنە دی، هەروەها رەنگە دۆزێکی سەرەکییان بێ یان نەیانبێ، یاخۆ رەنگە لە بەشداراندا رەفتار و پێگەیەکی تایبەتی کۆمەلایەتی بێ یا نەبێ. پۆلێن کردنێکی لاوەکی زۆر باو کە بە گوێرەی بوون یا نەبوونی دۆز و ئامانجی سەرەکی بریتیە لە «ئاپۆرەی بزۆز (ئەکتیڤ)» کە تێیدا سەرنج بەرەو لای هەندێ ئامانجی هاوبەش رادەکێشرێ؛ هەروەها «ئاپۆرەی نمایشی» کە هیچ خالێکی هاوبەشیان نییە و بەشداران تەنیا هەندێ رەفتاری هەیەجانی پیشان دەدەن. هەندێ گرووپی وەکوو گوێگران یاخۆ جەماوەری نێو شەقامەکان دەتوانن ببنە ئاپۆرە؛ جەماوەرێک کە خەریکی جەنگە یان ترساوە، هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی ئاپۆرەی هەیە.

بۆچوون و پێناسەی هەندێ لە کۆمەلناسان سەبارەت بە ئاپۆرە بریتیە لە:

ئەلیووت دەلێ: «کۆنترۆلە ئاسایی و ئەقلانییەکانی کەسایەتیەک کە ئازاد کراون یاخۆ بێجوولە ماون، ئاپۆرە بەرەو هەلس‌و کەوتی پەتیارانە یان ئاژاوە رادەکێشن». بلۆمێریش جارێکی‌تر لە سەر گرینگی جیاوازی نێوان ئاپۆرەی بزۆز کە لە ناوەندی سەرنجدایە و ئاپۆرەی نمایشی کە کەمتر سەرنجی پێدەدرێ، جەخت دەکا (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

رابێرت پارک لە نێوان هەموو تایبەتمەندییەکاندا لە سەر پێویست بوونی پێوەندی پێداگری دەکا. بەبڕوای پارک «ئاپۆرە رێکخراوێکی کۆمەلایەتی

سەرەتایی و کرچ و کاڵە. ئاپۆرە خاوەنی هیچ نەریتێک نییە و بەم بۆنەوە هیچ سیمبۆل و ڕێوڕەسمێکی تایبەتی نییە. ئەم ڕێکخراوە هیچ ئەرکێک ناخاتە ئەستۆی کەس و نابێتە هۆی ئەمەگداری هیچ کەس» (کوزر؛ ١٣٨٧). هەروەها دیسان پارک رای وایە کە «کۆمەڵەیەک دەبێتە ئاپۆرە کە پێوەندی نزیک لە نێوان ئەندامانیدا هاتبێتە دی» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## ئازاری سێکسی/ sexual harassment

تەشەنەی ئازاری سێکسی لە شوێنی کاردا، دەنگدانەوەیەکە لە شوناسەی سێکسی ڕێکخراوەکان. ئازاری سێکسی بریتیە لە دەسدرێژی سێکسی بەردەوام و زۆرەکی بە کردەوە یاخۆ بە قسە بۆ کەسی‌تر کە ببێتە هۆی ڕەنجاندن و وەڕس کردن و پەک‌کەوتنی ئیش و کاری. هاوسەنگ نەبوونی ڕادەی دەسەڵات، هۆی سەرەکی ئەم ئازارانەیە؛ هەرچەند هەن ژنانێکیش کە پیاوانی ژێردەستیان دەخەنە بەر ئازاری سێکسی، بەڵام چونکە زۆرتر پیاوان دەسەڵاتیان لە دەستە، ئازار دیتنی ژنان لە دەست پیاوان زۆرتر باوە (*Reskin and Padavice, 1994*). لە نێو دام و دەزگا و شوێنگەلی ئیش‌وکاردا پیاوان لە هێزو دەسەڵاتی کارییان بۆ دەسدرێژی سێکسی بە سەر ژناندا کەڵک وەردەگرن. ڕەنگە ئەم ئازارانە شێوازێکی بێشەرمانە بگرنە خۆ، وەکوو ئەوەی سەرۆکی ئیدارەیەک هەڕەشەلە کارمەندێکی بکات کە یا دەبێ پێوەندی لە گەڵ بێ، یاخۆ لە کار بێکاری دەکا. بەڵام زۆربەی ئازارەکان هێورترن. وەکوو ئەوەی سەرۆکێک بە تیزو پلار تێگرتن بە کارمەندێکی بگەینێ کە گەر لەگەڵی پێوەندی هەبێ، پاداشی بەرچاوی بەردەکەوێ؛ یان ئەگەر بۆی ڕەزا نەبێ تووشی ناکۆکی دێ و بۆ گەیشتن بە پلەی سەرتر تووشی کێشە دێ.

ئاشکرایە کە ناکرێ مەودای نێوان ئازارو کۆشەوەی ڕەوای پیاوێک بۆ

نزیک کەوتنەوە لە ژنێک ڕەچاو بکرێ. بەلام بە پێی ڕاپۆرتگەلی تاکەکەسی، لە هەر دەژنی بریتانی حەوتیان تووشی ئازاری سێکسی هاتوون. ئازاری سێکسی دەکرێ تەنیا جارێک رووی دابێ و دەکرێ ڕەوتێکی ئاکاری بەردەوام بێ (*L. Kelly 1988*). گەر ئازاری سێکسی ڕەوتێکی ئاکاری بەردەوام بێ، ژنان بۆ کاری ڕۆژانەیان تووشی ئاستەنگ و کێشەی زۆر دەبن و ڕەنگە لە هەموو جۆری مەرەخەسی کەلک وەربگرن و تەنانەت ڕەنگە واز لە کارەکەشیان بێنن.

ئەمڕۆ لە زۆربەی ولاتانی ئەرووپیدا ئازاری سێکسی بەربەستی یاسایی هەیە، بەلام بیرو ڕای کۆمەلناسان ئەوەیە کە زۆربەی هەرە زۆری ئەم ئازارانە ئاشکرا ناکرێن. هەرچەن زانیاری ژنان لە مەڕ ئازاری سێکسی گەشەی زۆری سەندووە، بەلام زۆربەی ئەو ژنانەی کە تووش هاتوون-و لەم سۆنگەوە باری دەروونیان ئالۆز بووە- ڕەنگە ئەم بە سەرهاتەیان بە ئازاری سێکسی نەزانن. ژمارەیەکی زۆر لەو ژنانەی کە تووشی ئازاری سێکسی هاتوون و دادخوازی ناکەن، ترسیان لەوەیە کە شکاتەکەیان بە ڕاست نەگیرێ یاخۆ بڕوایان پێ نەکەن، یاخۆ خۆیان بخرێنە بەر لێ پرسینەوە (*Giuffer and Williams: 1994*).

### ئاژاوە/ riot

لە کۆمەلناسیدا ئەم واتایە باس لە هەلوروژانی کۆمەلایەتی دەکا کە زۆر توند و تیژ و تووڕە و ناڕاستەوخۆیە ؛بڕوانە: **شۆڕش**.

### ئاسایشگا/ hospice

لە ئەمریکادا مردن تا ئەم دواییانە وەکوو تابۆیەک چاوی لێ دەکرا. ئەو نەخۆشانەی کە لە گیانەلادا بوون دەنێردرانە ئاسایشگاکان تاکوو گەنجان و

ئەو کەسانەی نەخۆش نین، نەیانبینن. پزیشکەکان کەمتر بە نەخۆشەکانیان دەگوت کە هیوایەک بە چابوونەوەیان نییە و لە دوایین کاتی ژیندان؛ بنەماڵەی نەخۆشەکانیش ئەم گومانەیان بوو کە نەخۆشەکەیان چاک دەبێتەوە. بۆیە نەخۆش بە تاقی تەنێ دەگەڵ ئێش و ئازارەکانی دەستەملان بوو و کەسی نەبوو کە ترس و دڵەڕاوکێیەکانی بۆ باس کا.

ئەلیزابت کۆبلێر رۆس و ئێرنێست بێکێر یەکەم کۆمەڵناسانێک بوون کە ئەم رچەیان شکاند و پێیان نایە نێو خەڵوەتگای ئەم کەسانەوە. کۆبلێر رۆس بەو وتوویژەی کە لە گەڵ ئەو نەخۆشانی کە خەریکی گیانەلا بوون تێگەیشت کە مردنیش وەکوو ژیان قۆناغی پێش‌بینی کراوی هەیە. ئەم قۆناغانە بریتین لە: ١- حاشا (مردن نایەتە سەروەختی من) ٢- تووڕەیی (بۆچی من؟) ٣- چەقە کردن (زۆرتر لە گەڵ خودا، بۆ زۆرتر ژیان) ٤- دژداماوی (هەست بە شکانێکی زۆر) ٥- لە کۆتاییدا دان‌پێدانان (هاوڕێ لە گەڵ هەست بە ماندوویی و نیاز بە پشوودانی پێش مردن) ( *Kubler Ross, E; 1969*). کۆبلێر رۆس تێگەیشت کە بنەماڵەی نەخۆشیش ئەم قۆناغانە هاوڕێ لە گەڵ هەست بە گۆناحباری بۆ ئەو کارانەی کە دەیانتوانی بیکەن و نەیانکردووە، یان دەکرا نەیکەن و کردوویانە، دەبڕن. بەڕای کۆبلێر سەرنج نەدان بەم نەخۆشانەو بنەماڵەکانیان لەم قۆناغانەدا و ئەو هەلانەی کە دەتوانن لەم کاتەدا چێژی لێ بگرن، زۆر توندوتیژ و زاڵمانەیە.

ئێرنێست بێکێر لە کتێبەکەیدا کە لە ژێرناوی سەرنجنەدان بە مردن، بڵاو کرایەوە، بە ئەنجامێکی لەم جۆرە دەگات (*Becker, E; 1973*). بەڕای بیکێر، ئێمە بە دوور گرتنی خۆمان لە مردن، خۆمان لە دوو شت بێ‌بەش کردووە: یەکەم، بێوەر کردنی تاک لە دوایین هەلی ئارام‌گرتنی پێش مردن؛ دووهەم، فەوتاندنی ئەو هەلانەی بنەماڵەی نەخۆش بۆ ناسینی مردن هەیانە تاکوو باشتر لە گەڵی رووبەڕوو بن.

بە گوێرەی ئەو ئامارانەی لە ١٩٨٠دا هاتوونەتە دەست، زۆربەی

ئەمریکییەکان هیچ ترسێکیان لە مردن نەبووەو زۆربەیان پێیان خۆش بووە کە کاتی مردنیان بزانن. هەروەها رایان وابووە کە بە جێی زیندوو ڕاگرتنی نائاسایی ئەو نەخۆشانەی دەرمان ناکرێن، دەبێ ئیزنی مردنیان پێ بدرێ. ئاکامی ئەو باسانە سەرهەڵدانی بزاڤێکە بە ناوی «بزاڤیئاسایشگا» (*Kamerman, J. B; 1988*). ئاسایشگا شوێنێکی خانووئاسایە (بە کەل و پەلی پێویستەوە) کە بۆ ئەو نەخۆشانەی دەرمان ناکرێن رەچاو کراوە تا قۆناغەکانی پێش مردن بە ئێش و ژانێکی کەمترەوە بەرنە سەر. بەڕای ئەم کەسانە، نەخۆشخانەکان بۆ ئەو نەخۆشانە دابین کراوە کە چاک دەبنەوە، بۆیە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە دەرمان نابن زۆر شیاو نییە. بە پێچەوانەی ئەوە، لە ئاسایشگاکاندا مردن رووداوێکی ئاساییە و هان دەدرێ تا بە دەرمانە هێورکەرەوەکان و راوێژکاری دەروونی، نەخۆش بۆ مردن ئامادە بکرێ. نەخۆشی ئەیدز کە بۆتە هۆی مردنێکی پڕئازار بۆ تووشیارانی، گەشەی بە بزاڤی ئاسایشگا داوە و گیانێکی نوێی داوە بە «هونەری مردن».

### ئاسەواری هاوسۆرن/ hawthorne effect

هاوسۆرن ناوی کارخانەیەک بوو لە لێواری شاری شیکاگۆدا. لە دەیەکانی ١٩٣٠دا ئەزموونێک بۆ هەڵسەنگاندن و تاقی کردنەوەی ئاستی لێهاتوویی کرێکارانی کارخانەی هاوسۆرن لە هەلومەرجی جۆراوجۆردا بەڕێوە چوو؛ ئاکامی ئەم ئەزموونە بە ناوی ئاسەواری هاوسۆرن بەناوبانگ بوو. توێژەرانێک بۆ نرخاندنی ئاستی بەرهەمهێنانی کرێکارانی ئەم کارخانە بە کار گیران (*Roethlisberger. F. J; 1939*). یەکێک لە گریمانەکانی توێژەران ئەوە بوو کە زۆرتر کردنی رووناکی نێو کارخانە ئاستی توانی کرێکاران بەرز دەکاتەوە. بەر لە هەر شتێ دەستیان دا بە پێواندنی رادەی توانی کرێکاران لە هەلومەرجی ئاساییدا –بەر لە زۆرتر کردنی رووناکی نێو کارخانە

(dependent variable «بگۆڕی بەندیوار»)، پاشان رووناکی کارخانەیان زۆرتر کرد (independent variable «بگۆڕی سەربەخۆ»). پاش پتر کردنی رووناکی، دیسان توانی کرێکارانیان پێوا. ئاکامی تاقیکردنەوەکە ئەوەی پیشان دەدا کە بە زۆرتر کردنی رووناکی کارخانە، توانی کرێکاران بەرزتر بۆتەوە. واتە بیردۆزەکەیان چەسپێندرابوو. بەلام بابەتی سەیر ئەوە بوو کە پاش کەم کردنەوەی رووناکی نێو کارخانە، دیسان توانی کرێکاران زۆرتر ببووەوە. ئەم رووداوە لە گەڵ بیردۆزەکەی ئەوان ناتەبا بوو. پاش توێژینەوەی زۆر، توێژەران تێگەیشتن کە کرێکاران تەنانەت ئەو کاتەش کە باش نەیاندەتوانی ببینن، چونکە هەستیان دەکرد چاودێریان لێ دەکرێ، باشتر و زۆرتر کاریان دەکرد. پاش ئەم ئەزموونە بوو کە کۆمەڵناسان زاراوەی ئاسەواری هاوسۆرنیان بەکار دەبرد. واتای ئەم زاراوەیە ئاڵوگۆڕێکە کە لە کاتی توێژینەوە لە هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی بە سەریاندا دەکۆڵنەوە، دێتە ئاراوە. کۆمەڵناسان پێیان وایە هۆی ئەم رووداوە ئەوەیە کە ئەم کەسانە دەزانن توێژینەوەیان لە سەر دەکەن. ستانلی میلگرام یەکێکتر لەو کۆمەڵناسانەیە کە لە ئەزموونی «هاودەنگی گرووپی»دا بەم ئەنجامە گەیشت (*Milgram,S; 1964: 137-43*).

### ئاسیمیلەبوون (توانەوە) / assimilation

واتای ئەم وشەیە بریتیە لە «لێکتر چوون»، یاخۆ «زۆرتر لەیەک چوون»؛ بەلام لە کۆمەڵناسیدا بەم چەشنە بەکار دەبرێ: ١) پرۆسەیەک کە تێیدا گرووپێک – کە زۆرتر لە گرووپە کەمینە یا کۆچەرەکان پێکدێت– بەهۆی پێوەندی لە گەڵ گرووپی زۆرینەوە، کولتووری باوی نێو کۆمەڵگا وەردەگرن و ئاوێتەی دەبن. ٢) ئاکام و ئەنجامی ئەم ئاوێتەبوون و وێکچوونە، واتە: یەکیەتی کولتووری.

بەم چەشنە ئاسیمیلەبوون پرۆسەیەکە کە تێیدا گرووپێک کۆمەڵەیەک لە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی خۆی لە دەست دەدات و کۆمەڵە کولتوورێکیتر (بە هۆی پێوەندی لە گەڵ کولتوورێکیتر و هەروەها بەشداری لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا) وەردەگرێ. ئەم گۆڕانە بەرەبەرە و بەکاوەخۆ روو دەدات و لە هەر قۆناغێکدا رەنگە ئاشکرا بێ. هەروەها ئەم زاراوە لەگەڵ زاراوەی تێکەڵبوون یا تێکەڵ بوونی رەگەزەکان بە هۆی پێوەندی خێزانییەوە کە زۆرتر رەهەندێکی بایۆلۆجیکی هەیە، جیاوازی زۆری هەیە. ئاسیمیلەی تەواو کاتێک روودەدات کە ئەندامانی نوێی کۆمەڵگا بە چەشنێک لەنێو پەیکەرەی کۆمەڵگادا ئاوێتەبن کە نەکرێ لە گەڵ ئەندامانی پێشووی کۆمەڵگا جیابکرێنەوە. خاڵێکیتر کە جێگای سەرنجە ئەوەیە کە زۆرجار بینراوە کە ئەندامانی نوێ یا هەمان گرووپی کۆچەر نە تەنیا کولتووری کۆمەڵگایان وەرگرتووە، بەڵکوو هاوکات لە گەڵ ئەو وەرگرتنە، ئاسەواری کولتووری خۆیان بە سەر کۆمەڵگادا بەجێ هێشتووە. ئەمە پیشان دەدات کە ئەم پرۆسەیە یەک لایەنە نییە (گولدوکولب؛ ١٣٨٤). بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بکەین بە کۆچ و هێرشی مەنگوولەکان بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی و ئێران بەتایبەت. ئەم کۆچەرانە هاوکات لە گەڵ ئەوەی کە لەنێو کولتووری کۆمەڵگادا تواونەتەوە و بەشە کولتوورییەکانی کۆمەڵگایان وەرگرتووە، ئاسەواری کولتووری خۆیان بە سەر کۆمەڵگادا بەجێ هێشتووە.

بۆ ئاسیمیلەبوون، گرووپی کۆچەر دەبێ لەم حەوت قۆناغە تێپەڕێ؛ واتە، گرووپێکی رەگەزی یان هۆزی کاتێک بەتەواوی شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵگای وەرگرتووە کە بە تەواوی ئەم حەوت قۆناغەی تێپەڕاندبێ:

١- گرووپ بە مەبەستی وەرگرتنی کولتووری کۆمەڵگا، واز لە کولتووری خۆی بێنێ (زمان، جلوبەرگ، ئایین، خۆراک و هتد). ئێسنۆگرافەکان بەم شێوازە دەڵێن کولتوور وەرگری.

٢- گرووپ بتوانێ بڕواتە نێو تۆڕ و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی گرووپی زاڵی نێو کۆمەڵگا. بەم کارە دەڵێن ئاسیمیلەی پێکهاتەیی( *structural assimilation*).

٣- ئەندامانی گرووپی کەمینە لەڕێی ژنوژنخواز لە گەڵ گرووپی زۆرینە، بەرەیەکی نوێ پێک بێنن. بەم کردەیە دەڵێن ئاسیمیلەی هاوسەرگیرانە (*marital assimilation*). شایانی باسە کە هەربەو چەشنە کە لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا، رابێرت فاریس لە فەرهەنگی زانستەکۆمەڵایەتیەکاندا، ئەم چەمکە کە تایبەتمەندییەکی بایۆلۆجیکی هەیە، لە گەڵ ئاسیمیلەبوون بە جیاواز دەزانێ.

٤- گرووپی کەمینە چییەتی خۆی لەڕێی تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی گرووپی زۆرینەوە بەدەست بێنێ.

٥- گرووپ بەرەنگاری دەمارگیرانەی لەگەڵ ئەندامانی گرووپی زۆرینەدا نەبێ.

٦- گرووپ رەفتاری دووچاوەکییانەی لە گەڵ ئەندامانی گرووپی زۆرینەدا نەبێ.

٧- گرووپ هیچ ململانێ و دژایەتییەکی لە گەڵ ئەندامانی گرووپی زورینەدا نەبێ.

لە کۆمەڵناسیدا جیاوازییەکی زۆر لە سەر چۆنییەتی پێناسە کردنی ئەم زاراوە نییە. هەرچەند هەندێ لە ئێسنۆگرافەکان ئەم زاراوەیە هاوواتا لە گەڵ کولتووروەرگری(*acculturation*)دەزانن. م.فریدمەن دەڵێت: «پرۆسەیەک کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە گرووپێکی کەمینە لەنێو کۆمەڵگایەکی بەربڵاودا جێگای خۆی بکاتەوە، دیاردەیەکە کە هەم دەتوانین پێی بڵێین ئاسیمیلەبوون و هەم پێی بڵێین کولتوور وەرگری. زاراوەی یەکەم کاتێک بەکار دێنین کە مەبەستمان لێکدانەوەی شێوازی ئاوێتەبوونی کەمینەیەک

لەنێو دڵی سیستەمی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کومەڵگای گەورەتر بێ.
کەچی مەبەست لە زاراوەی دووەم ئەوەیە کە بزانین تایبەتمەندییە
کولتوورییەکانی گرووپی کەمینە لە بەرانبەر تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی
گرووپی زۆرینەدا چلۆن تووشی ئاڵوگۆڕ دەبن» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).
بڕوانە: **تێکەڵاوی**.

## ئاشتی/ peace

ئاشتی بریتیە لەو هەل‌ومەرجەی کە توندوتیژی تێدا نەبێ. پێناسە کردن
و دیاری کردنی تخووب و کەوشەنی ئاشتی، وەکوو پێناسە و دیاری کردنی
سنووری جەنگ هەر لە سەردەمی کەوناراوە تا ئێستا پرس و تەگەرەی زۆری
تێکەوتووە. جەنگ‌ناسانێک وەکوو گاستۆن بۆتۆل هانیان داوە پێناسەیەک لە
شەڕ دابین بکەن کە بنەماکانی لە سەر هەندێ پێوەری حاشاهەڵنەگر
دامەزرابێ؛ واتە پێوەری ئاماری.

ئاشتی زاراوەیەکە زۆرتر لە پێوەندییە نێونەتەوەییەکاندا کەڵکی لێ
وەردەگیرێ. ئاشتی ڕەنگە باس بکات لە ١) دوایی هاتنی شەڕ و جەنگ،
وەکوو ئاشتی ڤێرسای یا لە واتایەکی بەربلاوتر ٢) نەبوونی شەڕ، ٣) دۆستی
و برایەتی ئەکتیڤ یا ٤) ئەو ڕێکخراوانەی کە توانیویانە پێوەندی نێوان دوو یا
چەن وڵات بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ڕێک‌وپێک بکەن. سەنت ئاگوستین
لە نێوان پێناسەکانی دووەم و سێیەم و چوارەمدا جیاوازی داناوە و گوتوویە
کە ئاشتی ڕاستەقینە تەنیا نەبوونی دژایەتییە ئەکتیڤەکان نییە، بەڵکوو
بوونی «هێمنایەتییە لە نێو سیستەمدا». لەم ساڵانەی دواییەدا بە داهاتنی
ئەم زاراوانەی خوارەوە، دان بەم جیاوازییەدا نراوە: «پێکڕاژیانی بێ‌کێشە» کە
زۆرجار باس لە دژایەتییەکی پەنامەکیش دەکات؛ هەروەها «هاوکاری
بێ‌کێشە» کە ئاماژە دەکات بە ئاریکاری بۆ گەیشتن بە دۆزی هاوبەش و

چارەسەر کردنی شەڕو کێشەکان بە شێوەیەکی دادوەرانە. ئەم جیاوازیە لە زاراەی «جەنگی سارد»یشدا شراوەیە کە ئاماژە دەکات بە نەبوونی ناتەباییەکی بەردەوام لە نێوان ئەو حکوومەتانەی کە ئەوەندە لە گەڵ یەک دوژمنایەتی و بەدگومانییان نییە کە ببێتە هۆی شەڕێکی ئەکتیڤی بەردەوام (رایت؛ ١٩٦٤).

یەکێک لەو پرسانەی کە کۆمەڵناسان هێناویانەتە ئاراوە ئەوەیە کە چۆن دەکرێ مەترسی شەڕ کەم بکرێتەوە؟ لێرەدا بە چەن ڕێگەچارە بۆ کەم کردنەوەی شەڕ ئاماژە دەکرێ:

١- بەرەنگاری: لۆجیکی کێبەرکێی تەقەمەنی، بۆتە هۆی تێکدانی ئاسایش و «هاوسەنگی رەشکوژی» (balance of terror) زلهێزەکان. بنەمای متمانەی هاوبەشی تێکدان ( mutually assured destruction- MAD) –بەم واتایە کە هەر لایەنێک کە دەسپێکەری هێرشی ناوکی دژ بە لایەنی تر بێ، توانی خۆڕاگرتن لە بەرانبەر هێرشی هەمەلایەنەی لایەنی تری هەیە- ستراتژی بەرەنگاری،بۆ ماوەی شەست ساڵ توانیویە ئاشتی بپارێزێ. بەڵام ئەم ستراتژییە سێ کەمایەسی هەیە: یەکەم، ئەم ستراتژییە بۆتە هۆی کێبەرکێیەکی زۆری چەک و تەقەمەنی. دووەم، ئەمڕۆکە مووشەکەکان دەتوانن کڵاوەی ناوکی زۆر خێراتر لەو سەردەمەی کە ئەم ستراتژییە داڕێژرا بگەیننە دوورترین شوێنەکانی دونیا. کۆنترۆڵی ئەم مووشەکانە دراوەتە کۆمپیۆتەرەکانی تایبەت بەم کارە و بەبۆنەی هەلی زۆر کەم بۆ دژکردەوە، مەترسی شەڕ زۆرتر بۆتەوە. سێیەم، بەرەنگاری ناتوانێ ببێتە هۆی بەرگری لە پەرەسەندنی چەکەناوکییەکان، ئەم چەکانەش بۆ خۆیان مەترسییەکی زۆرن بۆ ئاشتی نێونەتەوەیی.

٢- تیکنۆلۆجی پێشڕەوی بەرگری( strategic defence initiative- SDI): گەر تیکنۆلۆجی بۆتەهۆی بەدیهاتنی چەک، رەنگە خۆیشی بتوانێ

بەرگری لە شەڕ بکات. ئەمە بۆچوونێک بوو کە لە پەنای بەرەنگاری ستراتژیکەوە سەری هەڵداوە. ئەم بۆچوونە، ساڵی ١٩٨١ لە لایەن دەوڵەتی رەیگانەوە پێشنیار کرا. بەرگری ستراتژیک گەلالەیەکی ئاڵۆزە بۆ سەتەلایتەکان و پێوەندییان لە گەڵ دامودەزگا زەوینییەکان، تا بە هۆی ئەوانەوە بکرێ چەترێک بۆ بەرگری لە هێرشی مووشەکی دوژمنان دابین بکرێ. ئەم سیستەمە دەتوانێ مووشەکەکانی دوژمن لە هەمان کاتی هاویشتندا بدۆزێتەوە و بەر لە تەقینەوەیان لەناویان ببات.

٣- رامیاری و چەککردن (چەک داماڵین): هەندێ لە بیرمەندان رایان وایە کە باشترین رێگا بۆ گەیشتن بە ئاشتی، هەمان رامیاری و وتوویژە، نەک تێکنۆلۆجی (*dedrick, D, & R. E. yinger; 1990*). رامیاری زۆرتر لە چێ کردن و هەمار کردنی چەک و تەقەمەنی دەتوانێ ئاسایشی ولاتان دابین بکات. بەلام ئەم شێوازەش کێشە و تەگەرەی زۆری هەیە. هیچ ولاتێک پێی خۆش نییە بە کەم کردنەوەی گوژمەی کڕینی چەک و تەقەمەنی، خۆی ئەوەندە لاواز بکاتەوە کە نەتوانێ لە بەرانبەر هێرشی دوژمنانیەوە بەرگری بکات. بەم بۆنەوە سەرکەوتنی ئەم شێوازە لەوەدایە کە هەموو ولاتەکان بە یەکسانی لەم پرۆسەیەدا بەرپرس بن (فیشر و یوری؛ ١٩٨٨).

هەرچەن ولاتانی ئەمریکا و رووسیا توانییان بە وتوویژ بگەن بە یەکدەنگییەک بۆ کەمتر کردنەوەی تەقەمەنییە ناوکییەکان، بەلام هەندێ لە ولاتانی جیهانی سێیەم کە دەیانەوێ بە تەقەمەنی ناوکی خۆیان چەکدار بکەن، بوونەتەمەترسیەکی زۆر گەورە بۆ لەناو بردنی ئاشتی نێونەتەوەیی.

چارەسەر کردنی دژایەتییە بنەڕەتیەکان: بە سەرنج دان بە هەڕەشەی کوشتاری بەکۆمەڵ، چارەسەرکردنی ناکۆکییەبنەڕەتییەکان دەتوانێ مەترسی شەڕی ناوکی زۆر کەمتر بکاتەوە. تەنانەت پاش دوایی هاتنی شەڕی سارد،

جیاوازی و ناکۆکییەکانی نێوان ئەمریکا و رووسیا هەنووکە بەردەوامە. بێجگە لەمەش، بناوانی ئەو سەربازیگەرییەی کە لە ئەمریکای لاتین، ئاسیا، ئەفریقا و رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ نەتەوەخوازی، ناکۆکییە نەتەوەییەکان و نایەکسانییە چینایەتییەکانی نێو ئەم ولاتانە. لێرەدا ئەم پرسە دێتە ئاراوە کە گەر هۆی گەیشتن بە ئاشتی لە چارەسەرکردنی شەڕو ناکۆکییەنێو نەتەوەییەکاندایە ، بۆچی نەتەوەکانی جیهان، سێ‌هەزار بەرانبەری ئەو پارەی کە بۆ دیتنەوەی هۆی ناکۆکییەکان خەرجی دەکەن، بۆ کڕینی چەک و تەقەمەنی خەرجی دەکەن؟ (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## ئاكاری پرۆتستان / protestant ethic

پرۆتستان بەو کلیسایانە دەڵێن کە لە سەدەی شازدەهەمدا بە دابڕان و جیابوونەوە لە دەسەلاتی پاپ، هاتنە دی. پرۆتستانە سەرەتاییەکان، خۆیان بەم ناوە ناونەدەبرد، بەڵکوو بە خۆیان دەگوت «ئینجیلی». ئەم زاراوەیە لە کۆنترین واتایدا ئاماژەیە بە بەرهەڵستی سیاسی لە هەمبەر ئیمپراتۆری پیرۆزی رۆم لەساڵی ۱۵۲۹ دا دەکا کە لە لایەن شازادەئاڵمانیاییەکانەوە دەست پێکرا و گوێیان بە ئامۆژەکانی کلیسای رۆم نەدەدا.

ماکس ڤیبێر(١٨٦٤-١٩٢٠) لە ساڵی ١٩٠٤-٥ وتارێکی تێر و تەسەلی لە ژێر ناوی ئاکاری پرۆتستان و گیانی سەرمایەداری لە گۆڤاری ئەرشیڤی زانستە کۆمەلایەتییەکان و رامیاری کۆمەلایەتی بلاو کردەوە وگرینگییەکی شایانی دایە ئەم زاراوەیە. ڤیبێر سەرنجی دایە ئەو هەلومەرجەی کە لە ئەورووپادا سەرمایەداری لە بیچمی سەرەتایی خۆیدا لە سەر بنەمای «بنکە»یەکی ئابووریدا گەشەی سەندبوو. بەم بۆنەوە دەستی دا بە دیتنەوەی پێوەندی نێوان ئەم گەشە سەندنە (گەشە سەندندنی سەرمایەداری بنکەیی) و تایبەتمەندی دەروونی کەسایەتی پرۆتستان بە سەرنج دان بە گەشەی

کالۆنیستی لۆتەری(واتە شێوازێکی هزری پرۆتستانی کە کـاری دونیـایی بـە پیشەی دینی دەزانێ).

لەم رووەوە بیردۆزی ئاکاری پرۆتستان دەڵێ کە ئاکار و خواناسـی ئـایینی کالۆن، وەکوو سندانێک بوو کە کەسایەتی پڕۆتستان لە سەریدا کوتراوەتەوە.

کالۆنیستی نموونە، زۆر بە پەرۆش بـوو کـە بکـەوێتـە بـەر تـووک و نـزاو لەحنەتی پەروەردگار و ناهومێدانە هەڵوەدای دیتنـەوەی هـەڵـبژێردران لـە لایەن خوداوە بوو.

لە سەدەی حەڤدەهەمدا کالۆنیستەکان سەکەوتن لە دونیایان بە نیشانەی هەڵبژێردران لە لایەن خوداوە دەزانێ: ئەمانـە ئـەوەنـدە تینـوو و تامـازرۆی هەڵبژێردران بوون کە بە سەختی کاریان دەکـرد تـا گـەیشـتن بـەم پلـە و پاگەیە بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. دین لە لایەن ئەم کـەسـانەوە، گوشـارێکی زۆری دەخستە سەر تاک و ئەو ئاسوودەگیەی کە لە لای قەشـەوە لـە کـاتی دان نان بە گوناحەکانیان بۆیان دەهاتە ئاراوە، هیچ چێژێکی پـێ نـەدەدان و خوازیاری گەیشتن بە بەختەوەرییەک بوون کە پێشتر تایبەت بە قەشەکـان بوو.

کالۆنیسم لە سـەر ئـەم چـەمکـە پێـداگری دەکـا کـە مـرۆڤ بـە جێـی بەهرەگرتن لە ماڵ و سامانی، دەبێ تەنیا چاودێریان لێ بکا.

رەهەندی سیاسی ئەم ئایینـە، واتـە بـە دزێـو زانـینی لـەش پـەرسـتی و (زۆرجار) بەرگری لە دەسەلاتی ملهۆڕانەی دەوڵەت بە سەر ویژدانـدا، هـانی دان تا هەل‌ومەرجێک پێک بێـنن کـە ببێتـە هـۆی گـەشـە و بـەرفـراوانی سەرمایەداری.

لەم سۆنگەوە رێکخراوی عەقلانی و نەزمداری کار، گوێڕایەڵی پارێزکارانـە لە هەمبـەر بنکـەی ئـابووری -کـە تایبـەتمـەنـدی گیـانی سـەرمایـەداری سەرەتاییە- هەموویان لە ئاکامەکانی خواناسـی کالۆنیسـتی دێنـە ئـەژمـار.

ڕەخنەگری سەرەکی بیردۆزی ڤیبێر، ر. هـ. تۆنیەیە کە بڕوای وایـە هـۆگر بوونی کالۆنی بە کار و سامان، گۆڕانکاریگـەلی خوداناسـانەی زاتی و ئاکـامی دەروونی ئەو گۆڕانکارییانەنییـە، بـەڵـکوو لـە ڕاسـتیدا گوشـاری ئـابووری و ڕامیاری و پلە و پاگەی کۆمەڵایەتی کالۆنیستەکان بۆتە هۆی هاتنە دی ئـەم هۆگرییە. بە گوێرەی توێژینەوەیەک کە لەم دواییانەدا لە سەر سەرچاوەکانی کالۆنیسم لە بزاڤی چاکسازی دینی زووریخدا ئەنجام دراوە، وا پیشان دەدەن کە گوایە سەرمایەداری پێشتر دەست پێکراوە.

کۆمەڵەیەکی ئایدیۆلۆژیکی و دەروونی تایبەت کـە هـاوڕێ لـە گـەڵ ئاکـاری پرۆتستانین، لە نووسراوە گشتییەکانی کۆمەڵناسیدا کاریگەریان هەبـووە. ڤـیبێر ڕای وابوو کە ئاکاری پرۆتستانی لە ئاخێزگەی مێژوویی خۆی هەڵکەندراوەتـا لـە سەرلەبەری دونیادا بڵاو بێتەوە (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

### ئامێته کردن (تێکەڵ کردن) / conglomerate

لە پێوانە لە گەڵ قۆرخ و قۆرخی چەن لایەنە، ئاوێتە کـردن یـەکێـک لـە داهێنانەکانی شەریکەکانە. بەم چەشنە کە شەریکەیەک داراییەکـانی خـۆی لە نێو هەندێ لە پیشەکانی بەرهەمهێنان یان خزمەتگوزاریدا وەکوو سەرمایە دادەنێ. لەم دۆخەدا، بەڕێوەبەرانی کارگێڕی شەریکەی پـەڕە نرخـدارەکـان، چەندین شەریکەی جۆراوجۆر دەکڕن کە بەرهـەم و خزمـەتگوزاریـەکانیـان هیچ پێوەندییەکیان بـە یـەکتـرەوە نییـە. وەکـوو هۆتێلـەکـانی شـرایتۆن و شەریکەی بیمەی هارتفۆرد کە هی کۆمپانیای تەلەفوونی ATTن.

### ئاوڕوو (کەسایەتی) / prestige

لە کۆمەڵناسیدا ئەم زاراوە باس دەکات لە کاریگەرییەک کە تاک بە سـەر کەسانی‌تردا هەیەتی؛ چ ئەو کاریگەرییە لە ڕێگای شیاو و گونجاوەوە بێ و چ

لە ڕێگای خۆنواندن و درۆ و دەلەسەوە. بە سەرنجدان بە سەرچاوە و ئاخێزگەی ئەم زاراوەیە، زۆربەی لێڵی و پێناسە جۆراوجۆرەکانمان بۆ ئاشکرا دەبن:

تام بۆرنز لە فەرهەنگی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەم چەشنە باس لەم زاراوەیە دەکات: تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم، زاراوەی کەسایەتی لە زمانی ئاڵمانی و ئینگلیزیدا هەروەکوو زمانی فەرانسە بە هەمان واتای لاتینی ئەم زاراوەیە بەکار دەبرا و بریتی بوو لە: کاریگەرییەک کە لە ڕێگای فیلێکەوە تاک بە سەر کەسانیتردا دایدەنا. ئەم زاراوە بە چەشنی مەجازی بریتی بوو لە کاریگەرییە هونەری و ئەدەبییەکان. پەرەسەندنی واتای مەجازی ئەم زاراوەیە کە بریتی بوو لە کاریگەری زۆر و سەرنجڕاکێش، یا ڕاکێشانی تەلیسماوی سەرنجی خەلکی بەرەو لای تاکێک، لە گەڵ کاریگەری ناپلۆئۆن بە سەر دۆست و دوژمنیدا پێوەندی بووە. چونکە هەم پەسنبێژان و هەمیش دوژمنانی ناپلۆئۆن ئەم زاراوەیان سەبارەت بەو بەکار دەبرد. پاش ئەوە ئەم زاراوەیە زۆرتر پەرەی سەند و لە بریتانیادا بەو تایبەتمەندییانە دەبێژرا کە ڕێکخراو و نەتەوەو پیشەکان و هەروەها تاکەکان بوویان.

لە کۆتاییەکانی هەمان سەدەدا ئەم زاراوە لە زانستە ڕامیارییەکاندا باو بوو و باسی لە کاریگەری تاک بە سەر خەلکدا دەکرد؛ هۆی ئەم کاریگەری کەسایەتییە، کردەگرینگەکان و ئاکاری بەرزی تاک بوو (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

ئەم زاراوە لە واتایەکی ئاسانگیرانەدا کە بۆتە باو، ئاماژە دەکات بە پێگەی کۆمەڵایەتی و بە گوێرەی ڕێز و بەهایەک کە خەلکی بۆ تاکێکی دادەنێن، لە پێوانە دەدرێ. بە بڕوای مارکس، ڕێگایەک کە تاک بۆ بەدەست هێنانی داهات هەڵیدەبژێرێ، پیشاندەری پێگە و شوێنگەی کۆمەڵایەتی ئەو تاکەیە. بەلام بە بڕوای ڤیبێر، بێجگە لەو سەرچاوەی کە تاک بۆ بەدەستهێنانی داهات هەڵیدەبژێرێ، چەندوچوونی خەرج کردنی داهاتەکەشی لە پێناسە و

دیاری کردنی پێگەی کۆمەڵایەتی ئەو تاکەدا دەوری سەرەکی هەیە. میتۆد و ڕەوتی خەرج کردنی داهات روون دەکاتەوە کە تاک خاوەنی چ پێگەیەکی کۆمەڵایەتییە. بە بڕوای ماکس ڤیبێر، هەروەها پێگەی تاک پێوەندی بەمەوە هەیە کە تاک چ بەهایەک بە تایبەتمەندیگەلی وەکوو نەتەوە، رابردووی خێزانی، ئایین، کار و ئاستی خوێندنی تاکەکان دەدات و هەروەها ئەندامانی کۆمەڵگا چلۆن جوانی، بوێری، بەزیپک و زاکوونی، یان کارە پیرۆزەکان پێناسە دەکەن (وبر؛ ١٣٨٢). بۆ وێنە لە کۆمەڵگا پێشەسازییەکاندا کار یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ئابڕوو و کەسایەتییە.

بە لەبەرچاو گرتنی ئەمەی کە توێژبەندییە کۆمەڵایەتییەکان چەن ڕەهەندین، پێکهاتنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بەندیواری ئەوەیە کە خەڵکی لە سەر کام یەک لە ویست و پێناسەکان پێداگری زۆرتر دەکەن. بۆ وێنە لە هەندێ لە کۆمەڵگاکاندا پێناسە نەتەوەییەکان گرینگترن تا پێناسە ئابووری و چینایەتییەکان. پێناسەی نەتەوەیی دەورێکی سەرەکی لە شۆڕشەکانی ١٩٩٠-١٩٨٩ی رۆژهەڵاتی ئەروووپادا گێڕاوە. بەشی زۆری ئەم شۆڕشانە دژ بە دەسەڵاتی رووسیا بوون. بە بڕوای ڤیبێر دابەش کردنی کۆمەڵگا بە دوو چینی ئابووری دژ بە یەک (بیردۆزی مارکسی) زۆر ساویلکانەیە و ئاڵۆزی دژایەتییە کۆمەڵایەتییەکانی جڤاکە نوێکان لە بەرچاو ناگرێ (وبر؛ ١٣٨٢).

بەگشتی، هەروەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا، بە گوێرەی روانگەی سادەگیرانەیەک کە ئەمڕۆ باوە، لە زۆربەی وڵاتە پیشەسازی و نیوەپیشەسازییەکاندا، رادەی کەسایەتی و ئابڕووی تاکەکان بە گوێرەی کار و داهاتی خەڵکی دەپێوون. خەڵکی ئەم وڵاتانە بایەخێکی زۆر دەدەنە پیشەگەلی پزیشکی و بریکاری و ئەندازیاری. بەشێک لەم بایەخە کە دەدرێتە ئەم پیشانە، بەبۆنەی داهاتی زۆری ئەم کەسانەیە. بەڵام دەبێ

بزانرێ کە بە تەنیا داهات، ناتوانــێ پێـوەر و پێودانــێ بــێ بـۆ کـەسـایەتی و ئاوڕووی تاکەکان. بە دەست هێنانی ئەم کارانـە پێویسـتی بـە شـارەزایـی و پسپۆڕی و خوێنـدنی بالایـە. لـەنێـو کومـەڵـگاکاندا کـاری زۆر هـەیـە کـە پێویستیان بە خوێندن و شارەزایی و لێزانی زۆر نییـە. بـەم پێیـە دەتـوانین بگەین بەم دەرەنجامە کە بایـەخێـک کـە خـەڵـکی بـەم پیشـانەی دەدەن، بەبۆنەی شارەزایی و لێهاتوویی و پسپۆڕی ئەم کەسانەیە. لە زۆربەی ولاتانی پیشەسازی و مۆدێرندا، زنجیرەی بایەخ و کەسایەتی ئـەم کارانـە یـەکسـانن (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## ئایدیۆلۆژی / ideology

زاراوەی ئایدیۆلۆژی لە تێکەڵاوی دوو وشەی idea و logos پێکهـاتووە. یەکەمینیان بە مانای ئەندێشەیە و دووەمینیان تا رادەیەک بە مانای زانایی و ئاگەدارییە. دەڵێن کە سەرەتا لە کۆتایی سەدەی هـەژدەهـەمـدا لـە لایـەن فیلسووفی فـەرانسـی دیسـتوت دۆترێسـی (Destutt de Tracy) بـە واتـای زانستی بیر و بۆچوونەکان، بە مەبەسـتی شرۆڤـەی سـەرچـاوەو چۆنییـەتی گۆڕانی ئەندێشەکان هاتۆتەدی (گولـد؛ ١٣٨٤). لـە یـەکـەمـین دەیـەکـانی سەدەی نۆزدەهـەمـدا زاراوەی ئایـدیۆلۆژی جۆرێـک سـووکایەتی تێـدابوو و دەبینین کە لە *ئایدیۆلۆژی ئالمانیایی*شدا هەر ئەم سـووکایەتییـەی تێدایـە. هەنووکەش بـۆ هـەنـدێ لـە لیبراڵـەکـان، زاراوەی ئایـدیۆلۆژی واتایـەکـی سـووکایەتی ئـامێزی تێدایـە (ایگلتـون؛ ١٣٨١). سـەرنجێـک کـە زانایـانی کۆمەڵناسی، بە تایبەت لقەکانی کۆمەڵناسی مەعریفـە، زانسـت و دیـن بـەم زاراوەیانە داوە، بۆتە هۆی گرینگی ئەم زاراوەیە، بە چەشنێک بۆ مـاوەیـەکـی دوور و درێژ وەکوو وشەیەکی کلیلی سەیری دەکرا. لەم بـوارەدا کـەسـانێک وەکوو ماکس شیلەر، مانهایم و مارکس زۆرترین کاریگەرییان بـە سـەر ئـەم

زاراوەیەدا بووە.

ئایدیۆلۆژی بریتیە لە ڕێبازێکی سیستماتیک و ڕێکخراو، کە بنەماکانی بە تەواوی دیاریکراون؛ بەها و ئامانجەکان بە مرۆڤ فێر دەکا؛ بەرژەوەندییان لە بەرانبەر پرس و کێشەکان دیاری دەکا و ڕێنومایییان دەکات (سروش؛ ١٣٧٨).

مانهایم ئایدیۆلۆژی لە دوو واتای تایبەت و گشتیدا بەکار دەبا. بەڕای مانهایم، بۆچوونی مارکس و ناپلێئۆن لەمەڕ ئایدیۆلۆژی -کە بۆچوونێکی نێگاتیڤ و ئاڵوگۆڕ کراوە- باس لە واتایەکی تایبەت دەکا کە تەنیا پاژێک لە ئایدیۆلۆژی دەگرێتەوە. بەڵام کاتێک ئایدیۆلۆژی بۆ باس لە کۆمەڵەیەک تایبەتمەندی و هەل و مەرجی پێکهاتەیی خولێک لە مێژوو دێتە ئاراوە، لە گەڵ واتای گشتی ئایدیۆلۆژیدا ڕووبەڕوو دەبێ. لە واتای دووەمدا، ئایدیۆلۆژی لە گەڵ بیردۆزی کۆمەڵناسی مەعریفە نزیک دەبێتەوە. مانهایم دەست دەدا بە جیا کردنەوەی دوو واتای ئایدیۆلۆژی و یۆتۆپیا و لەم ڕوانگەوە ئایدیۆلۆژی بە بەرهەمی هەل و مەرجی کۆمەڵایەتی، ئابووری و مێژوویی کۆمەڵگاکان دەزانێ کە لە بەژنی جیهانبینی خولێکی مێژووییدا خۆی دەنوێنێ. مانهایم، یۆتۆپیا بە کۆمەڵە ئاوات و ئامانجێک کە چینی هەژاری بێدەسەڵات هەیانە، پێناسە دەکات. بەڕای ئەو، بە هەمان ڕادەیەک کە ئایدیۆلۆژی هان دەدا بۆ نەگۆڕان و سەقامگیری بارودۆخێک کە هەیە، یۆتۆپیا لە بیری گۆڕان و شۆڕشی کۆمەڵایەتیدایە. بۆیە یۆتۆپیا، ئایدیۆلۆژیەکی شۆڕشگێڕانەیە کە لە بیری گۆڕاندایە (مانهایم؛ ١٣٨٠).

ئایدیۆلۆژی لە بەرهەمەکانی مارکسدا لە خولە جیاوازەکاندا بە سێ واتای جیاواز بەکار براوە: ١- بە واتای «ئاگەداری درۆینە»، کارێکی درۆینە و بەئاوەژووی واقیع بە جێی ڕاستەقینە پێناسە کردن. ئەم واتا لە *ئایدیۆلۆژی ئاڵمانیدا* هاتووە. چونکە ئەم کتێبەی لە دەیەی ١٩٣٠دا بلاو کرایەوە، بەرەی

یەکەمی چالاکانی نێونەتەوەی دووەم و مارکسیستە رووسیەکان، شارەزاییەکیان لەمەڕ ئەم زاراوەیە نەبوو؛ مەگەر هەندێ لە وشیارترینەکانیان وەکوو لووکاچ و کارڵ کۆرش کە بە وردبوونەوە لە ناوەڕۆکی بەرگی یەکەمی کتێبی سەرمایە، ئەم رەهەندە گرینگەی بیر و بۆچوونی مارکسیان لێ ئاشکرا ببوو. ٢- بە واتای سیستەمی ئەندیشە، باوەڕ و بیرو بۆچوونگەلی تۆکمەکراوی هەر چینێکی کۆمەڵایەتی. چالاکانێ وەکوو ئێدوارد برێنشتاین، کائۆتێسکی، پۆلخانۆف، لنین و لۆگزامبورگ ئەم واتایانە بە تێگەیشتنی مارکس لە ئایدیۆلۆژی دەزانی. ئایدیۆلۆژی لەم واتایەدا (کە لە هەندێ نامیلکەی مارکس و ئەنگلس و ژمارەیەک لە نوسراوەکانیان لە سەر شۆڕشی ١٨٤٨دا هاتووە) بیردۆزێکی چینایەتییە و زۆرتر وەکوو جیهانبینی دەزاندرێ. ٣- بە مانای سیستەمێکی گشتگیر لە بەرهەمهێنانی بڕوا و بیرو بۆچوون و تێگەیشتنەکان لە کۆمەڵگایەکی تایبەتدا. ئەم واتایە چەن جار لە نووسراوەکانی مارکس و ئەنگلسدا هاتووە (زۆرتر لە نامیلکەکانی ئەنگلسی بە سالاچوودا). بە وردبوونەوە لەم تەوەرەدا دەسەڵاتی چینی دەسەڵاتداری تێدا بەدی دەکرێ.

لە یەکەمین لاپەڕەی دەسپێکی مارکس لە سەر *ئایدیۆلۆژی ئالمانیدا*، ئایدیۆلۆژی بە «زانستی بڕواکان» پێناسە دەکات، بەڵام تەنیا بەم مەبەستەوە کە پیشان بدا رەخنەی تێرو تەسەلی لە سەرە. بەم جۆرە باسەکەی دەست پێدەکا: «تا ئێستا، مرۆڤەکان بڕوای هەڵەیان سەبارەت بە خۆیان و ئەمەی کە چین و دەبێ چی بن، داڕشتووە. مرۆڤەکان باوەڕەکانی خۆیان بە گوێرەی بڕوایان بە خودا، مرۆڤی ئاسایی و سروشت، رێکو پێک کردووە. بەرهەمەکانی مێشکیان لە دەرەوەی چاودێری خۆیاندایە. خەڵکی خۆیان ئافرێنەرن، کەچی لە بەرانبەر ئافرێندراوەکانیان چۆک دادەدەن و کڕنۆش دەبەن» (احمدی؛ ١٣٨٥). پاشان گوتوویە با ئێمە مرۆڤەکان لە بەندەگی

بڕواکان و دەمارگرژییەکان و بوونـەوەرانی خـەیاڵـی ڕزگـار کـەیـن و دژ بـە حکوومەتی واتاکان شۆڕش کەین.

بیردۆزی مارکس سـەبـارەت بـە ئایـدیۆلۆژی وەکـوو ئاگـەداری درۆینـە، پیشانی دا کە لە هەر خولێکی مێژووییدا، بـاوەڕە بـاوەکـان، بـاوەڕی چـینی دەسەڵاتدارن کە دەبێ پاکانە بۆ حکوومەت و دەسەڵاتیان بکـات و بـەردەوام رایبگرێ.

بیری دوایی هاتنی سەردەمی ئایدیۆلۆژی لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٥٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ لە کۆمەڵناسی ئەمریکادا هاتە ئاراوە. سەرەتا ئێدوارد شیلز ئەم باسەی کردو پاشان «دانییێل بێل» زۆرتر پەرەی پێ دا. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە رایان وایە کە لە نێو سیستەمی سەرمایـەداریـدا بنـەڕەتیتـرین گۆڕانکارییـەکـان بـە هاوبـەشـی چـینی کرێکـار لـە سیاسـەتـە لیـبراڵ دیمۆکراسیەکاندا هاتۆتە ئـەنجـام، بۆیـە دەبـێ هـان بـدرێ ئـەم بارودۆخـە بپارێزرێ و بە چوونە ناو ئەم قۆناغە مێژوویەنوێیە کە بـە جۆرێـک لـە گـەڵ کۆمەڵگای پاش پیشەسازی پێناسە دەکرێ، سیاسەتە ئەقڵانییەکان بە سـەر ژیـانی کۆمـەڵایـەتی و رامیـاری کۆمـەڵـگاکاندا دادەسـەپـێن. لـە ئـاوەهـا بارودۆخێکدا ئیدی ئایدیۆلۆژییەکی نـوێ نایـەتـە دی و سیاسـەتـە نوێکـان تایبەتمەندی ئایدیۆلۆژیکیان نییە (غفاری؛ ١٣٨٨).

گی رۆشە لە کتێبی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا ئامـاژە بـەوە دەکـا کـە بـۆ پێناسەی ئایدیۆلۆژی دەبێ ئەم تایبەتمەییانەی خوارەوە لەبەر چـاو بگـرین: یەکەم: ئایدیۆلۆژی بریتیـە لـە سیسـتەمێـک لـە بۆچـوون و رای ئاشـکرا و رێکخراو کە شوێنگەی گرووپ یان کۆمەڵگایەک پاکانە، راڤە و شرۆڤە دەکا و دەیچەسپێنێ. ئەم سیستەمە دەکەوێتە ژێر کاریگـەری بـەهاکـان و رەوت و ئامانجێکی روون و ئاشکرا بۆ چۆنییەتی کردەو هەڵسوکەوتی کۆمـەڵایـەتی ئەو گرووپ یان کۆمەڵگایە پێشنیار دەکا. کەواتە، بە گوێرەی ئەم پێناسـەیـە

ئایدیۆلۆژی لە نێو کولتووردا وەکوو کۆمەڵەیەکی پێکبەستراو، هـاودەنـگ و ڕێکخراو لە زانیارییەکان و هەروەها نوێنەر و پیشاندەری بـیرو بۆچوونـەکـان دێتە ژمار.

دووەم: ئەم سیستەمە ئەو هەلە بۆ ئەو کەسانەی کـە لـە هـەل‌ومـەرج و شوێنگەیەکی تایبەتدا دەژین، دەڕەخسـێنێ کـە چـاکتر بتـوانن پێناسـە بـۆ شوێنگەی خۆیان بکەن و باشتر لە واتاکانی بگەن و بیسەلمێنن. ئایدیۆلۆژی پێیان دەڵێ کە چۆن و بۆچی و لە لایـەن چ کـەسـێکەوە چـەوسـاونەتـەوە، بۆچی دواکەوتوون، بۆچی وڵاتێـک تووشـی سـەرنخـوونی و فـەوتـان دێ و بۆچی دەبێ گۆڕانێک لە بـارو دۆخـی ئێسـتادا بێتـە ئـاراوە و لـەم چـەشـنە پرسیارانە.

سێیەم، هەرچەند ئایدیۆلۆژی سیستەمێکە لە ڕاو بۆچوونەکان، بەڵام نابـێ بە دیاردەیەکی ئینتزاعی بزانرێ، چونکـە لـە گـەڵ قازانجـە تاکـەکـەسـی و بەکۆمەڵەکانی تاکەکاندا پێوەندی هەیە. واتە، قازانجی ئـەو کـەسـانەی کـە دەیانەوێ لە پێگەی کۆمەڵایەتییان پارێزگاری بکـەن، یـان کـەسـانێک کـە دەیانەوێ شوێنگەی خۆیان بگۆڕن و بارێکی چـاکتر بـە ژیانیـان بـدەن. بـە واتایەکی‌تر، ئایدیۆلۆژی بە گوێرەی قازانجێک کە بۆ تاکەکـان هـەیـەتی، یـا دان بە شوێنگە هەنووکەییەکاندا دەنێ، یاخۆ دەیانخاتە بـەر ڕەخنـە (ڕوشـە؛ ١٣٨٧).

بەڵام دواتر ئایدیۆلۆژی زۆر خراوەتە بەر ڕەخنە و تەنانەت تاوانبار کراوە بە پارێزگـەری (conservatism). هـەرچـەن ئـەم تاوانبـار کردنـە بـە تـەواوی پووچەڵە و بێل دەڵێ «حاشا لە ئایدیۆلۆژی، بۆ ئەوەی کە واتادار بـێ، دەبـێ نەتەنیا لە سیستەمی یۆتۆپیایی ڕەخنـەبگـرێ، بـەڵـکوو دەبـێ کۆمـەڵـگای واقیعیش بخاتە بەر ڕەخنە» (گولد؛ ١٣٨٤). بەڵام ناتوانین ئـەم بـیردۆزە بـە شێوەی ڕەها بسەلمێنین و دانی پێدا بنین. چونکە ئایدیۆلۆژییەکان لە بەهـا

و نۆرمە کولتوورییەکانی کۆمەڵگا پێک دێن و هیچ کۆمەڵگایەکیش نییە کە کولتووری نەبێ. کەواتە چونکە ناتوانین بیر لە دوایی هاتنی کولتوور و کۆمەڵگای بێکولتوور کەینەوە، ناتوانین بیر لە نەمان و دوایی هاتنی ئایدیۆلۆژیش بکەینەوە. هەروەها ئەمەش کە بیردۆزی دوایی هاتنی ئایدیۆلۆژی لە هەل و مەرجێکی تایبەتی کۆمەلایەتی و رامیاری و مێژوویدا هاتۆتە دی، خۆی دەتوانێ ئایدیۆلۆژییەک بێ. رەنگە باشتر بێ وا بڵێین کە لە کۆمەڵگا کراوەکاندا گۆڕانە کۆمەلایەتییەکان بەرپرسی نوێیان بۆ هاتۆتە دی و ئەم بەرپرسانە دەبنە بەربەست لە بەرانبەر گۆڕانە رادیکاڵەکانەوە کە بە هۆی ئایدیۆلۆژیگەلی رادیکاڵەوە دێنە دی (غفاری؛ ۱۳۸۸).

### ئایین/ cult

به گشتی ئەم واتایە ئەو گرووپە بچووک و کەمتر رێکخراوانەدەگرێتەوە کە لە لایەن کەسایەتییەکی کاریزماتیکەوە بنیات نراون و رێبەری دەکرێن؛ کەسێک کە بە هۆی کەسایەتی و ئاکار و دانستەیەکی تاکەکەسیەوە یارانی لە دەوری خۆی کۆوەدەکا. چونکە کەسایەتی کاریزما دەورێکی بالا لە کۆوەکردنی پێڕەوانیدا دەبینی، زۆرجار پاش مردنی، گرووپەکەی لێک هەڵدەوەشێن. لەم رووەوە کەمتر ئەم ئایینانە ئەوەندە دەژین و گەشە دەستێنن کە ببنە مەزهەب. هەرچەند هەندێکیان توانیویانە گەشە بستێنن و درێژە بە ژیانیان بدەن. مەزهەبە سەرەکییەکانی دونیا سەرەتا وەکوو ئایین بوون؛ وەکوو ئیسلام، مەسیحییەت و یەهوودییەت. هەروەها چونکە ئەو ئایینانە تازە دادێن رێو رەسمی تایبەت بە خۆیان هەیە کە لە گەڵ داب و نەریتی باوی کومەڵگادا ناگونجێن، تووشی ناکۆکی و دژایەتی لە گەڵ ئەوانەی دێن کە لە دەرەوەی ئەم بازنەیەدان.

هۆوارد بێکێر تەکووزترین راپۆرتی لە مەڕ ئایینەوە ئاراستە کردووە. بێکێر

دەڵێ: «حەزێکی دینی کە خاوەنی دانستەیەکی تەواو تایبەت و تاکەکەسی بێ، لە ئایینِدا دەگاتە ئەو دۆزەی بۆی دەگەڕێ. ئامانجی پێڕەو گەیشتن بە ئەزموونێکی تاکەکەسی لەمەڕ رزگاری، هێمنی و دەرمانی گیان و لەشە».

ج. م. یینگێر ئاماژە بەم پێوەرانە دەکا: «زاراوەی ئایین زۆر رەهەندی جیاواز دەگرێتە بەر کە زۆربەیان بریتین لە قەوارەی بچووک، گەڕان بە دووی ئەزموونێکی عیرفانی، نەبوونی پێکهاتەیەکی رێکخراو و بوونی رێبەرێکی کاریزما». واتە: زێدەڕۆیی لە ئەزموونێکی تاکەکەسی مەزهەبی کە لە بیچمێکی وشیار و تەکووزکراودا لە ژێر ناوی کۆمەڵەیەکدا درێژە بە ژیانی دەدات (*William. L. Kolb*).

مارک گالانتێر بە وردی لە مەڕ ئایین لە ئەمریکادا توێژیوەتەوە تا بەڵکوو هۆی کۆما بوونی خەڵک لە دەوری ئەمانەدا لێی روون بێتەوە (*Galanter, M. 1989*). لە گەڵ زۆر کەس لەم ئایینانەدا وتو وێژی کردو تێگەیشت کە ئەمانە گرووپگەلێکی کاریزماتیکن، چونکە رێبەرایەتی ئەم گرووپانە لە ئەستۆی تاکێکدایە کە کەسایەتییەکی کاریزمای هەیە. ژمارەی ئەندامانی ئەم گرووپانە دەتوانن چەن کەس یاخۆ هەزاران کەس بن. هەرچەند ئەم گرووپانە جیاوازی زۆروزەوەندەیان پێکەوە هەیە، بەڵام لەم بابەتانەدا تەبان: ١) لە نێوان هەموویاندا سیستەمێکی بیرو باوەڕی هاوبەش هەیە؛ ٢) هەموویان یەکگرتوویەکی زۆر پتەویان پێکرا هەیە؛ ٣) هەموو ئەم گرووپانە نۆرم و رێسای زۆر بەهێزی ئاکارییان لەناوایە؛ ٤) رێبەرایەتی هەموو ئەم گرووپانە، لە روانگەی پێڕەوانیانەوە، کاریزماتیک و تەنانەت خاوەنی هێزو توانایییگەلی خودایین.

## ئایینی (تیۆلۆجی) رزگاریدەر / liberation theology

یەکێک لەو رەخنانەی کە لە بۆچوونەکانی مارکس و بیردۆزی دژایەتی،

سەبارەت بە مەزهەب دەگیرێ، ئەوەیە کە ئایین هەموو دەم «هەناسەی ساردی چینی چەوساوە» نییە. لە لای رەخنەگرانی ئەم بۆچوونانەدا، ئایین بۆ خەڵکی چەوساوە وەکوو ماتۆرێکە بۆ دەربڕینی دەنگی ناڕەزایەتی و ئامرازێکە کە بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی و نابەرانبەری ئابووری چێژی لێ دەگیرێ. ئایینی رزگاریدەر دەنگدانەوەی یەکێک لەم بۆچوونانەیە. تیۆلۆجیستانی رزگاریدەر بڕوایان وایە کە بەرپرسایەتی دابین کردنی دادی کۆمەڵایەتی (بۆ خەڵکێک کە کەوتوونەتە پەراوێزەوە، بە تایبەت جووتیاران و خەڵکی هەژاری نێو شارەکان) لە ئەستۆی ئەوانە و دەبێ دەورێکی کاریگەر لە رێبەری جەماوەری هەژاردا بگێڕن.

شێوازی زاراوەی ئایینی رزگاریدەر، خۆی بۆتە کۆسپێک لە سەر رێی پێناسە کردنی ئەم زاراوەیە. دەتوانین بڵێین کە بیچمی تاکی ئەم زاراوەیە، بە تەواوی مەبەست و بزاڤگەلی رزگاریخوازی ناگرێتەوە و دەبێ بڵێین کە چەندین ئایینی رزگاریدەرمان هەیە؛ وەکوو: تیۆلۆجی رەش پێستەکان (کانی لە ١٩٦٩)، تیۆلۆجی یەهوودی (ئێلیس لە ١٩٨٧)، تیۆلۆجی ئاسیایی (سۆ کوانگ سوون لە ١٩٨٣)، تیۆلۆجی ئەمریکای لاتین (هایت لە ١٩٨٥)؛ بێجگە ئەمانەش تیۆلۆجییەکی رامیاری هەیە کە لە ژێر کاریگەری رێبازی فرانکفۆرتدایە و رەنگە بتوانین بڵێین کە ئەوە تیۆلۆجییەکی رزگاریدەری کۆمەڵگای رۆژاوایە (متز لە ١٩٦٩). بە واتایەکی تر زۆرتر «ئایینگەلی رزگاریدەر»مان هەیە تاکوو یەک «ئایینی رزگاریدەر» (باتامور، کیرنن، میلی‌بند؛ ١٣٨٨).

ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە ئەم بۆچوونە خۆی لە ژێر کاریگەری بیروڕا مارکسییەکاندایە و پێڕەوانی خوازیاری گەشەی ئاستی رۆشنبیری خەڵکی هەژارن و دەیانەوێ ئەم چینە بە یەکگرتوویی و یەکیەتی خۆیان مافە پێ شێلکراوەکانیان بە دەست بێنن.

ئایینە گەورەکان هەموو کات دڵە خورپەی ڕەنج و ئازاری خەڵکی چەوساوەیان بووە، بەڵام هەریەکە بە جۆرێکی تایبەت پەرسڤی ئەم پرسەیان داوەتەوە. لە ڕوانگەی مێژووییەوە و بۆ بەرهەڵست بوونی ئەم هەژاری و نەداریە، مەسیحییەت دەستی داوە بە بەهێز کردنی بڕوای بڕوادارن بۆ گەیشتن بە جیهانێکیتر کە بێجگە لەم دونیا پڕ لە زوڵم و زۆرەی ئێستایە. بەڵام لەم چەن دەیەی دواییەدا هەندێ لە ڕێبەرانی کلیسا و قەشە مەسیحییەکان ڕوویان لە بیرو بۆچوونێک ناوە کە کۆمەڵناسان تیۆلۆجی رزگاریدەریان ناو ناوە. ئەم واتایە تێکەڵاوێکە لە بنەماکانی مەسیحییەت و پراکتیسی سیاسی (زۆرتر مارکسیسم). لە کۆتایی شەستەکاندا لە کلیسا کاتۆلیکەکانی ئەمریکای لاتینەوە دەستی پێکرا. پراگماتیستە سیاسییەکانی ئەم وڵاتانە هاوکات لە گەڵ ئەوەی کە بۆ رزگاری مرۆڤ لە گوناح و تاوان تێدەکۆشان، هانیان دەدا تا خەڵکی هەژار و بەڵەنگاز بتوانن خۆیان لەو هەژارییەی کە تووشی هاتبوون دەرباز کەن. پەیغامی تیۆلۆجی رزگاریدەر زۆر سانایە: ستەمی کۆمەڵایەتی دژ بە ئاکاری مەسیحییەتە و دەکرێ بەربەست بکرێ. کەواتە مەسیحییەکان دەبێ وەکوو ئەرکێکی ئایینی بۆ دابین کردنی دادوەری کۆمەڵایەتی کۆشەوەیەکی زۆرتر بکەن.

لە سەرەتای حەفتاکانەوە خەڵکێکی زۆر لە کاتۆلیکەکانی وڵاتانی ئەمریکای لاتین هاتنە ریزی ئەم بزاڤە؛ بەڵام ئەم بەربەرەکانێیە زۆر بۆیان بە گران تەواو بوو. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کلیساکان، وەکو Oscar Arnulfo Romero ئۆسقۆفی مەزنی کلیسای سانسالڤادۆر لە نێو ئاژاوەکانی ناوچەکەدا کوژران.

بزاڤی تیۆلۆجی رزگاریدەر بوو بە هۆی دوو جەمسەری لە نێو جڤاکی کاتۆلیکدا. جۆن پۆڵی دووەم، ڕێبەری کاتۆلیکەکانی جیهان، ئەم بزاڤەی بە هۆی ئاوێتە بوون لە گەڵ تێزی سوننەتی مەسیحی لە گەڵ سیاسەتە

مارکسیستیەکان، مەحکووم کرد. بەڵام ئەم مەحکووم کردنەش نەبووە هۆی پاشگەز بوونی خەڵکی لە لایەنگری لەم بزاڤە و رۆژ بە رۆژ ئەم باوەڕە لە دڵی خەڵکدا پتەوتر بوو کە تێکۆشان بۆ باشتر کردنی ژیانی هەژاران، بەشێک لە بیرو باوەڕی ئاییني مەسیحییەتە ( *Boff, L & Clodovis, 1984; Neuhouser, K. 1982:233-44*).

بەڕای یینگێر لانی کەم ئایین لە یەکێک لەم دوو هەل و مەرجەدا دەتوانێ ببێتە ماتۆڕێ بۆ بەرهەڵست بوون و گۆڕانی کۆمەلایەتی: یەکەم حکوومەت یان ڕێکخراوەگەلی‌تری کۆمەلایەتی نەتوانن ئەو بەڵێنانەێ کە داویانە بە ئەنجامی بگەینن (وەکوو: هەلی هاوسان بۆ کار، دادوەری بۆ هەمووان و هتد). لە ئاوەها هەل و مەرجێکدا گرووپە هەژارو زیان پێگەیشتووەکان دەتوانن دەست بدەن بە ڕێکخستنی ئەم بزاڤانە و لەم شێوازە نوێیە ئایینییە بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی خۆیان کەلک وەربگرن و پێڕەوەکانیان دژ بە سیستەمی داسەپاو بخەنە ڕێ ( *Yinger, J. M; 1971: 111*). بۆ وێنە ئەمریکا نەیتوانی بەڵێنەکانی خۆی سەبارەت بە هەلی یەکسان لە باری رەگەزی و ئاییني و نەتەوەیی کەمینەکان بگەینێتە ئەنجام. لە کاردانەوەی ئەم کەمایەسییە و بۆ بەربەرەکانێ لە گەڵ ئەم بارو دۆخە، ئایینێک بە ناوی «ئۆممەتی ئیسلام» یان موسوڵمانانی رەش پێست گەشەی کرد.

لە سییەکاندا ناسیۆنالیستێکی رەش پێست بە ناوی W. D. Fard کە نازناوی‌تری وەکوو فەراد محەممەدی بەکار دەبرد، ڕێکخراوی ئومەتی ئیسلامی بنیات نا و لە یەکێک لە مزگەوتەکانی شاری دیترۆیتدا خەریکی ئامۆژگاری بوو. کاتێ لە سالی ١٩٣٤دا فەراد محەممەد بزر بوو، ئێلیجا محەممەد بوو بە جێگری و درێژەی بە ڕێگای دا. فەراد محەممەد بە شاگردەکانی فێر دەکرد کە پیاوانی سپی‌پێست، رەنگدانەوەی شەیتانن و

دینی ڕەش پێستەکان بەر لە هاتنیان بۆ ئەمریکـا، ئیسـلام بـووە. هـەروەها فێری دەکردن کە ڕێگای رزگاری، گەیشتن بە دیسیپلین و نەزمە نـەک دان پێدانانی سپی پێستان.

گرووپی ئومەتی ئیسلام تەنیا یەکێک لەڕێکخراوە ئایینییەکانی ئەمریکایـە کە دەستیان داوە بە ڕەخنە و نـاڕەزایـەتی دەربـڕین بـۆ چـارەسـەر کـردنی کێشەی کەمینەکان. هەل و مەرجێکی‌تر کـە ئـایین تێیـدا دەتوانـێ ببێتـە ماتۆڕێک بۆ دەربڕینی ناڕەزایـەتی و گۆڕانکـاری، چـەن جـەمسـەری بـوونی کۆمەڵگایە لە باری چینایەتی و ڕەگەز و نەتـەوەوە. لـە سالـی ۱۹۷۵دا واتـە کاتێک شەڕی ناوخۆی لوبنان دەستی پێکرد، مـەودای چـینی دەوڵـەمـەنـد (زۆرتر مەسیحییەکـان) و چـینی هـەژار (زۆرتـر شـیعەکـان) گـەیشـتبووە ڕادەیەکی ئێجگار زۆر. هەرچەن مـەودای چینایـەتی هـەمـوو کـات بـووە و ڕووداوێکی نوێ نییە، بەڵام کاتێک زۆرتر زەق و بەرچاو بوو کە ژمـارەیـەکـی زۆر لە خەڵکی بێ‌پەنا و خانوو، لە لێواری شاری بـەیرووتـدا دەسـتیان دا بـە کردنەوەی کۆڵیت و تێیاندا ژیان.

خەڵکی هەژار بە دوو بۆنـەوە دەهاتنـە بـەیـرووت: یـەکـەم شـیعەکـانی باشووری لوبنـان بـوون کـە بـە هـۆی شـەڕی ئیسـرائیل و فـەلـەسـتینەوە خانووەکانیان کاول ببوون و ڕوویان لە بەیـرووت نـابوو؛ دووەم ئـەو کـەسـانە بوون کە لە ناوچەگوندنشینەکانی عەککار (لە باکووردا) و لە گەلیی بوقاع (لە ڕۆژاوادا) بەرەو بەیرووت کۆچیان کردبوو. حکوومەتی مەسیحی لوبنان هـیچ ئـاوڕێکی لـە بـارو دۆخـی ڕێگـا و بـان و قوتابخانـە و ئاسـانکاری بـۆ ژیـانی هاووڵاتیانی موسوڵمان نەدەدایەوە. ئەم ناوچە تەنیـا چـەن کارخانـەیـەکـی بچووک و چەن کۆمپانیایەکی بازرگانی تێدا بـوو؛ دەوڵـەت پـارەیـەکـی زۆر کەمی بۆ بەشی کشت‌وکاڵ تەرخان کردبوو (عضدانلو، ۱۳۸٤).

ئەم بابەتانە ئەوەمان پێ پیشـان دەدەن کـە بـۆ تێگـەیشـتن لـە پرسـی

کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاری و کولتووری جڤاکەکان، دەبێ دەوری ئایین لە بەرچاو بگرین؛ بە تایبەت ئەم خاڵە زۆر گرینگە کە باوەڕە ئایینیەکان چۆن بە سەر هەڵسوکەوتی مرۆڤەکاندا کاریگەرییان هەیە و چۆن کارەکانیان بە ڕەوا پیشان دەدەن. ماکس ڤیبێر لەو کۆمەڵناسانەیە کە لەم بابەتەدا بە تێرو تەسەلی کۆڵیوەتەوە و پیشانی داوە کە چۆن باوەڕە ئایینیەکان کردە ئابوورییەکان بە ڕەوا دەنوێنن و لەم بوارەدا رێنومایی بڕوادارنیان دەکەن (وبر؛ ١٣٨٧).

## ئەرک/ function

نەزم و رێکوپێکی کۆمەڵگا گرینگترین بابەتێکە کە ئەرکخوازان جەختی لە سەر دەکەن. ئەوان کۆمەڵگا وەکوو سیستەمێک دەزانن کە لە بەش و پاژگەلی جۆراوجۆر پێک هاتووە و ئەو بەشانە لە گەڵ یەکتر پێوەندیان هەیە. بەڕای ئەوان، ئەم بەشە لێکجیاوازانە ئەوەندە لێکتر نزیکن و پێوەندییان پێکەوە هەیە کە نەتەنیا بە سەر یەکدا کاریگەرییان هەیە، بەڵکوو کاریگەریان بە سەر سەرجەمی سیستەمدا بە راشکاوی دیارە. واتای ئەرک بریتیە لەرادەی بەشدارییەک کە هەر بەش بۆ ئاژووتنی سەرجەمی سیستەم هەیەتی و هەروەها کاریگەرییەک کە ئەم بەشە بە سەر پاژەکانیتردا هەیەتی. بە واتایەکیتر، ئەرک بریتیە لە ئاسەوارێک کە هەر بەش بە سەر بەشەکانیتر یاخۆ سەرجەمی سیستەمدا بەجێی دێڵێ. بۆ وێنە، دەکرێ جێژنی نەورۆز لە پێوەندی لە گەڵ بەشە کۆمەڵایەتییەکانیتر –وەکوو کڕینی شتومەکی نەورۆز، خاوێن کردنەوەی خانوو، بزاوتنی ئابووری و...– راڤە بکرێ. هەندێ لە کۆمەڵناسان ئەم واتایە وەکوو واتایەکی گشتی بەکار دەبەن کە بریتیە لە ئەرکی نیگەتیڤ، ئەرکی پازیتیڤ، ئەرکی ئاشکرا و ئەرکی پیوار.

بۆ روون بوونەوەی ئەم واتا ئالۆزە، ئەرکخوازانی سەرەتایی کۆمەڵگایان لە گەڵ بوونەوەرێکی بایۆلۆجیک هەڵدەسەنگاند: لەشی مرۆڤ لە بەشی جۆراوجۆری وەکوو ئێسک و ماسوولکە و دەمار و هۆرمۆن و خوێن و رەگ و دڵ و گورچیلە و سی و ماکی کیمیایی جۆراوجۆر و زۆر شتیتر پێک هاتووە، کە هەموویان بە پێوەندی لە گەڵ یەک و بە کاریگەر بوون بە سەر یەکدا دەبنە هۆی ئەوەی کە سیستەمی لەشی مرۆڤ لە دۆخێکی هاوسەنگدا بمێنێتەوە و لە سەر رەوتی خۆی بەردەوام بێ. هەریەک لەم بەشانە ئەرکێکی تایبەتی بۆ راگرتن و پاراستنی سەرجەمی سیستەمی لەشی مرۆڤ هەیە، بەڵام ناتوانێ لە بەشەکانیتر جیابێتەوە و بە تەنیا و بە سەربەخۆیی کاربکات. بەواتایەکیتر، پێوەندی و کارلێکی ئەم بەشانە بە سەر یەکدا، ئەرکەکانیان دیاری و کاریگەریان دەکات.

ئەرکخوازان، کۆمەڵگا بە لەشی مرۆڤەوە دەچوێنن کە لە بەشی جۆراوجۆر و لێکجیاواز پێک هاتووە کە لە گەڵ یەکدا پێوەندی و بەسەر یەکدا کاریگەریان هەیە. بەبڕوای ئەوان، ئەو پاژانەی کە پێکهێنەری کۆمەڵگان بریتین لە تەکنیکەکانی بەرهەمهێنانی خۆراک، وەرزش، دەرمان، خشڵ و زیو، رێورەسمی تازیە، رێزگرتن لە یەکتر، رێو رەسمە ئاینییەکان، یاسا، زمان، شێوازەکانی گواستنەوە، ئامراز و کەرەسەکان، باوەڕەکان و هتد. هەر یەک لەم بەشانە، وەکوو بەشە جۆراوجۆرەکانی لەشی مرۆڤ، بۆ بەرەنگاری و راگرتنی سیستەمی کۆمەڵگا خاوەنی ئەرکی تایبەت بە خۆیە. بۆ وێنە، یەکێک لە ئەرکەکانی دامەزراوەی پەروەردەی رەسمی بریتییە لە گواستنەوەی زانست و شارەزایی لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکیتر. بەشەکانیتری سیستەمی کۆمەڵایەتی، وەکوو رەسم و یاسا نەنووسراوەکان (نۆرم و باوەڕەکان) سەبارەت بە کات و شوێنی پێویست بۆ پێوەندی کردن لە گەڵ کەسانیتر، خەڵکی بە چەشنێکی رێکوپێک کە دەکرێ پێشبینی

بكرێن، بە یەكتر دەبەستنەوە. بەواتایەكی‌تر، نەبوونی ئەم رەسم و یاسا نەنووسراوانە دەتوانێ ببێتە هۆی بشێوە و ئاژاوە و نارێكی كۆمەڵایەتی.

## ئەركی ئاشكرا/ manifest function

ئەركی ئاشكرا بریتیە لە ئەنجامە زەق و دیار و پێش‌بینی كراوەكانی میتۆدە كۆمەڵایەتییەكان. رابێرت مێرتۆن، كۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەمریكی، داهێنەری ئەم زاراوە و زاراوەی ئەركی پیوارە. ئەو لە كتێبی بیردۆز و پێكهاتەی كۆمەڵایەتیدا ئەم باسە راڤە دەكات كە دەرەنجامی میتۆدە كۆمەڵایەتییەكان، بۆ ئەندامانی جۆراوجۆری كۆمەڵگا بە چەشنێكی لێک‌جیاواز شرۆڤە دەكرێ (مرتون؛ ١٩٦٨). بۆ وێنە خێزانە سوننەتی و ئاساییەكان، رەنگە هاوكات لە گەڵ ئەوەی كە نیاز و پێداویستی و ئاسانكاری بۆ گەشە و پێگەیشتنی كوڕەكانیان دابین دەكەن، بۆ كچان و ژنانی بنەماڵە سنوور و كۆسپ و تەگەرەی زۆر دابنێن. بەبڕوای مێرتۆن، خەڵكی بە دەگمەن سەرجەمی ئەركەكانی پێكهاتەیەكی كۆمەڵایەتی دەناسن و هەستی پێدەكەن.

## ئەركی پیوار/ latent function

ئەركی پیوار بریتیە لەو دەرەنجامە كردەییانە كە پێش‌بینی ناكرێن. بۆ وێنە، دەكرێ بە شێوازی كار و چالاكی دامەزراوەكانی خوێندنی باڵا ئاماژە بكرێ. ئەركی ئاشكرای ئەم دامەزراوانە، دابین كردنی زانست و زانیارییە بۆ خوێندكاران تا بتوانن بۆ جێ‌بەجێ كردنی ئەو ئەركەی كە دواتر دەخرێتە ئەستۆیان كەڵكی لێ‌وەربگرن و بە جوانی بەڕێوەی ببەن. بەڵام یەكێک لە ئەركە پیوارەكانی ئەم دامەزراوانە ئەوەیە كە رەنگە تاک لە گەڵ كەسانێک ئاشنا بێ كە دواتر بە سەر رەوتی ژیانیدا كاریگەری زۆریان هەبێ. یەكێک‌تر

لە ئەرکەپیوارەکانی ئەوەیە کە ئـەم دامـەزراوانـە میلیۆنهـا گـەنـج و لاو کـە ناتوانن لە بازاڕی کاردا جێگایەک بۆ خۆیان ببیننـەوە، لـە بـازاڕی کـار دوور دەخەنەوە. یەکێک‌تر لە ئەرکەپیوارەکانی ئەوەیە کە سیستەمی نابەرانبـەری کۆمەڵایەتی بە ڕەوا پیشان دەدات و کەسانێک کـە نـەیـانتوانیوە بڕۆنـە نێـو زانکۆوە، لە کارو باری پڕبایەخ و خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی دوور دەکاتەوە.

## ئەرکخوازی/ functionalism

ڕەنگە تا ئێستا سەبارەت بە هیچ بیردۆزێک وەکوو ئەرکخوازی جیاوازی لە بیرو بۆچوون و مشتومڕ لە سەر واتای ئەم زاراوەیـە نـەهاتبێتـە ئـاراوە؛ بـە چەشنێک کە هەندێ کەس بە تەواوی ئەم بیردۆزە ڕەت دەکەنەوە و بڕێ لە خاوەن ڕاکان بە بیردۆزێکی گشتگیری دەزانن. لە سەر ئەم هەموو کێشـەوە، دەبێ ئاماژە بکەین کە ئەرکخوازی وەکوو بیردۆزێک لە کۆمەڵناسی سـەدەی بیستەمدا سەقامگیر بووە و درێژەی بە ژیانی خۆی داوە.

ڕابردوو و مێژووی ئەم بیردۆزە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمـی فیلسـووف و هۆزانانی ڕۆژگاری کەونارا؛ واتە هەر لە سەردەمی ئەفلاتـوون و ئـەرەسـتۆوە. بنەمای ئەم بیردۆزە زۆر ساکارە و ئەوەش بریتیە لەوەی کـە: هـەر گشـتێک (کل) پێکهاتووە لـە هـەنـدێ پـاژ کـە بـە چـەشـنێکی تایبـەت ئاوێتـەن و پێوەندییان پێکڕا هەیە و تەنانـەت ئـەگـەر هـەردوو بـەش (واتـە: گشـت و پاژەکان) تووشی ئاڵوگۆڕ بن، دیسان یـەکیـەتی و سـەقـامی گشـت (کـل) دەپارێزن.

زۆربەی بیرمەندانی کۆمەڵایەتی، کاری ئۆرگانیزم بە بناغەی ئەرکخـوازی دەزانن و بۆ کۆڵینەوە لـە سـەر ئـەم بابـەتـە دەبـێ لـە کـتـێبی پێشـووناندا وردبینەوە. ئەفلاتوون و ئەرەستوو بۆ ڕاڤەی پێوەندی نێوان حکوومەت و هێز و دەسەڵات، لە سەر پێوەندییەکی ڕێک‌وپێک و خاوەن نـەزم کـە لـە نێـوان

پاژە جۆراوجۆرەکانی حکوومەتدا هەیە، جەختیان کـردووە (ارسـطو؛ ١٣٨٦).
لە نێوان هۆزان و بلیمەتانی ئیسلامیشدا هـەر ئـەم بۆچوونـە هـەیـە. ئیمـام ئەبووحامیدی غەزالی لە کتێبی کیمیای بەختەوەریدا بـۆ راڤـەی پێـوەنـدی نێوان کارو ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان، لە بیردۆزی ئەرکخوازی بەهرە دەگـرێ. بۆ ئەم مەبەستە، وێنـەی ئۆرگـانیکی دێنێتـەوە و هـەر کـار و پیشـەیـەکـی کۆمەڵایەتی بە یەکێک لـە ئـەنـدامان دەچوێنـێ و رێـکوپێکـی و نـەزمـی کۆمەڵگا لە گرۆی رێکوپێکی لە ئەنجامدانی ئەرکی هەر یەک لە بەشەکانی ئەندامی کۆمەڵگادا دەزانێ. هەروەهـا ئامـاژە دەکـات کـە نیـاز بـە ئـەرک و وەزیفەی نوێ دەبێتە هۆی بەدیهاتنی رێکخرا و ئەرک و وەزیفـەی نـوێ لـە کۆمەڵگادا و بە هەمان رادە کە کۆمەڵگا گەورەتر دەبێ، ئەرکەکانیش ئاڵـۆزتر دەبن (غەزالی؛ ١٣٨٩). لە کۆمەڵناسیدا ئەم بۆچوونە تایبـەت بـە سپێنسـێر دەزانن (دیلینی؛ ١٣٨٨)؛ بەڵام بێگومان هەم غەزالی و هەم ئیبنی خەلـدوون و زۆربەی هۆزانە ئیسلامییەکان بە راشکاوی ئاماژەیان پێ‌کردووە.

بنەڕەتی ئەرکخوازی لە سەر ئەم راستییە بنیات نـراوە کـە سـەرجـەمـی داب‌و نـەریـت و رەسـم و یاسـا و رێکخـراوە کۆمـەڵایـەتییـەکـان، دەوام و مانەوەیان بەستراوە بەو کارو ئەرکەی کە لە سیستەمی کۆمەڵایەتیـدا (واتـە: گشت) لە ئەستۆیاندایە. ئەوەی گرینگە، کەڵک و قازانجی ئەو ئەرکانەیـە لـە سەرجەمی سیستەمدا، چونکە دەبێتە هۆی ئاسانکاری لە پێوەندییەکانـدا تـا هەموو ئەو گرووپانەی کە لەو بازنەیەدان، کەڵکی لێ وەربگرن؛ تەنانەت گـەر ئەو دامەزراوانە لە رەهەندی ئابووریوە بەکەڵک نەبن، لە باری نائابوورییەوە بە قازانجن، واتە لە سەرجەمی سیستەمدا ئـەرک و وەزیفـەیـان لـە ئـەسـتۆیە (توسلی؛ ١٣٨٧).

بە گشتی باس و تەوەری ئەرکخوازی، بریتیە لە روون کردنـەوەی دەور و ئەرکی هەریەک لە بەشەکانی گشت، کە دەبێتە هۆی رێکوپێکی و نـەزمـی

ئەو گشتە (کل). لەم بیردۆزەدا لێهاتوویی و قازانجی هەر بەشێک بە گوێرەی ئەو ئەرکەی کە خراوەتە ئەستۆی لە پێوانە دەدرێ؛ واتە ئەگەر پاژێک بتوانێ بە باشی ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، بۆتە هۆی یەکگرتوویی ئەو گشتە. هەرچەند هابز و سپێنسێر و مالتووس و مارکس لە بەدیهاتنی ئەم بیردۆزەدا دەوری سەرەکییان بووە، بەلام دوورکایم بە بنیانتەری فەرمی ئەم بیردۆزە لە کۆمەلناسیدا دەزانرێ. دوورکایم لە کتێبی *دابەش‌کردنی کاری کۆمەلایەتی*دا بەردی بناغەی ئەم تیۆرییەی لە کۆمەلناسیدا داناوە. هەرچەند دوورکایم لەم کتێبەیدا بە توندی رەخنەی لە سپێنسێر گرتووە، بەلام بۆ خۆی لە ژێر کاریگەری دلەڕاوکێیەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە گەل ژینەوەرناسیدایە. ئەگەر ئەو وشانەی کە لەژێر کاریگەری ژینەوەرناسیدان بنینە لاوە، واتا سەرەکییەکانی وێکچوونێکی زۆریان لە گەل بیردۆزی ئۆرگانیزمدا هەیە. ١- کۆمەلگا لە خۆیدا دیاردەیەکی سەربەخۆیە و ناکرێ بە بەشی جۆراوجۆر دابەش بکرێ. ٢- هەرچەند پێداگری لە سەر ئەم خالە پیشاندەری پالدانەوە بە لای بیردۆزی ئۆرگانیکی نییە، بەلام دوورکایم «گشت» لە رەهەندی عیللیەوە بە سەرتر و پێشتر دەزانێ و بەشەکان بە پێکهێنەری کردەکان، نیازەکان و ویستەکانی گشت (کل) دەزانێ و بەم چەشنە پال دەداتە لای بیردۆزی ئۆرگانیکییەوە (دورکیم؛ ١٣٨٤).

بەگشتی لە بیردۆزی ئەرکخوازیدا گشت (کل) سەرتر لە پاژە (جزء) و ئەمە نیازەکانی گشتە کە دەبێتە هۆی زۆرتر بوونەوەی پاژەکان.

## ئەزموون/ experiment

ئەزموون بریتیە لە تاقی‌کردنەوەی تێزێک لە لایەن تۆژەرێکەوە و لە هەلو مەرجێکی تەواو کۆنترۆل‌کراودا (*A. Giddens, 2003*). لە کۆمەلناسیدا مەودای شێوازی ئەزموون بەرتەسکتر و سنووردارتر لە زانستە

سروشتییەکانە. لە ئەزمووونی کۆمەڵناسیدا تەنیا دەتوانین ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی بخەینە نێو بازنەی تۆژینەوە. هەروەها چونکە ئەو ژمارەیەش دەزانن چاودێری بە سەر کاریاندا دەکرێ و لە سەریان دەکۆڵنەوە، رەنگە بە ئاوەژووی رەوتی ئاسایی کارەکەیان ببزوونەوە. لە دەهەی ۱۹۳۰دا ئەو تۆژەرانەی کە لە کارخانەی هاوسۆرنی کۆمپانیای ڤێستێرنئەلکتریک خەریکی تۆژینەوە لە سەر رادەی لێهاتوویی کرێکاران بوون، بە سەرسوورمانەوە بینییان کە لێهاتوویی کرێکاران بەهەر گۆڕانێک لە بارودۆخدا (وەکوو کەمو زۆرکردنی رادەی رووناکی، پشوودان، کەمو زۆر کردنی ژمارەی گرووپی کرێکاران و ...) بەردەوام لە زۆربووندایە؛ ئەمەیان ناو نا **ئاسەواری هاوسۆرن** (hawthorne effect).

ئەزموون بە دوو جۆری ئەزموونی تاقیگەیی و ئەزموونی ئاسایی یان سروشتی جێبەجێ دەکرێ. لە تاقیگەدا تۆژەر بۆی هەیە بە وردبوونەوەیەکی زۆرتر هەلو مەرجی تاقیکردنەوە دابین کا، بەلام کەمایەسی ئەم شێوازە ئەوەیە کە ناتوانین ئەنجامی ئەزموونی تاقیگەیی بە ئاوێنەی بالانوێنی رووداوەکانی کۆمەڵگا بزانین. هەروەها لە ئەزموونی ئاسایی یا سروشتیدا ناکرێ هەموو ئەو رووداوە لاوەکییانەی کە رەچاو نەکراون، کۆنترۆڵ بکرێن.

بۆ ئەزموونی تاقیگەیی دەتوانین بە ئەزموونی «ئەنگێزەی پێشکەوتن لە ئافرەتان»ی ماتینا هۆڕنێر ئاماژە کەین کە دەستی دا بە تۆژینەوەیەکی بەرفراوان لە سەر ئەم چەمکەی کە بۆچی ژنان لە چاو پیاوان پێشکەوتنێکی کەمتریان هەیە. ئەم بیردۆزە بە بیردۆزی ترس لە سەرکەوتن بەناوبانگ بوو. ئەم ئەزموونە بریتی بوو لە ژن و پیاوانێ کە لە دوو دانیشتنی جیاوازدا کۆوە دەبوونو دوو چیرۆکی ناتەواویان پێ دەدراو پاش خوێندنەوە هەریەکەیان بە بۆچوونی خۆی دەبوا بە ئەنجامی بگەینێ. ئەم ئەزموونە دانی بە سەر ئەم بیردۆزەدا نا کە نیازی

ژنان بە ئەوین و خۆشەویستی پیاوان هۆی ترسانیانە لە سەرکەوتن لەو رکەبەرێیانەدا کە دەگەڵ پیاوان رووبەڕوو دەبن( *Horner, Matina; Femininity and Successful Achievement: A basic Inconsistency; 1970*).

ئەزموون لە شوێنی ئاسایىدا وەکوو ئەزمووونی تاقیگەیی پێویستی بە هەلومەرجی کۆنترۆڵ هەیە؛ واتە رەچاو کردنی گرووپی ئەزمووون، گرووپی کۆنترۆڵ، بزوێنەر، وەلام و تاقیکردنەوەی ئەوەی کە بزوێنەر دەبێتە هۆی وەلام دانەوە، یان نە. یەکێک لە گرینگترین گەلاڵەکانی ئاسوودەیی کۆمەلایەتی لە ئەمریکا، یارمەتیدانی توێژە دەسکورتەکانی کۆمەڵگایە. بۆ ئەم مەبەستە بە پارەدان و وەرنەگرتنی پیتاک لەو کەسانەی کە بێکارن یاخۆ داهاتیان ئەوەندە نییە کە پێداویستی ژیانیان پێی دابین کەن، یارمەتییان دەدەن. سالی ١٩٦٠ ئەم بیرە هاتە کایەوە کە رەنگە ئەم یارمەتیدانە مەیلی کارکردن و تێکۆشان بۆ گەیشتن بە ژیانێکی باشتر لە خەلکەکەدا کەم کاتەوە. سالی ١٩٧٠ لە پنسیلڤانیا و نیووجرسی تۆژینەوەیەکی بەربلاو بۆ روون‌کردنەوەی ئەم خالە دەستیپێکرا و پاش سێ سال توێژینەوە و وتووێژ ئەم بیرە کە یارمەتی دان دەبێتە هۆی کار نەکردن پووچەڵ کرایەوە و ئەم راستییە کە ئەم جۆرە یارمەتیدانە چاکترین رێگای بەرزکردنی ئاستی ژیانی خەلکە سەلمێندرا.

## ئەقلانییەت (ئاوەزگەری)/ rationality

ئەقلانییەت لە زانستە کۆمەلایەتییەکاندا بە چەن واتای جۆراوجۆر لێک دراوەتەوە و لە زانستی ئابووریدا، بە تایبەت لە بۆچوونی پارێتۆدا، بریتییە لە کردەیەکی ئەقلانی کە لە گەڵ مەبەستێک کە بکەر یان ئەکتەر دەیەوێ، سازگار بێ. بەم چەشنە ئەقلانییەت بریتیە لە سازگار بوونی ئامراز و ئارمانج پێکەوە. لە کۆمەڵناسیدا واتاگەلی «کردەی ئەقلانی بە گوێرەی ئامانج»

(ڤیبێر)، «کردەی لۆجیکی» (پارێتۆ)، «کردەی ئامرازی» (پارسۆنز) لە راستیدا یەک واتایان هەیە و بریتین لە کردەیەک کە کەرەستە و ئامرازی پێویست بۆ گەیشتن بە ئارمانج و دۆزەکانی هەڵدەبژێرێ. بەڵام ڤیبێر واتای «کردەی ئەقلانی بە گوێرەی بەهاکان»یش هەڵدەبژێرێ و مەبەستی ئەو کردانەیە کە نە لە گەڵ ئارمانجەکان، بەڵکوو لە گەڵ بەهاکان سازگارن (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

ماکس ڤیبێر لە کتێبی *ئاکاری پرۆتستان و گیانی سەرمایەداری*دا، دەستی داوە بە کۆڵینەوە لە سەر چۆنییەتی بەدیهاتنی سیستەمی سەرمایەداری و هۆکارەکانی ئەم بەدیهاتنە و هەروەها لێکدانەوەی ئەم پرسیارە کە بۆچی ئەم سیستەمە لە رۆژاوادا سەری هەڵدا نەک لە رۆژهەڵاتدا. لێرەدا ڤیبێر باسی ئەقلانییەت دێنێتە ئاراوە. واتە لە رۆژاوادا ئەقلانییەت کە هەمان سازگاری ئامراز و ئامانجە بە هۆی ئایینی پرۆتستانەوە دێتە کایەوە. هەرچەند ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لە ولاتانی رۆژهەڵاتدا ئەقلانییەت نەبووە، بەپێچەوانە ڤیبێر سەرنج دەداتە ئەو تەوەرەش و ئاماژە دەکات کە ئەقلانییەتی رۆژهەڵات لە سەر بەهاکان و واتا ئینتزاعی و سونەتییەکان جەخت دەکات، کەچی لە رۆژاوادا ئەقلانییەتی کردەیی (پراکتیکی) کە لە سەر ئەزموون بنیات نراوە، دێتە دی. هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە رۆژاواییەکان بتوانن بگەن بە پێشکەوت و دۆزە کردەییەکانیان (وبر؛ ١٣٨٧).

مێژوونووسی ئالمانی، ڤۆلفگانگ مۆمسێن، ئاماژە دەکات کە ڤیبێر بەم دەرەنجامە گەیشت کە ئەقلانییەتی ولاتە ئاسیاییەکان بە هیچ جۆر سووک و کەم نرخ نییە، بەڵکوو ئەم ئەقلانییەتە بە گریمانە و دەسپێکی زۆر جیاواز لە ئەقلانییەتی رۆژاوای مۆدێرنەوە دەس بەکار دەبێ و بەم پێیەش، کاریگەرییەکی زۆر جیاوازی بە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا هەیە

.(*Mommsen, W; 1989*)

لە لای ڤیبێر، ئەوەی کە هاندەری شارستانییەتی رۆژاوا بەرەو مۆدێرنیتە بوو، نە ئەقلانییەتی رەها و پەتی، بەڵکوو شێوازێکی تایبەت لە ئەقلانییەت بوو کە ڤیبێر پێی دەڵێ «ئەقلانییەتی فەرمی». ئەقلانییەتی فەرمی بریتییە لە ئەقلانییەتێک کە ساکارترین و هەرزانترین رێگا بۆ گەیشتن بە ئامانج هەڵدەبژێرێ. بەڵام ئەو ئەقلانییەتەی کە ولاتانی ئاسیایی لایەنگرییان لێ دەکرد، ئەقلانییەتی حەقیقی و گەوهەری (جوهری) بوو. ئامانجی ئەم ئەقلانییەتە فام کردنی ئەو بەها و دۆزانە بوو کە لە سەر سونەت، داب و نەریت، پارێزکاری و لەخۆبوردن بنیات نرابوون. هەروەها ڤیبێر ئاماژە دەکات کە ئەقلانییەتی فەرمی بە تەنیا تایبەت بە ولاتانی رۆژاوا نەبووە، بەڵکوو ئەم ئەقلانییەتە بە سەر ئەقلانییەتی حەقیقی و گەوهەریدا زاڵ ببوو. لە راستیدا، پووچەڵ کردنەوەی دۆز و بەها حەقیقی و گەورهەرییەکان و دانانی ئامانجی حسێبگەرانە لەجێی ئەوان، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەقلانییەتی رۆژاوا لە چاو شوێنەکانی تری دونیادا، شتێکی تایبەت بێ. ئەم جۆرە ئەقلانییەتە ئازادییەکی رووناکبیرانەی داهێنا کە شوێنەکانی تری دونیا لێی بێبەش بوون.

ڤیبێر لە درێژەی لێکدانەوەو توێژینەوەکانیدا پیشان دەدات کە چلۆن ئەقلانییەتی رۆژاوایی، لە رێی پەرەدان بە ئاکاری پرۆتستان و سەرهەڵدانی سەرمایەدارییەوە، دەبێتە تەوەرێکی پراکتیسی. سەرمایەداری وەکوو ئەقلانییەتی فەرمی، تەنیا تایبەت بە ولاتانی رۆژاوا نەبوو، بەڵکوو لە جیهانی کەونارا و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ولاتانێک وەکوو چین و هیندیش، هەبووە (بروباکر؛ ١٩٨٤). بەلام سەرمایەداری کاتێ لە ولاتانی رۆژاوای ئەورووپا و ئەمریکای باکوور بە بەرزترین ئاستی خۆی گەیشت، بوو بە بابەتێکی تایبەت بە رۆژاوا. بەڕای ڤیبێر، هۆی سەرەکی ئەم گەشە ساندنە،

ئاکاری پرۆتستان بوو کە لە ئەندێشەکانی جۆ کالڤینەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەم بیرانە، خەڵکی ئەورووپای رۆژاوای مۆدێرنیان بۆ کاری زۆر، خەرجی کەم، دیسیپلینی تاکەکەسی و خۆڕاگری لە کاردا هان دەدا. کالڤینیستەکان لە سەر ئەم سێ خاڵە جەختیان دەکرد: ۱) سپاس و شوکرانەبژێری و بەندەگی پەروەردگار، ۲) چارەنووس، واتە باوەڕ بەمەی کە چارەنووسی تاک لە هەمان کاتی لە دایکبوونییەوە دیاری کراوە و ۳) بیری کار کردنی زۆر و دژوار کە وەکوو ئەرکێکیان دەزانی کە پەروەردگار خستۆیە ئەستۆیان. ڤیبێر نەیدەگوت کە ئەم تیۆرییە بە تەنیا خۆی بۆتە هۆی سەرهەڵدان و هاتنەدی سەرمایەداری، بەڵکوو رای ئەوە بوو کە لە نێوان پرۆتستانیزم و واتای رزگاری و شێوازی پێویستی ژیان بۆ گەشەو پەرەسەندنی سەرمایەداری، پێوەندییەکی زۆر نزیک هەیە.

کەواتە، بەبڕوای ڤیبێر، ئەم بیرەی کە کاری یەکدەست و ئەقڵانی کارێکی ئاکاری پەسندکراوە و بێکاری و تەوەزەلی گوناح و تاوانە، بۆتە هۆی گەشە و پەرەسەندنی شێوازێک لە ژیان کە تێیدا خەڵکی خۆیان بەرپرسی چاک یان خراپ بوونی باری ژیانیانن. کۆوە کردنی سامان کاتێک گوناح و هەڵە و لادان بوو کە بۆ رابواردن و هێنانەدی ئارەزووەکانی نەفس کەڵکی لێ بگیرێ. بەڵام سامانێک کە لە رێی رەزامەندی پەروەردگاردا خەرج بکرێ، نەتەنیا گوناح و لە راستەڕێ کلابوون نییە، بەڵکوو پاداشیشی هەیە. کۆوەکردنی سامان بۆ رابورادن و ئاسوودەژیان کارێکی نائاکاری و هەڵە و گوناح بوو (وبر؛ ۱۳۸۷).

## ئەنگێزەی پیوار / hidden motive

ئەنگێزەی بەرپیوار، بە ئەنگێزەیەک دەبێژرێ، کە تاک هەیەتی بەڵام هیچ ئاگەدارییەکی لە کار و کاریگەرییەکانی نییە. بە سەرنجدان بەوەی کە تاک

پێی خۆشە بەها و نۆرمەتاکەکەسییەکانی لە زۆربەی هەل و مەرجەکاندا بەشداری بدا، بۆی هەیە لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەیدا ئەو بەشە لە نۆرم و ڕێساکانی کە ئەو هەڵس و کەوتەی پاکانە دەکەن، بێنێتە ناوەوە و ئەوانەی بەربەستی ئەو کردەوەن، لە بەرچاو نەگرێ. بەم بۆنەوەکاتێ ئەنگیزەکانی تاک لە تاقمێ لە بەهاکانی هاتبێتنە دی کە بەهاکانی‌تر دانی پێدانەنێن، دەتوانین بڵێین کە ئەو تاکە خاوەنی ئەنگیزەی بەرپیوارە.

## ئەورووپاناوەندی / euro centrism

ئەم زاراوە باس لە سەرتری میتۆدە کولتوورییەئەورووپییەکان (بە تایبەت بریتانیا) دەکات. یەک لەو چەمکە گرینگانەی کە کۆمەڵناسان باسی لە سەر دەکەن، پێناسەی واتای کولتوورە. زۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکان ڕۆژاوا کولتووری ئەورووپی بە کولتووری سەرتر و پێشڕەو دەزانن و هان دەدەن کولتووری خۆیان بە چوار تەنشتی جیهاندا بڵاو کەنەوە و تەنانەت بە سەر وڵاتانی‌تردا دایسەپێنن. بە واتایەکی‌تر، بڕوایان وایە کە سەرمەشقە کولتورییە (*cultural pattern*)ئەورووپیەکان لە هی بەشەکانی‌تری دونیا سەرتر و هێژاترن. بە ڕای بیرمەندانی ئەرووپی چوار هۆکار بوونەتە هۆی جیاوازی کولتووری ئەورووپی لە کولتووری شوێنەکانی‌تری دونیا:

١- **جیهان‌بینی**: بنەمای هزری ئەورووپی لە سەر بیر و هزری یوونان و ئیمپراتۆری ڕۆمەوە دانراوە و ڕۆنێسانس گەڕانەوەیەک بوو بۆ هزری یوونانی و شێوازی حکوومەتداری ئیمپراتۆری ڕۆم و هەروەها تایبەتمەندیگەلێکی «مرۆڤخوازانەی» نوێی بۆ هونەر، ڕامیاری و فەلسەفەی ڕۆژاوا هێنایە دی.

٢- **دین**: مەسیحیەت کە بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ، لە بیر و مێشکی خەڵکی ئەورووپادا ڕۆچوو. ئەو ڕۆچوونە بە چەشنێ بوو کە لە زۆربەی نووسراوەکانی بیرمەندانی ڕۆژاوادا واتای «ئەرووپا» و «جیهانی

مەسیحییەت» وەکوو یەک دێن.

٣- **رووناکگەری**: شۆڕشی پیشەسازی، دڕدۆنگی دیکارتی، هاتنە دی بۆچوونگەلی رووناکبیرانە کە راڤە و پێناسەی رووناکگەرییان دەکرد و بوو بە هۆی هاتنە دی بیرێکی نوێ لە هەموو بوار و رەهەندێکدا.

٤- **بەپیشەسازی بوون**: هەرچەن ئەورووپا تەنیا شوێنێک نییە لە جیهاندا کە پیشە سازی تێدا گەشەی سەندبێ، بەڵام یەکەم شوێنی دونیایە کە لە پیشەسازیدا پێشڕەو بووە (*Hay, D; 1969*).

## ئۆپۆزیسیۆن / opposition

ئۆپۆزیسیۆن بریتیە لە تاقم یاخۆ پارتێک کە بە یەکیەتی و یەکگرتوویەوە دەست دەدەن بە دژایەتی لە گەڵ سیاسەتی دەوڵەت بۆ گەیشتن بە دۆز و ئامانجی دیاریکراویان، بە تایبەت گەیشتن بە حکوومەت. لە راستیدا دەکرێ پارتی ئۆپۆزیسیۆن وەکوو حکوومەت، یاخۆ دەوڵەتی جێگر بە دەنگدەران بناسێنرێ.

یەکێک لە رەهەندەکانی حکوومەتە دیموکراتەکان، رەخساندنی هەل و دەرفەتە بۆ دژایەتی لە گەڵ کەسانێک کە دەسەلاتیان لە دەستایە. حکوومەتە دیموکراتەکان نە تەنیا ئیزن دەدەن کە خەڵکی لە گەڵ ئەو کەسانەی دەسەلاتیان لە دەستدایە دژایەتی کەن و بیانگرنە بەر رەخنە، بەڵکوو ئەو هەلەشیان بۆ دەرەخسێنن کە لە دەنگدان و هەڵبژاردنی داهاتوودا خەڵکی‌تر بۆ دەنگ‌نەدان بەم دەسەلاتدارانە دنە بدەن.

دەوری ئۆپۆزیسیۆن بە راشکاوی لە ولاتێکدا دیارە کە دوو پارت لە گۆڕەپانی رامیاریدا دەسەلاتیان بە دەستەوە بێ. بە چەشنێ کە هەموو جار یەکێکیان دەسەلاتی حکوومەت دەگرێتە دەست و ئەویتریان وەکوو «لایەنی دژ بە دەوڵەت» دەور دەگێڕێ. هەروەها ئەم لایەنە لە راستیدا وەکوو

حکوومەتێکی جێگرە کە گەر بەختی یار بێ، لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا سواری ئەسپی موراد دەبێ و دەسەڵاتی دەوڵەتی دەکەوێتە دەست. لە پارلەماندا ئەندامانی لایەنی دژ بە دەوڵەت، بەرنامە و گەلالەکانی دەوڵەت دەگرنە بەر رەخنە و پلار و گوشار دەخەنە سەر دەوڵەت کە کار و بار و گەلالەکانی تەکووزتر کا. دیسیپلینی پارتەکانی ئێستا بە جۆرێکە کاتێ رێبەرانی پارتی ئۆپۆزیسیۆن بیانەوێ کە دژ بە حکوومەت دەنگ بدەن، پێڕەوان و ئەندامانی ئەو پارتەش ئەمەگناسانە پێڕەویان لێ دەکەن؛ بەلام چونکە ئەندامانی پارتی دەسەلاتداریش بە هەمان چەشن پێڕەوی لە پارتی خۆیان دەکەن و لە پارلەمانیشدا ژمارەیان پتر لە لایەنی دژ بە دەوڵەتە، دەنگی ناکۆکی لایەنی دژ بە دەوڵەت تەنیا وەکوو دەربڕینی نارەزایەتییەکی رەسمی خۆی دەنوێنێ و کارێکی بۆ ناڕواتە پێش. کۆششەوەی ئۆپۆزیسیۆن بۆ ئەوەیە کە خەلکی بۆ نارەزایەتی لە دەوڵەت دنە بدا و سیاسەتەکانی خۆی بە پێشکەوتوو و گونجاو پیشان بدا تا بەلکوو لە دەنگدانی داهاتوودا بگەرێتەوە بۆ سەر تەختی دەسەلات.

لە ولاتانێکدا کە چەن پارتی سەرکی هەیە و حکوومەت لە چەن پارتی هەڤبەند پێک هاتووە، یاخۆ لە پارتێک پێک هاتووە کە لە لایەن پارتەکانیترەوە پشتگیری لێ دەکرێ، واتای ئۆپۆزیسیۆن بە تەواوی ئەم واتایەی سەرووی نییە. ئەو پارتانەی کە لە دەرەوەی زۆرینەدان، دەکرێ بلێین لە رەهەندی دژ بە دەوڵەتدان، بەلام چونکە زۆرجار لە نێوان خۆیاندا ناکۆکیان هەیە، ناتوانین وەکوو گرووپی ئۆپۆزیسیۆن ناویان لێ بەین(برومهید؛ ١٩٦٤).

## oligarchy / ئۆلیگارشی

ئۆلیگارشی یان حکوومەتی تاقمێکی کەم، وشەیەکە کە هەندێ ئاماژەی

سووکانەی تێدایە: مەبەست لەم زاراوەیە تەنیا دەسەڵاتی تاقمێکی کەم نییە، بەڵکوو مەبەست تاقمێکی کەمە کە نەتەنیا لە بەرانبەر خەڵکدا بەرپرس نین، بەڵکوو سیستەمێکی پڕ لە گەندەڵی و نالەبارییە، یاخۆ لە رەهەندگەلی ترەوە کەوتۆتە بەر رق و قینی گشتی.

ئۆلیگارشی دەتوانێ لە هەر کۆڕ و کۆمەڵەیەکدا کە تاقمێکی هاوبۆچوون بە سەر زۆربەی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەدا دەسەڵاتیان بێ، ببێژرێ. لە واتای رامیاریدا ئەم زاراوەیە لە سەردەمی ئەفلاتوونەوە لە گەڵ واتای مۆنارشی (حکوومەتی پادشا) و دیمۆکراسی (حکوومەتی جەماوەری خەڵکی) جیاوازییەکی زەقی بووە. ئۆلیگارشی لە روانگەی ئەفلاتوونەوە هەمان شێوازی بەراوەژووی حکوومەتی خانەدانانە (ئاریستۆکراسی). ئەم چینبەندییە کە ئەفلاتوون دایڕشتووە، هێشتا وەکوو خۆی ماوەتەوە، هەرچەن لە تیری رەخنەگرانی بە دوور نەبووە. بۆ وێنە، هابز دەیگوت: «ئەوانەی لە ئاریستۆکراسی تووڕە بن، پێی دەڵێن ئۆلیگارشی».

ئەرەستووش سێ جۆرە حکوومەت دەست نیشان دەکا و بە ناوی سێ جۆری حکوومەتی چاک ناویان دەبا: حکوومەتی پادشایەتی، ئاریستۆکراسی و کۆماری. لە بەرانبەری ئەم سێ جۆرە حکوومەتە چاکەوە سێ حکوومەت کە لە راستەڕێ لایان داوە ناودەبا: پادشایەتی ستەمکار، ئۆلیگارشی و دیمۆکراسی. دەڵێ: «ئۆلیگارشی ئەوەیە کە تەنیا قازانجی دەوڵەمەندانی تێدایە»؛ هەروەها دەڵێ: «ئۆلیگارشی ئەوەیە کە دەوڵەت لە ژێر رکێفی تاقمێ دەوڵەمەنددا بێ». بە بڕوای ئەرەستوو، لە حکوومەتی ئۆلیگارشیدا دەسەڵات لە ژێر رکێفی تاقمێکی زۆر کەم لە دەوڵەمەنداندایە و مافی هەژاران لەم حکوومەتەدا پێشێل دەکرێ و تاقمی دەوڵەمەند تووشی گەندەڵی و ملهۆڕی دەبن (ارسطو؛ ١٣٨٦)

لەم سەردەمەشدا، چونکە هەر جۆرە حکوومەتێک دەتوانێ ئۆلیگارشی بێ،

ئۆلیگارشی کەوتۆتە بەر ڕەخنە. هەروەک مەک ئایڤێر دەڵێ: «بە پرسینی ئەم پرسیارە کە یەک کەس حکوومەت دەکا یان چەن کەس یاخۆ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی، ناتوانین بەوردی دەوڵەتەکان چینبەندی بکەین. ژمارەیەکی زۆر یان خودی خەڵکی قەد حکوومەت ناکەن؛ حکوومەت کردن هەموو کات کاری تاقمێکی زۆر کەمە. بابەتی گرینگ دەگەڕێتەوە بۆ چۆنییەتی حکوومەتی تاقمێکی زۆر کەم کە بە سەر کۆمەڵگادا حکوومەت دەکەن. لەم سۆنگەوە چەن کەس نابنە بەرپرسی ژمارەیەکی زۆر؟ ئۆلیگارشی هەر ئەمەیە».

ئایڤێر لە درێژەدا دەڵێ کە حکوومەتی ژمارەیەکی کەم بریتییە لە حکوومەتی چین، پارت یان گرووپێک کە مۆنارشی، ئیمپراتۆری، دیکتاتۆری، حکوومەتی دین یان هەر جۆرێکیتر لە حکوومەتمان بۆ دێننە دی.

سپیتز دەڵێ کە حکوومەتی تاقمێکی کەم لە بژاردەکانی کۆمەڵگا ناتوانێ ببێتە خاڵێکی گرینگ بۆ دابڕانی دیمۆکراسی و ئۆلیگارشی. «خاڵی سەرەکی، بابەتی بەرپرس بوونە. ئەمەی کە دەسەلاتی ڕێبەرایەتی لە ڕەزامەندی سەربەستانەی خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ و هەروەها ڕێبازێک کە ڕێبەر گرتوویەتە بەر، لە گەڵ ڕەزامەندی و ناڕەزامەندی خەڵکی لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا سازگارە یا نە؟ کەواتە، ئەم بەشانەی کە پەیکەرەی بەرپرسایەتی رامیاری پێک دێنن، پێوەری سەرەکین بۆ جۆری حکوومەت، نەک ژمارەی ئەو کەسانەی کە حکوومەتیان لە ئەستۆیە» (گولد، ١٣٨٤).

## بژاردەکانی دەسەلات / power elite

سیرایت میلز لە ١٩٥٦دا بەرهەمێکی بلاو کردەوە بە ناوی بژاردەکانی دەسەلات کە تێیدا هانی داوە پیشان بدا ئەمریکا چلۆن لە ژێر چەتری دەسەلاتی چینێکی بچووک لە رامیاران و بازرگانان و خاوەن پیشەسازییە

مەزنەکاندایە.

ئەم بەرهەمەی میلز درێژەی هەمان باسی بژاردەکانی رامیاری پارێتۆوە. بەبڕوای میلز لە کۆمەڵگایەکی گەورەی وەکوو ئەمریکادا ئەندامانی چینێکی بچووک کە هەموو پلە و پاگە گرینگە کۆمەڵایەتییەکانیان داگیر کردووە، بە هۆی ئاخێزگەی کۆمەڵایەتی هاوبەش، پێوەندی تاکەکەسی و بنەماڵەییەوە، پێکەوە پێوەندیان هەیە (بشیریە؛ ١٣٨٠).

بەڕای میلز، بژاردەکانی دەسەڵات، پیلان نییە، بەڵکوو لە گرووپە دەسەڵاتدارەکانی نێو کۆمەڵگا پێک هاتووە کە سەرترین پلە و پاگەیان لە بەشی بەڕێوەبەرایەتی حکوومەت، هێزە چەکدارەکان، کۆمپانیا گەورەکان و ناوەندە ماڵییەکان لە ئەستۆیە. ئەندامانی ئەم گرووپانە رەنگە جێگایان پێکەوە بگۆڕنەوە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتری ئەم بازنەیە بڕۆن، بەڵام قەد لە بازنە ناڕۆنە دەرەوە. هیچ یەک لەم ئێلیتانە بە سەر ئەویتردا زاڵ نین، بەڵکوو بە ئاریکاری یەک و بە هۆی دەزگاگەلی راگەیاندنەوە، خەڵکی لە ژێر چەتری دەسەڵاتی خۆیاندا رادەگرن. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، کۆنگرەی ئەمریکا و گرووپگەلی گوشار، دەورێکی زۆریان لە سەر بڕیاردانەکان نییە. لەم کاتانەدا، بڕیاری دوایی لە لایەن ئەندامانی لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا گەورەکان و بانکدارەکان لە لایەکەوە و بەرپرسە رەسمییە سەربازییەکان لە لایەکیترەوە دەدرێ. گەر سەرۆک کۆمار بتوانێ رای ئەم کەسانە بۆ پەسند کردنی گەلالەی خۆی بگۆڕێ، ئەو گەلالە جێ بە جێ دەبێ (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

لە راستیدا میلز دەسەڵاتی بە واتای بەشداری لە بڕیاردانە رامیارییەکاندا هێناوە، کەچی واتای بژاردەکانی دەسەڵات لە گەڵ واتای «چینی دەسەڵاتدار» کە لە نووسراوەکانی پارێتۆ و مۆسکادا دیارن، جیا دەکاتەوە. بە پێی لێکدانەوەی میلز کۆمەڵگای ئەمریکا لە سێ بەش پێک هاتووە، واتە:

بژاردەکانی چینی یەکەم، بژاردەکانی چینی دووەم، جەماوەری ناسیاسی کە دەتوانن پێکەوە کۆوە بن و ئاپۆرە ببەستن. هەرچەند بەرهەمەکەی میلز بە زمانی رووسی وەرگێڕدرا و لە لایەن مارکسیستەکانەوە سەرنجی زۆری پێ درا، بەڵام میلز خۆی مارکسیست نەبوو و دەرەنجامێکیش کە پێی گەیشت نامارکسی بوو، واتە ئاکامێکی ئێلیتی دەست کەوت، ئەوەش بریتی بوو لەوەی کە «دەوڵەمەندەکان بە تەنیا لە لای سەرووی زنجیرەی دەسەڵاتی رامیاریدا بوون» (بشیریە؛ ١٣٨٠).

## ئینتزاعی (رووت) / abstraction

واتای ئەم زاراوەیە باس لە پرۆسەیەکی هزری دەکا کە بە هۆی ئیدراکێکەوە بگات بە تێگەیشتنێکی گشتگیر. لەم پرۆسەیەدا تێگەیشتن پاڵ بە یەکێک لە وێنەکانی واقیعەوە دەدا. ئەم وێنا لە نێوان چەن تێگەیشتنی جیاوازدا هەڵبژێردراوە و بە هۆی سیمبۆلەکانەوە شرۆڤە دەکرێ و بە گوێرەی گشتگیرکردنێکەوە کە لە هەندێ بواری زەق و ئاشکرادا سەرچاوەی گرتووە، دەگاتە ئەم گریمانەیە کە ئەم گشتگیر کردنە(تعمیم) لە تەوەری هاوچەشنیشدا کاریگەری هەیە. هەرچەند دەبێ بزانین کە ئەم گشتگیر کردنە ناتوانێ بە تەواوی شرۆڤەی هەر یەک لەوانە بکات(عضدانلو، ١٣٨٤).

### بارانی ئەسیدی / acid rain

بارانێکە کە بە هۆی پیسی هەواوە، ئەسیدی بووە و دەبێتە هۆی فەوتاندنی روەک و ئاژەڵان. ئەم دیاردەیە بە بۆنەی تەم و دووکەڵی سووتەمەنی کارخانەکانەوە -بە تایبەت لە وڵاتانی پیشەسازیدا- هاتۆتە دی. یەکێک لە دەرئەنجامە پێش‌بینی نەکراوەکانی شۆڕشی پیشەسازی، پیس کردنی هەوایە. سەد ساڵی لەمەو پێش ئەو تەم و دووکەڵە خەستەی لە دووکەڵکێشی کارخانەکان دەهاتە دەرەوە، ئاگەدارییەک بوو بۆ وڵاتە پیشەسازییەکان. پاش شەڕی جیهانی دووەم، پیسی هەوای شارە پیشەسازییەکان، ببووە کێشەیەکی گرینگ بۆ ئەم شارانە. لە دەیەی یەکەمی پاش شەڕی جیهانی دووەم، لەندەن یەکێک لە پیسترین شارەکانی دونیا بوو. لە ساڵی ١٩٥٢، تەمێکی رەش و خەست، ئاسمانی لەندەنی بۆ ماوەی پێنج رۆژ داگرت و بوو بە هۆی کوژرانی نزیک بە ٤٠٠٠ کەس. ئەم دووکەڵانە لە گەڵ هەورەکان تێکەڵ دەبن و دەبنە هۆی دابارینی بارانی ئەسیدی. کێشەی بارانی ئەسیدی، کێشەی وڵاتێکی تایبەت نییە، بەڵکوو کێشەیەکی جیهانییە؛ چونکە ئەو وڵاتانەی ئەم بارانانەی تێدا دەبارێن، رەنگە هەزاران میل دوورتر لە شوێنی چێ بوونی ئەم دووکەڵانە بن (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

### بازاڕی کاری دووەمین / secondary labor market

بازاڕی کاری دووەمین بریتیە لە کرێکارانی کارگە گەڕەکییەکان، کار و پیشە بچووکەکان (وەکوو مامەڵەی خانوو و ئاژانسی گواستنەوەی موسافیر)، کارگەلی خزمەتگوزاری تایبەت، کار کردن لە مەزرای کەسانی تردا (وەرزێری). کار لەم بازاڕانەدا کاتی و بێ‌دەوامە، مووچەی کەمە و هەل و

مەرجێکی کاری نالەباری هەیە. هەلی پێشکەوتن لەم کارانەدا زۆر کەمە (بۆ نموونە، گارسۆنێک بە دەگمەن بتوانێ ببێتە مودیری ریستووران، یان کرێکاری مەزرایەک بە دەگمەن بتوانێ ببێتە مودیری مەزرا). کرێکارانی ئەم بازارانە، لێهاتووییەکی زۆر کەمیان هەیە، یەکیەتی کرێکارانیان نییە و زۆرتر کاتی کار دەکەن. لەم رووەوە ئەم دوو بازاڕی کارە (سەرەکی ودووەمین) نە تەنیا لە یەک جیاوازن، بەڵکوو زۆریش نابەرانبەرن.

### بازاڕی کاری سەرەکی / primary labor market

بەڕای هەندێ لە کۆمەڵناسان، پرۆسەی بەپیشەسازی بوون، بوو بە هۆی پێشکەوتی دوو جۆرە کاری لێک جیاوازی بازاڕی کاری سەرەکی و بازاڕی کاری دووەمین لە ئەمریکا و هەندێ لە ولاتانی‌تری سەرمایەداریدا (*Kasarda, J. D; 1989: 26-47*). بازاڕی کاری سەرەکی بریتیە لە کار لە شەریکە و دەزگا و کارخانە گەورەکان، ئەنجامدانی ئەو کار و پیشانەی کە پێویستیان بە شارەزایی هەیە و هەروەها نوێنەرانی حکوومەت و پیشەسازییەکان. کار کردن لە بازاڕی کاری سەرەکی، داهاتێکی زۆرتر، هەل و مەرجی شیاوترو هەلی پێشکەوتی زۆرتری هەیە. تەنانەت کرێکارانی ئاساییش لەم بازاڕی کارەدا، شارەزایی و ئاستی خوێندنیان زۆرترە لە بازاڕی کاری دووەمین(عضدانلو؛ ١٣٨٤).

### باوکسالاری / patriarchy

دەتوانین بڵێین کە ئەم زاراوەیە، هەنووکە لە فەرهەنگی زاراوەکانی زانستە کۆمەلایەتییەکاندا نەماوە. پێشتر واتای ئەم زاراوە بریتی بوو لە گرووپێکی بنەماڵەیی کە پیاوێکی بەساڵاچوو بە سەریدا زاڵ بوو. هەرچەند هەندێ رەهەندی‌تریش کە نەختێ لە گەڵ ئەم پێناسەیە جیاوازی هەیە

دەگرێتەوە.

نووسەرانێ وەکوو هـ. مین و ل. مۆرگان جێگایەکی تایبەتیان بۆ ئەم پێناسەیە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا کردەوە. ئا. هابێل، روونی کردۆتەوە کە بە بۆنەی گۆڕانی دۆخ و قۆناغێک کە تێیدا باوک بە سەر هەموو بنەماڵەدا حوکمی دەکرد، ئەم قۆناغە کە یەکێک لە قۆناغە گرینگەکانی گەشە و تەواوتر بوونی کۆمەڵگای مرۆییە، دوایی هاتووە و مۆڵەتی نەماوە. هابێل دەنووسێ: «باوکسالاری و دەسەڵاتداری هۆزە سەرەتاییەکان، شتێک نییە بێجگە لە تارمایی بیرو بۆچوونەکانی سەدەی نۆزدەهەم». پێشتر، مەبەست لە باوکسالاری، حکوومەتێکی بنەماڵەیی بوو کە باوک یان جێگری باوک بە سەر هەموو بنەماڵەدا حوکمی دەکرد. هەندێ‌تر لە نووسەران لە زاراوەی «حکوومەتی رەهای پیاوان» پێناسەیەکی بەرفراوانتر دەدەنە دەست و رایان وایە کە ئەمە بارودۆخ و هەلومەرجێکی «زۆر دەگمەنە». لە فەرهەنگی نێونەتەوەیی نوێی ویبستردا هاتووە کە: باوکسالاری نە تەنیا ئاماژە بە سەرتری پیاوان —سەرتری پیاوان لە باری جەستەیی و کۆمەڵایەتییەوە- دەکا، بەڵکوو «مافی باوکی» یان «پشتی باوکی» لە پێداویستەکانی ئەم سیستەمەیە (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

هەرچەند باوکسالاری تا رادەیەکی زۆر بە پرسێکی جیهانگیر دێتە ئەژمار، بەڵام رادەی دەسەڵات و ویستی پیاو و ژن لە کولتووره جیاوازەکاندا جۆراوجۆرە. بۆ وێنە دەسەڵاتی پیاوان بە سەر ژناندا لە سعوودیدا زۆرتر لە هەر شوێنێکی دونیایە، کەچی ئەم دەسەڵاتە-دەسەڵاتی پیاوان بە سەر ژناندا- لە وڵاتی نورویژدا بە کەمترین ئاستی خۆی گەیشتووە. بە بڕوای والبی، باوکسالاری لە شەش پێکهاتەدا کە هەندێ جار لە گەڵ یەک تێکەڵاویان هەیە، خۆی دەنوێنێ: ١) ئاستی داهات؛ ٢) ژمارەی خێزان؛ ٣) دەوڵەت؛ ٤) توند و تووڕەیی؛ ٥) رەگەز؛ ٦) کولتوور (*Walby, S; 1990*). ئەم

شەش پێکهاتە لە هەر کولتوورێکدا کارێکی جیاوازیان لە ئەستۆیە. بەڕای والبی، لە سەدەی بیستەم و لە وڵاتە ڕۆژاواییەکاندا باوکسالاری تایبەت (باوکسالاری نێو خێزان)، بووەتە باوکسالاری گشتی یان دەوڵەتی (باوکسالارییەک کە دەوڵەت و بازاڕی کار چەند و چوونی ژیانی ئافرەتان دیاری دەکەن).

بە پێچەوانەی ئەوەی کە هەندێ لە نووسەران ئاماژەیان پێ کردووە، دەسەڵاتی باوکسالاری تەنیا بە سەر ئافراەتاندا نەبووە، بەڵکوو لە بنەماڵە بەرفراوانەکاندا دەسەڵاتی بەساڵاچووترین پیاو بە سەر هەموو ئەندامانی -چ ژن و چ پیاو- بنەماڵەدا یەکسان بوو. ئەنجامی ئەم سیستەمە لە سەدەی بیستو یەکدا لە بیچمی باوکسالاری حکوومیدا خۆی نواند. حکوومەتی پارتی بەعس و سەدام حوسێن لە عەراقدا یەکێک لە زەقترین وێنەکانی ئەم شێوازە بوو. بێشک پیاوانیش لەم شێوازەدا تووشی زیان و ئازاری زۆر دەهاتن، بەڵام ئازاری پیاوان هیچ کات پتر لە ئازاری ژنان نەبووە؛ چونکە هەر بنەماڵەیەک باوکی تێدا هەیە و باوکیش بە گوێرەی هەمان شێوازی قۆرخکردنی دەسەڵات، لە نێو بنەماڵەیدا حوکمی دەکرد و دوایین کەسانێک کە زۆرترین ڕەنج و ئازاریان بەر دەکەوت ژنان و ئافرەتان بوون.

بێگومان یەکێک لەو بەرهەمە ئەدەبییانەی کە سەرنجێکی وردبینانەی داوەتە ئەم سیستەمە لە عەراقدا، ڕۆمانی *حەسار و سەگەکانی باوکم*، نووسینی شیرزاد حەسەنە. شیرزاد حەسەن لەم ڕۆمانەیدا بە وردی چۆنییەتی دەسەڵاتی باوک بە سەر هەموو ئەندامانیتردا (چ کچان و چ کوڕانی نێو خێزان) پیشان دەدات. شیرزاد حەسەن لەم بەرهەمەیدا دەستی داوە بە ڕاڤەیەکی دەروونناسانە و کۆمەڵناسانە لە سیستەمی باوکسالاری. لەم سیستەمەدا کە وێکچوونێکی زۆری لە گەڵ سیستەمی کۆیلەداری هەیە، تاک کەسایەتی و بەها ئینسانییەکانی خۆی دەدۆڕێنێ و لەنێو کۆمەڵگایەکی

مەحکووم کراودا دەژیت. ژیانێک کە هیچ هیوایەک بە دەربازبوون لێی نییە. سەگەکانی باوکی سالار (سیمبۆلی دەسەلاتی بێچەندوچوونی باوک)، بێهیچ بەزەییەک ئەوانەی کە بیانەوێ لە کەوشەنێک کە باوک دیاری کردووە بپەڕنەوە، پەل‌پەل دەکەنەوە. باوک بۆ خۆی لە گەڵ ژنەکانیدا رادەبوێرێ و کوڕەکانی دەبێ بە حەسرەتەوە سەیری ئەو رابواردنەی باوکیان بکەن. هەموو ئەم زوڵمانەی کە سیستەمی باوک‌سالار لە تاک و سەرجەمی کۆمەڵگای دەکات، کۆمەڵگا بەرەو شۆڕش و هەڵوەشاندنی ئەو سیستەمە پاڵ پێوە دەنێ و باوک ستەمکار یا هەمان پادشای باوک سالار تەفرو توونا دەبێ. کێشەیەک کە پاش رووخانی ئەو سیستەمە دێتە ئاراوە ئەو شتەیە کە لە کۆمەڵگای کۆیلەداریشدا خۆی پیشان دا؛ ئەوەش بریتییە لە نەبوونی متمانە بە خۆ لەنێو کوڕەکانی باوکدا بۆ بەڕێوەبردنی خۆ و دەسپێکردنی شەڕ و کێشەی ناوخۆ و رووخانی دیوارەکانی حەسار و هەڵگیرانی کچانی شار و سەتان کێشەی‌تر، کە هێشتا لە عەرقدا دوایی نەهاتووە و هەر رۆژ دەیان کەس دەخاتە بەردەم دێوەزمەی مەرگەوە (شیرزاد حەسەن؛ ٢٠٠٥).

## باوەڕ / belief

لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە، باوەڕ یەکێک لە بەشە نامادییەکانی کولتوورە کە وەکوو وردە کولتوورە نامادییەکانی‌تر (بەها، نۆرم و سیمبۆل) نادیار و بەرپیوارە. ئەم وردە کولتوورانە کاریگەرییەکی بەرچاویان بە سەر هەڵس‌وکەوتی مرۆڤدا هەیە. باوەڕەکان بریتین لە بیر و بۆچوونێکی هاوبەش لەمەڕ کاری جیهان. خەڵکی بە گوێرەی باوەڕەکان واتە ئەو بیر و بۆچوونانەی کە خەڵکی بە راستیان دەزانن، پلە و پاگەی خۆیان لە نێو جیهاندا شرۆڤە دەکەن. باوەڕەکان دەتوانن لە سەر بڕوا کوێرەکان، ئەزموون، سوننەت یاخۆ شێوازە زانستییەکاندا بناغەیان داڕێژرابێ. بناغەی باوەڕەکان

هەرچی کە بێ، کاریگەرییەکی بەرچاوی بە سەر ڕەفتاری مرۆڤەکاندا هەیە.

بۆ پێوانی ڕادەی کاریگەری بڕواکان بە سەر هەڵسوکەوتی مرۆڤدا، دوو کەس لە کۆمەڵناسانی ئەمریکی بە ناوی ئیڤان فۆگت و جۆن رابێرت، دەستیان دابە توێژینەوەیەک لە سەر باوەڕی دوو گرووپی لێک جیاواز لە ئەیالەتی نیوومکزیکۆدا. ئەم دوو کۆمەڵناسە دەیانەویست تێبگەن ڕوانگەی ئەم دوو تاقمە لە سەر سروشت و کاریگەر بوونی بە سەر هەڵسوکەوتی مرۆڤدا چەند لێک جیاوازن. یەکێک لەم گرووپانە ئەمریکی و پڕۆتستان بوون و لە تیگزاسدا دەژیان و خاوەن خانوو بوون. گرووپیکە، سوورپێستە خۆماڵییەکانی هۆزی زوونی بوون کە لەم ئەیالەتەدا دەژیان. کۆمەڵناسان پاش تۆژینەوە تێگەیشتن کە گرووپی یەکەم خۆیان بە جیا لە سروشت دەزانن و پێیان وایە کە سروشت دەبێ لە ژێر ڕکێفی ئەواندا بێ و بەهرەی لێ وەربگرن. بە پێچەوانەی ئەوان، خۆماڵییەکانی زوونی، خۆیان بە پاژێ لە سروشت دەزانی و پێیان وابوو کە سروشت و ئادەمیزاد، نە قوربانی یەکترن و نەلە یەک سەرترن. پێیان وابوو کە هاودەنگی نێوان سروشت و مرۆڤ دەبێتە هۆی پاراستنی ڕێک و پێکی کاکێشان (*Vogt, E. Z; 1960*).

کاریگەری باوەڕە جیاوازەکانی ئەم دوو گرووپە دەتوانین لە پێوەندییان لە گەڵ ژینگە، بە تایبەت لە کاتی سیاساڵدا بزانین. پڕۆتستانە خاوەن مەزراکان لە تراکتۆر و شێوازە نوێکانی کشتوکاڵ بەهرە دەگرن؛ لە کاتی بێئاوی و وشکەساڵیشدا بە هۆی تیکنۆلۆجیای نوێوە هەورەکان ئاوس دەکەن و باران دادەبارێنن. بە پێچەوانەی ئەوان، خۆماڵییەکان هێزێکیان لە خۆدا ڕاهێناوە تا لە کاتی تەنگانەدا بتوانن لە گەڵ دژوارییەکانی ژین خۆیان سازگار بکەن. هەروەها لە کاتی کێشە و دژواریدا زۆرتر خەریکی گازە و سکاڵا دەبن. خۆماڵییەکانی زوونی باوەڕیان وایە کە ئەگەر مرۆڤ لە ئاست سروشتدا ئەرکەکانی بە جوانی بەڕێوە ببا، پەروەردگاریش پێداویستییەکانی

بۆ دابین دەکات. بە درێژایی سەدان ساڵ بارینی باران لە وەرزی گەرمی هاویندا جەخت لە سەر ئەم بۆچوونەیان دەکا. بەم بۆنەوە بە توندی دژایەتی لە گەڵ ئاوس کردنی هەورەکان بە هۆی تیکنۆلۆجیای نوێوە دەکەن ( *Vogt, E. Z; 1960:116*– عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## باوەڕی گشتیکراو / generalized belief

نیل سمێلسێر بۆ سەرچاوەی کردە بە کۆمەڵەکان چەن مەرج دەست نیشان دەکا کە بریتین لە: *بواری پێکهاتەیی*، بەو هەل و مەرجە گشتیە کۆمەڵایەتییانە دەبێژرێ کە هاندەر یاخۆ بەربەستی هەرجۆرە بزاڤێکی کۆمەڵایەتین. بۆ نموونە، بە بڕوای سمێلسێر سیستەمی کۆمەڵایەتی-رامیاری ئەمریکا بە بۆنەی نەبوونی نەزمی دەوڵەتی لە هەندێ چەمکەکانی کۆمەڵگادا، هەندێ رێگای ناڕەزایەتی و سەرهەڵدانی لەو وڵاتەدا ئاوەڵا هێشتۆتەوە. هیچ ئایینێکی رەسمی و حکوومی نییە و خەڵکی دەتوانن سەربەستانە بڕۆنە ریزی هەر ئاینێکەوە کە خۆیان پێیان خۆشە. دووەمین مەرج بریتیە لە *گوشاری پێکهاتەیی* یان هەمان شتێک کە مارکس ململانێی پێدەگوت و دەبێتە هۆی هاتنە دی قازانجگەلێکی ناتەبا و دژ بە یەک بۆ ئەندامانی کۆمەڵگا. ئەم گوشارانە لە قەوارەی: پەشێوی لە مەڕ داهاتوو، دڵەخورپە، کاسی و سەرسامی ئاشکرا دەبن. بەم چەشنە ناتەبایی و نابەرانبەری بەردەوامی نێوان گرووپەکان، دەبێتە هۆی هاتنەدی ناکۆکی گشتی.

سێیەمین مەرج کە سمێلسێر باسی لێ دەکا بریتیە لە *باوەڕە گشتیکراوەکان*. بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان بە تەنیا پەرسڤەدەری دڵە خورپە یان ئەو دوژمنایەتییانەی بە چەشنێکی لێڵ هەست پێ دەکرێن، نین. بەڵکوو لە ژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژییەکدا دێنە دی کە دەنگی

نارەزایەتییەکان  هەڵدەبڕێ و ڕێگەچارەیەکی پراکتیکی بۆ چارەسەر کـردنی پیشـان دەدات. بـۆ وێنـە بزاڤـە شۆڕشـگێڕانەکـان لـە سـەر ئـەم بۆچوونـە دادەمەزرێن کە بۆچی کۆمەڵگا پڕ لە نایـەکسـانی و نابـەرانبـەرییـە و چـۆن دەکرێ لە ڕێی خەباتی سیاسیەوە چارەسەر بکرێن (گیدنز؛ ١٣٨٦).

بە بڕوای سمێلسێر، باوەڕە گشتیکراوەکان دەبنە هـۆی کـەم کردنـەوەی گومان و دڕدۆنگی و نیگەرانی ئەنـدامانی گرووپێـک کـە دەیانـەوێ دەسـت بدەن بە کارێکی بەکۆمەڵ. بۆ نموونە ئاماژە دەکەین بـە کۆمـەڵـەی ئـایینی دەیڤید لە تیگزاسدا کە لە ساڵی ١٩٩٣دا ئاوری تـێ بـەر بـوو و هێـزەکـانی پۆلیس و فریاکەوتن بە هەموو کۆششێک کە کردیان نەیانتوانی تەنیـا یـەک کەسیش دەرباز کەن. وادیار بوو کە هەموو ئەندامانی ئەم کۆمەڵـە بـڕیاریان دابوو کە بەجێی خۆبەدەستەوەدان، لـە گـەڵ ڕێبـەری کاریزمایـان-دەیڤـید کۆرێش- بمرن. هەرچەند هێزەکانی پۆلیس لە کاتی فریاکەوتندا کـونی زۆر گەورەیان لە دیوارەکاندا داکردبوو و گازی فرمێسک هێنەریـان هاویشـتبووە ناوەوە، کەس لەوێ نەهاتبووە دەرەوەو سەرلەبەریان سووتابوون. هەرچـەنـد ئەم گریمانەش هەیە کە ڕەنگە دەیڤید تووشی نەخۆشیەکی دەروونی بووبێ، بەڵام ئەمە ناتوانێ ڕوونکەرەوەی ئەم بابەتە بێ کە بۆچی پێڕەوەکانی خۆیـان لە گەڵ ئەودا بە کوشتن دا. کردەوەکەیان هەر هۆیەکـی بـێ، لـە ڕوانگـەی کۆمەڵناسیوە دەخرێتە ریزی کـردەو هـەڵـسوکـەوتـە بـە کۆمـەڵـەکانـەوە (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## بزاڤە ئاینییە نویکان / (new religious movements (NRMs

لە دونیای نوێدا لە لایەکەوە مەیلی خەڵکی بۆ بەشداری لە ئایینـە نـوێ و سەقامگرتووەکان بە توندی ڕووی لە کزی ناوە و زۆربەی ئاینە فەرمییـەکـان بەرژەوەندییەکی پاراستنخوازانەیـان هـەڵـبژاردووە و لـە لایـەکـیتریشـەوە

زۆربەی خەڵکی بە شوێن ڕێگایەکدا دەگەڕن بۆ پالاوتنی دەروونیان و گەیشتن بە ئارامشی دەروونی و کەچی دونیای سیکۆلاریش ناتوانێ پەرسڤدەری ئەو نیازە بێ. بە بڕوای کۆمەڵناسان هۆی سەرەکی بۆ گەشە و پەرەسەندنی ئایینە نوێکان، هەمان گەشە و بلاوەی بەدونیایی کردنە. بە واتایەکی‌تر، لە لایەکەوە ئاینیە ڕەسمییەکان ناتوانن نیازەکانی کۆمەڵگا دابین کەن و لایەکی‌تریشەوە سیکۆلاریزم ناتوانێ نیازە دەروونییەکانی تاک یان گرووپەکان دابین بکات. بەم بۆنەوە ئایینە نوێکان کە زۆرتر وەکوو تاقم و دەستەکانن، بۆ دابین کردنی نیازی دەروونی تاک و گرووپەکانی کۆمەڵگا خەریکی گەشانەوە و پەرەسەندنن. بە واتایەکی‌تر، گەشەی سیکۆلاریزم و کەم بوونەوەی هێزی ئایینە سەقامگرتووەکان بۆتە هۆی زۆربوونەوە و پەرەسەندنی بزاڤی ئایینە نوێکان. ئەوەی زۆر کەوتۆتە بەر سەرنجی کۆمەڵناسانی هاوچەرخ، ئەوەیە کە تەنیا لە ماوەی چەن دەیەی ڕابردوودا زۆرتر لە بیست هەزار گرووپی ئایینی نوێ سەریان هەڵداوە و پەرەیان سەندووە (*Stark, R & W. S. Bainbridge, 1981*).

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئایینە نوێکان، نزیکی ئەم ئایینەیانەیە لە گەڵ ئایینە سەرەکی و سەقامگرتووەکان. هەندێکیان وەکوو هەری کریشنا (*hari krishna*)، پێوەندییان بە هیندووئیزمەوە هەیە، هەندێکی‌تر وەکوو گرووپە جۆراوجۆرەکانی زێن (zen)، بە بوودائیسمەوە پێوەندییان هەیە و هەندێکی‌تر وەکوو ڕۆڵەکانی مەسیح، بە مەسیحییەتەوە پێوەندییان هەیە. ڕۆی والیس گرووپە ئاینییە نوێکان بە سێ دەستە دابەش دەکات ( *Wallis, R; 1976*):

١) ئەو گرووپانەی جەخت لە سەر دونیا دەکەن: ئەندامانی ئەم گرووپانە زۆرتر تاک‌خواز و پازیتیڤن. بە واتایەکی‌تر، ئەم کەسانەگەش‌بینانە سەیری دونیا دەکەن و هان دەدەن لێهاتووییەکانی مرۆڤ ببیننەوە و لێی بەهرەمەند

بن. توێژینەکان وا پیشان دەدەن کە ئەم بۆچوونانە لە نێوان تاکەکانی چینی ناونجی و ئەو کەسانەی کە تەمەنیان بە نیوە گەیشتووە و بایەخێکی زۆتر بە بەها ماددییەکان دەدەن، زۆرتر باوە. زۆربەی ئەم گرووپانە شوێنێکی تایبەتیان بۆ عیبادەت و بەجێهێنانی ڕێو ڕەسمی ئایینی نییە. ئەمانە زۆرتر وەکوو تاقمێکن کە خۆیان دەرمانی خۆیان دەکەن تا ئەوەی کە پێڕەوی لە ئاینێکی سوننەتی بکەن. یەکێک لەمانە گرووپێکە بە ناوی کلیسای زانست (Church of Scientology) کە بە هۆی کەسێکەوە بە ناوی ران هۆباردەوە (Ron Hubbard) بنیات نراوە. هۆبارد فەلسەفەیەکی دامەزراند کە بنەمای لە سەر ئازاد کردنی زەین دانرابوو. بە بڕوای ئەو، ئازاد کردنی زەین دەبێتە هۆی «ڕووناکی بیر» و لەم سۆنگەوە زەین دەتوانێ باشتر واتا گەشبینانەکان هەست پێ بکا.

٢) ئەو گرووپانەی پشت لە دونیا دەکەن: ئەو گرووپانە زۆرتر تاقم و گرووپن، بەلام لە زۆر ڕەهەندەوە وەکوو ئایینە باوەکانی دونیان. ئەندامانی ئەم تاقم و گرووپانە، وەکوو ئەندامانی ئایینە ڕەسمییەکان، ڕێو ڕەسمی دوعا و سکالایان هەیە و داوایان لێ دەکرێ کە نووسراو و کتێبی ئایینە ڕەسمییەکان بخوێننەوە. هەروەها ئەم گرووپانە یاسای ئاکاری زۆر سفت و سەختیان هەیە و جۆری ڕوانینیان بۆ دونیا، ڕوانینێکی ڕەشبینانە و نیگەتیڤە. بە هۆی کردە بەکۆمەلەکانیانەوە هان دەدەن پارێزگاری لە باوەڕەکانیان بکەن و ئەندامانی نوێ بە ویستی خۆیان رابێنن. زۆربەیان باوەڕیان بە گەڕانەوەی مەسیحە و چاوەڕوانن کە خوداوەند ڕاستەوخۆ بارودۆخی دونیا بگۆڕێ و بەرەو باشتر بوونی ببا. بە بڕوای کۆمەلناسان زۆربەی ئەو کەسانەی کە دێنە ریزی ئەم گرووپانەوە، کەسانێکن کە لە لێواری شارەکاندا دەژین و باری ئابووری و کۆمەلایەتییان زۆر باش نییە. یەکێک لەم گرووپانە، گرووپێکە بەناوی یەکیەتی کلیسا کە بە ناوی موونیز (Moonies) بەناوبانگە. ئەم گرووپە بە هۆی

قەشەیەکی کوورياييەوە بە ناوی سان میونگ مـوون (Sun Myung Moon) لـە سالی ١٩٥٤ەوە دامـەزرا. مـوون لـە دەیـەی ١٩٦٠ لـە ئـەیالـەتی کالیفۆرنیـای ئەمریکا لایەنگری زۆری لە دەوری خۆی کۆ کردەوە. جۆن لۆفلەندی ئەمریکـی و ئایلین بارکێری بریتانی کۆمەڵناسانێک بوون کە لە ئەمریکا و بریتانیادا لـە سـەر ئەم گرووپە تۆژانەوە. گرووپی یەکیەتی کلیسا، جیهانی ماددی بە دونیایەکـی پـڕ لە گەندەڵی و خراپی دەزانێ و ئـەنـدامانی دەبـێ یاسـاگەلی دژواری ئاکـاری — وەکوو هەڵبژاردنی یەک هاوسەر و نەخواردنی ئەلکـول و نـەکێشـانی جگـەرە- بەڕێوە ببەن.

ئەم گرووپانە بزاڤگەلێکی ئاینین کـە لـەم سـالانەی دواییـەدا سـەرنجـی تاقمێکی زۆر لە خەڵکی ئاساییان بەرەو لای خۆیان راکێشاوە و خەڵـکی زۆر ئاگاداری هەڵـس‌وکـەوتی ئـەم گرووپانـەن. ترسـی خـەڵـکی لـە «مێشـک شوشتنەوە»و کۆنترۆڵی زۆر و تەنانەت خۆکوژی بەکۆمەڵی ئەم گرووپانەیـە. ٣٩ کەس لە ئەندامانی یەکێک لەم گرووپانە بە ناوی دەروازەی بەهەشت لـە کالیفۆرنیادا دەستیان دا بە خۆکوژی بەکۆمەڵ. بەم بۆنەوە، هەرچـەنـد ئـەم گرووپانە وێکچوونێکی زۆریان لە گەڵ ئایینە رەسمییـەکـانی دونیـا هـەیـە، بەلام زۆرتر وەکوو لادانی کۆمەلایەتی سەیریان دەکرێ.

٣) ئەو گرووپانەی هاوڕێی جیهانن: ئەم گرووپانە زۆرتر رەسمین و دانیـان پێدا نراوە. هـەرچـەنـد ئـەم گرووپانـە بایـەخـی زۆر دەدەن بـە پاراسـتن و لایەنگری لە بنەما سەرەکییەکانی ئایینە رەسمییەکان، بەلام بۆ ژیانی ئـاینی ناوخۆ بایەخێکـی زۆرتـر دادەنـێن. گرووپـی پێنتـێ کۆستالـی نـوێ (neo-Pentecostals) لە بریتانیا یەکێک لەم گرووپانەیە. بـەبـڕوای پێـڕەوانی ئـەم گرووپە، گیانی پیرۆز(روح‌القدس) ئاخاوتنی پێ خەلات کردوون و بـە هـۆی ئەوانەوە قسە دەکات. لایەنگرانی ئەم چـەشـنـە ئایینانـە، هـەم بـۆ ژیـان لـە جیهانی مـادی و هـەم جیهـانی دوارۆژ و هـەمـیش بـۆ بنـەماکـانی ئایینـە

سەرەکییەکان بە پەرۆشن. ئەم گرووپانە هاوکات لە گەڵ ئەوەی کـە هێـز و وره و ژیانێکی نوێ دەدەنە بـاوەڕ و ئیمـانی ئایینـە مـەزنـەکـان، خوازیـاری سەقامگرتنی ئەم ئایینانەن.

## بزاڤی بەرهەڵستکارانە / protest movement

کۆمەڵناسان ئەم زاراوە بۆ کۆشەوەی خەڵکی ئاسایی بۆ گۆڕانی سیاسەتـە سەقامگرتووەکان بەکار دەبەن. دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ لە ئـەمریکـادا، بـە ناوی دەیەکانی بزاڤە بەرهەڵستکارەکان بەناوبانگن. ئەم بزاڤـانە سـەرەتـا بـە بزاڤی شارستانییەوە دەست پێکران و بە بزاڤی دژ بە شەڕی ویتنـام و بزاڤـی ژنان درێژەی پێ درا. بەگشتی دەتوانین بڵێین کـە هـەرچـەنـد لـە دەیـەی ١٩٨٠دا ئاستی پراکتیسی رامیاری کەم بوونەوەیەکی بەرچـاوی بـوو، بـەلام بزاڤە بەرهەڵستکارەکان وەکوو یەکێک لە شێوازە گرینگەکان دەربڕینی بـیرو بۆچوون، بە ژیانی خۆی درێژەی دا.

بزاڤی بەرهەڵستکارانە کارێکە بۆ کۆ کردنەوەی خەڵکی تا سـەبـارەت بـە بابەتێک کە ئاگادرییـان لێـی نییـە، یـان هێـزی بـەرەنگـاری لـەگـەڵ ئـەو چەمکەیان نییە و ناتوانن خۆیان رێک خەن و دەنگیان بە گوێی کەسـانیتـر بگەینن، رێکبخا. ئەم بزاڤانەش وەکوو هەموو گرووپـەکـانی گوشـار، رەنگـە کەسانێکی دەسچوو لە نێو حکوومەت یان پەرلەماندا بە مەبـەسـتی گـۆڕانی سیاسەتی رامیاران و یاسادانەران بـەرەو لای خۆیـان رابکێشـن. بـەلام ئـەم بزاڤانە بە پێچەوانەی گرووپەکانی گوشار، دەیانەوێ لە رێی تاکتیکی رەخنـە گرتن و نارەزایـەتی دەربـڕین و کـۆ کردنـەوەی خـەڵـک و خۆپیشـاندانەوە، سەرنجی گشتی خەڵک و دەزگاکانی راگەیاندن بەرەو لای خۆیان رابکێشـن و رامیاران و یاسادانەران رازی بکەن و دەسەلاتی خۆیان پێیان پیشان بدەن.

بزاڤی ئاگەدار کردنەوەی خەڵک سەبارەت بە ڤایرووسی ئەیدز، بە بزاڤێکی

بەرهەڵستانە دێتـە ژمـار. خـەبـات دژ بـەم ڤایرووسـە، لـە لایـەن گرووپـی پزیشـکانەوە دەسـت پێکـرا کـە چۆنییـەتی ئـەم ڤایرووسـەیـان ناسـیبوو و زانیبوویان کە چلۆن کەسانیتریش تووش دەکا. پاشان دەبوایـە کۆمـەڵـەی نێربازان ئاگادار کەنەوە و تێیان بگەینن کە پتـر لـە هـەرکـەسێکیتـر ئـەم کەسانە رەنگە تووشی ئایدز بن (*Shilts, R; 1987*). لە نیوەی هـەشـتاکاندا، کۆمەڵەی نێربازان کەوتنە رێ و بە یارمەتی کـەسـایەتییـە بـەناوبانگـەکـان توانییان کێشەی ئەیدز وەکوو کێشەیەکی گشتی بە هەمووان بناسێنن.

## بزاڤی پشتوێنی شین / grean belt movement

لە ساڵی ١٩٧٥دا وانگـاری ماتـایی (Wangari Maathai) بیۆلۆجیسـت و لایەنگری ژینگە و مرۆڤخواز و چالاکی کنیایی، بە دامەزراندنی بزاڤی خۆراک دان، چاودێری بە سەر زاوزێ و جەنگڵـکاری لـە یـەکێـک لـە ناوچـە کـاول کراوەکاندا، یەکێـک لـە گرینگتـرین و کاریگـەرتـرین بزاڤـەکـانی ژینگـەی جیهانی دارشت کـە بـە پشـتوێنی شـین نـاوی دەرکـرد. بـەڕای وانگـاری، نەخۆشی و لەناوچوونی ژینگە، کاریگەرییەکی زۆر خراپی بـە سـەر شـێوەی ژیان و شادمانی مرۆڤدا داناوە. لـە سالـی ١٩٧٥دا زۆرتـر لـە پـەنجـا هـەزار ئافرەتی بۆ چاندنی دە میلیۆن دار خستە رێ. لە گەڵ ئەو لایەنگرانەی کە لە دەوری ئالابوون، خۆپیشاندانێکی دژ بـە کـاول کـردن و فـەوتانـدنی ژینگـە خستە رێ.

## بزاڤی کۆمەڵایەتی / social movement

بزاڤی کۆمەڵایەتی بریتیە لە کۆشەوەیەکی بەردەوام و تەکـووز لـە لایـەن گرووپێکی کۆمەڵایەتییـەوە بـۆ گـەیشـتن بـە ئامـانج یـان ئامانجگـەلێکـی هاوبەش. ئەم کۆشـەوە بـە تایبـەتی بـۆ پاراسـتن، گـۆڕان یـان ئـاڵوگـۆڕ و

نەهێشتنی ناوەندێکی کۆمەلایەتییە. هەروەها ئەم زاراوە ئەو کەسانەش کە خەریکی ئەم کارەن دەگرێتەوە. ئەوەی بێژرا، تایبەتمەندییەکی نەگۆڕ نییە و رەنگە لە بزاڤێکەوە بۆ بزاڤێکیتر گۆڕانی بە سەردا بێ.

بلۆمێر کۆشەوەیەکی بەرچاوی بۆ روون کردنەوەی زاراوەی «بزاڤی کۆمەلایەتی» لە چوارچێوەی هەلسوکەوتی بەکۆمەلدا ئەنجام داوە: «کارێکی بەکۆمەل بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی نوێ لە ژیاندا. دەسپێکردنی ئەم بزاڤانە لە هەلومەرجێکی نائارامدایە. هاندەر و بەدیهێنەری ئەم بزاڤانە، ناڕەزایەتی لە سیستەمی باوی نێو کۆمەلگا و هەروەها مەیل بە گەیشتن بە دواڕۆژێکی باشتر و بێکێشەترە. بزاڤە کۆمەلایەتییەکان، هاوکات لە گەل گەشەسەندنیان، تایبەتمەندی کۆمەلگاکەشیان بەدەست دێنن. بەم چەشنە کە دەبنە خاوەنی بیچم و رێکخراوێک لە داب‌و نەریتەکان، رێبەرایەتی و دابەش کردنی بەردەوامی کار، یاسا و پێوەر و بەها کۆمەلایەتییەکان و بە گشتی کولتوور و دامەزراوە و گەلالەیەکی نوێ لە ژیان، دادەڕێژن». بلۆمێر بەم چەشنە بزاڤە کۆمەلایەتییەکان دابەش دەکات: ١) بزاڤی کۆمەلایەتی گشتی، وەکوو بزاڤی کرێکاری؛ ٢) بزاڤی کۆمەلایەتی تایبەت، وەکوو بزاڤی دژ بە کۆیلەداری؛ ٣) بزاڤی کۆمەلایەتی نمایشی، وەکوو بزاڤی ئایینی و مۆد. هەروەها دەلێ: «بزاڤی کۆمەلایەتی یان پیشاندەری کۆشەوەیەکی بەکۆمەلە بۆ گۆڕانی بەشێک لە پێوەندییە کۆمەلایەتییە هەنووکەییەکان، یاخۆ گۆڕانێکی گەورە و رێنوێنی نەکراوە لە پێوەندییە کۆمەلایەتییەکان کە بە ناچار ژمارەیەکی زۆر لە بەشداران دەگرێتە نێو بازنەی خۆی» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

هەروەک بێژرا، یەکێک لە گرینگترین دۆزەکانی بزاڤە کۆمەلایەتیەکان، گۆڕانی کۆمەلایەتییە. ئەم بزاڤانە بە شێوەی جۆراوجۆر ئەم کارانە ئەنجام دەدەن. دەتوانن یاسادانەران ناچار بکەن کە یاسایەک بچەسپێنن کە لە

گەڵ دۆزەکانی ئەواندا هاوڕێ بێ. دەتوانن بە سەر دەنگی خەڵکدا لە کاتی دەنگداندا کاریگەرییان بێ. هەروەها دەتوانن بە بەرپا کردنی خۆپیشاندانی رەخنەگرانە، هێز و توانی خۆیان بە رامیاران و کاربەدەستانی حکوومەت پیشان بدەن. خۆپیشاندانی جەماوەری خەڵکی، لە گەڵ ناوەندە لیبرالەکانی دیمۆکراسی، کە زۆربەی گۆڕانە سیاسییەکان لە لایەن ئەوانەوە ئەنجام دەگرێ، ناتەبان و بە پێچەوانەی رەوت و ڕێبازی ئەوانە. ماکس ڤیبێر یەکەم کۆمەڵناسێک بوو کە لە نێوان کردە بۆرۆکراتیکە ئاساییەکان (کە کار و باری ئاسایی رامیاری بەڕێوەبەرایەتی دەکەن) و تایبەتمەندییە سەقامنەگرتووەتاوتاوییەکانی بزاڤی کۆمەلایەتی (کە کێشە بۆ دەسەلات ساز دەکەن) جیاوازی دانا. بەڕای ڤیبێر بزاڤە کۆمەلایەتییەکان دەتوانن سەقامی بۆرۆکراسی لەناو ببەن و بزوێنەری شێوازی گۆڕانی خێرای کۆمەلایەتی بن (وبر؛ ١٣٨٢).

بەڕای هەندێ لە کۆمەڵناسان لە خولی مۆدێرندا چوار جۆر بزاڤی کۆمەلایەتی لێک جیا دەکرێنەوە (*Blumer, H; 1969*):

١) بزاڤی لاوەکی (alternative movement): ئەم بزاڤانە هان دەدەن تا گۆڕانێکی سنووردار لە هەندێ لە تاکەکاندا بێننە دی (وەکوو بزاڤی لەش جوانی لە ئەمریکادا). ئەم جۆرە بزاڤانە هیچ مەترسییەکیان بۆ نەزمی کۆمەلایەتی نییە.

٢) بزاڤی رزگاریخوازی (redemptive movement): ئەم بزاڤانە هان دەدەن تا گۆڕانێکی بنەمایی لە ژیانی تاکەکاندا بەدی بێنن (وەکوو کۆشەوەی ئایینەکان بۆ گۆڕانی دینی خەڵکی).

٣) بزاڤی چاکسازی (reformative movement): ئەم بزاڤانە بە چاکسازی لە بەشێکی کۆمەڵگادا، دەیانەوێ سەرجەمی کۆمەڵگا بگۆڕن (وەکوو بزاڤی مافی شارستانی لە ١٩٦٠ی ئەمریکادا کە خوازیاری گۆڕانی

بنەمایی بۆ گەیشتن بە هەلی یەکسان بۆ خوێندن، کارو داهات بوون).

٤) بزافی شۆڕشگێڕانە (revolutionary movement): هان دەدا تا سەرجەمی کۆمەڵگا بگۆڕێ (وەکوو شۆڕشی ١٩١٧ رووسیا) (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## بزاوتی ئەستوونی / upward mobolity

بزاوتی ئەستوونی، بزاوتێکە بەرەو شوێنگەیەکی باشتر (موحسنی؛ ٢٠٠٦). واتە، گۆڕانی پێگەی تاک کاتێک کە لە چینێکی کۆمەلایەتییەوە بۆ چینێکیتر دەڕوا. هەرچەند مەرج نییە هەموو بزاوتێکی ئەستوونی بەرەو شوێنگەیان پێگەیەکی باشتر بێ، هەندێ جار ئەم بزاوتە بزاوتی دابەزینە. بۆ وێنەیەک لە بزاوتی ئەستوونی هەلکشان ئەوەیە کە خوێنکارێکی هەژار بە کۆششی زۆر ببێتە فیزیازانێکی بەناوبانگ. یان بەپێچەوانەی ئەوە بزاوتی ئەستوونی بەرەو خوار وەکوو ئەوەیە کە کرێکارێکی مووچەبگیر لە کار دەربکرێ و بڕواتە ریزی بێکاران (کوئن؛ ١٣٨٧).

## بزاوتی کۆمەلایەتی/ social mobility

بزاوتی کۆمەلایەتی بریتییە لە گواستنەوەی گرووپ یان تاکێک لە پێگەیەکی کۆمەلایەتیوە بۆ پێگەیەکیتر. رەنگە ئەم بزاوتە، هەلکشان یان دابەزین بێ؛ واتە، تاک بە هۆی چالاکی و کۆشش یان بەخت و شانسەوە بەرەو پێگەیەکی سەرتر هەلکشێ، یان بەهۆی تێنەکۆشان یان بەخت نەهێنانەوە، لە پلەو پێگەیەکی کۆمەلایەتی کە هەیەتی دابەزێ.

بیرو ڕای زۆر لە سەر بزاوتی کۆمەلایەتی هەیە کە زۆر لێکتر نزیکن. بۆ وێنەسوروکین، وەکوو پێشڕەو لە تەوەری بزاوتی کۆمەلایەتیدا بەم چەشنە پێناسەی ئەم زاراوەیە دەکا: «جێگۆڕکێی تاک لە نێو بازنەی کۆمەڵگادا»

(نیک‌گهر؛ ١٣٦٩). گیدنز بەم جۆرە باسی بزاوتی کۆمەڵایەتی دەکا: «لە توێژینەوە لە سەر پۆلێنی کۆمەڵایەتیدا، ئێمە ناچارین نە تەنیا سەرنج بدەینە جیاوازی نێوان شوێنگە ئابووری یان کاریەکان، بەڵکوو دەبێ سەرنج بدەینە بارودۆخی ئەو تاکانەی ئەم پلە و پێگەیانە داگرتووە. بزاوتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە هەڵکشان یان دابەزینی تاک لە نێوان شوێنگەکۆمەڵایەتی-ئابوورییەجیاوازەکاندا» (گیدنز؛ ١٣٨٦).

کۆمەڵگاکان لە ئاست بزاوتی کۆمەڵایەتیدا یان بەسراون یاخۆ کراوەن. گەر تاکێک بتوانێ بە هەوڵ و کۆشش پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی بگۆڕێ و هیچ کۆسپێکی پێکهاتەیی لە سەر ڕێی هەڵکشانیدا نەبێ، ئەوە کۆمەڵگایەکی کراوەیە؛ کەچی لە هەندێ کۆمەڵگادا هەڵکشان زۆر ئاستەمە؛ لەو کۆمەڵگایانەدا کە سیستەمێکی بەستراویان هەیە، تاک لە هەمان پێگەیەکدا کە دێتە دونیاوە ناچار دەبێ هەر لەو پێگەشدا بمرێ. لەو چەشنە کۆمەڵگایانەدا تاک هیچ ڕێگایەکی بۆ بزاوتی هەڵکشان نییە؛ وەکوو سیستەمی کاست لە هیندوستاندا. لەم سیستەمە کە بە گوێرەی ئاینی هیندوو داڕێژراوە و بڕوایان بە دۆنادۆنە (تناسخ)، تاک لە سەر ویستی خودایان لە هەر پێگە و چینێکی کۆمەڵایەتیدا کە دێتە دونیاوە، تا مردن دەبێ هەر لەو پێگەیەدا بژێ و هەلی هەڵکشانی بۆ نییە، مەگین پاش مردن کە بۆ جارێکی‌تر دۆن بە دۆن کرا. لەم کاتەدا گەر لە دونیادا بە چاکی ژیابێ، ئەوا ڕۆحی لە جەستەی تاکێک کە لە کاستێکی سەرتردایە دێتە دونیاوە و گەر واش نەبێ لە کاست یان چینێکی خوارتردا دێتە دونیاوە.

## بزاوتی کۆمەڵایەتی پێکهاتەیی / structural social mobility

زۆربەی بزاوتە کۆمەڵایەتییەکان کە لە وڵاتە پیشەسازییە مۆدێڕنەکاندا ئەنجام دەگرێ، بزاوتی کۆمەڵایەتی پێکهاتەیین. کاتێ پێکهاتەی کۆمەڵگا بە

بۆنەی رووداوی وەکوو داهێنان، گەشەی شارەکان، شەڕ، گەشە یان قەیرانی ئابووری، بەدیهاتنی کاری نوێ یان لەناوچوونی کارە کۆنەکان تووشی گۆڕانکاری دێ، چین و پێگەکانی کۆمەڵگا سەرو ژێر دەبن و کۆمەڵگا تووشی بزاوتی کۆمەڵایەتی پێکهاتەیی دێ. ئاکامی ئەم ئاڵوگۆڕانە ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی بەبێ هەوڵ و کۆششی خۆیان، یان بەرەو سەر هەڵدەکشن، یاخۆ بەرەو چینی خوارتر دادەبەزن.

### بزاوتی نێوان وەچەکان / intergenerational mobility

جۆرێک بزاوتی کۆمەڵایەتییە لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی‌تر. بۆ وێنە: کاتێ کچی شۆفێری تاکسیەک خوێندنی بالا دوایی دێنێ و دەبێتە پزیشکێکی سەرکەوتوو، لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی‌تر رۆیشتووە و بزاوتی نێوان وەچەکانی ئەنجام داوە. هەرچەند ئەم بزاوتە دەتوانێ دابەزینیش بێ، وەکوو ئەوەی کە منداڵی پزیشکێک بووبێتە شۆفێری تاکسی. ئەمەش هەر بزواتی نێوان وەچەکانە (کوئن؛ ١٣٨٧).

### بزاوتی نێو وەچەیی / intragenerational mobility

بریتیە لەو ئاڵوگۆڕەی کە لە پێگەی کۆمەڵایەتی تاک یان گرووپێکی یەک وەچەدا ئەنجام دەگرێ. بۆ وێنە بنەماڵەیەکی مامناوەنجی کە پێنج منداڵیان هەیە لە بەرچاو بگرن. چوار کەس لەو منداڵانە پاش دوایی هێنانی بەشی پاش ناوەندی دەڕۆنە نێو بازاڕی کار و خەریکی کارێکی ناونجی بەرەو خوار دەبن. بەڵام منداڵی پێنجم لە هەمان کاتدا کە خەریکی کارێکی کاتی دەبێ، دەڕواتە نێو زانکۆ و درێژە بە خوێندنی بالا دەدا. ئەم کەسە پاش دوایی هێنان بە خوێندن، لە باری کارییەوە سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست دێنێ و لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزتردا جێی خۆی دەکاتەوە، کەچی

براکانی لە هەمان پێگەی کۆمەڵایەتی پێشوویاندا دەمێننـەوە. ئـەم کـەسـە توانیویە دەست بدا لە بزاوتێکی نێو وەچەیی (کوئن؛ ١٣٨٧).

## بناغەی کولتووری/ cultural base

بەگوێرەی پێناسەیەک کە لێزلی وایت لـەم زاراوەیـە دەکـات، بناغـەی کولتووری بریتیە لەو داهێنانانەی کە لە نێو کۆمەڵگادان. بە بڕوای ئـەو هـەر داهێنانێکی نوێ بەرهەمی داهێنانەکانی پێش خۆیە. بـۆ وێنـە، چـێکـردنی یەکەمین فڕۆکە، بەرهەمی داهێنـانی پێشـتر وەکـوو گـاز، مـاتۆر، سـوکانی فڕۆکە، فڕۆکەی بێماتۆر و چەرخ بووە. هەر بەم چەشـنە زۆربـەی داهێنانـە بازرگانییەکانیش بەرهـەمـی داهێنانـەکـانی بـواری تیکنۆلۆجیـا، پزیشـکی، ئەندازیاری، وزە و هتدن. بـە بـڕوای وایـت، ژمـارەی داهێنانـەکـان لـە نێـو بناغەیەکی کولتووریدا بە شێوەی تـەسـاعودی پـەرە دەسـتێنن. هـەروەهـا بەبڕوای ئەو، بۆ بەدیهاتنی هەر داهێنانێکی نوێ، دەبـێ بناغـەی کولتـووری ئەو کۆمەڵگا بە رادەیەکی شیاو و پێویست پەرەی سەندبێ تا بتوانـێ ئیـزنی بەدیهاتن بداتە داهێنانێکی نوێتر. بۆ وێنە، گـەر برایـانی وایـت لـە سـەدەی چواردەهەمدا ژیابان، قەد نەیاندەتوانی فڕۆکـە چـێ بکـەن، چونکـە بناغـەی کولتووری بۆ بیری نوێ، مادە سەرەکییەکان و ئەو داهێنانانەی کـە بـۆ چـێ کردنی فڕۆکە پێویستن، بەدی نەهاتبوون (وایت؛ ١٩٤٩).

## بنەماگەری / fundamentalism

جیابوونەوەی ئاینن لە سیاسەت بۆتە هۆی پێکهێنـانی بـوارێکی نـوێ بـۆ گەشەو پەرەسەندنی رامیاری ئایینی. بە تایبەت سەرهەڵـدانی بنـەماگـەری ئایینی، کاردانەوەیەکە لە بەرانبەر هەڕەشـەکـانی دونیـای نـوێ و پرۆسـەی تێکدانی سیستەمی پێشووی جیهان. بەم چەشنە بە نائایینی بـوونی ژیـانی

کۆمەلایەتی و رامیاری (سێکۆلاریزم) لەم سەردەمە نوێیەدا، رەنگە ئایین و کەسایەتییە ئاینییەکان زۆرتر لە سیاسەتدا بەشداری بکەن (بشیریە؛ ١٣٨٠).

بنەماگەری بریتیە لە بزاڤێکی ئایینی کە جەخت لە سەر پێڕەوی لە رواڵەتی کتێبە پیرۆزەکان دەکات. ئەم زاراوە هەندێ جار بەو کەسانەش دەبێژرێ کە ناوەرۆکی کتێبەپیرۆزەکان بە هەمان چەشنی رواڵەتی، بە دروست دەزانن و پێڕەوی لێ دەکەن. سەرەتا ئەم زاراوە بۆ بزاڤە پرۆتستانەکان بەکار دەبرا کە لە دەیەی ١٩٢٠دا دژ بە مۆدێڕنیسم دەستیان دا بوو بە نارەزایەتیەکی بەربلاو. هۆی نارەزایەتییان ئەوە بوو کە مۆدێڕنیسم نەریت و باوەڕەکانی خستۆتە لاوە و تەنیا ئاوڕ لە زانست دەداتەوە. لەم رووەوە خوازیاری گەڕانەوە بو بنەمای ئایینی خۆ و پێڕەوی رواڵەتی لە یاسا و داب و نەریتەکان بوون. هەندێ ئەم زاراوەیانە هاو واتا لە گەڵ کۆنپەرستی و لایەنگری لە مەسیح بەکار هێناوە. بەلام دەبێ ئاگەدار بین کە واتای بنەماگەری لە گەڵ هیچ یەک لەم زاراوانە هاو واتا نییە. بنەماخواز بریتیە لە کەس، گرووپ یان دەستەیەک کە بە بێ هیچ شرۆڤە و لێکدانەوەیەک خوازیاری پێڕەوی لە کتێبی پیرۆزن. لەم سۆنگەوە بنەماگەری بەم چەشنەی خواریش پێناسە دەکرێ: بیردۆزێکی ئایینی کۆنخواز کە لە گەڵ روانگە رووناکبیرانە نوێکان و پێوەندییەدونیاییەکان ناتەبایە و لایەنگری لە بەها سوننەتیەکان و رۆحی ئەو دونیا (بە هەمان چەشن کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە) دەکا. بنەماخوازەکان رایان وایە کە ئەو بەهایانەی کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوون، تەنیا راستەقینەیەکن کە هەن و کات و شوێن هیچ کاریگەرییەک لە سەر راست و دروست بوونیان دانانێ. بە واتایەکی تر، رای بنەماخوازەکان ئەوەیە کە ئەو بەها نووسراوانە بۆ هەموو کەس بە هەر دین و ئاینێکەوە و لە هەر شوێنێکدا گونجاو و لەبارن. زۆرجار ئەو گرووپانەی کە

مۆرکی بنەماگەرییان لە سەر دانراوە، بە گرووپگەلێکی کۆنپەرست دەزانن کە بە چەشنێکی هەتاهەتایی لە رابردوودا دەژین (*Caplan, L; 1987*).

خەلکی ولاتانی رۆژاوا زۆرتر ئەم چەشنە پێناسە ساویلکانەیە بۆ ئەو شەڕو ئاژاوانەی بەکار دەبەن کە لە ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دادەگرسێن. بەلام ئەم پێناسە سادەبینانە ناتونێ بەوردی بزاڤو سەرهەلدانی جۆراوجۆری رۆژهەلاتی ناوەڕاست شی بکاتەوە. بە واتایەکی‌تر، واتای بنەماگەری زۆر ئالۆزتر لەو پێناسەیە کە خەلکی رۆژاوا بە پێڕەوی لە دەزگاگەلی راگەیاندنەوە دووپاتەی دەکەن و دەیلێنەوە. بەر لە هەر شتێک دەبێ ئەم خالە لە بەرچاو بگرین کە ناتوانین ئەم زاراوەیە بە گوێرەی کات، نەتەوە، چینی کۆمەلایەتی یان ئایدیۆلۆژی سیاسی پێناسە بکەین؛ چونکە بنەماگەری رادەیەکی بەرفراوان لە خەلکی گرتۆتە خۆ. هەروەها گرووپە بنەماخوزاەکان، هەموو کات لە گەل دەسەلاتدارنی رامیاری و ئابووریدا خەریکی دژایەتی و ناکۆکی نین. ئەمانە دەتوانن گرووپگەلێک بن کە بە هێزەوە لایەنگری لە رژیمە سیاسیەکان دەکەن. رەنگە یەکێک لە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی بنەماخوازەکان ئەوە بێ کە بڕوایان وایە کە پێوەندی لە گەل خودا یان هێزە سەروو سروشتییەکانی‌تر، دەتوانێ پەرسفدەری کێشە و پرسە تاکەکەسیەکانیان بێ. هەروەها، بنەماخوازان خوازیاری ئەوەن کە کولتووری نوێ بگێڕنەوە بۆ بناغە ئایینیەکانی (*Lechner, F. J; 1989:51*).

کاپلەن و هانتێر (*Hunter, J. D; 1983; 1985*) لە نێوان بنەماگەری و شێوازەکانی‌تری ئاییندا جیاوازی دادەنێن. بەڕای ئەوان بۆچوونەکانی بنەماگەری ئایینی بریتین لە:

١) باوەڕ بە بێخەوش بوونی کتێبە ئایینیەکان بە هەمان چەشنی سەرەتایی: ئەم تایبەتمەندییە بەو واتایە نییە کە تەنیا یەک شرۆڤە لە کتێبە

پیرۆزەکان هەیە. بەڵکوو هەر گرووپێک بۆ خۆی بە گوێرەی بیرو بۆچوونێک کە لە مەڕ کۆمەڵگا و ئایین هەیەتی، شرۆڤەیەکی تایبەتی لە کتێبە پیرۆزەکان هەیە. بوونی گرووپە بنەماگەرە ئیسلامی و مەسیحییەکان نموونەیەکی باشن بۆ ئەم وتەیە.

٢) حاشا لە پلۆرالیسمی ئایینی: بنەماخوازەکان پێیان وایە کە رێژەیی بوونی تاکەکان دەبێتە هۆی کزبوونی باوەڕی تاکەکەسیان. بەم بۆنەوە، ئەم کەسانە باوەڕی تاکەکانی نێو کۆمەڵگای مۆدێرن بە ناڕەوا و نەشیاو دەزانن.

٣) باوەڕ بە ئەزموونی تاکەکەسی خۆیان سەبارەت بە بوونی خودا: بنەماخوازەکان بەردەوام پەیدۆزی بووژاندنەوەی رۆحن. بەڕای ئەوان هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ پیرۆزن.

٤) دژایەتی لە گەڵ دونیاپەرستی و نوێخوازی: بەڕای بنەماخوازەکان، هاودەنگی لە گەڵ گۆڕانکارییەکانی جیهان دەبێتە هۆی تێکچوون و توانەوەی باوەڕە ئاینییەکان. واتە، بەپێی ئەم باوەڕە، مرۆڤخوازی دونیایی یان نائایینی دەبێتە هۆر کوفر و گەندەڵی.

٥) برەو دان بە باوەڕە پاراستنخوازەکان، وەکوو باوکسالاری: بە گوێرەی بۆچوونی بنەماخوازەکان، خودا مرۆڤی لە شێوازی بوونەوەرێکدا ئافراند کە رەگەزێک بێجگە لە رەگەزی خۆی دەوێ و لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا پیاوانی بە سەر ژناندا زاڵ کرد. بەم بۆنەوە لە گەڵ بزاڤی یەکسانی ژن و پیاو یان هاوڕەگەزخوازییەکان دژایەتی دەکەن و پێیان وایە کە ئەم بزاڤانە دەبنە هۆی تێکدانی ئاکار.

٦) ئامادە بوون لە نێو خەڵکدا بە مەبەستی دوایی هێنان بە نایەکسانیەکان، یان فام کردنی قەیرانە کۆمەڵایەتییەکان: بنەماخوازەکان بۆ لەناو بردنی خەم و کەسەری خەڵکی پێشنیارەکانی خۆیان دەڵێن و بەم چەشنە ئەندامانی نوێ بە ئەندامێتی وەردەگرن. ئەم تایبەتمەندییە بۆتە

هۆی ئەوەی کە خەڵکی ئەم کەسانە بە دواکەوتوو و خۆپەسەند بزانن. بەڵام هەر ئەم تایبەتمەندیەش یارمەتیمان دەدات تا تێبگەین بۆچی لایەنگرانیان، بەجێی دەسەڵاتە رووناکبیرانەو نوێ و ئەم جیهانییەکان، ئەو رێبازانەیان هەڵبژاردووە (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## بۆچوونی کۆمەڵناسانە / sociological imagination

واتای فێربوونی بیرکردنەوەی کۆمەڵناسانە، بەرانبەرە لە گەڵ راهێنانی هێزی خەیاڵ و رامان. توێژینەوەی کۆمەڵناسانە ناتوانێ تەنیا پرۆسەیەکی ئاسایی بێ بۆ بە دەست هێنانی زانیاری. کۆمەڵناس کەسێکە کە بتوانێ نەکەوێتە ژێر کاریگەری راستەوخۆی بارودۆخە کەسییەکانی خۆی. کاری کۆمەڵناسانە بەستراوە بەو شتەی کە رایتمیلز ناوی *بۆچوونی کۆمەڵناسانەی* لە سەر دانا (*Mills. C. W. 1959*).

بۆچوونی کۆمەڵناسانە پێویستی هەیە بەوەی کە بتوانین بیر و خەیاڵمان لە رەوتی ئاسایی ژیان دوور کەینەوە تا بتوانن سەرلەنوێ سەیری رووداوە ئاساییەکانی ژیان کەینەوە. کۆمەڵناسی یارمەتیمان دەدات تا بتوانین باشتر لە ئەزموون و کێشە و روانگەکانمان بگەین. خەڵکی لە وتو وێژی رۆژانە و ئاساییاندا هان دەدەن لە نێوان کێشە کەسییەکانی خۆیان و تەوەرە گشتییەکاندا جیاوازی دابنێن. ئێمە وای بۆ دەچین کە کێشە و پرسە تاکەکەسییەکان رەنگدانەوەی ئەزموونگەلی راستەوخۆ و پێوەندیگەلی تاکەکەسین و چارەسەر کردنیان لە ئەستۆی خودی تاکە. بە پێچەوانەی ئەوە، تەوەرە گشتیەکان سەرتر لە ئەزموونە تاکەکەسییەکانن، بۆیە رەنگە لێڵ و ئینتزاعی دیار بن. هەرچەند بەها گشتییەکان زۆرجار دەکەونە مەترسییەوە، بەلام لە راستیدا ئێمە زۆرجار نازانین مەبەست لەم بەها گشتییانە چین و بۆچی تووشی مەترسی هاتوون، بەلام پێمان خۆشە تەوەرە

گشتییەکان لە کێشە تاکەکەسییەکانی خۆمان جیا کەینەوە. لە روانگەی کۆمەڵناسیەوە ئەم دوو چەمکە لێکتر جیاواز نین و تێکەڵاوی یەکترن. بە بڕوای رایتمیلز بە بێ تێگەیشتن لەم دوو تەوەرە، نە ژیانی تاک و نە مێژووی کۆمەڵگا هیچ یەکیان بە تەواوی ناناسرێن (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

بۆ وێنە دەتوانین رووداوێکی زۆر ئاسایی وەکوو خورادنەوەی قاوە لە بەرچاو بگرین. لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە دەتوانین ئاوەها هەڵسوکەوتێک لە چەن رەهەندەوە بخەینە بەر باس و لێداون. سەرەتا دەتوانین بڵێین کە قاوە تەنیا جۆرێک خورادنەوە نییە کە بۆ پاراستنی رادەی ئاوی نێو لەشمان پێویستە. بەڵکوو وەکوو بەشێک لە رێورەسمی کۆمەلایەتییە کە بایەخی سیمبۆلیکی هەیە. ئەو رێورەسمەی کە قاوەی تێدا دەخورێتەوە، گرینگتر لە خودی خواردنەوەکەیە. بۆ وێنە دوو کەس کە بڕیاری قاوە خواردنەوە پێکەوە دادەنێن، مەبەستی سەرەکییان قسە و لێدوانە تا خواردنەوەی قاوە. خواردن و خورادنەوە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەلێکن بۆ کارلێکی کۆمەلایەتی؛ ئەم هەلانەش بابەتێکی گرینگ بۆ توێژینەوەی کۆمەڵناسانە دەدەنە دەست.

قاوە ماددەیەکی سڕکەرە، کافئینی تێدایە کە بە سەر مێشکدا کاریگەری هەیە. ئەوانە خوویان بە خواردنەوەی قاوە هەیە، لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا وەکوو ئەوانەی گیرۆدەی ماددە سڕکەرەکانن سەیر ناکرێن. هۆی ئەم بابەتەش خۆی دەتوانێ پرسیارێکی کۆمەڵناسانەی سەرنجڕاکێش بێ. سێیەم، کەسێک کە خەریکە قوم-قوم قاوە دەخواتەوە، هاتۆتە نێو بازنەی کۆمەڵە پێوەندیەکی کۆمەلایەتی و ئابووری زۆر ئاڵۆزەوە کە لە سەرلەبەری دونیادا تەشەنەی کردووە. بەرهەمهێنان، راگواستن و دابەش کردنی قاوە پێویستی بە پێوەندییەکی بەردەوام لە نێوان کەسانێکە کە هەزاران میل دوورتر لەو کەسانەن کە قاوە دەخۆنەوە. توێژینەوەلە سەر ئەم بازرگانییە

جیهانییه، یەکێک لە ئەرکە گرینگەکانی کۆمەڵناسییە، چونکە ئەمڕۆکە زۆربەی ڕەهەندەکانی ژیانمان وا لەژێر کاریگەری پێوەندی و توجارەتی جیهانیدا(گیدنز؛ ١٣٨٥).

بە گشتی پێوەندی نێوان پرسەکان و تەوەرەکان، لە کەڵکەڵە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسین. تێگەیشتن لە ئاوەها پێوەندییەک، بەستراوە بە چۆنییەتی بۆچوونی کۆمەڵناسانەوە. بۆچوونە کۆمەڵناسانەکان کەرەسە و ئامرازێکی گرینگن بۆ پێوەندی دانی ژیانی تاکەکەسی تاکەکان بە هێزە مێژوویی-کۆمەڵایەتییەکانەوە. لە دونیای ئەمڕۆدا، تەیار بوون بە بۆچوونی کۆمەڵناسانەوە، یارمەتیمان دەدات تا چاکتر لە پێوەندی و بەندیواری وڵاتان، نەتەوەکان و ڕەگەزە جۆراوجۆرەکانی دونیا بگەین.

## بورژوازی / bourgeoisy

بورژوازی لە سەرەتادا بە چینە ناونجییە فەرانسییەکان دەبێژرا؛ لەم چەرخەدا بۆ ئەم زاراوەیە دوو ڕەهەند دەستنیشان کراوە: یەکەم، ئاماژە دەکات بە تاکە سوننەتخواز و بەرچاو تەنگەکان؛ واتە زۆتر ژیانی ئاسایی و ڕواڵەتی بریکار و قەشە و بازرگان و کارمەندانی دەوڵەت دەگرێتەوە. ئەم زاراوە، جۆرێک سووکایەتی تێدا بوو و باسی لە لووتبەرزی چینی سەرمایەدار دەکرد. ڕەهەندی دووەم لە بیردۆزی مارکسیەوە سەرچاوە دەگرێ و بریتیە لە سەرمایەداران و خاوەنانی کەرەسەگەلی بەرهەمهێنان. لە سەرەتای سالانی شۆڕشی پیشەسازیدا (لە دەیەی ١٧٥٠ بەم لاوە) سەرمایەدارەکان پێکهێنەرانی چینی ناونجی بوون؛ واتە چینێک لە نێوان کرێکارن و وەرزێران لە لایەکەوە و زەویداران و دەرەبەگەکان لە لایەکی ترەوە. لە کۆتایی بەرگی سێی کتێبی *سەرمایە*دا، مارکس باس لە بوونی سێ چینی گەورە دەکات: کرێکاران، سەرمایەداران و خاوەن

زەوینەکان (مارکس؛ ١٣٨٣).

خاوەن زەوینەکان وەکوو چینی سەرەکی لە دەورێکدا کە خەریک بوو دەبووە پیشەسازی، گرینگترین چین بوو. بارینگتۆن مۆر دەڵێ گۆڕانی داهاتووی دیمۆکراسی بەوەوە بەستراوە کە بەپیشەسازی بوون لە سەرەوە (واتە لە چینە خاوەن زەویەکانەوە) سەرچاوە دەگرێ (وەکوو ئەو پرۆسەی لە ئاڵمانیا و ژاپۆندا بەڕێوە چوو) یاخۆ لە خوارەوە، لە شۆڕشی بورژواییەوە (بەو جۆرەی کە لە فەرانسەدا هاتە ئاراوە) (مۆر؛ ١٣٧٦). پاش بوون بە پیشەسازی، بایەخی زەویدارەکان هاتە خوارەوە و بەو جۆرەی کە پۆلانزاس (١٩٧٦) (مارکسیستی مۆدێرنی فەرانسی) دەڵێ زۆرتر لە هەر شتێ وەکوو بەشێک لە بورژوازی دەزاندران. بەشێکی تری بوژوازی مۆدێرن کە زۆر گرینگ بوو، سەرمایەدارە ماڵییەکان بوون. ئەم گرووپانە لە بارودۆخی جۆراوجۆردا دەتوانن قازانجەکانیان یەکسان یاخۆ لێک جیاواز بێ. لە بریتانیادا بە درێژایی ساڵانێکی زۆر، سەرمایەدارانی پیشەسازی بەشی زاڵی بوژوازی بوون و لە چاو زەویدارەکاندا توانییان لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەرکەوتنی زۆر بەدەست بێنن، بەڵام ئێستا ئەم سەرکەوتنە تایبەتی سەرمایەدارانی ماڵییە. دەیڤید هارڤی (١٩٨٩) تاوتوێی ئەو شتەی کە ئێمە پاش‌پیشەسازی پێ دەڵێین، دەکات و هۆی ئەم گۆڕانە بە گەشەی هێز و دەسەڵاتی سەرمایەدارانی ماڵی دەزانێ کە بەهرەلە تیکنۆلۆجیای زانیاری نوێ وەردەگرن تا بتوانن سەرمایەیان‌لە شوێنێکدا دابنێن کە لە کەمترین کاتدا زۆرترین قازانجیان دەست کەوێ. مارکس هەندێ ناتەبایی لە نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی بورژوازیدا دیبەوە و رایگەیاند کە ئەم قازانجە دژ بە یەکانە، لە لایەن دەوڵەتەوە وەکوو «لیژنەی ناوەندی» بورژوازی کۆنترۆڵ دەکرێن.

بێ‌گومان، مارکس لە زۆر شوێندا وای هەست کردووە کە دوو چینی

سەرەكی سەرمایەداری، بورژوازی و پرۆلێتاریا، سەرمایەداران و كرێكاران، لە پشت ئەو سەنگەرانەوە كە مەودایەكی زۆریان لە نێواندا نەماوە، خەریكی بەربەرەكانێ لە گەڵ یەك دەبن؛ واتە هەموو چینەكانی‌تر لەم دوو سەنگەرەدا كۆوە دەبن. هەروەها پێی وابوو كە بورژوازی تەمەنێكی زۆر كورتی هەیە و ئەركی ئەوەیە كە ببێتە هۆی گەشەسەندنی چینی كرێكار و لەوە بەدوا ئەركێكی نەماوە و دەبێ نەمێنێ. لەم بابەتەدا بەتەواوی بە هەڵەدا رۆیشتووە و ئاوڕی لە گرووپە ناونجییەكان كە بەردەوام لە هەڵكشاندان، نەداوەتەوە. یەكێك لە گرووپە سەرەكییە ناونجییەكان چینی وردە بوژوان (كرایب؛ ١٣٨٨).

چینی وردەبورژوا زۆر لەوەی دەكا كە ئەمڕۆ پێی دەڵێن چینی ناونجی و بریتیە لەو وردە كاسبكارانەی كە ڕەنگە بەبێ كرێكار كار بكەن، یاخۆ پتر لە چەن كرێكاریان نەبێ؛ هەروەها ئەو پسپۆڕانەی كە پێوەندییەكی ڕاستەوخۆیان لە گەڵ ئامرازەكانی بەرهەمهێنان نییە؛ وەكوو بریكارەكان، دووكاندارانی بچووك و ... . دەیڤی مەكلێلان (١٩٧١) دەڵێ كە ماركس لە بەرگی دووەمی *بیردۆزی بەها زیادییەكان* (١٨٦٢/١٩٦٩)دا ریكاردۆی بە بۆنەی نەناسینی چینی ناونجیەوە -كە خەریكی گەشەسەندنە- خستۆتە بەر ڕەخنە و پلار. بەڵام بێ‌گومان ئەمە تەنیا ئاماژەیەكە و بۆ روون كردنەوە و شرۆڤەی زۆرتر خراوەتە ئەستۆی ماركسیستەكانی داهاتوو (كرایب؛ ١٣٨٨).

## بۆرۆكراسی / bureacracy

سیستەمی بۆرۆكراسی لە تایبەتمەندییەكانی كۆمەڵگاكانی سەدەی بیستەمە، هەرچەند ئەم پێكهاتانە لە سەدان ساڵ لەمە پێشەوە هەبوون. ماكس ڤێبێر، بۆرۆكراسی بە ئامراز و كەرەسەیەكی لێهاتوو دەزانی بۆ گەیشتن بە دۆز و ئارمانجەكانی رێكخراو. بەڕای ڤیبێر ، رێكخراو دەتوانێ بە

هۆی بۆرۆكراسیەوە كارمەندەكانی هان بدا كە زۆرترین كاری بۆ بكەن و لە ئاوێتەبوونی ژیان و پێوەندییە كەسیەكانی كارمەندان لە گەڵ چالاكییەئیداریەكانیان بەرگری دەكات. هەروەها دەسنیشانی كردووە كە بۆرۆكراسی زۆرتر لە ڕەوت و شێوازە ڕێكخراوەییەكانیتر بەرگری لە فەوتانی كات و پارە دەكات (كوئن؛ ١٣٨٧).

بۆرۆكراسی لە واتای گشتی خۆیدا –بەڕای ڤیبێر- تایبەت بە كۆمەڵگاكانی ڕۆژاوا نییە. پادشاكانی میسر، ئیمپراتۆری چین، كلیسای كاتۆلیكی ڕۆم و دەوڵەتەئەورووپییەكان، هەموویان وەكوو بنكە بەرفراوانەكانی سەرمایەداری ئێستا خاوەنی نووسینگە و كارمەند و كاری دیوانی بوون. بەڵام ئەو بۆرۆكراسییەی ڤیبێر ئاماژەی پێ دەكا، خاوەنی پێكهاتەیەكی تایبەتە. ئەم جۆرە بۆرۆكراسیە بریتیە لە ڕێككەوتنی بەردەوام و سەقامگرتووی هاوكاری نێوان تاكەكان، كە هەر یەكەیان خاوەنی ئەركێكی پسپۆڕانە و تایبەتن. كاری بۆرۆكراسی جیا لە ژیانی خێزانییە، تەنانەت دەتوانین بڵێین كە جیاوازە لە كەسایەتی خودی كارمەندیش. ئێمە لە پێوەندی لە گەڵ كارمەندێكدا كە لە ئیدارەیەكدا دانیشتووە، لە گەڵ كەسایەتی خودی ئەو كەسە پێوەندیمان نییە، بەڵكوو لە گەڵ بەڕێوەبەرێكی گومناو بەرەوڕوو دەبین كە هیچ سەرنج نادەینە ئەوەی كە بزانین ئەم بەڕێوەبەرە چ تایبەتمەندی و كەسایەتییەكی هەیە. هەروەها، بێگومان زۆر تووڕە و زویر دەبین گەر كارمەندێك بە هۆی كێشەی خێزانی خۆیەوە كارەكانی بە جوانی جێبەجێ نەكات، یاخۆ باس لە كەمایەسی ژیانی بێنێتە نێو ئیدارەو لە لای كارمەندانیتر بیگێڕێتەوە. كارمەند دەبێ بە كاری ئیداری خۆی ڕابگا و ئەم كارەش هیچ پێوەندییەكی بە منداڵ و ڕۆژی پشوودان و لەم چەشنە باسانەوە نییە. ئەم بێناو و نیشان بوونە، بەشی زاتی بۆرۆكراسییە و هەركەس دەبێ یاساكان بناسێ و بە پێڕەوی لە یاسا و دەستوورەكان

ببزوێتەوە و لە هەمبەر ئەو كارەی مووچەیەكی دیاری كراو بە گوێرەی پلە و پاگەو رادەی كار كردنی وەربگرێ (آرون؛ ١٣٨٦).

ماكس ڤیبێر بەم جۆرە تایبەتمەندییەكانی سیستەمی بۆرۆكراسی شرۆڤە دەكات:

١) بەپیشەیی بوونی كارەكان: لە سیستەمی بۆرۆكراسیدا هەر كەسە دەبێ بە تەنیا ئەو كارەی لە ئەستۆی نراوە جێبەجێ بكات. كرێكارێكی مۆنتاژی ترۆمبیل رەنگە تەنیا ئەركی بەستنی سپەری ترۆمبیل بێ كە بە سەر هێڵی بەرهەمهێنانەوە خەریكی رۆیشتنە (وبر؛ ١٣٨٢).

٢) بوونی زنجیرەی پلە و پاگە ئیدارییەكان: هەر خاوەن پلەیەك لەم زنجیرەدا خاوەنی بەرپرسایەتی، ئەرك و چاوەڕوانی تایبەت بە خۆیە و هەر تاكێك لەم زنجیرەدا دەبێ چەندوچووونی چالاكییەكانی بە بالادەستەكەی خۆی رابگەینێ. لە سیستەمی بۆرۆكراسیدا، رادەی دەسەلات بە پلە و پاگەی تاكەوە بەستراوە، نەك خودی تاك (كوئن؛ ١٣٨٧).

٣) رەفتاری فەرمی: لەم سیستەمەدا حوكم و پلەی رێكخراوەیی هەركەس بە گوێرەی ئەركێكە كە خراوەتە ئەستۆی. بە گشتی بۆ هەموو ئەو كارمەندانەی پلەو پاگەیان لە سیستەمی بۆرۆكراسیدا یەكسانە، حوكم و روتبەی ئیداری یەكسان دەردەچێ (كوئن؛ ١٣٨٧).

٤) بەڕێوەبەرایەتی ئیداریەكان، پێویستیان بە فێركارییەكی تایبەت و پسپۆڕانەیە. ئەم بابەتە كە رۆژبەرۆژ زۆرتر پەرە دەستێنێ، هەم بۆ كارمەندان و بەڕێوەبەرانی كەرتی تایبەت و هەمیش بۆ كارمەندانی ئیداری دەولەتی رەچاو دەكرێ (وبر؛ ١٣٨٢).

٥) بەڕێوەبەری ئیدارە لە یاساو دەستوورگەلێكی گشتی پێڕەوی دەكا و دەكرێ هەموو ئەو یاسایانە فێری كارمەندانیتر یا خۆ بەڕێوەبەران بكرێن (وبر؛ ١٣٨٢).

ماكس ڤیبێر بۆرۆكراسی بە كەرەسەیەكی شیاو بۆ گەیشتن بە

ئامانجەکانی ڕێکخراو دەزانی. بە بڕوای ڤیبێر، ڕێکخراو دەتوانێ بە کەڵک وەرگرتن لە بۆرۆکراسی، کاری کارمەندان بگەیەنێتە بەرزترین و زۆرترین ئاستی خۆی و بەر بە ئاوێتە بوونی کاری کارمەندانی بەشە جۆراوجۆرەکان بگرێ. هەروەها زۆرتر لە شێوازە ئیدارییەکانی‌تر بەرگری لە بەفیڕۆ چوونی کات و پارە دەکرێت (وبر؛ ١٣٨٢).

## rehabilitation / بووژاندنەوە

بووژاندنەوە یەکێک لە پاکانەکانی تەمبێیە (بڕوانە: سزادان، بەرگری کردن، بووژاندنەوە). بووژاندنەوە بەرنامەیەکە بۆ ڕاهێنانی تاوانکار تا بگەڕێتەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست و لادانەکانی دووپاتە نەکاتەوە. ئەم بەرنامە لە سەدەی نۆزدەهەم و شان بە شانی زانستە مرۆییەکان گەشەی سەندووە. بە بڕوای کۆمەڵناسان، لادان و تاوانەکۆمەڵایەتییەکانی‌تر بە هۆی هەلومەرجی نەشیاو و نالەباری وەکوو هەژاری، نەبوونی پەروەردەی شیاو و گونجاو دێنە دی. بەڵگەی کۆمەڵناسان بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە گەر تاوانبار دەتوانێ لادان فێر بێ، توانی ئەوەشی هەیە کە پێڕەوی کردن لە یاسا و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان فێر بێ. پرسی سەرەکی بۆ کۆمەڵناسان، کونترۆلی شوێنێکە کە تاک تێیدا پەروەدە دەبێ. کاری یانەکانی چاکسازی و ڕاهێنان-وەکوو شوێنگەلی کۆنترۆڵ- ئەوەیە کە شێوازی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری شیاو و گونجاو بە خەڵکی فێر کەن.

وێکچوونی سزادان و بووژاندنەوە لەوەدایە کە هەردوویان هان دەدەن تا تاک بە چەشنێک ڕابێنن کە خۆی لە گەڵ نۆرم و یاساکانی کۆمەڵگا بگونجێنێ. جیاوزاییان لەوەدایە کە بووژاندنەوە لە سەر چاکسازی پێکهاتەیی جەخت دەکا، کەچی سزادان، تاوانبار ناچار دەکا کە دان بە سزادانەکەیدا بنێ. بێجگە ئەوانەش، سزادان خوازیاری تەمبێیەکە کە لە گەڵ لادانەکەدا

بەرانبەر بێ، بەڵام بووژاندنەوە لە دووی دەرمانی تاوانە. بەم بۆنەوە، هەرچەند لادانە وەک یەکەکان، سزایەکی وەک یەکیان هەیە، بەڵام رەنگە پێویستیان بە بووژاندنەوەیەکی جیاواز هەبێ (عضدانلو؛ ١٣٨۴).

## بۆلشیڤیزم / bolshevism

هەرچەن زاراوەی بۆلشیڤیزم لە گەڵ لنینیزم بە هاوواتا دەزانرێ، بەڵام ئەم زاراوە ئاماژە دەکات بە کردە یان بزاڤێکی سووشیالیستی-مارکسیستی، کەچی لنینیزم بریتیە لە شرۆڤەی هزری شۆرشی سوشیالیستی. لنین دانەری ئەم بۆچوونە رامیاریەیە، بەڵام چەمکی بۆلشیڤیزم گۆرانی کۆمەلایەتی شۆرشگێرانەیە کە زۆربەی مارکسیستەکان (وەکوو ستالین و ترۆتسکی و مائۆ) تێیدا بەشدارن. بۆلشیڤیزم لە کۆنگرەی دووەمی پارتی سووشیال دیمۆکراتی رووسیا (R.S.D.L.P) لە ١٩٠٣دا هاتە دی. هەر لەو کاتەوە، لنین بۆلشیڤیزمی وەکوو «بزاڤێکی هزری رامیاری و وەکوو پارتێکی رامیاری» پەسەند کرد (باتامور؛ ١٣٨٨).

بۆلشیڤیزم لە روانگەی لایەنگرانیەوە بریتی بوو لە سەرسپاردنی بێ چەندوچوون بە مارکسیسم، دان نان بە رێکخراوێکی پارتی کە بە گوێرەی زنجیرەی پلە و پاگەی فەرمیوە چین‌بەندی کراوە و خاوەنی ناوەندێکی لێزان و پسپۆر لە باری شۆرشەوەیە کە کاری رێنومایی و رێبەرایەتی پارتیان لە ئەستۆیە؛ هەروەها خاوەنی تاکتیکی شۆرشگێرانەن لە بەرانبەر تاکتیکی چاکسازانەوە. لە روانگەی پارتی مینشڤیزمەوە (پارتی دژ بە بولشێڤیستەکان)، بۆلشیڤیزم تاوانبار کراوە بە دۆگماتیسم، ئایین‌پەرستی، دەسەلاتخوازی لە لایەن رێبەرانیەوە، بایەخ نەدان بە قازانجە راستەقینەکانی کرێکاران و گوێ نەدان بە بیر و بۆچوونەکانیان و هۆگرێتی بە پیلانگێری (گولد؛ ١٣٨٤).

لنین دوو پێناسە لە بۆلشیڤیزم دەداتە دەست کە بریتین لە : ١)

مارکسیسمی شۆڕشگێڕانەی رووسیا و ٢) بەکارهێنانی مارکسیزمی شۆڕشگێڕانەلە هەل و مەرجە تایبەتەکانی سەردەمدا. لنین، بۆلشیڤیزمی لەم دوو رەهەندەدا دەناسی و وەکوو «پرۆسەی هزری رامیاری و پارتێکی رامیاری» ناوی لێ دەبرد.

لە دەرەوەی رووسیادا، لە نێوان سالانی ٣٠-١٩٢٩ دا بۆلشیڤیزم وەکوو بزاڤیکی پێشکەوتوو، چەپگەرا و رادیکاڵ سەیری دەکرا؛ کەچی لە نێوان سالانی ٥٠-١٩٤٠ دا وەکوو حکوومەتێکی یەک پارتی نوێ باسی لێ دەکرا. هەر لەم رووەوە گووریان بەم جۆرە بۆلشیڤیزم لێک دەداتەوە: «کۆمۆنیزمێکی نوێ کە لە شۆڕشی ١٩١٧ی رووسیادا دەسەلاتی گرتە دەست و لەو سەردەمەوە بوو بە بزاڤێک کە بایەخێکی جیهانی هەیە» (گولد؛ ١٣٨٤).

### بەبازاڕی بوون/ marketization

ئەم زاراوە بۆ سیستەمێکی ئابووری بە کار دەبرێ، کە بناغەی لەسەر رەوشت و بنەما و میتۆدی بازاڕ (وەکوو رانان، داواکردن، هەلبژاردن و ململانێ) دانراوە.

### بەپیشەسازی بوون/ industrialization

بەپیشەسازی بوون، لە واتایەکی گشتیدا و بەبێ ئاماژە بە هیچ جۆرە شۆڕشێکی پیشەسازی تایبەت، بە مانای گەشەی پیشەگەلی نوێیە هاوکات لە گەڵ هەموو هەلومەرج و کێشەیەکی ئابووری و کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگایەکی کشتوکالیدا.

هەرچەند بەرفراوانی ئەم زاراوەیە ناگاتە ئاستی شۆڕشی پیشەسازی، بەلام ئەم زاراوەلە ٣٠ سالی لەمەوپێشەوە بۆ پۆلێنی هەلومەرجگەلێکی تایبەت

بەکار براوە، چونکە زاراوەی کۆنتری شۆڕشی پیشەسازی، بۆ نواندنی ئەو واتایە زۆر کارا نەبوو. ئەم زاراوە دوو واتای سەرەکی هەیە کە بریتین لە:

١- بە گشتی باس لە کۆمەڵگایەک دەکات کە پیشەکانی بەرهەمهێنان، ڕۆڵی سەرەکییان لە گەشە و پەرەسەندنیدا بووە. تایبەتمەندییەکانی ئەم پیشانە بریتین لە: سەرمایەدانانی نەگۆڕ و زۆر لە بەشی کارخانە و بیناسازیدا، بەکارهێنانی زانست لە تەکنیکی پیشەسازی و بەرهەمهێنان لە بارستێکی زۆر و ستاندارد کراودا. ئەم واتایە جیاوازە لەوەی کە لە شۆڕشی پیشەسازیدا باسی لێ دەکرێ. بۆ وێنە، لە باکووری ئیتالی و رووسیا و ژاپۆندا ڕەوتی بەپیشەسازی بوون دیار بوو، بەڵام باری ژیانی ئابووری خەڵک گۆڕانێکی زۆر کەمی تێدا بەدی دەکرا.

٢- بەپیشەسازی بوون بەگوێرەی ئەو پیشانەی لە بەر چاو دەگیرێ کە لە رێی شۆڕشی پیشەسازی بریتانیاوە لە شوێنەکانی‌تردا بەکار برا. هەروەها مێژوونووسان ئەم زاراوەیە بۆ پیشاندانی هەرچەشنە گەشەیەکی پیشەسازی لە بەرانبەر کشتو کاڵدا دەزانن. وەکوو پیشەدەستییەکان، بەرهەمهێنان لە رادەیەکی کەم یا زۆردا (کولمن؛ ١٩٦٤).

## بە پیشەیی کردن / professionalization

واتای ئەم زاراوەیە باس لە مەیلی تاقمێک دەکا بۆ بەدەست هێنانی تایبەتمەندییەکانی کارێکی تایبەت و پسپۆڕانە، یاخۆ باس لە پرۆسەیەک دەکا کە دەبێتە هۆی بەدەستهاتنی ئەم تایبەتمەندییانە. ماکس ڤیبێر لە نووسراوەکانیدا بەتایبەت لە بابەتانەی کە لە سەر بۆرۆکراسی نوسیویە، لە سەر ئەم خاڵە جەخت دەکا کە دەسەڵات و هێزی تاک نەک لە خودی تاکدا، بەڵکوو لەو پلەو پاگەیەدایە کە لە دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتیدا پێی‌سپێردراوە. دەسەڵاتێک کە ماکس ڤیبێر وەکوو دەسەڵاتێکی یاسایی و

فەرمی، باسی لێ دەکا، روون و ئاشکرایە و هەموو کۆمەڵناسان دەیناسن: بەڕێوەبەرێک دەستوور دەداتە کارمەندێکی و ئەو کارمەندەش دەبێ دەستووری بەڕێوەبەر جێبەجێ بکا. دەسەڵاتی بەڕێوەبەر بە هۆی یاسا و ئەو هۆکارانەی بۆ چاودێری بە سەر کارمەندەکاندا ڕەچاو کراون پشتگیری لێ دەکرێ؛ وەکوو دەرکردنی کارمەند یاخۆ دابەزاندنی پێگەی کاری. پیتێر بلاو و ریچارد شۆنهێر، لە هەمان کاتدا کە دان بە سەر ئەم دەسەڵاتەدا دەنێن، ئاماژە بە دەسەڵاتێکیتر دەکەن بەناوی «دەسەڵاتی پیشە» کە ئەم جۆرە دەسەڵاتە زۆر لێڵ و ئاڵۆز دیارە. بەڕای ئەمان، ئەم جۆرە دەسەڵاتە زۆرتر لەوەی کە دیارە بۆ دیمۆکراسی مەترسی هەیە و ناکرێ بە سانایی پێناسە بکرێ (*Blau, P. M; and R. A. schoenherr, 1973*).

بەبڕوای بلاو و شۆنهێر، دەسەڵاتی پیشە لە دامەزراوەیەکدا، باس لەوە دەکات کە ئەو دامەزراوە بە خێرایی بەرەو بەپیشەییبوون دەڕوا. بەپیشەیی بوون پرۆسەیەکە کە تێیدا دامەزراوەیەک، دەست دەدا بە دامەزراندن و گرتنە کاری پسپۆڕانێک (وەکوو کیمیازان، فیزیازان، ژمێریار، بریکار، ئەندازیار، دەروونناس، کۆمەڵناس و هتد)، کە بۆ بابەت و کارێکی تایبەت، کە بۆ گەیشتن بە دۆز و ئامانجەکانی ڕێکخراو گرینگن، بە چەشنی فەرمی پەروەردە کراون. ئەم پسپۆڕانە لە زانکۆ و ناوەندە فەرمییەکانی پەروەردەدا ڕاهاتوون. بەم چەشنە، ئەم پسپۆڕانە لە ئەنجامدانی کارەکانیاندا سەربەخۆن و ڕاستەوخۆ لە سەرپەرشتەکانیان دەستوور وەرناگرن. پسپۆڕان لە نێو چوارچێوەی پیشەکەیاندا دەست دەدەن بە لێکدانەوە و وردبوونەوەلە هەلومەرجەکان و کێشە و پرسەکان چارەسەر دەکەن، یاخۆ شتێکی نوێ دادەهێنن. لە ڕوانگەی پسپۆڕاندا، کارێک کە ئەوان بۆ ئەو دامەزراوەیە ئەنجامی دەدەن (بە دەست هێنانی زانیاری، ئەنجامدانی خزمەتگوزاری یاخۆ داهێنان) کارێکی تەکنیکی و بەبێ لایەنگرییە. ئەم پسپۆڕانە بیر لە

ئەنجام و ئاكامی كاریان ناكەنەوە و تەنیا وان لەو بیرەدا كـە ئـەركـەكـەیـان بەڕێكوپێكی جێبەجێ كەن.

بلاو و شۆنهێر بڕوایان وایە كە ئـاوەهـا پێـوەندییـەک لـە نێـوان پیشـە و ڕێكخراودا كێشە ساز دەكات؛ چونكە لە لایەكەوە هیچ كـەس بـەرپرسـایەتی كاری ڕێكخراوێكی گەورە ناگرێتە ئـەسـتۆ و لـە لایـەكـیتـرەوە دیتنـەوەی كەسێک كە سەرچاوەی بە ئەنجام گەیشتنی ئاوەها كردەیـەكـە، زۆر دژوار و ئاڵـۆزە (*Ibid: 20-21*). لانی كـەم دوو هـۆ بـۆ ئاڵـۆز و دژوار بـوونی ئـەم شوێنگەیە ڕەچاو دەكرێ. یەكەم: بناغـەی پێشـنیار و دادوەری پسـپۆڕ، لـە سەر زانستی پیشەیی و شێوازی پەروەردەیدا بنیات نراوە. ڕەنگـە پسـپۆڕێک بە جوانی بنەماكانی زانستێكی وەكوو حسێبداری، فیزیا، كیمیـا، بیۆلـۆجی و كۆمەڵناسی بزانێ و تێی بگـا، بـەڵام ئـەم پسـپۆڕانە بـە چـەشـنێكی یـەک ڕەهەندی ڕاهاتوون و زانیارییەكانیان دەستەبەندی كراون. ڕەنگە ئەم كەسانە سەبارەت بە بابەتێک شارەزایی زۆریان هەبێ، بەڵام لە زانستەكـانیتـر هـیچ نازانن. بۆ وێنە ڕەنگە كیمیازانێک بتوانێ ماكێک بۆ كوشـتنی قۆلانچـە چـێ بكات، بەڵام سەبارەت بە كۆسپ و تەگەرەكانی سەر ڕێگای بەهـرە وەرگـرتن لەم ماكە، هیچ شتێكی پێ فێر نەكـراوە. ڕەنگـە كۆمـەڵناسـێک بتوانـێ بـە تەواوی لەو كۆسپ و بەربەستانە بگات، بەڵام هیچ زانسـتێک سـەبـارەت بـە تیكنۆلۆجیایی ئەو ماكەی پێی فێر نـەكـراوە. كـەواتـە چونكـە كۆمـەڵـناس زانستێكی سەبارەت بە كیمیـا نییـە، ناتوانـێ بـەرنامـەیـەک بـۆ فێركـردنی چۆنییەتی بەكارهێنانی ئەو ماكە دابڕێژێ.

بێجگە لەمەش بڕیار دان لە ڕێكخراوە گەورەكاندا ئاڵـۆز و دژوارە، چونكـە هیچ تاكێک بە تەنیا خۆی ئەو زانیاریانـەی كـە دەبنـە هـۆی بـڕیاردان، كـۆ ناكاتەوە. بڕیاردان بەرهەمی زانیـاری و پێشـنیارەكـانی یـەک كـەس نییـە، بەڵكوو بەرهەمی زانیاری و پێشنیاری چەن پسـپۆڕ لـە بـواری جۆراوجـۆرە.

زۆرجار بڕیاردەران (یا بەڕێوەبەرانی گشتی) بەڕاشکاوی لە بنەمای زانیاری و پێشنیاری پسپۆڕەکان ناگەن. بەم بۆنەوە لە کاتی ڕوودانی کارەساتێکدا، پسپۆڕان دەڵێن کە تەنیا ئەرکی ئەمان کۆکردنەوە و دابین کردنی زانیارییەکان بووە و کەچی بڕیاردەران دەڵێن کە بڕیاری ئەمان بە گوێرەی زانیاری و پێشنیاری پسپۆڕان بووە و بەم بۆنەوە نەیانتوانیوە دەرەنجامی کارەکەیان پێش‌بینی بکەن. بە واتایەکی‌تر، هیچ یەک لەم دوو لایەنە (بڕیاردەران و پسپۆڕان) بەرپرسایەتی کارەساتەکە ناگرنە ئەستۆ.

## بەختەکانی ژیان/ life chanced

بەختەکانی ژیان زاراوەیەکە کە یەکەم جار ڤیبێر بۆ داهێنانی باسێکی نوێ سەبارەت بە پێناسەکردنی چین، بەکاری هێنا. بەختی ژیان لە گشتی‌ترین واتایدا بریتیە لە: «دابین کردنی کاڵا، هەل‌ومەرجی ڕواڵەتی ژیان و ئەزموونە کەسیەکانی ژیان».

ڤیبێر بەنیاز نەبوو کە چینی کۆمەڵایەتی لە گەڵ ئاستی ژیان (بە هەر پانتایەکەوە کە بیری لێ بکرێتەوە) بەرانبەر بزانێ. تەنیا کاتێک کە بکرێ پیشان بدرێ بەختەکانی ژیان تایبەت بە تاقمێک لە خەڵکی خاوەن دەسەڵاتە، ئەو کاتەیە کە دەکرێ ئەو تاقمە -بە گوێرەی بۆچوونی ڤیبێر- بە پێکهێنەری چینێک بزانرێن. پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگا پیشاندەری دابەش‌کردنی کۆمەڵایەتی دەسەڵات بە مەبەستی بەکارهێنانی کاڵا یان توانایە بۆ گەیشتن بە داهات؛ داراییش (بۆ کڕین و بەهرەوەرگرتن لە کاڵا یا توانایيەکان) بە هۆکاری سەرەکی دەزانرێ. بەگوێرەی هەل‌ومەرجی بازاڕی بەکارهێنانی کاڵا، دابەش کردنی سامان دەبێتە هۆی پێکهاتنی ناتەبایی و ناکۆکی لە شوێنگە چینایەتییەکاندا؛ واتە هۆکارێکە بۆ بەدیهاتنی بەختەکانی ژیانێکی تایبەت کە چینەکان دیاری دەکات. «دارا بوون و نەداربوون، بە

چەمکی سەرەکی هەموو شوێنگە چینایەتیەکان دەزانرێ».

بونی جیاوازی بەردەوام و سازگار لە بەختەکانی ژیانی گرووپگەلی کۆمەلایەتی-ئابووری لەنێو جڤاکە پیشەسازییەنوێیەکاندا، راستییەکی جێکەوتوو و سەلمێندراوە. کەواتە، بۆ وێنە بە سەرنجدان بە ئاخێزگەی کۆمەلایەتی منداڵێک، دەکرێ کەم تا کورتێک پێش‌بینی بکرێ کە چەن بۆی هەیە ئەم منداڵە بەر لە کاتی خۆی لەدایک بێ، مانگی یەکەم تا ساڵی یەکەم زیندوو بمێنێ، برا و خوشکی زۆری هەبێ یا تاقانە بێ، لە شوێنگەیەکی جەنجاڵ و قەرەباڵغدا گەورە دەبێ، لە ئەزموونەکانی هۆشدا نومرەی چاک وەردەگرێ، زۆرتر لەو تەمەنەی کە بۆ خوێندن رەچاو کراوە لە قوتابخانەدا بمێنێتەوە، بڕواتە زانکۆ، لە پێگەی کاری بابیدا بمێنێتەوە یا سەرتر کەوێ، بە هۆی نەخۆشی جۆراوجۆرەوە پەکی بکەوێ، تەمەندرێژ یا تەمەن کورت بێ. بەلام گرێدانی هەموو ئەم بۆچوونانە لە گەل شێوازی دابەش‌بوونی سامانی گرووپە کۆمەلایەتی-ئابوورییە لێک جیاوازەکان، لە شوێنگەی بازاڕدا (بەچەشنێ کە بتوانین چییەتی چینەکان بەو جۆرەی کە نیازی ڤیبێر بوو جیا بکەینەوە) بۆ خۆی چەمکێکی‌ترە.

هێشتا ئەم بابەتە بەهێزە کە «توانی ئابووری» و «ناتوانی ئابووری» تەوەر و بابەتی بنەڕەتین لە هەموو شوێنگە چینایەتییەکاندا (فلود؛ ١٩٦٤).

## بەدەروونی کردن / internalization

لە کۆمەلناسیدا ئەم زاراوە بەرانبەرە لە گەل بەکۆمەلایەتی کردن. پرۆسەی بەکۆمەلایەتی‌کردن و بەدەروونی‌کردن و باوەڕە کۆمەلایەتییەکان، لە کاتی لە دایک بوونەوە دەست پێدەکەن و تا کۆتایی تەمەن، درێژەیان هەیە. ئەم زاراوە باس لە پرۆسەیەک دەکات کە منداڵ لەم سۆنگەوە ورە و توانەکانی خۆی دەگەشێنێتەوە و پەرەیان پێدەدات و کەسایەتی و چییەتی

تاکەکەسی خۆی بە دەست دێنێ. بە هۆی ئەم پرۆسەوە، مرۆڤ نۆرم و بەهاو باوەڕ و زمانێک کە بۆ پێوەندی کردن بە خەڵکەوە پێویستی پێیە، فێری دەبێ و لە ناخی خۆیدا سەقامگیری دەکات. هەروەها بەکۆمەڵایەتی کردن و دەروونی کردنی نۆرم و باوەڕە کۆمەڵایەتییەکان، پرۆسەیەکە کە کولتوور لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکیتر رادەگوێزرێتەوە.

## بەرزبوونەوەی چاوەڕوانییەکان / rising expectation

لە دەیەی ١٩٦٠دا ئاژاوەو نائارامی زۆربەی شارەکانی ئەمریکای داگرت. ئەم ئاژاوانە، بە تایبەت ئاژاوەی شاری لۆسانجێلیس لە ساڵی ١٩٩٢دا کۆمەڵناسانی هان دا بۆ توێژینەوەبۆ ناسینی هۆکانی ئەم کێشە و ئاژاوانە. ئەوەی کە زۆرتر سەرنجی کۆمەڵناسانی بەرەو لای خۆی رادەکێشا ئەوە بوو کە زۆربەی ئەم ئاژاوانە لەو گەڕەکانەی شاردا بوون کە بە رێژەی ساڵانی رابردوو و ناوچەکانی دەور و پشتیان، بارو دۆخێکی شیاوتری ئابووری و کۆمەڵایەتییان بوو. بۆ وێنە لە دەیەی ١٩٨٠ و لە چاو دەیەیەک لەوە پێش نرخی هەژاری لە ٣٣% بۆ ٢١% دابەزیبوو؛ نرخی مرۆڤکوژی لە شاری لۆسانجلێس، لە ئاستی ناونجی هەموو ولاتدا بوو ( *U.S News & World report, May 31, 1993: 38*). پرسیارێک کە بۆ کۆمەڵناسان هاتە ئاراوە ئەوەبوو کە بۆچی ئەم ئاژاوانە لەم گەڕەکانەی شاردا دێنە دی، نەک لە گەڕەکە هەژارەکاندا؟ بۆچی شۆڕشەکانی دەیەی ١٩٦٠ پاش خولێک گەشەی ئابووری و زۆرتر بوونەوەی ئازادییە شارستانییەکان بۆ کەمینەکان هاتە دی؟ ئەمە هەمان شتە کە ئەمڕۆکە کۆمەڵناسان بەرزبوونەوەی رادەی چاوەڕوانییەکانی پێ دەڵێن.

## بەرهەمهێنانەوە/ reproduction

بیردۆزانی تیۆری ململانێ لە روانگەیەکی ترەوە سەیری چین‌بەندی و یەکسانی هەل و دەرفەتەکانی ژیان دەکەن. ئەمانە رایان وایە کە هۆی کێشەوگرفتەکانی نێو سیستەمی پەروەردە، ململانێی نێو کۆمەڵگایە. پەروەردەش تەنیا بەشێکە لە سیستەمی دارا و نەدار یان سەرمایەدار و هەژار. مارکس بڕوای وابوو کە سیستەمی پەروەردە دەبێتە هۆی بەردەوامی پێکهاتەی چینایەتی. بە کۆنترۆڵی شێوازی پەروەردە، بێ‌شک دەسڕاگەیشتنی گرووپە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا بە هەل‌ومەرج و ئاسانکارییەکانی نێو کۆمەڵگا کۆنترۆڵ دەبێ. کەواتە، دەوری پەروەردە، درێژەدان بە پێکهاتەی چینایەتی نێو کۆمەڵگایە.

ئەندامانی نێو چینێکی کۆمەلایەتی، شێوازی بەکۆمەلایەتی بوونێکی یەکسان و وەک یەکیان هەیە، بەم بۆنەوە بەها و نۆرم و شێوازی ژیان و حەزەکانیان زۆر لێکتر دەکەن. هەر گرووپێکی نێو کۆمەڵگا دەیەوێ لە کۆمەڵگادا بەشێکی زۆرتر لە دەسەلات و سامان و پلە و رێز بە دەست بێنێ، بۆیە هەر ئەمە دەبێتە هۆی هاتنە دی ململانێ لە نێو کۆمەڵگادا. هەندێ بڕوایان وایە کە پەروەردە دەبێتە هۆی یەکسانی و بەرامبەری لە کۆمەڵگادا، بەلام لایەنگرانی بیردۆزی ململانێ، پەروەردە بە یەکێک لە هۆکارەکانی بەرهەمهێنانەوەی نابەرانبەری و نایەکسانی دەسەلات، سامان و رێزی کۆمەلایەتی دەزانن. بەهاکان، بنەماکان و دامەزراوەکانی کۆمەڵگا، هەموویان رەنگدانەوەی قازانجی گرووپە دەسەلاتدارەکان و چینی حاکمی کۆمەڵگان و پەروەردەش لەم ریزە بەدەر نییە.

لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٦٠دا، منداڵی کرێکار یان جووتیارێکی فەرەنسی بۆ رۆیشتننە نێو زانکۆ، کەمتر لە یەک لە سەت بەختی بوو، کەچی لە هەمان کاتدا ئەم بەختە بۆ بەڕێوەبەرانی پایەبەرز و چینی سەروو -وەک پزیشک و بریکار- شەست لە سەد بوو. بیردۆزی بەرهەمهێنانەوە کە لە

دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا ناوبانگی دەرکرد، دژکردەوەیەک بوو لە بەرانبەر شکانی سیستەمی پەروەردەی ئەرووپا بۆ گەیشتن بە بەرانبەری کۆمەلایەتی. بەر لەمە، جیاوازییەتاکەکەسییەکان لە بیرو زمان و هۆش و ئەنگێزەی خوێندن، بە هۆی سەرنەکەوتنی مندالانی چینە خوارووەکان دەزاندرا. لە راستیدا زۆرتر سەرنج بە تایبەتمەندییە تاکە کەسییەکانی مندال دەدرا، تا شێوەی کاری قوتابخانەکان. بە سەرهەلدانی بیردۆزی بەرهەمهێنانەوە، سەرنجی سەرەکی درایە ئەو چاوەڕوانیانەی کە بە نەبێژراوی ماونەتەوە و هەروەها سەرنجی زۆرتر درایە کاریگەریە نادیارەکانی قوتابی زیرەک و قوتابی نازیرەک و هەروەها پێوەندی نێوان قوتابخانە و ئابووری. بەگوێرەی بیردۆزی بەرهەمهێانەوە، قوتابخانە هەلومەرج و ئاسانکارییەکان بۆ سەرکەوتن، تەنیا بۆ کەسانێک دابین دەکا کە ئاخێزگەیان لە چینی سەرووی کۆمەلگادا بێ. بە گشتی بیردۆزی بەرهەمهێنانەوە دەبێتە دوو بەش: **بەرهەمهێنانەوەی کۆمەلایەتی، بەرهەمهێنانەوەی کولتووری** (شارعپور؛ ١٣٨٧).

### بەرهەمهێنانەوەی کولتووری / cultural reproduction

بناوانی ئەم بیردۆزە لە نێو بەرهەمەکانی دوو بیرمەندی بەناوبانگی ئەرووپی، بازێل بێرنشتاین و پییەر بۆردیۆدایە. گریمانەی سەرەکی ئەم دوو بیردۆزە ئەوەیە کە لە نێو سیستەمی پەروەردەدا، شێوازێکی تایبەت لە نەزمی کۆمەلایەتی هەیە کە سەرچاوەی لەنێو هەلومەرجی کۆمەلایەتی و مێژووییەکە کە لە دەرەوەی ئەم سیستەمەدایە. نەزمی کۆمەلایەتی سیستەمی پەروەردە، بە تەواوی بەندیوارە بە هەلومەرجی دەرەوەی ئەم سیستەمە و لە راستیدا ئەرکی پەروەردە، راگواستنی میراتی کولتووری کۆمەلگایە. بە گوێرەی ئەم بیردۆزە، زۆر گرینگە بزانین لە قوتابخانەکاندا چ

شتێک رادەگوێزرێ؛ راگواستنێک کە هەم لە رێی بەرنامە پەروەردەییەکانە و هەمیش لە رێی خودی رێکخراوی قوتابخانەوە جێبەجێ دەبێ.

بێرنشتاین، پێکهاتەی کۆمەلایەتی بە سیستەمێک نابەرانبەر لە چینەکان دەزانێ و هۆکاری سەرەکی راگواستنی ئاسەوارەکانی ئەم پێکهاتەیە، هەمان بنەماڵەیە. پلەوپاگەی چینایەتی بنەماڵە، هۆی سەرەکی دیاری کردنی بنەماکانی زمانناسییە (*Bernstein; 1971*).

ئاشکرایە، تاک لە نێو هەر چینێکدا کە راهاتبێ، بە شێوازی تایبەتی ئەو چینە قسەدەکات. گەر ئاخاوتنی بنەماڵەی کرێکارێکی ناپسپۆڕ تۆمار بکرێ و لە گەڵ شێوازی ئاخاوتنی بنەماڵەی کەسایەتیەکی پایەبەرزی ئیداریدا بەراورد بکرێن، جیاوازیەکە ئاشکرا دەبێ، هەرچەن هەر دوو بنەماڵە لە سەر یە شت -وەکوو نرخی شتمەکی خواردت، یان رادەی پێشکەوتنی منداڵان لە قوتابخانەدا- بپەیڤن. بێشک جیاوازییەکی زۆر هەیە هەم لە نێوان ئەو وشانەی کە بەکار براون و هەم لە چۆنیەتی چنینی ئەو وشانەدا. ئەم دوو جیاوازییە، بناغەی بیردۆزی بێرنشتاین پێکدێنن. بەڕای ئەو چۆنیەتی پێوەندی کۆمەلایەتی، بە سەر شێوازی ئاخافتندا کاریگەری هەیە و ئەم ئاخاوتنەش بەسەر پێوەندی کۆمەلایەتیدا کاریگەری هەیە. لە راستیدا بناغەی هزری بیردۆزی بێرنشتاین دەگەڕێتەوە بۆ بیروبۆچوونەکانی دوورکایم، مارکس و مید؛ دوورکایم رای وابوو کە تەوەرەکانی بیرو هزر، بەرهەمی کۆمەڵگان (*Robinson; 1981*).

بەم چەشنە، شێوازی بەرتەسک و سنووردار، مۆدێلی زمانی تاکەکانی چینی کرێکارە و شێوازی ورد و رێکوپێک، مۆدێلی زمانی چینی ناونجییە. بەڕای بێرنشتاین، جیاوازی لە رادەی بیروهۆش نابێتە هۆی جیاوازی نێوان مۆدێلە زمانییەکان، بەڵکوو هۆی ئەوە جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نێوان پێوەندیە کۆمەلایەتیەکان. بێرنشتاین رای وایە کە دوو جۆری

سەرەکی لە زمان هەیە: شێوازی رەمەکی و شێوازی فەرمی. زمانی رەمەکی بە رستەی کورت، ساکار و هەواڵی دیاری دەکرێ. لەم شێوازەدا سیمبۆلەکان خوارترین ئاستی گشتگیرییان هەیە. زۆر بە کەمی لە ئاوەڵناو و مەرج کەڵک وەردەگیرێ. بەڵام زمانی فەرمی، پێکهاتەیەکی چەن تویی هەیە. زۆرتر پاڵ دەداتە لای واتا ئینتزاعییەکانەوە و بازنەی وشەی زۆر بەرفراوانە. بێرنشتاین دەڵێ کە مندالانی چینی کرێکار، بە زمانی رەمەکی قسە دەکەن، کەچی مندالانی چینی ناونجی، بە زمانی فەرمی دەدوێن. منداڵی چینی ناونجی دەتوانێ بە هەردووی ئەم زمانانە بدوێ و لێیان تێبگا، بەڵام منداڵی چینی کرێکار تەنیا لە شێوازی خۆی دەگا و تەنیا بە شێوازی خۆی دەتوانێ بدوێ. شێوازی رەمەکی زۆرتر بۆ پێوەندی نێو دۆستان و هاوالان چاکە تا پێوەندیەکانی‌تر (*Bernstein; 1977*).

دەتوانین بڵێین کە کاری بۆردیۆ، درێژەی کاری بێرنشتاینە. ئەمیش سەبارەت بە کولتوور، پێڕەوی لە روانگەی دوورکایم دەکا. بەڕای بۆردیۆ، بەرهەمهێنانەوەی کولتووری (کە بە هۆی پەروەردەوە جێبەجێ دەبێ) رێگایەکی گرینگە بۆ بەرهەمهێنانی دووبارەی پێکهاتەی چینایەتی؛ واتە بەرهەمهێنانەوەی کۆمەلایەتی بە هۆی رێکخراوە پەروەردەییەکانەوە جێبەجێ دەبێ، بۆیە سیستەمی پەروەردە بە باشترین رێگایەک دەزانێ کە مێژوو بۆ گواستنەوەی دەسەلاتی دیوەتەوە (*Bourdieu; 1973*). لە ئاوەها هەڵومەرجێکدا قوتابخانە دوو ئەرکی لە ئەستۆیە: ١) پاراستنی کولتوور: قوتابخانە ئەرکی بەرهەمهێنان و راگواستنی سەرمایەی کولتووری لە ئەستۆیە، کولتوورێ کە لە پێشوونانەوە بە میراتی پێمان گەیشتووە. ٢) بەرهەمهێنانەوەی کولتوور: بە ڕای بۆردیۆ، بوون لە قوتابخانە دەبێتە هۆی بەردەوامی و یەکگرتوویەکی بنەمایی سەبارەت بە کالا کولتوورییەکان. تاک لە رێی پەروەردەیەکی بەردەوام و تەکووزەوە کە قوتابخانە رێکی دەخا، بەبێ

ئـەوەی خـۆی بزانــێ، دەبێتـە خـاوەنی سیسـتەمێکـی تـەواو لـە بـیرو تێگەیشتنەکان کە لە ناسینی کولتـووری خۆیـدا یارمـەتی دەدا (شـارع‌پـور؛ ١٣٨٦).

منداڵ لە نێو بنەماڵـەدا لـە بـاری کۆمـەڵایـەتی و زمـان‌ناسـیەوە رادێ و هەروەها تایبەتمەندیگەلێـک وەکـوو شـێواز و رەوتی کـار کـردنی پـێ فێـر دەکرێ. بنەماڵەیە کە بە منداڵ فێر دەکا چ چاوەڕوانییەکی لە داهاتووی بـێ و پێوەرەکانی سەرکەوتن و هەندێ زانیاری تایبەت سەبارەت بـە بـەهاکـانی قوتابخانەی پێ فێر دەکا. بەم چەشنە، منداڵ دەگاتە فام و تێگەیشتنێک کە بتوانێ بەهاکانی نێو کۆمەڵگا بناسێ. بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم سەرمایە لە رێی بنەماڵەیانـەوە فێـر نـابن، قوتابخانـە تـەنیـا هۆکارێکـە کـە دەتوانـێ کولتووری زاڵی نێو کۆمەڵگایان پێ بناسێ. کەوابوو، سەرچاوەی نایەکسانی کولتووری، هەمان بنەماڵەیە کە منداڵ لە بـاری زمـانی و کۆمـەڵایـەتییـەوە راناهێنێ. ئێمە وامان خوو گرتووە کە بنەماڵەکان بە گوێرەی ماڵ و سـامانی ماددیانەوە دابەش کەین، بەڵام دەکرێ پلەوپاگەی بنەماڵـەکـان بـە رێـژەی سەرمایەی کولتوورییانەوە دابەش بکرێن. سەرمایەی کولتـووری بریتیـە لـە بەرهەمە کولتوورییەکان (کتێب، ئاسەواری شێوەکاری و...)، چالاکیگەلێـک وەکوو بەشداری لە کۆنسێرتی مۆسیقا، سەردانی مۆزەخانـەو بیرئانینـەکـان، سەردانی کێبەرکێیە وەرزشیەکان، بوون لە قوتابخانەیەکی شیاو و بـوون بـە خاوەنی بەڵگەنامەی خوێندنی باڵا.

دەوری قوتابخانـە ئـەوەیـە کـە سـەرمایـەی کولتووریـەک کـە لـە نێـو بنەماڵەکاندا هەیە، بکاتە سەرکەوتنێکی پـەروەردەیـی. کـەسـانێک کـە لـە ئاستێکی شیاوی سەرمایەی کولتووری بەهرەمەندن، دەتوانن ئەو سـەرمایـە بکەن بە بەڵگەنامەیەکی فەرمی و پاشان بە هۆی ئەم بەڵگەنامـەوە ئـەرک و بەرپرسایەتیەکی بەرزی کۆمەڵایـەتی بـەدەسـت بێـنن (شـارع‌پـور؛ ١٣٨٦).

## بەرهەمهێنانەوەی کۆمەلایەتی / social reproduction

بۆلز و جینتیس لە بیرمەندانەنی ئەم چەرخەن کە بۆ راڤەی سیستەمە پەروەردەییەکان، بەر لە هەر شتێک سەرنجیان داوەتە تایبەتمەندی هێز و پێوەندی کۆمەلایەتی بەرهەمهێنان. ئەم بیرمەندانەزۆریان سەرنج داوەتە پێوەندی کۆمەلایەتی بەرهەمهێنان، چونکە ئەم پێوەندییە کۆمەلایەتییانە بناغەی دابەش‌کردنی کاری کۆمەلایەتین. بەشی هەرە زۆری چالاکییەکانی بۆلز و جینتیس بۆ سەلماندنی ئەم خالە تەرخان کراوە کە سیستەمی پەروەردە، لە بەرهەمهێنانەوەی دابەشکردنی کاردا دەوری سەرەکی دەگێڕێ. هەرچەند دەسەلاتی چینی سەرمایەدار بێ‌کۆسپ و بەربەست نییە و ئەمەی کە سیستەمی پەروەردە کراوەتە ناوەندێک بۆ گەشەدان بە نابەرانبەریە کۆمەلایەتییەکان، قوتابخانەکانی کردۆتە مەلبەندی دژایەتی چینایەتی.

پێوەندی نێوان سێ دامەزراوەی بنەماڵە، کار و قوتابخانە، چوارچێوەیەکی سەرەکی بۆ بیردۆزی بۆلز و جینتیس سەبارەت بە دەوری پەروەردە لە بەرهەمهێنانەوەی دابەشکاری کۆمەلایەتیدا چێ کردووە. وادیارە کار بەشی سەرەکی ئەم چوارچێوەیە. لەم بابەتەدا توێژینەوەی کۆهن سەبارەت بە چینی کۆمەلایەتی و بەهاکانی دایک و باوکەکان، ئاماژە دەکات بە پلە و پاگەی تاک لە پێکهاتەی دەسەلات لە شوێنی کاردا (*kohn; 1963*).

بۆلز و جینتیس رایان وایە کە نابەرانبەری پەروەردە بەشێک لە تان و پۆی جڤاکی سەرمایەدارییە؛ بۆیە تا سیستەمی سەرمایەداری بەردەوام بێ، ئەم نابەرانبەرییە درێژەی هەیە. بەم بۆنەوە سیستەمی پەروەردە بە بەشێکی سەرەکی لە بەرهەمهێنانەوەی پێکهاتەی چینی دەسەلاتدار دەزانن. لە راستیدا رەخنەی بۆلز و جینتیس لە قوتابخانە ئەوەیە کە قوتابخانە

پێوەندییەکی بەردەوامی لە گەڵ سیستەمی پیشەسازی هەیە و بۆیە شتێکە زۆرتر لە دەزگایەکی ئایدیۆلۆژیکی.

بە گشتی رای ئەم دوو تۆژەرە ئەوەیە کە لە جڤاکە سەرمایەدارییەکاندا، فێرکاری قوتابخانەیی بۆتە هۆی گۆڕانی چۆنییەتی مرۆڤەکان، بە تایبەت بۆتە هۆی نامۆ کەوتنی ئینسانەکان لە خۆیان و بۆ ناسینی راستەقینەی خۆیان تووشی کێشە هاتوون. پەروەدە بۆ بەرهەمهێنانەوەی ئەو جۆرە زانیارییەی کە چینی سەرمایەدار خوازیارین، هان دەدا و بەردەوامی دەداتە پرۆسەی بەرهەمهێنانێک کە ئەم چینە دانەر و لایەنگریە (شارع‌پور؛ ١٣٨٧).

خاڵە لاوازەکانی بەهەمهێنانەوەی کۆمەلاتی بریتیە لە: روانگەیەکی نەزۆک سەبارەت بە مرۆڤ و رەش بینی و سەرنج نەدان بە ناکۆکی و قەیرانەکانی نێو قوتابخانە و شوێنی کار. بە بڕوای گرامشی ئەم بیردۆزە لە روون کردنەوەی چۆنییەتی کۆنترۆلی چینی دەسەلاتدار بە سەر کۆمەڵگادا، زۆر لە سەر ئیجباری راستەوخۆ پێداگری کردووە.

یەکێک‌تر لە خاڵە لاوازەکانی ئەم تیۆرییە، سەرنج نەدان بەو زانستەیە کە پێکهێنەری وانەکانە. بە بڕوای ئەوان، بەرهەمهێنانەوەی کۆمەلایەتی نەک لە رێی ناوەرۆکی پەروەردەی قوتابخانەکانەوە، بەڵکوو لە رێی بیچم و قەوارەی پەروەردەوە دێتە دی. بۆیە ئەم پرسانە دێنە ئاراوە کە چ پێوەندییەک لە نێوان ناوەرۆک و شێوازی پەروەردەدایە؟ ئایا شێواز بە سەر ناوەرۆکدا کاریگەری هەیە؟ ئایا دەتوانین وای بۆ بچین کە ناوەرۆک بایەخێکی کەمی هەیە؟سەرنج نەدانی بۆلز و جینتیس بەم بابەتانە، لە خاڵە لاوازەکانی بیردۆزەکەیان دێتە ژمار(شارع‌پور؛ ١٣٨٧).

### بەشی دووەمینی ئابووری / secondary economic sector

ئەم بەشە بریتیە لەو بەشەی کە ماکە کاڵەکان بۆ ئاڵوگۆڕ دەبەنە نێو

کارخانەکان. ئەم بەشە لە ئابووری، دەسکەوتی پاش شۆڕشی پیشەسازی و بنیاتنانی کارخانەگەلی جۆراوجۆر لە ئەورووپایە. تا بەر لە شۆڕشی پیشەسازی، خێزانەکان دەوری سەرەکیان لە بەرهەمهێناندا دەگێڕا، بەڵام بە زۆربوونی ژمارەی خەڵک و پاش شۆڕشی پیشەسازی و داهاتنی کەرەسە و ئامرازی نوێ بۆ بەرهەمهێنان، کاری خێزانەکان پەرسڤدەری داواکارییەکانی نێو بازاڕ نەبوو، بۆیە کارخانەکان داهاتن و ئەم کارخانانە بە گۆڕانی مەوادی سەرەکی و کاڵ، پێداویستییەکانی کۆمەڵگایان لە رادەیەکی زۆر و بەرچاودا دێنایە بەرهەم (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

ئەم بەشە لە کاری ئابووری، پالاوتنگەکانی نەوت، بە کار هێنانی کانزاکان بۆ مەکینەگەلی پیشەسازی و چێ کردنی ترۆمبیل دەگرێتەوە. لە نێوان سالانی ١٩٨٠-١٩٩٣دا ژمارەی ئەو کرێکارانەی کە لە کارخانە پیشەسازییەکانی رۆژاوای ئەورووپادا خەریکی کار بوون، لە ٢٧ میلیۆن کەسەوە گەیشتە ٢١ میلیۆن (*Eurosat; 1995: 288*).

## بەشی سێیەمینی ئابووری / tertiary economic sector

یەکێک لە دیاردە ئابوورییەکانی خولی پاش پیشەسازی، داهاتنی پیشەی خزمەتگوزارییە بەجێی بەرهەمهێنانی پیشەسازی. ولاتانی پێشکەوتوو بە گواستنەوەی کارخانەکان بۆ ئەو ولاتانەی خەریکی گەشەسەندنن، توانیویانە لە هێزی کاری هەرزانی ئەو ولاتانە کەڵک وەربگرن و هەم تەم و دووکەڵی کارخانەکانیان بۆ ئەو ولاتانە گواستۆتەوە و بۆ خۆیان لە بەشی خزمەتگوزاری و بەڕێوەبەرایەتی و بەرهەمهێنانی تیکنۆلۆجی و زانیاریدا کار دەکەن (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

ولاتانی هەژار تەنیا ٢٢ لە سەتی بەرهەمەکانیان لەم ڕێگایەوە دابین دەکرێ، کەچی لە سالی ١٩٧٠دا زۆرتر لە ٤٠ لە سەتی داهاتی ولاتانی

پێشکەوتووی رۆژاوای ئەورووپا لە سۆنگەی بەرهەمی کارخانەکانەوە دابین دەکرا (بەشی دووەمینی ئابووری). لە ساڵی ۱۹۹۲دا بەشی خزمەتگوزاری زۆرتر لە ٦٠ لە سەتی داهاتی ئەم وڵاتانەی پێک دێنا و ٧٠ لە سەتی هێزی کاری خەڵکی ئەورووپا بە چەشنێک لەم بوارەدا کار دەکەن ( *Eurosat; 1995: 250*). ئەم گۆڕانکارییە بە یەکێک لە گرینگترین گۆڕانکارییەکانی ئابووری نوێ دێتە ژمار.

## بەشی یەکەمینی ئابووری / primary economic sector

کۆمەڵناسان لە لایەکەوە شۆڕشی کشتوکاڵ و پیشەسازی و زانیاری لێک جیادەکەنەوەو لە لایەکی‌ترەوە ئابووری کۆمەڵگاکان بە سێ بەشی یەکەمین و دووەمین و سێیەمین دابەش دەکەن (بڕوانە: بەشی دووەمین و بەشی سێیەمینی ئابووری). لە لای ئەوان هەر یەک لەم شۆڕشانە بۆتە هۆی گۆڕانی هاوسەنگی لەناو بەشە ئابوورییەکانی کۆمەڵگادا. بەشی یەکەمین بریتیە لەو بەشەی کە مەوادی سەرەتایی و کاڵ راستەوخۆ لە سروشت هەڵدەگرن. ئەم بەشە کە بریتیە لە کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، ماسی‌گری، جەنگڵوانی و دەرهێنانی کانەکان، بەشی سە رەکی ئابووری کۆمەڵگا پێش پیشەسازییەکان دەگرێتە بەر. ٦٣ لە سەتی داهاتی وڵاتە هەژارەکان لە بەشی یەکەمینی ئابووریدایە. هەرچەند گەشەی ئابووری کۆمەڵگاکان زۆرتر بێ، بایەخی بەشی یەکەمین کەمتر دەبێتەوە. ئەم بەشەی ئابووری، ۳۲ لە سەتی داهاتی ئابووری وڵاتانێ ناونجی و ٤ لە سەتی داهاتی ئابووری وڵاتانی پێشکەوتوو پێک دێنێ (*Eurosat; 1995: 250*). ئەم بەشە لە زۆربەی شوێنەکانی جیهاندا خەریکە بایەخ و گرینگی خۆی لە دەست دەدا.

## بەها (بایەخ)/ value

بەها کۆمەڵایەتییەکان، بۆ خەڵکی روون دەکەنەوە کە چ شتێک گرینگ و

بەنرخە و دەبێ خەڵکی بە پێی ئەو بایەخانە هەڵس‌وکەوت کەن و چ شتێک لە باری ئەخلاقییەوە نالەبارەو دەبێ خەڵکی خۆی لێ بپوێرن (موحسێنی؛ ٢٠٠٦). بە پێچەوانەی واتای باوەڕ کە باس لە پێناسەی ئەو شتانە دەکات کە هەن، بەها، پەسنی ئەو شتانە دەکات کە دەبێ بن. بە واتایەکی ساکارتر، بەها، بریتیە لەو بۆچوونانەی کە دەڵێن چ شتێک دروستە و چ شتێک هەڵەیە. بەهاکان، پێوەرگەلێکن بۆ دادوەری کردن.

بەهاکان، پێوەرێکی کۆمەلایەتین و خەڵکی لەسۆنگەی ئەوانەوە جوانی و دلڕفێنی و خوشیکی کەس یان کردەوەیەک دەنرخێنن و دەیکەن بە ڕێنومای ژیانی کۆمەلایەتییان. واتاگەلێک وەکوو «ئازادی دەنگدان» یان «هەلی یەکسان» لە جڤاکە دیمۆکراتیکەکاندا واتای بەهادارن. بەها کولتووریەکان نە تەنیا چۆنییەتی بۆچوونمان لە مەڕ کۆمەڵگا پێک دێنن، بەڵکوو داڕێژەری بنەمای کەسایەتیمانن(عضدانلو؛ ١٣٨۴).

لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەندێ بەها گرینگی زیاتری پێ دەدرێت. لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا، بەگفت بوون، پێشکەوتنی ماددی و ململانێ، بەهاگەلی گرینگن. کەچی لە کۆمەڵگای ناپیشەسازیدا بەهاگەلیتر گرینگن. لە هەندێ کۆمەڵگادا گرینگی زۆرتر بە تاکخوازی دەدرێ، کەچی لە هەندێ کۆمەڵگایتردا بایەخی زۆرتر بە نیازە گشتییەکان دەدرێ؛ بۆ نموونە زۆربەی قوتابییانی بریتانی لە ئەزموونددا گەر ببینن قوتابیەک دەغەڵبازی دەکات و لە رووی کەسانیتر وەلام دەداتەوە، زۆری پێ تووڕە دەبن، کەچی قونابیانی رووسی ئەم تووڕەبوونەیان پێ سەیرە و پێیان وایە کە یارمەتیدانی یەکتری بۆ سەرکەوتن لە ئەزمووندا، بەهای کولتووریە (گیدنز؛ ٢٠٠۴).

لە کۆمەڵگایەکی ساکاردا، ڕێککەوتن لە سەر کۆمەڵە بەهایەک زۆر ئاسانە، کەچی لە کۆمەڵگایەکی نوێدا سیستەمێک لە بەهاکان، زاڵ و بالادەستن. وەکوو ئەوەی «گرینگی دان بە گەشەی ئابووری پێویستە یاخۆ

ژینگە؟» کۆمەڵگا دەبێ زۆرتر پەرە بە تاکخوازی بدا یان بیر و باوەڕی گرووپی؟ (موحسنی؛ ٢٠٠٦)

بە گۆڕانی کۆمەڵگاکان و ئاڵۆزتر بوونی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەهاکانیش تووشی گۆڕان دێن؛ تەنانەت بۆیان هەیە ببنە دژەبەها، یاخۆ دژە بەهاکان ببنە بەها و نۆرمی کۆمەڵایەتی. وەکوو ئەوەی کە پێوەندی سێکسی بەر لە زەماوەند یان پێکەوە ژیانی کوڕ و کچانێ کە ژن و مێردی رەسمی نین، لە چەن دەیەی لەمەو پێش، رووداوێکی نائاسایی و لادان لە بەهاکان بوو، کەچی ئێستا لە زۆربەی وڵاتاندا وەکوو دیاردەیەکی ئاسایی سەیری دەکرێ.

## بە کۆمەڵایەتیبوون / socialization

بەکۆمەڵایەتیبوون لە روانگەیەکی کۆمەڵییەوە بریتییە لە رەنگدانەوەی هەموو ئەو ئەزموونانەی کە لە رێگەیانەوە ئەندامانی گەنج و منداڵی کۆمەڵگا فێری کولتووری کۆمەڵگاکەی خۆیان دەبن. بەڵام لە روانگەی تاکەکەسییەوە، مرۆڤ لە رێگەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە ئامادەیی هەڵسوکەوتی ناو ژیانی کۆمەڵی تێدا پەیدا دەبێ(موحسنی؛ ٢٠٠٦).

لە باری دەروونناسی کۆمەڵایەتییەوە، بەکۆمەڵایەتیبوون بریتییە لەپرۆسەیەک کە تاک فێر دەبێ لە رێی فێر بوونی دابونەریتێک کە لە لایەن گرووپەوە دانی پێدا دەنرێ، خۆی لە گەڵ ئەو گرووپە سازگار بکا.

بەرفراوانی واتای ئەم زاراوەیە بە قەدەر رادەی هۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوونە. ت. پارسۆنز و ر. بیلز پاش روونکردنەوەی ئەم خاڵەی کە «ناوەندی سەرەکی بە کۆمەڵایەتی بوون، کۆمەڵگایەکە کە منداڵ تێیدا دیتە دونیاوە»، ئاماژە دەکەن کە رەهەندە گرینگەکانی کولتوور بۆ ئەم مەبەستە، بایەخەکانی کۆمەڵگان؛ هەروەها هەلومەرجی پێویست بۆ

بەکۆمەڵایەتی بوون «بوون لە بارو دۆخێکی کۆمەڵایەتییە کە تاک بەهێزتر و بەرپرسانەتر لەو سیستەمە کولتوورییەدا لە گەڵ یەک تێکەڵ بن؛ هەروەها هەر بەم چەشنە لە گەڵ منداڵانیان سیستەمێکی کۆمەڵایەتی پێک دێنن و ئەو میتۆدانە کە بە منداڵانی فێر دەکەن، لە خۆیاندا جێگیر و سەقامگیر دەبن».

زاراوەی بە کۆمەڵایەتی بوون زۆرتر سەبارەت بە منداڵان بە کار دەبرێ. بەڵام ئەم ڕەوتە لە ڕاستیدا گشتگیرە و گەورە ساڵانیش دەگرێتە بەر. تاک لە هەر تەمەنێکدا بۆی هەیە کە لە گەڵ گرووپی نوێدا ئاشنا بێ و بایەخەکانیان فێر بێ. زۆربەی کۆمەڵناسان ڕایان وایە کە بەکۆمەڵایەتی بوون خۆی لە دوو بیچمی سەرەکیدا دەنوێنێ:

١) بەکۆمەڵایەتی بوونی سەرەتایی: ئەم بەکۆمەڵایەتی بوونە لە منداڵیەوە دەست پێدەکا و بە گرینگترین بەشی بەکۆمەڵایەتیبوونی تاک دەناسرێ. بەکۆمەڵایەتیبوونی سەرەتایی لە نێو خێزانەوە دەست پێدەکا و لە باخچەی ساوایان و قوتابخانەدا درێژەی پێدەدرێ و لە کۆتاییەکانی نەوجەوانیدا کە تاک ئامادە دەبێ تا دەوری جۆراوجۆری گەورەساڵان لە نێو کۆمەڵگادا بگرێتە ئەستۆ، دوایی دێ. ئەم بەکۆمەڵایەتیبوونە، تاک بەرەو تێگەیشتن لە «خۆ»، کولتوور، زمان، ڕێسا (نۆرم)، بەهاکان و هەروەها تێگەیشتنێکی گشتی لە ژیانی کۆمەڵایەتی ڕێنوێنی دەکا. بەشە سەرەکییەکان ئەم چەشنە بەکۆمەڵایەتی بوونە بریتین لە: خێزان، گرووپی هاوساڵان، قوتابخانە و ڕاگەیاندنە گشتییەکان.

٢) بەکۆمەڵایەتی بوونی لاوەکی: ئەم بەکۆمەڵایەتیبوونە کاتێک دەست پێدەکا کە تاک بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی نوێی کۆمەڵایەتی ئامادە بێ. ئەم جۆرە بەکۆمەڵایەتیبوونە بریتیە لە پرۆسەیەک کە تێیدا تاکێک کە پێشتر بەکۆمەڵایەتی بووە، دەورێکی نوێی کۆمەڵایەتی دەگرێتە ئەستۆ و لە

پێگەیەکی نوێی کۆمەڵایەتیدا رادەوەستێ. کاتێک تاک بەکۆمەڵایەتی بوونی سەرەتایی دوایی پێ هێنا و بۆ خوێندنی پسپۆڕانە ئامادە بوو، بەکۆمەڵایەتی بوونی لاوەکی دەست پێدەکا. تاک لەم قۆناغەدا لە گەڵ نۆرم و رێساکانی کار ئاشنا دەبێ و لە باری زمانی کارییەوە رادێ. ئەم پرۆسە، تاک بۆ لە ئەستۆ گرتنی دەور یان پێگەی نوێی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکا. بێجگە لەمانەش، هەندێ رێو رەسمی وەکوو جێژنی دوایی هێنان بە خوێندن، لە گەڵ بەکۆمەڵایەتی بوونی لاوەکیدا گرێ دەخوا و پیشان دەدا کە شوێنگەی تاک لە کۆمەڵگادا گۆڕانی بە سەردا هاتووە (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## بیردۆز (تیۆری)/ theory

بە وردبوونەوە لە چەن کتێبی بیردۆزەکانی کۆمەڵایەتیدا بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەم زاراوە چەن واتای جۆراوجۆری هەیە. هەر کۆمەڵناسێک بە گوێرەی بۆچوونی خۆی پێناسەیەکی داوەتە دەست. ج. بیلی لە کتێبی بیردۆزی کۆمەڵایەتی لە کردەدا دەنووسێ: «تیۆری لە کۆمەڵناسیدا دەورێکی ئاڵۆزی هەیە؛ بیردۆز لەم زانستەدا وەکوو زانستەکانی‌تر دەبێتە هۆی هان دان و هەڵخراندن، یەکیەتی دەبەخشێ و بەرەو تۆژینەوەهانمان دەدات؛ بەڵام لە هەمان کاتدا بە رێبازی جۆراوجۆری دابەش دەکات کە هیچ پێوەندیەکی بە کردە و پراکتیکەوە نییە. لە ناوەرۆکیدا دەتوانین دابەش‌کردنێکی کاری دەسکردانە هەڵینجێنین». دیسان دەڵێ: «زاراوەی بیردۆزی کۆمەڵایەتی بە چەشنێکی لێڵ بە کار دەبرێ، بە جۆرێک کە هەندێ جار هەر لێکۆڵینەوەیەک دەگرێتەوە و هەندێ جاریش تەنیا ئەنجامی کۆڵینەوەکان کە بە چەشنێکی ئێستقرایی کۆوەکراون، دەگرێتە بەر. بەگشتی بەکارهێنانی بیردۆزی کۆمەڵایەتی لە هەردوو واتای گشتی و تایبەتیدا زانیاریمان سەبارەت بە هەڵی کەڵکوەرگرتن لە بیردۆزە

کۆمەڵناسانەکان فرەتر دەکات» (توسلی؛ ١٣٨٧)

بیردۆز بریتیە لە حوکم یا دەستوورێک کە چەندوچوونی پێوەندی واقیعە تایبەتەکانمان بۆ روون دەکاتەوە. پێوەندی کردن و تێگەیشتن و فام کردنی بینراوە تەریک و تاکەکان، دەمانباتە نێو ڕەهەندێکی تری کۆمەڵناسیەوە بە ناوی تیۆری. بە گشتی تیۆری دەستوورێکە بۆ روون کردنەوەی چۆنییەتی و چەندایەتی پێوەندی واقعیەتەکانی نێو کۆمەڵگا. لە ژێرەوە بۆ روون بوونەوەی باشتری بیردۆز، چەن نموونە لە پێناسەجۆراوجۆرەکانی دێنین:

١- ئەمڕۆکە تیۆری بە گشتی بریتیە لە لێکدانەوە و شرۆڤەی بەربڵاوی پرسەکان لە ڕێی بیرو خەیاڵ و رامانەوە، بەبێ ئەوەی کە هیچ پێوەندیەکی بە کردەوە بێ. ئەم پێناسە دوو خاڵمان بۆ روون دەکاتەوە: یەکەم گریمانەیی بوونی بیردۆز؛ دووەم، کەم پێوەندی بوون بیردۆز لە گەڵ کردە. بەم بۆنەوە لەم پێناسەدا بیردۆز خاوەنی واتایەکی ناکردەیی یا ناواقعییە.

٢- بە پێچەوانەی پێناسەی ژمارەی یەک، ئەزموونخوازان رایان وایە کە بیردۆز بریتیە لە کۆشەوەیەکی پراکتیکی بۆ کۆوەکردنی بەڵگە و دەسکەوتە ئەزموونییەکان و دیتنەوەی یەکگرتوویی نێوان داتاکان و روون کردنەوەو راڤەی ئەو دەسکەوتانە لە ڕێی لێکدانەووە (ئێستقرا)، بەبێ ئەوەی خەیاڵ و داڵغە هیچ دەورێکیان تێیدا هەبێ. بە واتایەکی‌تر بیردۆز بریتیە لە دیتنەوەی پێوەندیەکی عێللی لە نێوان دیاردەکاندا. هەرچەند دەبێ ئاماژەی پێ بکەین کە ئەم پێناسە لە لایەن ئاوەزخوازانەوە پەسند نەکراوە. هەروەها مێژووی زانست پێمانی پیشان داوە کە تیۆری بە هۆی لێکدانەووە (ئێستقرا) بەدەست نایێ، یا گەر بەدەست بێ، ئەوەندە بەرتەسکە کە ناتوانین ناوی بیردۆزی بە سەردا بنێین.

٣- بیردۆز بریتیە لە کۆمەڵە یاسایەک کە لە سەر بنەما لۆجیکییەکاندا پێکەوە پێوەندییان هەیە و روونکەرەوەی بەشێک لە واقعییەتن. بە گوێرەی

ئەم پێناسەیە، بەردی بناغەی تیۆری، بریتیە لە یاسامەند بوون. بە واتایەکی تر، بیردۆز گوتارێکە کە پیشاندەری پێوەندی عیللی نێوان دیاردەکانە. بەلام لەم پێناسەشدا روون نەبۆتەوە کە ئایا ئەم پێوەندییە عیللییە بە هۆی ئەزموون و لێکدانەوەوە (ئیستقرا) بە دەست دێت، یاخۆ بە هۆی هەلسەنگاندنەوە (قیاس) (رفیع‌پور؛ ١٣٦٠).

٤- تیۆری بریتیە لە کۆوەکردن و وردبوونەوە لە تەوەرگەلی جۆراوجۆر لە نێو بازنەی کۆمەلەیەکی یەکگرتوو و لۆجیکیدا، بە چەشنێ کە بتوانین بە هۆی ئەم کۆمەلەوە هەندێ لە دیاردەکان راڤە بکەین. «بیردۆز بە شێوازی گریمانەیی لە لایەن هەموو زانایانەوە پەسند کراوە» (مندراس؛ ١٣٤٩). ئەم پێناسە لە راستی زۆر نزیکترە (توسلی؛ ١٣٨٧).

بێ‌شک بیردۆزەکان ناتوانن پەرسڤدەری هەموو کێشەکانی کۆمەلگا بن و لە هەموو رەهەند و لایەنەکانی بابەتە کۆمەلایەتییەکان بکۆلنەوە. بەلام بۆ گەیشتن بە وەلامێکی شیاو و گونجاو لە سەر پرسێکی کۆمەلایەتی، پێویستە کە لە دەرەوەی بازنەی تیۆرییەکان، هان بدرێ کە زانیارییەجۆراوجۆرەکان کۆوە بکرێن و بۆ لێکدانەوە و باشتر تێگەیشتنیان، لە بیردۆزەکان کەلک‌وەربگیرێ. هیچ بیردۆزێک ئەوەندە گشتگیر نییە کە هەموو بابەتەکان لە نێو بازنەی خۆیدا بگرێ؛ تەنانەت زۆرن ئەو کۆمەلناسانەی کە دەست دەدەن بە دارشتنی بیردۆزێک، کەچی بۆ خۆیان لە کردەدا و لە کاتی وردبوونەوە و لێکدانەوەدا، لەو بیردۆزەیان کلا دەبن.

## بێسانکار / horticulture

تا چەن دەیەی لەمەو پێش، کۆمەلناسان پێرەوی ئەم گریمانەیە بوون کە بە هۆی ئاوەز و فامی مرۆڤەکانەوە، داهێنانی تێکنۆلۆژیکی و گەشەی کۆمەلگاکان دەبێ بە کارێکی ئاسایی و سروشتی بزانرێ. بەلام لەم

دواییانەدا هەندێ پرس و گومان لە سەر ئەم بیرو بۆچوونانە هاتە کایەوە. کۆمەڵەیەکی بەرچاو بە توێژینەوەگەلی مێژینەناسی ئاشکرایان کردووە کە زۆربەی کۆمەڵگا راوچییەکان، هەزاران ساڵ بەر لەوەی بە هۆی شێوازی بێسانکارییەوە بژیوی ژیانیان دابین کەن، لە گەڵ ئەم شێوازە ئاشنایەتییان هەبووە (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

هۆی هاتنەدی ئەم جڤاکانە دەگەڕێتەوە بۆ ئاشنا بوونی ئەندامانیان لە گەڵ توو چاندن، بەخێو کردن و هەڵگرتنی روەکە خۆراکییەکان. بۆ گواستنەوەی کۆمەڵگا راوچییەکان بۆ کۆمەڵگای بێسانکار، ئاماژە بە سێ هۆکاری سەرەکی کراوە: ١) گۆڕانی ژینگە ٢) زۆربوونی جەماوەر ٣) گەشەی زانیاریە کولتووری و تیکنۆلۆجیکیەکان. بێڵ و دەیلەمی چێوی بۆ کەندنی خاک، لە گرینگترین و سەرەکیترین ئامراز و کەرەسەکانی ئەم چاخەدێنە ئەژمار (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣). هەروەها رەوتی ئەم کارە لە سەر تیکنۆلۆجیای «کەندن و سووتاندن»دا دارێژراوە. لەم شێوازەدا بێسانکارەکان بەشێک لە زەوی لە دارو گژو گیا خاوێن دەکەنەوەو ئاوریان تێبەردەدەن و خۆڵەمێشەکەی وەکوو کوود بەکار دەبەن و بۆ ماوەی دوو تا سێ ساڵ توو دەچێننە نێو خاک تا ئەوەی کە خاکەکە توانی خۆی لە دەست بدات. پاش ئەوە ئەم پرۆسەیە لە شوێنێکیتردا دووپاتە دەکەنەوە (رابرتسون؛ ١٣٧٥). لەم چاخەدا ژنان دەورێکی زۆرتر دەگێڕن و ئەرکی کێڵان و هەڵگرتنی بەرهەمەکانیان لە ئەستۆ بووە و پیاوان بە گوێرەی خولی راو، هەل و کاتی زۆرتریان هەیە و زۆرتر دەپەرژانە سەر ئەو کارانەی کە دژوارتر بوون (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣). کۆمەڵناسان، کۆمەڵگای بێسانکار بە یەکەمین شۆڕشی مەزنی کۆمەڵایەتی لە مێژووی مرۆڤدا دەزانن. هەرچەند ئەم گۆڕانە لە روانگەی خەڵکی ئەو سەردەمەدا بە هۆی بەرەبەرە بوونیەوە بە شۆڕش نەزاندراوە. گواستنەوە لە قۆناغی راو و کۆکردنەوەی خۆراک بۆ بێسانکاری،

بوو بە هۆی پتر بوونی بەرهەم، زۆرتر بـوونی باڕسـت، گـەشـەی جـەمـاوەر، نیشتەجێ بوون، داهاتنی بازرگانی، هاتنـەدی پێگـە و دەوری نـوێی وەکـوو سیحربازی و پیشەسازی.

سیسـتەمـی خزمایـەتی لـەم جڤـاکانەدا شـێوازێکی ئاڵـۆزتری هـەیـە و گرووپگەلی خوێنی بەرفراوان یان کلان هاتوونەتە دی و بە بۆنەی مانەوە لـە یەک شوێن و چاندنی مـردووەکـان لـە شـوێنێکی دیـاریکراودا، پـەرسـتنی پێشوونان بایەخێکی بەرچاوی بەدەست هێناوە. هەروەها لـەم کۆمـەڵـگایەدا خزمانی دایکی بایەخێکی زۆرتریان هەیە؛ رەنگە هۆکـەشـی بگـەڕێتـەوە بـۆ بەشداری زۆر و بەرچاوی ژنان لە کاری بەرهەمهێنان و نەبـوونی پیـاوان لـە نێو خێزاندا بە هۆی رۆیشتن بۆ راو یان شـەڕ لـە گـەڵ دوژمنـان (غفـاری؛ ١٣٨٨).

## بێکاری / unemployment

بێکاری بریتیە لە دیاردەیەکی بەرفراوان و زۆر گرینگ کە لـە سـەرەتـای دەیەی ١٩٨٠دا وەکوو کێشەیەکی گرینگی کۆمەڵایەتی خراوەتە بـەر بـاس. شرۆڤەی ئامارە فەرمییەکانی بێکاری ئاسان نییە و ناتوانین بـە ئاسـانی ئـەم دیاردەیە پێناسە بکەین. لێرەدا مەبەست لە کار، کـاری کـرێ، یـان کـار لـە پیشەیەکی ناسراودایە. ئەوانەی وەکـوو بێکـار ناویـان نووسـراوە، رەنگـە بـە شێوەی کاتی، خەریکی هەندێ کاری وەکوو رەنـگ کـردنی خانووبـەرە یـان باخەوانی بن (گیدنز؛ ١٣٨٥).

بێکاری بە یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی بـەرهـەمهێنـانی سـەرمایـەداری دەزانن. لەو وڵاتانەدا کە هەنووکـە گـەشـەیـان نـەسـەنـدووە و لـە شـێوازە سەرەتاییەکانی دان و ستانی بازاڕی و بازرگانی سوننەتی بـۆ دابـین کـردنی بژیوی ژیانیان بەهرە وەردەگرن، ناتوانین رادەی بێکاری بە چەشنێکی شـیاو

و به گوێرەی ئەو پێوەرانەی لە دونیای مۆدێڕندا هەیە لە پێوانە بدەین. مەرجی بێکاری لە کۆمەڵگا نوێکاندا بوونی خاوەن کارە؛ کەسانێک کە خاوەنی کاری خۆیانن و بۆ خۆیان کار دەکەن، ناتوانن بێکار کەون، ڕەنگە لە هەندێ هەلومەرجدا کاریان نەبێ؛ ئاوەها پێناسەیەک، خۆی لە کێشەی بێکاری چینی جووتیار، دووکاندار و ئەوانەی کاری ئازادیان هەیە، لادەدا. بە زۆرتر بوونی تەمەن، زۆربەی ئەوانەی خەریکی کارن، بە چەشنێکی ئارام و نادیار ڕادەی چالاکیان کەم دەبێتەوە و زۆر بە دژواری کاتی لە دەست دانی توانی کاریان ڕەچاو دەکرێ. هەروەها ئافرەتێک کە خەریکی کاری ئاسایی ناوماڵە، ناکرێ بە بێکار بزانرێ.

نووسینگەی نێونەتەوەیی کار بۆ پێناسەیەکی ستاندارد لە کار، بایەخی زۆر دادەنێ. بەرپرسانی ئەم نووسینگەیە کەسانێک بە کارکەر دەزانن کە یان بۆ خۆیان کار دەکەن، یاخۆ بۆ کەس یان کەسانیتر کاردەکەن؛ یاخۆ کەسانێکن کە خەریکی کاری خانوویین و هیچ مووچەیەک وەرناگرن و لە حەوتەدا لانی کەم پانزدە سەعات خەریکی جێبەجێ کردنی ئەرکێکن کە ڕاستەوخۆ پێوەندی بە کارو باری ناوخۆی بنەماڵەوە هەیە، بەبێ لە بەرچاو گرتنی کاتێک کە بۆ کاری نێو خێزان تەرخان کراوە و مووچەی پێ نادرێ. بە کەسانێک دەڵێن بێکار، کە لەو ڕۆژەوە کە خەریکی کار نین، هەستن بۆ دیتنەوەی کار و گەر کارێکیان پێ پێشنیار کەن دەتوانن لە ئەستۆی بگرن (گولد؛ ١٣٨٤).

## پادشایەتی (مۆنارشی)/ monarchy

پادشایەتی یا مۆنارشی بریتیە لە حکوومەتێک کە سەرۆکی دەوڵەت یا حکوومەت، پادشا یا شاهینە بێ کە خاوەنی بایەخێکی تایبەتی دینی یاخۆ سەمبۆلیک بن. هەروەها پادشایەتی بریتیە لە ١) دامەزراوەیەکی تایبەت لە نێو ئەو حکوومەتەدا، ٢) دەوڵەتێک کە ئاوەها حکوومەت یا دامەزراوەیەکی بێ.

بۆ ئەرەستوو ئەم زاراوە بە مانای حکوومەتێکی «تاکەکەسی» بوو، جا ئەوە چ بە شێوەی پادشایەتی بێ یاخۆ بە شێوەی ملهۆڕانە و ستەمکارانە. هەرچەند لە کتێبی پێنجمی politicsدا لە نێوان حکوومەتی مۆنارشی و حکوومەت لە واتای تایبەتدا جیاوازی دادەنێ، چونکە مۆنارشی لە ریزی جۆرەکانی حکوومەتدا دانانێ، بەڵکوو بە نوێنەری دەسەلاتێکی تاکەکەسی دەزانێ کە لە هەر جۆرە سنوور و پاوەنێک رزگارە. کەچی لە کتێبی سێهەمدا مۆنارشی بە یەکێک لە شێوازەکانی حکوومەت ناو لێدەبا (ارسطو؛ ١٣٨٦).

ئەمرۆکە ئاوەها دەسەلاتێکی بێبەرگر و بێڕادە، لە بەرانبەر حکوومەتی پادشایەتی پەرلەمانیدا دادەنێن و پێی دەڵێن، پادشایەتی رەها یا موتڵەق. پادشایەتی پەرلەمانی بریتیە لە سیستەمێک کە تێیدا پادشا سەرۆکی ولاتە و بێجگە لە هەندێ ئەرکی سەمبۆلیک و رواڵەتی، ئەرکێکی وای لە ئەستۆ نییە؛ مەگەر ئەوەی لە هەندێ ولاتدا لە ژێر چاودێری پەرلەماندا ئەرکی هەڵبژاردنی سەرۆک وەزیرانی خراوەتە ئەستۆ.

بۆ جیاکردنەوەی حکوومەتی کۆماری و پادشایەتی ئاماژە بە سێ خاڵ دەکرێ:

١) جیاوازییەکە بریتیە لەوەی کە «لە شوێنێکدا کە سەرۆکی دەوڵەت هەمان سەرۆک کۆمار بێ، ئەو حکوومەتە کۆمارییە، لە شوێنێکیشدا کە

سەرۆکایەتی دەوڵەت لە ئەستۆی پادشا یان شاهینە بێ، ئەو حکوومەتە پادشایەتییە».

٢) زۆر کەس دەڵێن لە سیستەمێکدا کە حکوومەت بە میرات بگاتە جێنشنانی حکوومەت، ئەوە دیاردەی حکوومەتی پادشایەتییە. بەڵام میراتی بوونی حکوومەت، تەنیا یەکێک لەو چوار هۆکارەیە کە دەکرێ لە سەر تەختی پادشایەتی رۆبنیشێ. هۆکارەکانی‌تر بریتین لە هەڵبژێردران بە هۆی خەڵکەوە، هەڵبژێردران بە هۆی پادشای پێشووەوە، هەڵبژێردران بە هۆی بەخت و هات و غەیبەوە.

٣) بوونی یەک یا هەردووی ئەم بابەتانەی کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەکرێ، پادشایەتی لە هەموو شێوازەکانی‌تری حکوومەت جیادەکاتەوە: ئا) رەهەندی سیحراوی یا ئاینی بوون کە زۆرجار بە رێو رەسمی تایبەتی تاجگوزارییەوە جێبەجێ دەکرێ. ب) بوونی ئەرکێکی تایبەت و سیمبۆلیک. بۆ وێنە لە راگەیندراوێکی فەرمی سەبارەت بە پادشایەتی لە بوگاندادا هاتووە کە: «کاباکا... هەروا بەردەوام سەمبۆلی یەکیەتی خەڵکی بوگاندا و پێوەندی نێوان رابردوو و ئێستا و داهاتووە» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

پادشایەتی یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی حکوومەت لە کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکاندا بووە. پادشایەتی لە ئەورووپادا لە سەر بنەمای یاساوە دانرابوو، هەرچەند رەنگە ئەم یاسایانە بۆ بەربەست کردنی دەسەڵاتی پادشا زۆر بەرتەسک و سنووردار یاخۆ نادادوەرانە بووبێتن. بەڵام لە خولێکی کورتدا کە پادشایەتی رەها یان دیسپۆتیک دەسەڵاتدار بوو، مافەکانی دەوڵەت بێ‌سنوور نەبوون. حکوومەتی دیسپۆتیک بەهێزترینی حکوومەتەکانی ئەرووپا بوو، بەڵام ئەویش دەبوایە لە هەندێ یاسا و پێوەر پێڕەوی بکات. بۆ وێنە لوویی چوارەدەهەم کە دەسەڵاتدارترین پادشای فەرانسە بوو، نەیدەتوانی لەخۆڕا و بەبێ هیچ پشتگیرییەکی یاسایی گیان یا

ماڵی یەکێک لە خانەدانەکان یاخۆ بەرپرسە حکوومییەکان، بازرگانان و کاربەدەستان بگرێ.

لە رۆژاوادا کەسێک دەبوایە ببێتە پادشا کە لە بەرەی پادشایان بێ. بۆ وێنە کەس لە چینێکی خوارتر لە چینی پادشاکانەوە نەیدەتوانی ببێتە پادشا. ئەلیزابتی دووەم، شاهینەی بریتانیا، وەچەی جۆرجی یەکەمە کە لە ١٧١٤-١٧٢٧دا پادشایەتی کردووە. هەرچەند جۆرجی یەکەم ئاڵمانی بووە، بەڵام چونکە بنەماڵەی ستوارت میراتبەرێکی پرۆتستانی لێ بەجێ نەما، جۆرجی یەکەم توانی ببێتە میراتبەری ئەو دەسەڵاتە. جۆرجی یەکەمیش بۆ خۆی لە بەرەی جەیمزی یەکەم بوو کە لەسالانی ١٦٠٣-١٦٢٥ دا پادشای بریتانیا بوو.

بەڵام پادشایەتی لە ئێران و ولاتانی رۆژهەلاتدا بە گشتی زۆر جیاواز بووە. بوون بە پادشا لە رۆژاوادا پێویستی بە شکۆی خودایی بوو. واتە پێویست بوو کە تاک بە هەر پێگەیەکی کۆمەلایەتییەوە کە بێ، لە لایەن خوداوە بۆ پادشایەتی هەڵبژێردرێ. دیارە ئەم هەڵبژاردنەش یا بە هۆی بەخت و هاتەوە بووە، یاخۆ بە هۆی زۆر و شەڕ و کوشتارەوە. پادشا ناچار بوو کە دان بە ئایینی خەڵکدا بنێ و رێزی بۆ دابنێ و لایەنگری لێ بکات تا بە هۆی بەرپرسە ئاینییەکانەوە دەسەلاتەکەی بسەلمێندرێ. بۆ وێنە بە وردبوونەوە لە پادشاکانی ئێران بۆمان روون دەبێتەوە کە چلۆن پادشایەک هاتۆتە سەر کار و پادشایەکی‌تری لەناو بردووە. سەفەوییەکان تۆرەمەی شێخ سەفیەدین بوون. شێخ سەفی زانایەکی ئاینی بوو کە هیچ پێوەندییەکی بە حکوومەتەوە نەبوو. پاش سەفەوییەکان نادرشای ئەفشار هاتە سەر کار. پاش نادر کەریمخانی زەند کە حکوومەتی زەندییەی بنیات نا. دوای ئەوانیش حکوومەتی قاجارەکان و پاش ئەویش حکوومەت پەهلەوی. رەزاخانی پادشای ئێران کابرایەک بوو لە چینی خوارووی کۆمەڵگاوە. سەربازێک بوو

کە خۆی گەیاندە پادشایەتی. دەبینین ئەم پادشایەتییە -کە پێویستی بە شکۆی ئیزەدی بوو- زۆر لە گەڵ ئەو پادشایەتییە کە پێویستی بە پێوەندی خوێنی لە گەڵ تۆرەمەی پادشایان بووە جیاوازی هەیە (کاتوزیان؛ ١٣٨٨).

بە وردبوونەوە لە نێو دیرۆکە کوردییەکانیشدا، راستی ئەم پەیڤەمان بۆ روون دەبێتەوە. یەکێک لەو دیرۆکە کوردیانە کە جێگای باش و وردبوونەوەیە، چیرۆکی شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێیە. کاتێک شێخ فەرخ لە وڵاتی خۆی هەڵدێ و بەرەو گەرمیان دەڕوا و دەڕوا بۆ لای ماڵی خالی، خالی ئاوڕی لێناداتەوە و شێخ فەرخ ئاوارەی کووچەو کۆڵان دەبێ. کاتێک پادشا یا حاکمی ئەو شوێنەبە ئەمری خودا دەچێ و میراتبەری لێ بەجێنامێنێ، خەڵکی بۆ هەڵبژاردنی پادشا بازی شاهی هەڵدەفڕێنن. ئەو بازەش لە سەر شانی هەرکەس بنیشێتەوە، ئەو کەسە بێچەند و چوون دەبێتە پادشا. دەبینین کە بازەکەش لە سەر شانی فەرخۆڵەی ئاوارەی دوورە وڵات دەنیشێتەوە و دەبێتە پادشا. لەم هەڵبژاردنەدا هیچ ئاوڕ لەوە نادرێتەوە کە ئەم پادشا لە بەرەو تۆرەمەی پادشایانە یانە، بەڵکوو بەم بۆچوونەی کە ئەو بازە لە لایەن خوداوە، دەستووری پێدراوە و ئەو کەسەی کە وەکوو پادشا هەڵدەبژێردرێ، لە راستیدا شکۆی ئیزەدی ئاوڕی لێداوەتەوە و پەروەردگار ئەو پلەوپاگەیە پێیداوە (ئۆسکارمان؛ ٢٠٠٥).

هەروەها دەبینین کە دەسەڵاتی پادشا لە ئێراندا هیچ تخووب و کەوشەنێکی نەبووە. پادشا بەبێ هیچ بەڵگە و بیانوویەک توانیویە گیان و ماڵ و سامانی پایەبەرزەکانی حکوومەت، بازرگانان، دادوەرەکان و وەزیرەکانی بگرێ. پادشا خۆی بە نوێنەری خودا لە سەر زەوی زانیوە و هیچ پێویستی بۆ چەسپاندنی ئەم دەسەڵاتەی نەبووە. پادشا بە سەر گیان و ماڵی خەڵکدا دەسەڵاتی بووە. ئەم راستیەلەنێو ئاسەوارەئەدەبی و ئاینییەکاندا بە روونی رەنگی داوەتەوە. غەزالی لە کیمیای بەختەوەریدا چیرۆکێک دەگێڕێتەوە کە سەرنجڕاکێشە. پادشایەک

**پادشایەتی**

وەزیرێکی باوەڕپێکراوی دەبێ کە دەبێتە جێی بەخیلی دەستوپێوەندەکانی تری پادشا. جارێک یەکێک لە دوژمنەکانی کابرا، پیلانێکی بۆ دەڕێژێ و بانگی دەکاتە ماڵی خۆی و خواردنێکی زۆر خۆشی پڕ لە سیری بۆ لێدەنێ. پاشان دەڕواتە لای پادشا و دەڵێ ئەم وەزیرەی کە ئەوەندە بڕوات پێیە، دەڵێ هەناسە پادشا بۆنی پیسی دێ، بەڵگەش ئەوەیە کە بەیانی هات سەرنجی بدە بزانە دەست بە بینیەوە ناگرێ؟ بەیانی کابرای وەزیر چونکە خۆراکی پڕلە سیری خواردووە و دەمی بۆنی سیری دێت، بۆ ئەوەی بۆنەکەی پادشا نەڕەنجێنێ، دەست بە بینیەوە دەگرێ. پادشاش پێی وایە مەبەستی سووکایەتی بە پادشایە، بۆیە فەرمانی کوشتنی کابرا دەدات (غەزالی؛ ١٣٨٩). هەرچەند غەزالی لەم سەربهوردە مەبەستێکی تری هەیە، بەلام خالێکی سەرنجڕاکێشی تێدایە، ئەوەش هەمان دەسەلاتی بێسنووری پادشایە، کە تەنیا لە بەر ئەوەی کە پێی وابووە وەزیرەکەی گوتوویە پادشا بۆنی زاری دێت، فەرمانی کوشتنی داوە، ئەوەش بەبێ هیچ بەربەست و گرفتێک. لەم چەشنە چیرۆک و سەربهوردانە لەنێو ئاسەوارە ئەدەبی و ئاینییەکانی رۆژهەلاتدا بەزۆری هەیە. بەلام هەرچەند کاتێک جەیمزی یەکەم پادشای ئەنگلتەرە نووسی پادشایان جێگرانی خودان لە سەر زەویدا، زۆر لەبیردۆزی شکۆی ئیزەدی رۆژهەلاتییەکان نزیک بۆتەوە. جەیمزی یەکەم لە دژایەتی لە گەل ناونجیگەرییەکانی دادگای تایبەتی پادشایەتیدا نووسی کە گومان کردن لەو شتەی کە پێوەندی بە «رەمز و رازی خودایی»وە هەیە دژایەتییە لە گەل یاسا. بەلام هەر ئەوەی کە پادشا ناچار بووە بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی لە گەل دادوەرەکاندا شەڕەقسە بکات و بۆ چەسپاندنی رەوابوونی خۆی لە یاسا یارمەتی بخوازێ، پیشان دەدا کە ئەم پادشایەتییە چەند لە گەل پادشایەتی رۆژهەلاتییەکان جیاوازی بووە. (کاتوزیان؛ ١٣٨١).

## پارادایمی ململانێ / the conflict paradigm

پارادایمی ململانێ چوارچێوەیەکە بۆ دارشتنی ئەو بیردۆزانەی کە کۆمەڵگا بە مەڵبەندێکی نابەرانبەر دەزانن، مەڵبەندێک کە دەبێتە هۆی هاتنەدی ناتەبایی و ململانێ. ئەم بیدۆزە یاریدەرێکە بۆ پارادایمی ئەرکخوازی، بەم جیاوازییەوە کە پارادایمی ململانێ جیاوازی و نایەکسانییەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکان زەقتر پیشان دەدات. کۆمەڵناسانێ کە پێڕەوی لەم پارادایمە دەکەن، وان بە دووی دیتنەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەوە کە چلۆن هۆکارگەلێک وەکوو چینی کۆمەڵایەتی، رەگەز، نەتەوە، رەچەڵەک و تەمەن لە گەڵ دابەش کردنی نابەرانبەری سامان، دەسەڵات، خوێندن و بایەخی کۆمەڵایەتیدا گرێیان خواردووە. تۆژەرانی ململانێ بە جێی گەشەدان بە ئەرکەکانی کۆمەڵگا، ئەم خاڵە زەقتر دەکەنەوە کە: پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان قازانجی هەندێ کەس دابین دەکەن و کەسانیتر لە قازانجەکانیان بێبەش دەکەن. پێداگری ئەم کۆمەڵناسانە لە سەر ململانێیە کۆمەڵایەتییەکانە کە لە نێوان چین و توێژە زاڵەکان و چینە کەمدەسەکانی کۆمەڵگادا هەیە: پێوەندی دەوڵەمەندان لە گەڵ هەژاران، سپی پێستان لە گەڵ رەشپێستان، ژنان لە گەڵ پیاوان و هتد. لە لای لایەنگرانی ئەم پارادایمە ئەوانەی کە خاوەنی پلە و پاگە سەرووەکانی کۆمەڵگان، تێدەکۆشن پلە و پاگەی خۆیان بپارێزن و ئەوانەش کە بێبەشن هان دەدەن دەسەڵاتێک بخەنە دەست. کەواتە لە لای ئەم کۆمەڵناسانەوە، کۆمەڵگا بەردەوام گۆڕەپانی شەڕ و ململانێی نێوان چینی سەروو و چینی خوارووی کۆمەڵگایە. بە گوێرەی ئەم روانگەیە:

١) پۆلێنکردنی کۆمەڵایەتی ئاکامی ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکانە. کانە کۆمەڵایەتییەکان لە خزمەت دابین کردنی پێداویستییەکانی هەندێ لە چینەکانی کۆمەڵگادان و چینەکانیتر لەم کانانە بێبەهرەن.

٢) پۆلێن کردنی کۆمەلایەتی دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆربەی هەرە زۆری لێهاتووییەکانی ئەندامانی کۆمەلگا نەگەشێنەوە و هیچ بەهرەیەکیان لێ وەرنەگیرێ.

٣) پۆلێن کردنی کۆمەلایەتی تەنیا بۆ هەندێ لە خەلکی کەلکی هەیە.

٤) بەها و باوەڕە کۆمەلایەتییەکان ئایدیۆلۆژیکین؛ لە راستیدا ئەم بەها و باوەڕانە دەنگدانەوەی ویستی ئەندامانی بەهێزی کۆمەلگان.

٥) چونکە سیستەمگەلی پۆلێن کردنی کۆمەلایەتی تەنیا پێداویستی و نیازەکانی پاژێک لە کۆمەلگا دابین دەکەن، ناتوانن زۆر پتەو و قایم و نەگۆڕ بمێننەوە.

## societal protection / پاراستنی کۆمەلایەتی

پاراستنی کۆمەلایەتی چوارەمین و دوامین پاکانەیە بۆ تەمبێ (بڕوانە: سزادان، بەرگری کردن،بووژاندنەوە). پاراستنی کۆمەلایەتی ئامرازێکە بۆ ئەوەی کۆمەلگا بەر بە دووپاتە بوونی تاوان بگرێ (لە ڕێی لەبەندکردنی کاتی، لە بەند کردنی دائێمی، کوشتن). پاراستنی کۆمەلایەتیش وەکوو بەرگری کردن، ڕێگایەکی لۆجیکییە بۆ تەمبێ و سزادان و هان دەدا کە لە دووپاتە بوونی تاوان و لادانی کۆمەلایەتی بەرگری بکات. بە واتایەکی تر، تەمبێی تاوانبار، بۆ پارێزگاری لە کۆمەلگایە. ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی نوێیە و زۆر ساکارتر لە بووژاندنەوەیە. گەر کۆمەلگا نەتوانێ لە ڕێی بووژاندنەوە تاوانکار بێنێتەوە سەر هێلی راست، یاخۆ هەلومەرجی کۆمەلایەتی بگۆڕێ، بە لەبەند کردن یاخۆ کوشتنی تاوانبار، خەلکی لە تاوانەکان دەپارێزێ (شیخاوندی؛ ١٣٨٦. سروستانی؛ ١٣٨٧).

## party / پارت

پێناسەیەک لە سەرجەمی ئەو دیاردانەی لە دونیای ئەمڕۆدا بە ناوی پارت

بەناوبانگن ڕەنگە کارێکی ئەستەم و دژوار بێ، مەگەر ئەوەی کە پێناسەیەکی گشتی لێ پێشکەش بکرێ. بەم چەشنە پارت بریتیە لە تاقمێک لە تاکەکان کە پرسە گشتییەکان گەلاڵە دەکەن و کاندیدای دەنگ دانەکان دیاری دەکەن.

ڤیبێر دەڵێ: لە کۆمەڵگا هەنووکەییەکاندا، دامەزراندنی پارت، ڕەهەندێکی گرینگ لە دەسەڵات پێک دێنێ. بە بۆچوونی ڤیبێر پارت بریتیە لە تاقمێک لە تاکەکان کە بە بۆنەی هاوبەشی لە ڕوانگە و قازانج و بۆچوونەکانیانەوە دەست دەدەن بە کارێکی هاوبەش. مارکس بە گوێرەی ناتەبایی چینایەتی دەستی دا بە شرۆڤەی جیاوازی و دژایەتیەکانی پێگە و دامەزراوەپارتیەکان. بە گوتەی ڤیبێر هەریەک لەم دوانە بۆ خۆیان دەتوانن بە سەر هەلومەرجی ئابووری تاکەکان و گرووپەکاندا کاریگەرییان هەبێ و لەم سۆنگەوە بە سەر چینەکانیشدا کاریگەر بن. پارتەکان ڕەنگە داواکارییەکیان هەبێ کە سەرتر لە جیاوازی چینایەتی بێ؛ بۆ وێنە پارتەکان ڕەنگە بە گوێرەی پێوەندی ئایینی یان نەتەوەیی دابمەزرێن (گیدنز؛ ١٣٨٤).

مانتی جانستۆن دەڵێ: مارکس و ئەنگلس قەد نەپەرژانە سەر بیردۆزێکی تەواو سەبارت بە پارتە ڕامیارییەکان. بەپێچەوانەی ئەوان لە بۆچوونی لنیندا سەبارەت بە پارت، خاڵێکی زۆر ئەکتیڤ و بەهێز هەیە کە پیشان دەدات لنین بایەخێکی هزری و پراکتیسی ئەوتۆی بۆ دادەنا. لە بەرهەمەکانی لنینیشدا -وەکوو مارکس- پتر لە یەک مۆدێلی پارت دەتوانین ببینین، هەرچەند کە لە نێو هەموو ئەو پارتانەدا بڕوایان بە یەک پارتی پێشڕەوە کە تێدەکۆشێ بیردۆز و زانستی سووشیالیستی لە گەڵ بزاڤی خۆئەنگێزی کرێکاریدا ئاوێتە بکات (باتامو و میلیبند؛ ١٣٨٨).

هەندێ لە پێناسە هەنووکەییەکانی پارت لە سەر تەوەری ئەنگێزەی دەسەڵاتی پارتەکان جەخت دەکەن، بەم بۆنەیە کە سی. ئا. مریام و

## پارت

گاسێنگڵ دەڵێن: «دەتوانین پارت بە جۆرێک گرووپی کۆمەڵایەتی بزانین کە زۆتر لە سەر کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بە چەشنێ کە لە لایەن حکوومەتەوە بەڕێوە دەبرێ، جەخت دەکەن. سیستەمی پارتی دەکرێ بە دامەزراوەیەک بزانرێ کە حکوومەت کامڵ دەکا، لە دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی کاربەدەستانی حکوومەت و دیاری کردنی سیاسەتە گشتییەکانی حکوومەت یارمەتی خەڵکی دەدات و هەروەها دەورێکی گرینگتر کە دەیگێڕێ بریتیە لە ڕەخنە گرتن لە بەڕێوەبەرایەتی حکوومەت». هەر بەم چەشنە سی. جەی. فرێدریک دەڵێ: «گرووپێک لە تاکەکان کە بە چەشنێکی سەقامگرتوو و بە مەبەستی بەدەستگرتن و کۆنترۆڵی گرووپێکی هاوبیر لە دەوری یەک کۆوە دەبن». لاسوێل و کاپلان دەڵێن: «پارت بریتیە لە گرووپێک کە پرسە سەرەکییەکان پۆلێن دەکا و کاندیدەکان بۆ هەڵبژاردن بە خەلک دەناسێنێ». جیاوازی نێوان پێناسەکان زۆر نییە و دەکرێ بە گوێرەی هەلومەرجێک کە دێتە ئاراوە، لە هەر یەک لەو پێناسانە کەلک وەربگیرێ. بەم چەشنە بە ئاوڕدانەوەلە پێناسەیەک کە ڤیبێر کردوویە دەتوانین بڵێین: «پارتی رامیاری، کۆمەڵەیەکە کە پێک هاتووە لە خەڵکێک کە بە ویستی خۆیان خەریکی پڕوپاگەندەو هەڵخڕاندنی سیاسی خەڵکی بۆ بە دەستهێنانی دەسەلات و بۆ گەیشتن بە هەلودەرفەتی شیاو بۆ لایەنگران و چالاکانی خۆیانن تا لە سای ئەو هەلودەرفەتانەدا بگەن بە دۆز و ئارمانجە ئاشکراکانیان». بە واتایەکیتر دەتوانین بلێین: «پارتی رامیاری، بریتیە لە گرووپێک کە بە راشکاوی و بەگشتی بنیاتنراوە تا لە ڕێی دەنگدان و هەڵبژاردنەوە، بەڕێوەبەرایەتی حکوومەت بگرێتە ئەستۆ». بەم پێیە، دەبێ ئاگەدار بین کە ئەو پێناسانەی کە لە سەر دەنگدان جەخت دەکەن، بە ئاستەم دەتوانن پارتە ملهۆڕ و تووتالیترەکانیش بگرنە نێو بازنەی خۆیان. پارتی نازی و پارتە کۆمۆنیستەکان لەم ریزەن (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## پارێزکای دونیایی/ this worldly asceticism

ماکس ڤیبێر بۆ راڤە و شیکردنەوەی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی سەرمایەداری، لە وتاری ئاکاری پرۆتستان و گیانی سەرمایەداری کە سەرەتا لە ساڵی ١٩٠٤-١٩٠٥ بڵاوی کردەوەو پاشان لە ساڵی ١٩٢٠دا پاش کۆچی دوایی کردنی، بە چەشنێکی تێر و تەسەلتر بڵاو کرایەوە، دەستی داوە بە راڤەی هۆکانی بەدیهاتنی سەرمایەداری. بە بڕوای ماکس ڤیبێر، زۆر بۆچوونێکی ساویلکانەیە گەر هۆی بەدیهاتنی سەرمایەداری بە مەیلی مرۆڤ بە ماڵ و سامان بزانین. بە بڕوای ڤیبێر ئەم مەیلە لە درێژایی مێژوودا لە گەڵ مرۆڤ بووە، بەڵام دەبینین کە کۆمەڵگای مرۆیی قەد بەرەو ئەم سیستەمە نەڕۆیشتووە و ئەو سامانەی کە بوویە، لە ڕێی رابواردن و شەڕ و ئاژاوەدا خەرجی کردووە. بۆ وێنە ئەنگێزەئابوورییەکانی سەرمایەدارانی نوێ، بەهێزتر لە ئەنگێزەی بازرگانە رۆژهەڵاتییەکان نەبووە. مەیلە ئابوورییە پرژ و بڵاوەکان تەنیا دەبنە هۆی ئەنجام و ئاکامێکی نائەقڵانی. کەسانێک وەکوو کۆرتێز(cortes) و پیزارۆ (pizzaro)، کە رەنگە بەهێزترین نوێنەری ئەم هەستە بن، هیچ بۆچوونێکیان سەبارەت بە ژیانی ئابووری ئەقڵانی نەبوو. ڤیبێر زاراوەی ئەقڵخوازی وەکوو زاراوەیەکی هونەری بەکار هێنا و مەبەستی لەوە سیستەمێکی ئابوورییە کە بە رێکی و تەکووزی لە گەڵ ئامرازە ئابوورییەکانی ئەو سەردەمە یەکیان گرتبێ بۆ گەیشتن بە قازانجی ئابووری. ئاوەها سیستەمێک لە سەر خوو و خدە و نەریت بنیات نەنراوە. پرسێک کە دێتە ئاراوە ئەمەیە کە بۆچی ئەم هەستە بە سەر ئەو باوەڕە زاڵ و باوەی نێو کۆمەڵگایەدا -کە مەیل بە کۆوە کردنی سامان بە کارێکی ناکۆمەڵایەتی و نائاکاری دەزانی- سەرکەوت. وەڵامی ڤیبێر ئەوەیە کە دەبێ سەرچاوەی ئەم دەسکەوتە لەو بزووتنەوانەدا بزانین کە لە شۆڕشە دینییەکانی سەدەی شانزدەهەمەوە سەرچاوە دەگرن (تانی؛ ١٣٨٧).

## پارێزکاری دونیایی

ڤیبێر له درێژەی تۆژینەوەکانیدا بەم ئەنجامە دەگات کە لقــی پرۆتســتانی مەسیحی، واتە کالڤینیزم، گیانی سەرمایەداری لەنێو جەســتەی کۆمــەڵگادا بەدیهێنا. کالڤینیزم بە پێچەوانەی دینەکانی‌تر، جەختی لە ســەر پارێزکــاری دونیایی دەکرد. بنەمای پارێزکاری دونیایی لە سەر ئەم بــاوەڕە دانرابــوو کــە خەڵکی ئامرازەکانی دەستی پەروەردگارن و کردەکانیــان لــە لایــەن خــوداوە دیاری کراوە. بۆیە، کاتێک خەڵکی ئەو ئەرکانەی لــە لایــەن خــوداوە پێیــان ئەسپێردراوە جێ‌بەجێ دەکەن، فەرمانبــەرداری خودایــان بــەجــێ هێنــاوە و ئەرکەکانیان بە شێوازی ئەقڵانی و بە باشــترین جــۆر جــێ‌بــەجــێ کــردووە؛ هەروەها کاتێک لە دەسڕەنجیان بۆ رابواردن و خۆشی خەرج ناکەن، دیســان سەری رێزیان لە هەمبەر خودا داهێناوە و بەندەگی خۆیان بــەجــێ هێنــاوە. بەم چەشنە کالڤینیستەکان ژیانی خۆیان بۆ ســەرکــەوتــن تــەرخــان کــرد و تەکووزی و کاری زۆر و دژواریان بە بەشێک لە ئەرکە شەرعییەکانی خۆیــان دەزانی. لە لای ئەوان تەوەزەلی و رابواردن لەم دونیایەدا گوناحێکی ئێجگــار گەورە بوو. ئەوان پێیــان وابــوو کــە کــاری دژوار و کۆشــەوەی زۆر، ئــەرکــی دینییانە و خودا ئەوانی بۆ بەختەوەری هەتاهەتــا ئافرانــدووە. ئــەم چــەشــنە ژیانــە، هــەمــان شــتێکە کــە پێــی دەڵــێن پارێزکــاری دونیــایی. ئیلاهیــاتی کالڤینیستی بە گوێرەی بارودۆخە ئابوورییــەکــان و نــەریتــەکۆمــەڵایــەتی و هەل‌ومەرجە رامیارییەکــانی هــەر وڵاتێــک و هــەروەهــا لــە هــەر خولێکــدا، کاریگەری جیــاوازی بــووە. کالڤــینیزم هــەم ســەرنجــی بــە رابــردوو دەدا و هەمیش بە داهاتوو. گەر لە هەندێ قۆناغدا لایەنگری گۆڕان و داهێنان بــوو، لە هەندێ قۆناغدا بۆچوونی کۆن‌پەرستانەیان بوو (وبر؛ ١٣٨٧).

سەرچاوەی ڤیبێر لەم نامیلکەیەدا، نووسراوەکانی پیۆریتەنــەکــان(puritans) یا گرووپی پارێزکارانی بریتانی لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا بوو. وێنەیــەک کە ڤیبێر لە بورژوایی پارێزکار –بورژوازییەک کــە بازرگانیــان بــە ئــەرکێکــی

دینی خۆیان دەزانی کە لە لایەن خوداوە خراوەتە ئەستۆی بژاردەکانی-پیشانی دەدا لە ئامۆژەکانی ئەم گرووپە پارێزکارانەوە سەرچاوە دەگرێ (تانی؛ ١٣٨٧).

## پازیتیڤیسم/ positivism

کۆمەڵناسان ئەم واتایە بە ئامرازێک دەزانن بۆ ناسینی زانستی دونیا. لە راستیدا پازیتیڤیسم روانگەیەکی فەلسەفییە کە لە لایەن ئۆگۆست کۆنتەوە دارێژرا و لە سەر ئەم را و بۆچوونەیە کە زانستیە مرۆییەکان دەبێ لە شێوازی زانستە ئەزموونییەکان پێڕەوی بکەن (عضدانلو؛ ١٣٨٤). مەبەستی کۆنت لە دارشتنی بیردۆزی زانستی خۆی (واتە: پۆزیتیڤیسم) بەرەنگاری لە گەڵ ئەو بزاڤەی بوو کە خۆی ناوی فەلسەفەی مەنفی (نیگاتیڤ) و کاولکەری رووناکبیری لە سەر دانابوو. لە گەڵ کاتۆلیکە دژبە شۆڕشەکانی فەرانسە، بە تایبەت دۆبۆناڵد و دۆمیستەر، هاودەنگ بوو و کەوتبووە ژێر کاریگەری بیر و بۆچوونەکەیان. بەڵام لانی کەم لە دوو رەهەندەوە دەتوانین رەوتی کۆنت لەوان جیا کەینەوە؛ یەکەم: دڵنیا بوو کە ئیدی ناگەڕێنەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، چونکە پێشکەوتی زانست رێگای پاشگەز بوونەوەی داخستووە؛ دووەم ئەوەی کە کۆنت سیستەمێکی رێکوپێکی دارشت کە لەوەی پێشوونان، لێهاتووتر و کارامەتر بوو و توانی پاژێکی گرینگ لە کۆمەڵناسی سەرەتایی بنیات بنێ (جۆرج ریتزێر، ١٣٨٥).

هەروەک بێژرا پۆزیتیڤیسم بۆچوونێکی فەلسەفی بوو و لە سەر یاسای ئەو سێ قۆناغەی کە کۆنت وەکوو پێشکەوتی هزری مرۆڤ ناوی لێ دەبات، دارێژرابوو. بە گوێرەی ئەم بیردۆزە، سێ قۆناغی هزری هەیە کە سەرانسەری مێژوو، گرووپ و کۆمەڵگا و زانست و تەنانەت تاکەکان ئەو سێ قۆناغەیان تێپەڕاندووە: یەکەم قۆناغی ئیلاهییاتێکە کە جیهان تا ساڵی ١٣٠٠ زایینی

لە سەر ئەو ڕێبازە دەڕۆیشت. لەم قۆناغەدا پێکهاتەی هزری لە سەر ئەم رایە بوو کە هێزە بەرپیوار و نادیارە و ئاسمانییەکان لە بنەمای هەموو شتێکدا دەستیان هەیە. بەتایبەت، کۆمەڵگا و جڤاکی ئینسانی لەم قۆناغەدا بە دەسکردی خوداکان دەزانران. قۆناغی دووەم، قۆناغی سەرووسروشتییە کە لە ۱۳۰۰ تا ۱۸۰۰ دەگرێتەوە. لەم قۆناغەدا بۆچوون ئەوە بوو کە هێزە ئینتزاعییەکان (وەکوو سروشت) نەک خودا داتاشراوەکان، راڤەی هەموو دیاردەیەک دەکەن. لە ئەنجامدا (لە سالی ۱۸۰۰) جیهان رۆیشتە نێو قۆناغی پازیتیڤیسم. مرۆڤی ئەم قۆناغە بۆ دیتنەوەی یاساگەلی داسەپاو بەسەر جیهاندا پێداگرییان لە سەر دیتنی جیهانی کۆمەڵایەتی و سروشتیە، هەروەها وازهێنان لە گەڕان بە دووی هۆوە رەهاکاندا (خودا و سروشت) (کاپلستون؛ ۱۳۸۲. ریتزر؛ ۱۳۸۴).

هەرچەند پازیتیڤیسم خۆی بە قۆناغێک دەزانێ کە بۆ شرۆڤە و روون‌کردنەوەی دونیا لە ئەزموون و زانستی ئەزموونی چێژ وەردەگرێ، بەڵام زور ساویلکانەیە گەر لە گەڵ ماتریالیسم بە یەکێک بزانرێن. بێ‌گومان لە هیچ خولێکدا بیرمەندێکی مەزن و گرینگ نەبووە کە بە تەواوی ماتریالیست بێ. زۆرجار لودڤیک ڤۆیەرباخ بە نموونەی هەرە مەزنی ئەم چەشنە بۆچوونە دەزانن، بەڵام تەنانەت ئەویش بە تەواوی ماتریالیست نەبووە (هیوز؛ ۱۳۸٦).

«دەتوانین نووساندنی پۆزیتیڤیسم بە ماشین‌خوازی بە دروستتر بزانین، چونکە باس لە شرۆڤە بە پێی فیزیای نیۆتۆن، بە تایبەت لقی تازەداهاتووی کارەبا، دەکا. هەر بەم پێیە ناتورالیسمیش باس لە شرۆڤە بە پێی بایۆلۆژی دەکا؛ هەرچی زۆرتر لە سەدەی نۆزدەهەم تێدەپەڕا، شرۆڤە بە گوێرەی بایۆلۆژی پتر گەشەی دەسەند، بەتایبەت پاش داسەپانی بیردۆزی دارڤین لە ۱۸٦۰-۱۸۷۰» (هیوز؛ ۱۳۸٦).

ئاگۆست کۆنت لە بیردۆزەکەیدا پێداگری زۆری لە سەر هۆکارە هزریەکان

دەکرد. لە راستیدا بڕوای وابوو کە ناکۆکی هزری دەبێتە هۆی ناکۆکی کۆمەلایەتی. بەڕای کۆنت، ئەو ئالۆزییانەی کە لە سۆنگەی پێکهاتە هزرییەکانی پێشووەوە (ئیلاهییاتی و سەروسروشتی) هاتبوونە دی، لە سەردەمی پازیتیڤیسمیشدا هەروا بەردەوامە و درێژەی هەیە. تەنیا کاتێک ناکۆکییەکانی کۆمەلگا دواییان دێ کە پازیتیڤیسم بە سەر هەموو جیهاندا بە تەواوی زاڵ بێ. چونکە گەیشتن بەم دۆزەش نیازی بە پرۆسەیەکی تەکامولی هەیە، پێویست بە هەلکردنی ئاوری شۆڕش و دژایەتی نێو کۆمەلگا نییە. بە کورتی دەتوانین بلێین کە کۆنت چەن بۆچوونی سەرەکی بۆ گۆڕانکاری کۆمەلایەتی رەچاو دەکات: پاراستنخوازی بونیادی، چاکسازی خوازی، پراگماتیسم و بیردۆزی تەکامۆلی لە مەڕ کۆمەلگا (آرون؛ ١٣٨٦).

ئەمڕۆکەش زۆرکەس وەکوو پۆست پۆزیتیڤیزم رایان وایە کە دەبێ دیاردە کۆمەلایەتییەکان بە گوێرەی یاسا نەگۆڕە ئەزموونییەکان شرۆڤە بکرێن؛ بەلام ئەم بیردۆزەش بەرهەلستی زۆری هەیە. کۆمەلناسانی ئەمڕۆ لەم بابەتە گەیشتوون کە دیاردە مرۆییەکان زۆر ئالۆزتر و ئەستەمتر لە دیاردە سروشتییەکانن، زانستیش بۆ خۆی دژوارتر و ئالۆزتر لەو شتەیە کە دیارە. مرۆڤ ئافرێندراوێکە بە بیرو بۆچوونی تایبەت بە خۆی کە رەنگە تەنیا لە لای خۆی پاکانەی بۆ بکرێ و بە لۆجیک بزانرێ. بۆیە کردەوە مرۆییەکان قەد بە هۆی «یاسا کۆمەلایەتییەکانەوە» راڤە ناکرێن (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## پاشەکشەخوازان / retreatism

بەڕای مێرتۆن خەلکی لە بەرانبەر زەختە پێکهاتەییەکانی کۆمەلگاوە دژ کردەوەیەک لە خۆیان پیشان دەدەن. ئەم دژکردەوە تێکەلێکە لە سەلماندن و نەسەلماندنی ئەو بەهایانەی کە بۆ گەیشتن بە ئامانج پێویستن یاخۆ

هۆکارێکن بۆ گەیشتن بە ئامانج. ئەم دژکردەوانــە لــە بیچمــی جۆراوجــۆری وەکوو هاوڕێ بــوون، داهێنــان، راپــەڕیــن و پاشــەکشــەدا خۆیــان دەنــوێنن (سروستانی؛ ١٣٨٧).

پاشەکشەخوازی بریتیە لە دان پێدا نەنان یاخۆ دژایەتی لە گــەڵ ئامانجــە کولتوورییەکان و هۆکارەکانی گەیشتن بەو ئامانجانە. کەسانێک لە بەرانبــەر ئەم زەختە پێکهاتەییانە ئاوەها کاردانەوەیەکیان هەیە کە نە لە رێگای شیاو و نە لە رێگای نارەواوە نەیانتوانیوە پاگەیەک لە کۆمەڵگادا بە دەست بێنن؛ بەم بۆنەوە لە کۆمەڵگا کشاونەتەوە.

## پاشەکشە کردووان / retreatists

بە رای مێرتۆن پاشەکشە کردووان کەسانێکن کە بە رێژەی بەها و نۆرمــە کولتووریەکانی کۆمەڵگا نامۆ کەوتوون و کۆشەوەیەک بۆ هاوڕێ کردنی خــۆ لە گەڵ ئەو رێسایانە ناکەن. دەرکراوان، بەرەڵلاکراوان، دەرۆزەکەران، بــێ‌ڕێ و جێیان، گیرۆدە بووان بە مادە سڕکەرەکان و ئەلکول، لە ریــزی پاشــەکشــە کردووانن. ئەم کەسانە لە کۆمەڵگادا دەژین، بەلام هیچ پێوەندییــەکیــان بــە کۆمەڵگاوە نییە . بڕوانە: **پاشەکشە خوازان**.

## پالاوتن / purge

مەبەست لە پالاوتن، دەرپەڕاندنی ئەندامانی پارت، گرووپ یان حکوومەتە کە لە گەڵ رێبەرایەتیدا ناتەبــان، یــاخۆ لــە روانگــەی رێبــەرایــەتییــەوە، بــە ئەندامی نەگونجاو دێنە ئەژمار، لــە رێگــای زینــدان و حــەبــس و کوشــتن و دوورخستنەوە و هەر رێگایەکی‌ترەوە ئەم کــەســانە لــەریــزی ئــەو گرووپانــە دەخرێنە دەرەوە. هەروەها زیندانی کردن یاخۆ کوشــتنی بــەکۆمــەڵــی ئــەو تاقمانەی لە گەڵ حکوومــەتــدا نــاکۆکن و لــە بــواری کۆمــەلایــەتییــەوە بــە

مەترسیدار دەزاندرێن.

هەرچەند کە پاڵاوتن زاراوەیەکە کە زۆرتر تایبەتە بە پارت و حکوومەتە یەک دەستووریەکان، بە تایبەت حکوومەتە کمۆنیستییەکان، لە سەدەکانی رابردووشدا هەندێ نموونەی هەیە؛ وەکوو «پاڵاوتنی پرایـد». سەرهەنگ پراید لـە سالـی ١٦٤٨دا ئـەو تاقمـەی -کـە هـەستی دەکـرد لایـەنگـری حکوومـەتی پادشـایەتـین- لـە پـەرلـەمـان وەدەرنـان. رژیمـی ناسـیونال سوسیالیستی ئاڵمانیا (نازی) لە سالی ١٩٣٤دا دەستی دا بـە لـەنـاو بـردن و پاڵاوتنی رێبەرانی ئێ.ئا و ئەو نازییانەی لە گەڵ بیرو بۆچوونـەکـانی هیتلێـر ناتەبا بوون.

لە یەکیەتی سۆڤییەتدا پاڵاوتن (چیستکا) بەم چـەشـنە پێناسـە کـراوە: «پاڵاوتنی پارتی کمۆنیست لەو ئەندامانەی کە لە گەڵ چینی کرێکاردا نـامۆ و دوژمـنن و خۆیـان پـەسـتاوتۆتە نێـو ریـزی کرێکارانـەوە. پـاڵاوتنی کەسایەتیگەلی دەغەڵباز، لارێ، خۆپەسەند، بۆرۆکرات و گەنـدەڵ کـە هـیچ گوێ بە دیسیپلینی پـارت نـادەن». یـەکـەمـین پـاڵاوتنی رەسمـی پـارتی کۆمۆنیست لە ١٩٢١دا کەوتەڕێ. بەم پێیـەش، بـەر لـەم مێـژووە، واتـە لـە ١٩١٩دا، لە پێوەندی لە گەڵ کۆوە کردنی کۆمۆنیستەکان بۆ شـەڕی نـاوخۆ، دەستوورێک بۆ ناونووسی دووبارەی ئەندامانی پارت بە مەبەستی بژار کردنی ئەندامانی «گەندەڵ»و «خوێنخۆر»ی پارت دەرکـرا. بـە هـۆی ئـەم بـژارەوە ئەندامانی پارت نیوە بە نیوە بوون.

لە پاڵاوتنی ١٩٢١-١٩٢٤دا نزیک بە ٢٥٠٠٠ کەس لە ئـەنـدامانی پـارت (واتـە سـێ یـەکـی ئـەنـدامان)، لـە پـارتی کۆمۆنیسـت دەرکـران. ئامـارە رەسمییەکان وا پیشان دەدەن کە زۆرترین لادانەکان بریتی بوون لـە: ٣٤٪ «مونفەعیل»، ٢٥٪ خوازیاری شێوەی ژیانی بۆرژوایی و حەز بە خواردنەوەی بەردوامی ئەلکول، ١١٪ لادان لە دەستوورەکانی پارت. هەرچەنـد رێبـەرانی

پارت رایانگەیاندبوو کە ئەم پالاوتنە بۆ تەمێی ئەو گرووپانەی کە لە گەڵ سیاسەتە رەسمییەکان دژایەتییان کردووە بەکار نابرێ، کەچی زۆربەی ئەوانەی پالێورابوون، لەریزی ئەم کەسانە بوون (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## پرستیژی کاری / occupational prestige

مەبەستی کۆمەڵناسان لەم زاراوەیە ئەو بایەخەیە کە خەڵکی کۆمەڵگا بۆ ئیش و کارە جۆراوجۆرەکانی دادەنێن. بە گشتی خەڵکی بەهایەکی زۆر دەدەنە هەندێ کاری وەکوو پزیشکی، ئەندازیاری، بریکاری و بە گشتی ئەو کارانەی داهاتی زۆریان هەیە. بەڵام پرستیژی کاری شتێک سەرتر لە داهاتی تەنیایە، چونکە ئەو کارانەی لە لای خەڵکی بەنرخن، پێویستیان بە خوێندنی باڵا و ئاستێکی بەرز لە توانایی هەیە. بە پێچەوانەی ئەو کارانە، هەندێ کاری وەکوو کۆلکێشی، قاپشۆری و ... نەتەنیا داهاتێکی کەمیان هەیە، بەڵکوو پێویستیان بە شارەزایی و پسپۆڕی نییە و خوێندنێکی کەمیان پێویستە. دەبێ ئەم خاڵەمان لە بەرچاو بێ کە هەرچەن ئەم کارانە کە پرستیژی زۆریان هەیە زۆرجار لە گەڵ داهاتی باشیش هاوڕێ نین، بەڵام لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا، بە تایبەت کۆمەڵگا پیشەسازییەکان ئەم کارانە زۆر لێکتر دەچن. دەتوانین بڵێین کە لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا ئەو کارانەی کە لە گرۆی کاری دەستدا نین و پێویستیان بە چاودێری نییە، لە چاو ئەو کارانەی کە پێویستیان بە کاری دەست و چاودێری هەیە، پرستیژێکی زۆرتریان هەیە.

تا نزیک بە پەنجا ساڵی لەمەو پێش، تەنانەت لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا، پیاوان نانهێنەری بنەماڵە بوون و ژنان تەواو کات خەریکی ماڵداری بوون. شێوازی ژیان و پاگەی کۆمەڵایەتی بنەماڵەکان بە کار و داهاتی پیاوەوە بەسترابوو. بڕیارە سەرەکی و گرینگەکانی بنەماڵە (وەکوو

کڕین یان گۆڕانی خانوو و ...) لە ئەستۆی پیاودا بوو و ژن تەنیا بەرپرسی پاک و خاوێنی و چێشتلێنان بوو. ژن پێداویستی ماڵی دەکڕی و پیاو پارەکەی دەدا. پیاو دەیگوت کە کەی دەبێ لە گەڵ ژنەکەی هاونوێنی بکات و ژن لە سەری بوو کە گوێی لە ویستی پیاوەکەی بێ. چونکە ژنان لە ئەنجامدانی کاری دەر لە ماڵ شارەزاییەکیان نەبوو و دەسەڵاتی ئەوەشیان نەبوو کە داهاتێکیان بۆ بنەماڵە بێ، تەنانەت ئەو ژنانەی کە بە زۆر دەدرانە شوو و بە ژیانی خۆیان ڕەزا نەبوون و بە خراپی لە گەڵیان هەڵسوکەوت دەکرا، ناچار دەبوایە ئەو هەلومەرجە نالەبارە قبووڵ بکەن.

هەرچەند ئەمڕۆ دابەشکردنی کار و هاوسەنگی دەسەڵات گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە، بەڵام ئەم گۆڕانە ئەوەندە نییە کە بیری لێ دەکرێتەوە. هیشتا نیوەی لە ژنانی وڵاتە پیشەسازی و پێشکەوتووەکان نەهاتوونەتە نێو بازاڕی کارەوە و خەریکی ماڵدارین (*Berk, S. F; 1988: 287-302*). لە ڕیزبەندی پرستیژی کارەکاندا، کاری ژنانی ماڵدار کە مووچەیەک وەرناگرن، نەهاتووە؛ واتە: پرستیژی ئەم کارە سفرە (*Oakley, A; 1985* ). بەڵام پرستیژی ئەم کارە –گەر مووچەی پێ بدرێ– ٣٤ لە سەتە ( *Nakao, K & J. Treas, 1990*). گەر ژنیش وەکوو پیاو لە دەرەوەی ماڵ کار بکات، کاری پیاو گرینگتر لە هی ژن دێتە ئەژمار. توێژینەوەیەک لە ئەمریکادا ئەنجام دراوە پیشان دەدات کە گەر پێشنیاری کارێک باشتر لە شارێکیتردا بە پیاو بدرێت، زۆربەی پیاوان (٧٢%) و ژنان (٦٢%) ڕایان وایە کە ژنی ماڵ دەبێ واز لە کارەکەی بهێنێ و لە گەڵ مێردەکەیدا بڕوات. بەڵام گەر ئاوەها هەلێک بۆ ژن بڕەخسێ، تەنیا ٢٠% ژن و پیاوان ڕایان وایە کە دەبێ پیاو لە گەڵ ژنەکەی بڕوا و واز لە کارەکەی بێنێ ( *Simon, R. J & G. Danziger; 1991*).

## پرسیارنامە / questionnaire

پرسیارنامە، کۆمەڵە پرسیارێکی نووسراوە کە توێژەر ئامادەیان دەکا و لە نموونەی ئاماری خۆی داوا دەکا کە وەڵامیان بدەنەوە. زۆربەی توێژەران پرسیارنامەکانی خۆیان بە یەکێک لەم دوو شێوازە دابین دەکەن و پیشانی وەڵامدەرانی دەدەن:

١) پرسیارنامەی بەستراو: لەم شێوازەدا، توێژەر هەندێ وەڵام هەڵدەبژێرێ و لە پێش پرسیارەکەی رایدەنێ تاکوو وەڵامدەر بۆ وەڵامدانەوە بە پرسیارەکەی، یەک یان چەن وەڵام هەڵبژێرێ و دەستنیشانیان کا. هەرچەن لەم پرسیارنامانەدا، وەڵامەکان پانتایەکی بەرتەسکیان هەیە و رەنگە لێکدانەوە و شرۆڤەی وەڵامەکان تووشی لێڵی بکەن، بەڵام کاری لێکدانەوەو راڤەی وەڵامەکان بۆ توێژەر ئاسانترە.

٢) پرسیارنامەی کراوە: لەم شێوازەدا هیچ وەڵامێک لە بەرانبەر پرسیارەکانەوە رانەنراوە و وەڵامدەر دەتوانێ سەربەستانە و بەکەیفی خۆی بیرو رای خۆی دەربڕێ. کاری توێژەر بۆ لێکدانەوەی ئەم وەڵامانە دژوارە و دەبێ واتایەکی شیاو بۆ وەڵامەکان ببینێتەوە تا لە گەڵ پرسیارەکەی خۆی بگونجێن.

هەر پرسیارنامەیەک بریتیە لە پەڕەیەک بۆ نووسینی را و بۆچوونەکان، شیکردنەوەیەکی کورت بۆ چۆنییەتی وەڵامدانەوە بە پرسیارەکان، پرسیارەکان و شوێنێک بۆ وەڵامەکان، ئەو کۆدانەی کە بۆ خستنە نێو کۆمپیۆتەری وەڵامەکان پێویستن، هەندێ روون کردنەوە سەبارەت بە چۆنیەتی ناردنەوەی پرسیارنامەکە (هەروەها پاکەتی نامە و تەمبر لە گەڵ ئادرێسی ناردنەوە) و لە کۆتاییدا سوپاس و پێزانین بۆ ئاریکاری وەڵامدەرەوە (بیکر؛ ١٣٨٧).

لە هەر پرسیارنامەیەکدا چەن بنەمای گشتی هەیە کە دەبێ لە بەرچاو

بگیرێ:

١) پرسیارەکان دەبێ تەنیا بریتی بن لەو پرسیارانە کە پێوەندیان بە بابەت و گەلاڵەی لێکدانەوەی پرسیارەکان هەیە.

٢) پرسیارنامە بۆ وەڵامدەر روون و ئاشکرا بێ.

٣) کورت و پڕواتا بێ بە جوانی هەموو رەهەندەکانی ئامانجی پرسیارەکە بگرێتەوە.

٤) گەر پرسیارنامەکە بۆ وەڵامدەرەوە بەڕێ دەکرێ دەبێ چەند و چوونی وەڵامدانەوەکان و روون کردنەوەی لە گەڵدا بێ.

٥) دەبێ بەر لە ناردنی پێداویستەکانی وەڵامدەرەوە بۆ وەڵامدانەوە و ناردنەوەی پرسیارەکان بزانرێ و دابین بکرێ (بیکر؛ ١٣٨٧).

## پزیشکی / medicine

پزیشکی دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتییە کە ئامانجی بەرەنگاری لە نەخۆشی و بەرزتر کردنی ئاستی تەندروستی کۆمەڵگایە. پزیشکی بەشی تەندروستی واتایەکی بەرفراوانتری هەیە کە بە ناوی پاراستنی تەندروستی (health care) (واتە: هەر کردەوەیەک کە بە مەبەستی چاکسازی باری تەندروستی تاکەکانی کۆمەڵگا بێ) بەناوبانگە. بە درێژایی مێژووی مرۆڤ، تا ئەو کاتەی کە بەرهەمهێنانی جڤاکەکان گەشەیەکی بەرچاوی سەند و ئەندامانیان دەوری رەسمی و بەرچاوی گرتە ئەستۆ، بەرپرسایەتی باری تەندروستی لە ئەستۆی خودی تاک یان بنەماڵەیدا بوو. پزیشکی –وەکوو دامەزراوەیەک- کاتێک هاتە دی کە شێوازی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی کار ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات و زۆر ئاڵۆزتر بوو. پزیشکەکان بەرەبەرە ئەو بەشانەی لەشی مرۆڤ کە چاکبوونەوەیان بۆ هەیە، ناسی و رێگە دەرمانی زۆرێک لەو نەخۆشیانەیان پێشان دا. هەرچەند ئەمڕۆ رەنگە ئەو شێوە

دەرمانییانەکە پێشوونانمان لە پزیشکی سوننەتیدا (وەکوو پزیشکی سووزەنی و گیایی) پیشانیان دەدایـن، بە نازانستی و سیحربازانەی بـزانین؛ بـەڵام هـەر ئەم شێوازانە، ئێستاش لە دونیادا کاری زۆر بۆ چـاککردنـەوەی نـەخۆشـان ئەنجام دەدەن (*Ayensu, E. S; 1981: 87-89*). هەرچەند کۆمـەڵـگا زۆرتـر بەرەو پیشەسازی بوون بڕوا، ئەرکی پاراستنی تەندروستی زۆرتـر دەکـەوێتـە ئەستۆی پسپۆڕانێ (لە پسپۆڕی بێهۆشیوە تا دەگاتە تکنیسیەنی رادیۆگرافی) کە خوێندنی باڵایان هەیە و بەڵگەنامەی پیشەییان وەرگرتووە.

## پزیشکی بەکۆمەڵایەتی کراو / socialized medicine

بە گشتی ئەمڕۆ لە وڵاتانی پیشەسازی و پێشکەوتوودا پێداگرییـەکـی زۆر لە سەر تەندروستی سەرجەمی کۆمەڵگا دەکرێ و گوژمەیەکـی زۆریـش بـۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراوە. تەندروستی یەکێـک لـە پرسـە گرینگـەکـانی هەموو کۆمەڵگایەکەو گوژمەی بەهرەوەرگرتن لە تیکنۆلۆژیای نوێی پزیشکی ئەوەندە زۆرە کە زۆربەی خەڵکی لە هەموو کۆمەڵـگایەکـدا (پێشـکەوتـوو و دواکەوتوو) ناتوانن بە تەواوی لێی بەهرەمەند بن. هەندێ لە وڵاتـانی وەکـوو بریتانیا و سوید، گوژمەی تەندروستی هاووڵاتیانی خۆیان لە رێی وەرگـرتنی پیتاکەوە دابین دەکەن؛ هەندێ وڵاتیتری وەکوو ئاڵمانیا، نورویژ، دانمارک و بلژیک بیمەی تەندروستی دەوڵەتیان هەیە؛ هەنـدێکیتـری وەکـوو گریـک، ئۆتریش‌و هۆڵەند بیمەی تایبەتیان هەیە؛ هەندێ وڵاتیتری وەکوو ئیرلەنـد، فەرانسە و سویس، خاوەنی ئاوێتەیەک لە بیمەی تایبەت و دەوڵەتین.

لە ساڵی ۱۸۹۱دا لە وڵاتی سوید یاسایەک دەرکـرا کـە بـە گـوێرەی ئـەو یاسایە حکوومەت بوو بە بەرپرسی پاراستنی تەندروستی تاکەکانی کۆمەڵگا. بە واتایەکیتر: دەوڵەت ناچار بوو بۆ پاراستنی تەندروستی تاکەکان هان بـدا و بەرنامە و گەلاڵەی نوێ دابڕێژێ. هاووڵاتیانی سـویدی، دەبوایـە گوژمـەی

تەندروستی خۆیان بخەنە سەر پیتاک و بیدەن بە حکوومەت. بەم بۆنەوە دانیشتوانی ئەم وڵاتە زۆرتر لە وڵاتانی‌تری دونیا پیتاک دەدەنە حکوومەت. زۆربەی کاتەکان، پزیشکەکان بەجێی وەرگرتنی پارە لە نەخۆشەکان، مووچە لە حکوومەت دەستێنن و زۆربەی نەخۆشخانەکانیش حکوومین. چونکە ئەم سیستەمی پزیشکییە زۆر لە وڵاتە سووشیالیستییەکان دەکا، ناوی پزیشکی *بەکۆمەڵایەتی کرا*ویان بە سەردا ناوە. کەواتە، پزیشکی بەکۆمەڵایەتی کراو، سیستەمێکی چاودێری لە تەندروستییە کە حکوومەت خاوەنی کەل و پەل و کەرەستەی پزیشکی و چاودێری تەندروستی تاکەکانە و زۆربەی پزیشکەکان کارمەندی حکوومەتن.

## پشتی شانۆ / back stage

بریتیە لە شوێن و جێگایەک کە بەدوور لە چاوی خەڵکە و لەم شوێنەدا رەنگە تاکەکان دەست بدەن بە کاری نارەوا و بەدەر لە نۆرم و یاسا؛ ئەو کارانەی کە لە پێش چاوی خەڵکەوە ئیزنی ئەنجامدانیان نییە. چونکە هەڵس‌وکەوتی پشتی‌شانۆ جیاوازە لەو هەڵس‌وکەوتەی کە خەڵکی لە سەرشانۆدا هەیانە، خەڵکی کۆشەوەی زۆر دەکەن تا پەردە بە سەر ئەم کارانەیان بکێشن و نەهێڵن کەس پێیان بزانێ و تێیان بگا. بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بکەین بە بەشی چێشتخانە لە ریستوورانەکاندا. کارمەندی ریستووران رەنگە لە نێو چێشتخانەدا (پشتی‌شانۆ) کارێک بکەن کە لە لە لای موشتەرییەکانیان (سەرشانۆ) خۆیان لەو کارانە دەپارێزن؛ وەکوو خواردنی خۆراک لە قاپی موشتەری، داکەوتنی خۆراک و هەڵگرتن و گەڕاندنەوەی هەمان خۆراک بۆ نێو دەفری موشتەری و هاوار کردن بە سەر یەکتردا. کەچی کاتێ دێنە نێو هۆڵی چێشت‌خواردن (سەرشانۆ)، خۆیان لەم شێوە هەڵس‌و کەوتانە دەپارێزن.

## پۆلێنکردنی (چینبەندی) سەرەتایی/ primitive classification

ئەم زاراوە لە وتارێکدا کە کۆمەڵناسانی فەرانسی، دوورکایم و مارسێل مووس لە ساڵی ۱۹۰۳دا بلاویان کردەوە، هاتووە. دوورکایم و مووس ئەم پرسیارەیان هێنایە ئاراوە کە: مرۆڤەکان چلۆن و بۆچی جیهانی کۆمەڵایەتی و فیزیایی خۆیان پۆلێن دەکەن؟ پەرسڤی ئەم کۆمەڵناسان بۆ پرسیارەکەیان کە لە لایەن ژۆزێف نیدهامەوە لە ساڵی ۱۹٦۳دا بەوردی خراوەتە بەر رەخنە، زۆرتر پاڵ دەداتە لای سەرنج و بۆچوونە مێژووییەکانەوە.

بەلام پاش ئەم وتارە بوو کە راڤەی سیستەمە پۆلێنکراوە سەرەتاییەکان خرایە بەر سەرنج و وردبوونەوە. تۆژینەوەلەمەدا کە جڤاکەکان چلۆن کۆمەڵگەلێک وەکوو خزم و کریڤان، روەک و گیانداران، دەرمان و نەخۆشییەکان، بوونەوەرە سەرووسروشتییەکان و رەنگەکانیان پۆلێن کردووە، هەروەها ئەم چینبەندییانە لە سەر چ بناغەیەک داڕێژراون، بووبە هۆی ئەنجامدانی کۆڵینەوەگەلی بەرچاو و بەنرخ (سی. گریوز؛ ۱۳۸٦).

## پووچەڵ کردنەوە/ neutralization

کۆمەڵناسان ئەم واتایە بۆ پووچەڵ کردنەوەی مۆرکی لادان لە لایەن کەسانێکەوە کە ئەم مۆرکەیان لێ دراوە، بەکار دەبەن. ئەو رووداوانەی کە دێنە ئاراوە، وەکوو لادانی یەکەمین، مۆرکی لادان و لادانی دووەمین، ناکرێ تاک دڵنیا بێ کە بە تەواوی خۆی لێیان دەپارێزێ. هەندێ جار ئەوانەی لە یاسا و نۆرم و رێساکانی کۆمەڵگا لادەدەن، بە نەناسراوی دەمێننەوە و مۆرکی لادانیان لێ نادرێ. تەنانەت زۆربەی ئەو کەسانەش ئەگەر بناسرێن و مۆرکیان لە سەر بنرێ، بە چەشنێکی سەرکوتووانە و لە رێی پرۆسەیەک کە گێرشام سایکس و دەیڤید ماتزا ناوی پرۆسەی پووچەڵ کردنەوەیان لە سەر داناوە (*Sykes, G; and D. Matza; 1957: 664-470*)، خۆیان لە

دەپارێزن و پاکانە بۆ کارەکەیان دەکەن. بە واتایەکی‌تر، ئەم کەسانە بە پاکانە کردن، یان بە ژیرانە پیشان دانی لادانەکەیان، هەم هەست بە گوناح و تـاوان ناکەن و هەمیش دەنگی تاوانبارکەرانی خۆیان کـەم دەکـەنـەوە. سـایکس و ماتزا پێنج تەکنیکی سەرەکی بۆ پووچەڵ کردنەوە دەستنیشان دەکەن:

١) حاشا و قەبووڵ نەکردنی بەرپرسایەتی (خەتای مـن نـەبـوو و بێجگـە لەوە کارێکی‌ترم لە دەست نەدەهات).

٢) حاشای ئازار گەیاندن بە کەسانی‌تر (لە راستیدا من ئـازارم بـە کـەس نەگەیاندووە).

٣) حاشای کوشتن، گەر کوژراوێک هەبێ (خۆیان ئەم کـارەسـاتەیـان بـە سەر خۆیاندا هێنا، حەقی خۆیان بوو).

٤) لۆمە و سەرزەنشتی ئەو کـەسـانەی تاوانباریـان دەکـەن (هـەموویـان خەریکی گەندەڵین).

٥) هانا بردن بۆ ئەمەگداری بە کەسانی‌تر (من ئەم کارەم بۆ هەڤاڵـەکـەم کرد، نەک خۆم).

دایانا سکالی و جۆزێف مارۆلا لە کاتی کۆڵـینەوە لـە سـەر تاوانبـاران بـە ئازاری سێکسی، بینیان کـە ئـەم کـەسـانە بـۆ پاکانـەی خۆیـان و پووچـەڵ کردنەوەی مۆرکێک کە بە سەریاندا نراوە، لـە شـێوازی جۆراوجـۆر کـەڵـک وەردەگرن. هەندێکیان حاشایان لە رەفتاری ئازاری سێکسی دەکرد و ژنانیان بە هەڵخرێنەر و تاونبار دەزانی؛ هەندێکیان شێوازی جلـک لـە بـەر کـردنی ئافرەتەکانیان بە هۆی کارەکەیان دەزانی؛ هەنـدێ دەیـانگوت «نـە» گـوتنی ژنان هەمان «ئەرێ»یە؛ هەندێ دەیانگوت ئەوانیش زۆریان حـەز بـەم کـارە دەکرد؛ هەندێکیش دەیانگوت «ئەو ژنە مرۆڤێکی چاک نەبوو، حـەقـی هـەر ئەوە بوو»؛ تاقمێکیش تێکەڵێک لەم پاکانەیـان دەهێنایـەوە. ئـەوانـەش کـە دانیان بە سەر کردەکەیاندا دەنا، مەست و بێهۆش بوونی خۆیـان بـە هـۆی

تاوانەکەیان دەزانی. هەرچەند زۆربەی هەرە زۆری تاوانباران ئازاری سێکسییان بە خراپ دەزانی، کەچی کەسیان نەبوو دان بە مۆرکی «ئازاری سێکسی»دا بنێ (*Scully, D; and Marolla; 1984: 530-44*).

## پەروەردە/ education

ئەم زاراوەزۆرتر بریتیە لە پەروەردە (بۆ گەنجان)، ڕاهێنانی هزری و ئاکاری، گەشاندنەوەی کەسایەتی تاکەکانی کۆمەڵگا بە تایبەت لە ڕێی فێرکاری فەرمی لە قوتابخانە و ڕێکخراوەکانیتردا. ئەم زاراوەلە واتایەکی بەرفراواندا ئاماژە دەکات بە فێرکاری و ڕاهێنانێک کە لە تەمەنی گەورە ساڵیدا بە کار دێت.

هەندێ جاریش ئەم زاراوەیە بەربلاوتر دەکرێ تا هەموو ئاسەوارەکانی ڕاهێنان لە هەموو بوار و قۆناغێکدا بگرێتەوە (شارع‌پور؛ ١٣٨٧).

هەرکەس چاوەڕوانییەکی لە پەروەردە هەیە: ئەزموونێکی زەینی سەرنجڕاکێش بۆ منداڵ، هۆکارێک بۆ هەڵاتن لە بێکاری یاخۆ هەڵگەڕان لە چینەکانی خوارەوە بۆ چینەکانی سەرووی کۆمەڵگا. پەروەردە بۆ هەندێ لە دایک و باوکان ئامرازێکە بۆ منداڵەکەیان تا بگات بەو پلە و پاگەی کە ئاواتی خۆیان بووە.

جیاوازیگەلێک کە لە پێناسە کردنی پەروەردەدا هەیە بۆتە هۆی شێوازی جیاواز و جۆراوجۆر لەم بابەتەدا. جۆن ستوارت میل هەر شتێک کە بەسەر تاکدا کاریگەری هەبێ، بە پەروەدەی دەزانێ. دیوویی دەڵێ: بە گشتی پەروەردە کۆمەڵە پرۆسەیەکە کە گرووپ یان کۆمەڵگایەک-گەورە یان بچووک- دەسەلات و دۆزەکانی خۆی رادەگوێزێتەوە تا بتوانێ گەشەی بەردەوامی خۆی مسۆگەر بکا(شکوهی، ١٣٦٧). دوورکایم رای وابوو کە دەبێ بەکار هێنانی ئەم زاروەیە زەقتر و ڕاشکاوتر بێ و جەختی زۆرتری لە سەر

بکرێ و زۆرتر «کاریگەری بەرە بە سالاچووەکان بە سەر بەرەی گەنجدا بگرێتەوە کە هێشتا بۆ ژیانی کۆمەلایەتی رانەهاتوون»؛ بەم پێیە دەتوانین بلێین «پەروەردە بریتیە لە بە کۆمەلایەتی بوونی رەوتداری بەرەی گەنج و لاو». بە گوێرەی ئەم روانگە ئەرکخوازانەیە، پەروەردە دامەزراوەیەکە بۆ راهێنانی تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکان، بە جۆرێ کە لە داهاتوودا دەبێتە هۆی یەکەتی و یەکگرتوویی بەرەی دوارۆژ «کۆمەلگا تەنیا بە مەرجێ دەتوانێ درێژە بە بوونی خۆی بدا کە کە پێوەندی و یەکگرتوویی لە نێوان ئەندامانیدا بێ: پەروەردە بە بەهێز کردنی نیازەسەرەکییەکانی ئەم یەکگرتووییە لە مندالدا، بوون و بەردەوامی کۆمەلگا مسۆگەر دەکات». ماکس ڤیبێر هەرچەن بە راشکاوی باسێکی بنەرەتی لە سەر پەروەردە نەکردووە، بەلام بە وردبوونەوە لە تیۆری بۆرۆکراسی ڤیبێر روون دەبێتەوە کە مەبەستی هەر سیستەمێکی پەروەردە ئەوەیە کە خوێندکاران بۆ بەرێوەبردنی جۆرێکی تایبەت لە ژیان رابێنێ. ئەم جۆری تایبەتە بە گوێرەی پلەوپاگە و رادەی دەسەلاتی کۆمەلایەتی هەر تاکێکە لە نێو پێکهاتەی کۆمەلگادا (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

هەندێ باسی جۆراوجۆر لە بەرهەمەکانی مارکس و ئەنگلسدا بە دێ دەکرێ (بۆ وێنە: سەرمایە، بەرگی ١؛ ئایدیۆلۆژی ئەلمانیایی، بەرگی ١؛ رەخنەی پرۆگرامی گۆتا). بەلام بیردۆزێکی یەکگرتووتر کە لە مارکسیزمدا هاتە دی، پاش شۆرشی ئۆکتۆبر بوو. چونکە کۆمەلگای مارکسیستی پێویستی بە پراکسیسی پەروەدەیی بوو، بۆیە ئەم نیازە بوو بە دنەدەری گەلالەیەکی نوێ لەم رەهەندەدا. لە راستیدا بیردۆزی مارکسیستی لە پەروەردەدا، بیردۆزێکی پراتیکییە. خودی مارکس هەرچەند بە چەشنێکی سەربەخۆ لە سەر پەروەردە باسی نەکردووە، بەلام بایەخێکی زۆری داوە بە فێرکاری، بە تایبەت بە شێوازی دابەشکردنی ئاسانکاری بۆخوێندن لە

کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا.

مارکسیستە پێکهاتە خوازەکان(Structuralist) لەسەر ئەم باوەڕەن کە پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، بەتایبەت پێکهاتە ئابورییەکانن کە میتۆدی هەڵس‌وکەوتی کۆمەڵگا دیاری دەکەن. بەڕای لوویی ئاڵتوسەر جۆرێک لە جەبرخوازی ئابووری سێبەری خستۆتە سەر بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا، وەکوو بەشی پەروەردە، زانیاری و ئایین، بەڵام لە هەمان کاتدا هەر بەشێک بە گوێرەی بەشەکانی‌تر تا رادەیەک سەربەخۆیە (*Robison.P.1981*) بەشی سەرەکی لە سیستەمی سەرمایەداریدا، چێ کردنی هێزی کار و هەلومەرجی بەرهەمێنانە، واتە هەمان چێ کردنی پێوەندی بەرهەمێنان. لە روانگەی ئاڵتۆسەرەوە قوتابخانە دەوری بەرهەمێنانەوەی کولتووری (Cultural reproduction) دەگێڕێ، بۆیە لە راستیدا قوتابخانە هۆکارێکی بێ‌لایەن و سەربەخۆ نیە، بەڵکوو وا لە ژێر کاریگەری ئاپۆلۆژی دەوڵەتدا. لە بیردۆزە نوێکان کە لەسەر پەروەردە و فێرکاری ئاخاوتوون، دەتوانین ئاماژە بە پارادایمی رەخنەگرانە بکەین. ئەم پارادایە شرۆڤەیەکی جیاواز لە پەروەردە دەداتە دەست. ئەمیش وەکوو بیردۆزی قوتابخانەی ئەرکی، لەسەر ئەو بۆچوونەیە کە قوتابخانە پێوەندییەکی نزیکی بە کۆمەڵگاوە هەیە، بەڵام باوەڕیان وایە کە سیستەمی پەروەردە زۆرتر پێداویستی و نیازەکانی بژاردەکانی کۆمەڵگا دابین دەکا تا ئەوەی کە نیازەکانی سەرجەمی کۆمەڵگا پێک بێنێ. هەروەها زۆرتر لەسەر پێوەندی نێوان فێرکاری فەرمی و فێرکردنی گوێڕایەڵی پێداگری دەکا تا فێرکردنی توانایی بۆ تێگەیشتن. بۆیە سیستەمی پەروەردە مەودای نێوان چینەکانی کۆمەڵگا زۆرتر دەکا و خەڵکی رادێنێ کە بەو هەلومەرجەی کە تێیدان رەزا بن ( *Hurn. C; 1985*)

**پەروەردەی فەرمی (رەسمی)/ formal education**

کۆمەڵناسان لە نێوان فێرکاری فەرمی و نافەرمیدا (بڕوانە فێرکاری نافەرمی) جیاوازی دادەنێن. فێرکاری فەرمی کۆشەوەیەکی ئامانجدارو گەڵالەکراوە بۆ گواستنەوەی لێهاتوویی و شێوازەکانی بیر کردنەوە. لەم رووەوە فێرکاری فەرمی پرۆسەیەکی سیستماتیکە کە تاک بە گوێرەی بەرنامەیەکی دارێژراو، زانستەکانی خۆی فێری کەسانی‌تر دەکات. زۆرتر فێرکاری فەرمی بە پرۆسەی دەوڵەمەندسازی، رزگاری‌کەری و بەدەست هێنانی ئەزموونی بەکەڵک دێتە هەژمار، بەڵام زۆر جار ئەم رەوتە دەبێتە هۆی بیر کورتی، دەمار گرژی یاخۆ «مێشک شۆردنەوە». پەروەردەی فەرمی کاتێک سەرکەوتوو دەبێ کە خوێندکاران ئەو شتانەی پێیان فێر دەکرێ، بە هەمان چەشن کە مامۆستایان چاوەڕوانیان لێ دەکەن، فێری بن و بەکاری بهێنن (شارع‌پور؛ ١٣٨٧).

**پەروەردەی نافەرمی/ informal education**

ئەم فێرکارییە بە ئاوەژووی پەروەدەی فەرمی کە ئامانجدارو گەڵالە کراوە، بەخۆڕایی و بەبێ‌بەرنامە و ئامانج روو دەدا. واتە، ئەو ئەزموونانەی کە بە شێوازی نافەرمی فێر دەکرێن، بە چەشنێکی ئاسایی دێنە کایەوە. کەس ئەم چەشنە فێرکارییەی بۆ راگواستنی لێهاتوویی و راهێنانی شێوازی بیرکردنەوە دانەڕشتووە. فێرکاری نافەرمی لە هاتوچۆی نێوان بنەماڵەکان، دۆستایەتی، سەفەر و ... دێتە ئەنجام (عضدانلو، ١٣٨٤).

**پەرەسەندن / diffusion**

پەرەسەندن بریتیە لەو پرۆسانەی کە دەبنە هۆی وێکچوونە کولتوورییەکانی نێو کۆمەڵگا. پەرەسەندن بریتیە لە سێ جۆر پرۆسەی

مێژوویی بڵاوبوونەوەی کولتووری:

١- هەندێ جار کولتوور لە ڕێی کۆچەوە پەرە دەستێنێ و بڕێ جار بەم پرۆسەیە «پەرەی یەکەمین» یا «پەرەی کولتووری» دەڵێن. نموونەی ئەم جۆرە، پەرەسەندنی سیستەمی یاسایی بریتانیایە لە زۆربەی ناوچەکانی ئەمریکای باکوور و ئۆسترالیادا.

٢- جاربەجار پەرەسەندن کولتوورێکی دووەمینە و ڕاستەوخۆ تاقمێک لە تاقمێکی‌تری وەردەگرن. ئەمە تایبەتمەندییە ماددیەکانیش دەگرێتەوە.

٣- هەندێ جار پەرەی هەزری بە تەنیا خۆی دەتوانێ بڕواتە ڕیزی پەرەسەندنەوە کە کرۆبێر پێی دەگوت «پەرەی بزوێنەر».

یەکەم جار تایلێر بوو کە وشەی پەرەسەندنی لە ئێسنۆگرافیا و کۆمەڵناسیدا داهێنا. هەروەک بێژرا، مەبەست لەم وشەیە، پەرە و گەشەی کولتوورییە لە ڕێی کۆچ و پێوەندی و تێکەڵاوی نێو کۆمەڵگاکانە. بەکار بردنی ئەم زاراوە، دەتوانێ پەرسفدەری ئەو وێکچوونە کولتوورییانە بێ کە کۆمەڵگاکان لە یەکتر نزیک دەکاتەوە (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## پەنابەر / refugee

بەگوێرەی پێناسەی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، پەنابەر بە کەسێک دەبێژرێ کە بە هۆی یەکێک لە هۆکارەکانی ڕەچەڵەک، ئایین، نەتەوە، بیرو بۆچوونی سیاسی، یاخۆ ئەندام بوون لە گرووپێکی کۆمەڵایەتیدا بترسێ لەوەی کە تووشی ئەشکەنجە و ئازار بێ و بتوانێ بۆ هۆی ئەم ترسەش، بەڵگەی پتەو قایم و ئاشکرا بێنێتەوە (*Walsh, M. W; 1993: A6*). کۆمەڵناسان لە توێژینەوەکانی خۆیاندا بە دانانی جیاوازی لە نێوان دووچاوەکیە تاکەکەسیەکان و دووچاوەکییە فەرمییەکان، بەم ئەنجامە گەیشتوون کە دیاری کردنی پێناسە، مەحکووم کردن، بەرگری و دیاری کردنی تەمبێ بۆ

دووچاوەکییە بەڕەسمی بووەکان زۆر دژوارە؛ چونکە ئاوەها دووچاوەکییەک تەنانەت کاتێک کە زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگا دەمارگرژ یان دووچاوەکیخواز نەبن، دیسان دەتوانێ لە کۆمەڵگادا هەبێ. ناتوانین شۆپی ئەم جۆرە دووچاوەکییانە لە نییەت و مەبەست و کردەوەی تاکەکاندا ببینینەوە. ئەم جۆرە ڕەفتارە دووچاوەکییانە، ئەنجامی پێڕەوی لە هەندێ کردەوەی سەقامگیرکراون کە لە رواڵەتدا بە قازانجی کەسێکی تایبەت نییە و زۆریش دادوەرانە دیارە. بە واتایەکیتر، ئەم دووچاوەکییانە ئاکامی یاسا و پێوەرگەلێکن کە لە رواڵەتدا وادیارە بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بە چەشنێکی یەکسان لەبەر چاو دەگیرێ. بۆ وێنە، پێناسەی نەتەوەیەکگرتووەکان کە لە سەرەوە هات، ئازاری سێکسی بە هۆی پەنابەری نازانێ. توندی لە گەڵ ژنان، ساواکوشتن، خەتەنەکردنی ئافرەتان، هاوسەرگیری زۆرەکی و بەراویتن (سقط جنین) زۆرتر بە کردەیەکی تاکەکەسی یان کردەیەکی یاسایی دەزانرێ کە پێوەندی بە یاسای ولاتێکەوە هەیە کە ئەو ژنە سەربەو ولاتەیە.

## پیرناسی / gerontology

ئەم زاراوە لە وشەی گریکی geron بە واتای «بەساڵاچوو» گیراوە. پیرناسی بە مانای توێژینەوە لە سەر بەساڵاچوو و پرۆسەی پیر بوونە. پیرناسان پەیدۆزی پرۆسەی پیربوون و دیتنەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەن کە ئایا لە پرۆسەی پیربووندا کەسایەتی تاکەکانیش تووشی گۆڕان دێ یان نە. هەروەها پەیدۆزی دیتنەوەی بەشە کولتوورییەکانی پرۆسەی پیربوون و جیاوازی ئەم پرۆسەیە لە نێوان کولتوورە جیاوازەکاندایە. پیرناسان بێجگە لە توێژینەوە بە سەر پرۆسەی بیۆلۆجیکی پیربوون، ئاڵوگۆڕی دەروونی، کولتووری و چینبەندی پیری لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانیشدا دەخەنە بەر

لێکۆڵینەوە.

## پێشبینی / prediction

بەبێ پێش‌بینی و بەبێ گریمانەیەک سەبارەت بە داهاتوو، چالاکی کۆمەڵایەتی، بە تایبەت چالاکیەکی رامیاری شیاو و گوونجاو، زۆر ئەستەمە. بەڵام کێشە و گرفتی چالاکی کۆمەڵایەتی لەوەدایە کە هەرچەند کۆمەڵگا ئاڵۆزتر بێ، پێش‌بینی کۆمەڵایەتی هەم دژوارترە و هەمیش پێویستتر.

گرتنی سیاییەک لەو پێش‌بینییانەی کە رۆژگار هەڵە بوونی سەلماندوون، کارێکی زۆر دژوار نییە، بۆ وێنە: دێنی دۆرۆژمۆن پێناسەی وشەی «ترۆمبیل»ی لە فەرهەنگی زۆر بەناوبانگی ئاڵمانی برۆکهاوێرز لە ساڵی ۱۸۸۰دا بەم جۆرە دەگێڕێتەوە: «ترۆمبیل ناوێکە کە بە گەڕۆکێکی سەیرو سەمەرە دراوە کە بە هۆی ماتۆڕی ئیحتراقییەوە دەئاژوێ... ئەم داهێنانە کە ئەمڕۆ لە بیرکراوە، بەردەوام شکستی هێناوە و بەرپرسانی زانستی، دانیان پێدا نەناوە». بە لەبەرچاو گرتنی بارو دۆخی ئێستای ترۆمبیل، ئەم پێناسە هەڵەیەکی زۆر زەقی لە شێوازی پێش‌بینیدا تووش بووە. ئاگۆست کۆنت لە کورسی وانەکانی فەلسەفەی پازیتیڤیسمدا پێش‌بینی کردووە کە قەد مرۆڤ ناتوانێ تایبەتمەندی کیمیاوی ئەستێرەکان بناسێ (بودون و بوریکو؛ ۱۳۸۵).

ئەم چەن نموونە، هۆکارە سەرەکییەکانی شکست هێنانی پێش‌بینی لە چەمکی کۆمەڵایەتیدا روون دەکەنەوە. وەکوو ئەوەی کە کاتێک دەرەنجامێکی ئاماری یان یەکگرتوویەکی بەردەوام سەبارەت بە بابەتێک دێتە دەست، ئەوو ئاکامە ئامارییە بە چەشنێکی ئاسایی مرۆڤ هان دەدات بۆ پێش‌بینی کردنی رووداوەکانی داهاتوو بەگوێرەی هەمان دەرەنجام و ئاکامی ئاماری (بودون و بوریکو؛ ۱۳۸۵).

پێش‌بینی بریتیە لە دەربڕینی ئاکامی ئاڵوگۆڕێک لە داهاتوودا کە

چاوەڕوان دەکرێ لە داهاتوودا روو بدات. لانی کەم سێ هۆکار لە پێشبینیدا پێویستن: ۱) پرۆسەی ئاڵوگۆڕ کە پێشبینی لە سەر دەکرێ، ۲) زنجیرە هەلومەرجێک کە دەبنە هۆی ئاڵوگۆڕ، ۳) مەزەندەیەک بۆ روودانی ئەو دەرەنجامە. کاری پێشبینی بریتیە لە دەربڕینی راو بۆچوونێک کە بنەمای لە سەر سەرجەمی ئەم هۆکارانەوە دانراوە (گولد و کولب؛ ۱۳۸٤).

پێشبینی لە زاستدا پرۆسەیەکی لۆجیکی و کۆنترۆل کراوە کە پێویستی بە تاقیکردنەوەی زەینی و کردەوەیی هەیە. بەم بۆنەوە بەڕای پارسۆنز: «ئاشکرایە کە ئەم کارە (واتە: پێشبینی) شتێک بێجگە لە لۆجیکی تاقیکردنەوە نییە، لە هەلومەرجێکدا کە ئاستەنگەکان، کۆسپێکن لە بەرانبەر چێکردنەوەی بارودۆخ و هەلومەرجی سەرەتایی و هەروەها ناکرێ هۆکارەکان بگۆرین تا بزانین چ شتێک روودەدا، لە ئاوەها هەلو مەرجێکدا دەبێ دەست بدەین بە تاقیکردنەوەی زەینی؛ واتە هێلێک لە رەوتی رووداوەکان بە شێوەی زەینی بکێشین» (گولد و کولب؛ ۱۳۸٤).

## پێشکەوت (گەشەکردن)/ development

تا ئێستا زانایانی زانستە کۆمەلایەتییەکان پێناسەی زۆریان بۆ پێشکەوت هێناوەتە ئاراوە. هەر یەک لەم زانایانە هانی داوە بە گوێرەی دۆز و ئارمانجێک کە خۆی بوویە، پێناسەیەک لە پێشکەوت بداتە دەست.

واتای پێشکەوت، پاش شەڕی جیهانی دووەم، وەکوو زاراوەیەکی گشتگیر بەکار براوە. ئەم واتایە زۆر ئاڵۆز و چەند رەهەندییە. هەندێ لەو پێناسانە کە زانایانی زانستە کۆمەلایەتییەکان لە پێشکەوتنیان کردووە، بریتین لە: مایکێل تودارۆ دەڵێ: «دەبێ پێشکەوتن بە بزاڤێکی چەن رەهەندی بزانین کە پێویستی بە گۆڕانی بنەمای پێکهاتەی کۆمەلایەتی، بۆچوونی سەرجەمی خەڵکی و دامەزراوە نەتەوەییەکان و هەروەها خێرایی لە گەشەی ئابووری،

کەم کردنەوەی نابەرانبەری و بنەبڕ کردنی هەژاری و نەداری هەیە. پێشکەوتن دەبێ پیشان بدا کە کۆمەڵەی سیستەمی کۆمەلایەتی، هاوڕێ لە گەڵ نیازە هەمەڕەنگ و سەرەکییەکان و ویستی تاک و گرووپە کۆمەلایەتییەکانی ناو سیستەم، لە بارودۆخی نەشیاوی ژیانی رابردوو دەرباز بووە و بەرەو هەلومەرجێکی نوێ لە ژیانی مادی و مەعنەوی کە چاکتر لەوەی پێشووە، دەڕواتە پێش» (تودارو؛ ١٣٦٦). دادالی سیرز: «پێشکەوتن بە بزاڤێکی چەن رەهەندی دەزانێ کە دەبێتە هۆی نوێ کردنەوەی رێکخراو و لاگرییەکی جیاواز لە سەرجەمی سیستەمی ئابووری-کۆمەلایەتیدا. بەڕای سیرز، پێشکەوتن بێجگە لە باشتر کردنی ئاستی بەرهەمهێنان و داهات، دەبێتە هۆی گۆڕانی بنەمایی لە پێکهاتەناوەندی، کۆمەلایەتی و ئیدارییەکان و هەروەها شێواز و پێودان و بۆچوونەکانی خەلکی. پێشکەوتن، زۆرجار خوو و رەوشت و بیرو بۆچوونەکانی خەلکیش دەگرێتە بەر» (ازکیا؛ ١٣٧٧).

پیتێر دۆنالدسۆن لە پێناسەی گەشەسەندندا دەلێ: گەشەسەندن بریتیە لە گۆڕانی بنەمای پێکهاتەی کۆمەلایەتی و لایەنگیری دامەزراوەکان بۆ گەیشتن بە سەرجەمی دۆز و ئامانجەکانی کۆمەلگا. لەم رێبازە گرینگەدا گەر هەموو خەلکی بەشدار بن، رەنگە بە خێرایی بگەن بە بەرهەمی ئەو پێشکەوتنە؛ چونکە پرۆسەی گەشەسەندن بە رەنج و ئازاری زۆر دەگاتە ئەنجام. تا ئەو دەمەی کە سەرجەمی خەلکی بە شارەزایی و ئاگەداری تەواوی کۆمەلایەتیەوە سەبارەت بە گۆڕان و نیاز بە هاوڕێ بوون لە گەڵ ئەو گۆڕانە، هاریکاری سەرەکییان لە گەڵ رەوتی گەشەسەندندا نەبێ، قەد ئەم پرۆسە بەردەوام نابێ و ناگاتە ئەنجام (دینی؛ ١٣٧٠).

هەندێ لە کۆمەلناسان زۆرتر لە سەر بەها کولتووری و کۆمەلایەتییەکان جەخت دەکەن و بەم چەشنە پێناسە بۆ پێشکەوتن دەکەن: پێشکەوتن، گەیشتن بە ژیانێکی پڕپیت و بەرهەمە کە کولتوور پێناسەی بۆ دەکا. بەم

## پێشکەوت

چەشنە دەتوانین بڵێین کە پێشکەوتن، گەیشتنی مرۆڤە بە بەها کولتوورییە تایبەتەکانی پێشکەوتن (مسیرا، وەرگیراو لە: ازکیا؛ ١٣٧٤). لە باری کۆمەلایەتیدا جەخت لە سەر ئاسوودەگی و نەمانی هەژاری کراوە. لەم رەهەندەدا پێشکەوت بریتیە لە پرۆسەی دوورکەوتنەوە لە دواکەتوویی؛ واتە دەرباز بوون لە پەنجەی هەژاری. تەنیا رێگای پێشکەوتن، دانانی بەرنامە و پرۆگرامە بۆ پێشکەوتن (میردال؛ ١٣٦٦). برۆگفیلدیش بەم چەشنە پێناسە بۆ پێشکەوت دەکا: پێشکەوت بریتیە لە رۆیشتن بەرەو ژیانێکی ئاسوودە و بەبێ هەژاری و بێکاری و نایەکسانی (برگفیلد؛ ١٣٧٧).

کۆمەڵناسانی مێژوویی، پێشکەوت بە رۆیشتنێکی مێژوویی و بگار لە قۆناغێکی مێژووییەوە بۆ قۆناغێکیتر دەزانن. پێناسەی ئەوان لە پێشکەوت بریتیە لە رۆیشتنی کۆمەڵگا لە قۆناغێکی مێژووییەوە و سەرکەتنی هەمەلایەنە لە گەیشتن بە قۆناغێکیتری مێژوویی. بەواتایەکیتر، پێشکەوت بریتیە لە تێکچوونی سیستەمە کۆنە کۆمەلایەتییەکان و دامەزران و گەشەی سیستەمە نوێکان. مەبەست لەم گۆڕانە-چ لە پانتای بەربلاودا بێ یاخۆ پانتایەکی بچووکدا- بەرز بوونی پێودانەکانی ژیان لە ولاتانی دواکەوتووە. بەم چەشنە کە، پێشکەوت پەڕینەوەیە لە قۆناغێکی نزم لە زنجیرەی پلەوپاگەکان بۆ قۆناغێکی سەرتر لەوە. کۆمەڵگاکان یا ئەم قۆناغەیان تێپەڕاندووە، یاخۆ خەریکن تێپەڕی دەکەن، یا لە داهاتوودا لێی دەپەڕنەوە.

لە هەموو پێناسەکانی پێشکەوتدا، ئاواتی ژیانێکی باشتر حەشار دراوە. بۆ گەیشتن بە ئارمانجی باشتر بوونی باری ژیانی کۆمەڵگاکان، لە رەوتی پێشکەوتنی نەتەوەکاندا، بۆچوون و پێشنیاری زۆر گەلالە کراوە. هەرچەند بۆچوونە پراکتیک و هزریەکانی پێشکەوت زۆرن بەلام لێرەدا گرینگترینیان پێناسە دەکەین کە بریتین لە: «پێشکەوتی ناوخۆیی»، «پێشکەوتی دەرەکی»، «پێشکەوتی یەکسان»، «پێشکەوتی نایەکسان»، «پێشکەوت لە

سەرەوە»، «پێشکەوت لە خوارەوە».

پێشکەوتی ناوخۆ: لەم ڕەوتەدا سەرجەمی توانەکانی ناوخۆی وڵات بە سەرنجدان بە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، ئابووری، رامیاری و کولتووری لە چوارچێوەی بارودۆخی مێژووییدا لە بەرچاو دەگیرێ و بە پەرەدان بە چالاکییەکانی ناوخۆی کۆمەڵگا، بۆ چارەسەرکردنی نیازەکانی ئەندامانی هەمان کۆمەڵگا، بەکار دەبرێ. لەم ڕەوتەدا، بابەتی هەرە گرینگ، بەرز کردنی رادەی چەندوچوونی ژیانی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگایە و کۆشەوەکان بۆ گەیشتن بەم مەبەستەن. ئەم میتۆدە لە دەرەوە نایێ و لە سەر داهێنانەکانی ناوخۆ بنیات نراوە و بە هیچ جۆر بە چاولێکەری ناگاتە ئەنجام.

پێشڕەوتی دەرەکی: ئەم میتۆدە کە پاش شەڕی دووەمی جیهانی هاتە کایەوە، بە تەنیا دەرمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەزانرا. هەروەک لە ناوی ئەم ڕەوتەوە دەردەکەوێ، سەرچاوەی ئەم میتۆدە دەرەکی و بیانییە و میتۆدێکی چاولێکەرانەیە و بە گوێرەی ئەم میتۆدە، وڵاتانی دواکەوتوو دەبێ لە هەمان شێوازی وڵاتانی پێشکەوتوو بەهرە وەربگرن. لەم میتۆدەدا هیچ ئاوڕێک لە ڕەهەندی مێژوویی وڵاتانی جیهانی سێیەم نادرێتەوە. تەنانەت هیچ سەرنجێک نادرێتە بارودۆخی ئەمڕۆی وڵاتانی جیهانی سێیەم و دوێنێی وڵاتانی پێشکەوتوو. کۆمەڵناسانی پێشکەوت، کە لە بواری جیهانی سێیەمدا کۆڵاونەتەوە، ئەم میتۆدە بە «پێشکەوتی رۆژاوایی» ناودەبەن.

پێشکەوتی نایەکسان: مەبەست لە پێشکەوتی نایەکسان، پێشکەوتێکە کە لە سێ ئاستی گەورە و ناونجی و وردا نایەکسان بێ. لە ئاستی گەورەدا، مەبەست ئەوەیە کە لە لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوودا هیچ هاوسەنگی و یەکسانییەک نییە و پێشکەوتنی وڵاتانی پێشکەوتووی ئێستا لە

سۆنگەی دواخستنی ولاتانی جیهانی سێیەمە. بە واتایەکی‌تر ڕێگاکانی پێشکەوتی ولاتانی جیهانی سێیەم، زۆر بەرتەسک و سنووردارن و نایەکسانی بە راشکاوی دیارە (تیلور، وەرگیراو لە: لهسایی‌زادە؛ ۱۳۸۷). هۆی ئەم نایەکسانییە دەگەڕێتەوە بۆ دابەش‌کردنی کاری جیهانی؛ لەم پرۆسەیەدا بەرهەمهێنانی هەندێ کالا بە سەر هەندێ لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا دادەسەپێ.

لە ئاستی ناونجیدا هەرکات پێشکەوت لە بەشی پیشەسازی و کشتوکالدا، یان لە نێوان شارو گونددا نابەرانبەر گەشە بسێنێ، پێشکەوت نایەکسان بووە.

لە ئاستی وردا پێشکەوتی نایەکسان بریتیە لە نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان بەشە جۆراوجۆرەکاندا. بۆ وێنە لە بەشی کۆمەلایەتیدا زۆربەی بوودجەکان بۆ بەشێک تەرخان دەکرێن و بەشەکانی‌تر کەمتریان بەردەکەوێ و بەم بۆنەوە بەشێکی کۆمەلگا زۆر پێشدەکەوێ، کەچی بەشەکانی‌تر دوادەکەون (لاوی، وەرگیراو لە: لهسایی‌زادە؛ ۱۳۸۷).

پێشکەوتی یەکسان: لە پێشکەوتی یەکساندا بە پێچەوانەی پێشکەوتی نایەکسان، دۆزی سەرەکی لە پێشکەوت، گەشەی هاوکاتە لە چەندوچوونی بەشەکانی ئابووری، کۆمەلایەتی، رامیاری و کولتووری کۆمەلگادا. لەم جۆرە پێشکەوتەدا، هیچ یەک لە بەشەکانی ئابووری، کۆمەلایەتی، رامیاری و کولتووری بە ژێربینا یان رووبینا نایەنە ئەژمار و بەم بۆنەوە هیچ یەکیان بە گرینگتر لەوانی‌تر نازانرێ. لە باری پلان‌دانانیشدا هیچ بەرو دوا ناکەون. بە دانانی بەرنامەیەکی گشتگیر و هەمەلایەنە، هەموو بوارەکان پێکڕا بەرەو پێش دەڕۆن.

پێشکەوت لە سەرەوە: لە راستیدا ئەم پێشکەوتە گۆڕانێکی پێکهاتەییە کە لە چوارچێوەی بارودۆخی هەنووکەیدا دێتە کایەوە. بە واتایەکی‌تر، کۆمەلگا دەست نادا بە گۆڕانی بناغەیی، بەلکوو چاکسازی لەو هێزانەوە دەست

پێدەکات کە لە سەرەوەی کۆمەڵگادان و پاشان بەشەکانی تری کۆمەڵگاش دەگرێتەوە. لەم گۆڕانەدا هێزە سەرەکی و بنەماییەکانی گۆڕان، «بژاردەکان»ن. ویلفرێدۆ پارێتۆ و مووسکا لە دانەرانی ئەم بیردۆزەن. ئەم دوو بیرمەندە رایان وایە کە کۆمەڵگا بە هۆی بژاردەکانیەوە ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێ و بەرەو پێش دەڕوا. ئەو بژاردانەی کە دەسەڵاتیان لە دەستدایە بە هاوکاری ئەوانەی کە بێدەسەلاتن، دەتوانن رەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بە سەر خەڵکی ئاساییدا داسەپێنن و کۆمەڵگا بەرەو پێشکەوت پاڵ پێوەبنێن. هەروەها مەک کلێلەند و هیگن، لەو بیرمەندە نوێیانەن کە لە سەر دەور و کاریگەری کارئافرێنەران بە سەر پێشکەوتنی کۆمەڵگادا جەخت دەکەن (لیور، وەرگیراو لە: لهسایی‌زادە؛ ١٣٨٧).

پێشکەوت لە خوارەوە: ئەم پێشکەوتە گۆڕانێکی بناغەییە کە دەبێتە هۆی وەرگەڕاندنی پێکهاتەکۆمەلایەتییەکان. زۆرتر ئەم پێشکەوتە هاوڕێیە لە گەڵ شۆڕش و بەشداری چین و توێژەکانی کۆمەڵگایە. لەم گۆڕانەدا لاوان بەشدارییەکی ئەوتۆیان هەیە. لە پێشکەوت لە خوارەوە، مەبەست و دۆزی سەرەکی، گۆڕانی بارودۆخی باوی نێو کۆمەڵگایە (لهسایی‌زادە؛ ١٣٨٧).

## پیشەکان/ professions

ئەم زاراوە باس لەو کارانە دەکات کە پێویستیان بە زانست و شارەزایی هەیە. فێر بوونی ئەم زانستانە پێویستی بە فێرکاری و پەروەردەی تایبەت هەیە و کۆرسەکانی فێرکاری ئەم زانستانە زۆرتر هزرین و کەمتر لە رێی ئەزموونەوە بەدەست دێن. ئاستی پسپۆڕی و شارەزایی بەشداران لەم کۆرسانەدا لە رێگای تاقی‌کردنەوەلە زانکۆ یان ئەو دامودەزگا و رێکخراوانەی کە بۆ راهێنانی ئەم خوێندکارانە تەرخان کراون، لە پێوانە دەدرێ و بەو کەسانە لەم خولانەدا سەرکەون بڕوانامەیەک دەدرێ کە دەسەلاتێکی

## پیشەکان

شایانیان پێ دەدات.

ئەم هێز و دەسەلاتە لە لایەن یەکیەتی و کۆمەڵەپیشەییەکانەوە پشتگیری لێ دەکرێ. ئەم یەکیەتییانە هەندێ یاسا و پێوەر بۆ وەرگرتن، فێرکردن و هەڵسوکەوت لە گەڵ خەڵکی (ئاکاری پیشەیی) بۆ بەشدارن و ئەندامانیان دادەڕێژن و چاودێری دەکەن لەوەی کە ئاستی زانست و لێهاتوویی و شارەزایی خوێندکاران کەم نەبێتەوە. لە ئاستی مووچەیان لایەنگری دەکرێ و تێدەکۆشن تا گرووپەرەقیبەکان لە دەستێوەردان لە کار و بار و چالاکییە پیشەییەکانیان دوور بگرن و بۆ پاراستنی پێگەی پیشەییان تێدەکۆشن.

ئەمرۆکە ئەم زاراوە ئاماژە دەکات بە کار و پیشەیەکی تایبەت کە بەشداران لەم کارەدا پتر لەوەی کە خەریکی بەرهەمهێنانی کالایەک بن، خەریکی خزمەتگوزارین. ئەم پیشانە جیاوازن لە گەڵ ئەو کارانەی کە کالایەک بۆ سوود و قازانج لە نێو دووکان یاخۆ هەر شوێنێکیتردا رادەنێن و دەیانفرۆشن. هەروەها جیاوازە لە گەڵ هەندێ کاری وەکوو نەشتەرگەری، دەرمانسازی یاخۆ هەندێ لە ئەندازیاران کە دەست دەدەن بە فرۆتنی هەندێ کالا کە فرۆشتنیان پێویستی بە شارەزایی و زانینێک هەیە کە لە رێگای فێرکارییەوە بە دەست دێت (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

شارەزایی و لێهاتوویی پسپۆڕەکان دەبێ لە لایەن خەڵک و بەرپرسە رەسمییەکانەوە دانی پێدا بنرێ. بە واتایەکیتر، ئەم پسپۆڕانە دەبێ بۆ پیشەکەی خۆیان پێودانگی یاسایی ببیننەوە. گەر وانەکەن، دەسەلاتە لاوەکییەکان، کۆنترۆڵ و چاودێری بە سەر ئەم پیشەیە دەگرنە ئەستۆ. هەروەها پسپۆڕان دەبێ پیشان بدەن کە توانی چاودێری بە سەر ئەندامانی خۆیانیان هەیە.

بە بڕوای گوود، گەر پسپۆڕان ئەم دوو پێداویستییە سەرەکییە بە دەست

بێنن (واتە پەسند کردنی خەڵکی و چاودێری بە سەر ئەندامانیان)، تایبەتمەندییەکانی‌تری ئەو کارەش دەسەلمێنن. ئەم تایبەتمەندییانە بریتین لە:

١- ئەو پیشە خۆی پێوەرو پێودانگەکانی فێرکاری و خوێندنی ئەندامانی دیاری دەکا.

٢- لەچاو ئەو کەسانەی کە کاری ئاساییان هەیە، خوێندکارانی پیشەیی، پرۆسەی بەکۆمەڵایەتی بوونیان دژوارترە.

٣- زۆربەی پیشەکان لە لایەن بەرپرسە رەسمییەکانەوە دانی پێدا دەنرێ و بیچمێکی یاسایی دەگرێتە خۆ.

٤- پەسندکردنی لێهاتوویی خوێندکار و هەروەها تەسلیم کردنی بڕوانامە، لە لایەن ئەندامانی هەمان پیشەوە ئەنجام دەگرێ.

٥- زۆربەی یاساکانی ئەو پیشە، بەهۆی ئەندامانی هەمان پیشەوە دادەڕێژرێن.

٦- هاوکات لە گەڵ گەیشتن بە داهات، دەسەلات و پێگەی کۆمەڵایەتی، ئەو پیشە دەتوانێ داوای ناونووسی خوێندکارانی شیاو و لێهاتوو بۆ ئەو پیشەیە بکات.

٧- تا رادەیەکی زۆر، پسپۆڕەکان لە چاودێری و کۆنترۆڵی کەسانی‌تر ئازادن.

٨- ئەندامانی پیشە، پێناسەی سەرەکی خۆیان لە رێی هەمان پیشەوە بە دەس دێنن (*Good, W. J; 1960*).

بۆ نموونەی پیشەکان دەتوانین ئاماژە بکەین بە لێژنەی پزیشکان، کۆمەڵەی بریکاران، ئەنجومەنی ئەندازیارانی کارەبا و کۆمەڵەی کۆمەڵناسان و سەندیکای رۆژنامەوانان.

### پیشەی ئێخە سپییەکان / white-collar occupations

ئەم واتایە باس لەو پیشانە دەکا کە بایەخێکی ئەوتۆی کۆمەڵایەتییان هەیە و زۆربەیان دەپەرژێنە سەر کاری هزری. ئەم کارانە بریتین لەو شوێنگانەی کە لە بەشی فرۆش، بەڕێوەبەرایەتی و خزمەتگوزاری دامەزراوەیەکی بۆرۆکراتیکدا هەیە. هەرچەند ئەمڕۆکە بەشێکی زۆر لەم کەسانە خەریکی هەندێ کارن کە هەموو رۆژ دەبێ دووپاتەیان کەنەوە (وەکوو کرێکارانی کارخانە پیشەسازییەکان)، بەڵگەکان وا پیشان دەدەن کە زۆربەی ئەم کەسانە خۆیان لە ریزی چینی کرێکار نازانن و بارودۆخی خۆیان بە گوێرەی پێوەرە مارکسییەکان ناپێون؛ بە پێچەوانە، زۆربەی ئەم کەسانە پێیان وایە کە پێگەی کۆمەڵایەتییان بەرزتر لە پێگەی کۆمەڵایەتی باوکەکانیانە.

بە سەرنج دان بەم خاڵەی کە لە چاخی نوێدا بە گۆڕانی چۆنییەتی کۆمەڵگاکان، واتە گۆڕان لە کۆمەڵگای پیشەسازییەوە بۆ کۆمەڵگای سەروو پیشەسازی، چۆنییەتی کارەکانیش گۆڕانیان بە سەردا هاتووە. بە گوتەی گێرهارد لێنسکی، لە کۆمەڵگای سەروو پیشەسازیدا دەوری کرێکارانی ئێخە شین زۆر کەمتر دەبێتەوە و پرۆسەی بەرهەمهێنانی خولی پیشەسازی جێگای خۆی لە گەڵ بەشی خزمەتگوزاری و بەرهەمهێنانی زانیاری و تیکنۆلۆجی دەگۆڕێتەوە. لەم سەردەمەدا زۆربەی کرێکاران و ئەو کەسانەی لەم کۆمەڵگایەدا کار دەکەن، کرێکاری ئێخە سپین؛ هەرچەند ئەم کرێکارانە خۆیان بە کرێکار نازانن. هەروەها رەنگە داهاتی هەریەک لەم کەسانە زۆر کەمتر بێ لە کرێکارێکی پسپۆڕ یان نیوە پسپۆڕی ئێخە شین، بەڵام ئەم کەسانە خۆیان لە چینی کرێکار سەرتر دەزانن (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

### پیشەی ئێخە شینەکان / blue-collar occupations

ئەم زاراوە ئاماژە بەو پیشانە دەکات کە بە کاری جەستەیی جێبەجێ دەکرێن و لەپیشەهزری و کۆمەڵایەتییەکان جیاوازن. ئەم کەسانە بریتین لە

کرێکارانی شارەزا و نیوە شارەزا و کرێکاری سادەی وەکو کرێکارانی مەزرا، کارخانەکان، کرێکارانی کانەکان، کرێکارانی بیناسازی و هتد. ئەم واتایە بۆ هەڵاواردن و جیاکردنەوەی کارە هزرییەکان لە کارە جەستەییەکان بەکار براوە.

## پێکهاتەخوازی/ structuralism

کەڵکوەرگرتن لەم زاراوە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی هزری کۆمەڵناسی لە سەدەی نۆزدەهەمدا. لەم سەدەیەدا، بەشێکی زۆر لە کۆمەڵناسان و ئێسنۆگرافەکان لە باس لە سەر یەکەتی و گشتگیربوونی دیاردەی کۆمەلایەتی، واتای پێکهاتەیان بە شێوازی جۆراوجۆر بەکار هێناوە. هەروەک یەکەم جار دوورکایم لە پێکهاتەی بیچمناسی (structures morphology) باس دەکات، هەروەها مارکس باسی سەرپێکهاتە (super-structure) و ژێرپێکهاتە (infra-structure) دێنێتە کایەوە.

وشەی پێکهاتە (structure) لە وشەی لاتینی structura و لە کاری struere بە مانای چێ کردن و بنیات نان وەرگیراوە. تا بەر لە سەدەی حەڤدەهەم ئەم وشە تەنیا لە نژیارڤانیدا بەکار دەبرا، بەلام پاش ئەوە هاتە نێو زانستی نەشتەرگەری و زمانەوانییەوە. پێکهاتەی بەشەکانی لەشی مرۆڤ بە بینایەک دەچوێندرا و هەروەها بیچم و قەوارەو تێکەلاوی وشەکانیش بەخاوەن پێکهاتە دەزاندران. لە سەدەی نۆزدەهەمدا هێربێرت سپێنسێر ئەم زاراوەیە لە ژینەوەرناسی وەرگرت و لە زانستەکۆمەلایەتییەکاندا کەڵکی لێوەرگرت. هەرچەند ئەو لە نێوان ئەندامی کۆمەلایەتی و بایۆلۆجیکیدا جیاوازی دادەنا، بەلام واتای پێکهاتەی کۆمەلایەتییەک کە ئەو مەبەستی بوو، رەنگ و بۆیەکی سروشتخوازانەی بوو (توسلی؛ ١٣٨٧).

پێکهاتەخوازی لە پێگەی رێبازێکی هزریدا، لە چەن مەڵبەندی

لێک‌جیاوازەوە تێدەپەڕێ. یەک لەوانە ئێسنۆگرافیای بریتانی و فەرانسییە و دووەمینیان نەریتی سەرەکی کۆمەڵناسی فەرانسەیە: کۆنت لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم و دوورکایم لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بیری کۆمەڵگا، وەکوو شتێکی بەرزتر و هێژاتر لە تاکیان هێنایە کایەوە.

لقی سێیەم نەریتی فەلسەفییە کە لە کانتەوە سەرچاوە دەگرێ و بیری سەرەکی ئەو ئەمەیە کە مرۆڤەکان خاوەن هێزی ئاوەزن و بەهۆی ئەم ئاوەزەوە نەزم بە سەر جیهاندا دادەسەپێنن. لقێکی‌تر کە لەوان گرینگترە، لە نێو ڕێباری زمان‌ناسی پێکهاتەیی فێردینان دۆسۆسۆر و ڕێبازی فۆرمالیستی رووسی لە ڕەخنەی ئەدەبییەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەگەرچی ئەم ڕێبازی هزرییە، سەرچاوەی زۆری هەیە، بەڵام بۆ خۆی لق و پۆی زۆری لێ بۆتەوە و کەسایەتییە هەڵکەوتەکانی ئەم بیردۆزە، فەرانسین: ستراوس (ئێسنۆگرافی)، ئاڵتۆسر (بیردۆزی کۆمەڵایەتی و فەلسەفە)، بارت (ڕەخنەی ئەدەبی)، کریستین مێتز (ڕەخنەی فیلم)، ژاک‌لاکان (دەروون‌دۆزی)، میشل فۆکۆ (مێژووی هزر) و ژاک دریدا (فەلسەفە) (کرایب؛ ١٣٨٨).

بابەتێک کە دەبێ ئاماژەی پێ‌بکرێ، سەرنجێکە کە ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر دەدرێتە پێکهاتەخوازی؛ هەرچەند دەڵێن زۆرتر لە فەرانسەدا لایەنگری هەیە، بەڵام ئەمڕۆکە بۆتە دیاردەیەکی نێونەتەوەیی. کێشەی پێکهاتەخوازی لەوەدایە کە هەنووکە نەیتوانیوە لە کۆمەڵناسیدا وەکوو لقەکانی‌تر زۆر گەشە بستێنێ و بە ڕاشکاوی پێناسە بکرێ. بەڵام بەکورتی ئاماژە بە هەندێ لە بۆچوونەکانی ئەم ڕوانگەیە دەکرێ. هەندێ لە پێکهاتەخوازان لە سەر ئەو شتەی کە خۆیان پێکهاتە قووڵەکانی زەینی پێ دەڵێن، جەخت دەکەن. بەبڕوای ئەوان، ئەم پێکهاتە ناوشیارانە، خەڵکی بۆ بیرکردنەوە و کار هان دەدەن. کاری دەروون‌ناسی بەناوبانگ زیگمۆند فرۆید، دەخرێتە ڕیزی ئەم تاقمەوە. تاقمێکی‌تر ئەوانەن کە جەخت لە سەر پێکهاتە بەرفراوان و

پیوارەکانی کۆمەڵگا دەکەن و ئەم پێکهاتانە بە هۆی سەرەکی کاری تاک و کۆمەڵگا دەزانن. هەندێ جار مارکس دەخەنە ریزی ئەو کەسانەوە کە لە سەر ئەم بۆچوونە بووە؛ چونکە لە سەر پێکهاتەی ئابووری بەرپیواری کۆمەڵگای سەرمایەداری جەخت دەکات. لە ئەنجامدا گرووپێک لە پێکهاتەخوازان لە سەر پێوەندی دیالکتیکی نێوان تاکەکان و پێکهاتەی ئابووری دەکۆڵنەوە. ئەوان لە نێوان پێکهاتەکانی زەین و پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا پێوەندییەک بەدی دەکەن. کلۆد لوی ئێشتراوس دەخەنە ریزی ئەندامانی ئەم روانگەوە (ریتزر؛ ١٣٨٥).

کێشە و کۆسپی کۆمەڵناسی پێکهاتەیی لەوەدایە کە بۆتە هەنبانەیە ک لە بیرو بۆچوونی جۆراوجۆری لێک جیاواز. بێشک تا ئەم بیرە لێکجیاوازانە یەک نەگرن، هەروا لە پەراوێزی کۆمەڵناسیدا دەمێنێتەوە. بە گشتی، ئاڵو گۆڕی لقە جۆراوجۆرەکانی پێکهاتەخوازی بۆ کۆمەڵناسان ئەوەندە سەرنجراکێش بووە کە رەنگە بیردۆزی کۆمەڵناسی پێکهاتەیی لە سالانی داهاتوودا سەرنجێکی زۆرتر بۆ لای خۆی رابکێشێ. هاوکات لە گەڵ پێکهاتەخوازی لە نێو کۆمەڵناسیدا، بزاڤێکیتریش بەناوی پاشپێکهاتەخوازی، لە دەرەوەی ئەم رێبازەدا سەری هەڵێناوە کە سەرتر لە گریمانە سەرەتاییەکانی پێکهاتەخوازی دەڕوا (هەمان سەرچاوە).

## پێگەی ئابووری-کۆمەلایەتی/ socio-economic status

باوەڕی مارکس ئەوە بوو کە دەسەلات و ئێعتباری کۆمەلایەتی تاکەکان لە بارودۆخی ئابووریيانەوە سەرچاوە دەگرێ. بەم بۆنەوە بە پێویستی نەدەزانی کە وەکوو هۆکاری نایەکسانی کۆمەلایەتی لە سەریان بکۆڵێتەوە. ماکس ڤیبێر بە تێگەشتن لەم بابەتەدا کە چینبەندی لە جڤاکە پیشەسازییەکاندا یەکگرتوو و یەکسان نییە، لە گەڵ ئەم بۆچوونەی مارکس

ناتەبا بوو. بە ڕای ئەو ڕەنگە تاکێک لە یەکێک لە ڕەهەندەکانی نایەکسانی کۆمەڵایەتیدا پێگەیەکی سەرتری بێ، کەچی لە ڕهەندەکانی‌تردا پێگەیەکی نزمی بێ. بۆ وێنە: بەرپرسە ڕەسمییەکانی سیستەمی بۆرۆکراتیک، ڕەنگە خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر بن، بەڵام لە سامان و ئیعتبارێکی کۆمەڵایەتی زۆرکەم بەهرەمەندن.

بە پێچەوانەی مارکس کە بە گوێرەی دوو چینی کۆمەڵایەتی زۆر ئاشکرا و ڕوون و پێناسە کراو نایەکسانی کۆمەڵایەتی لێکدەدایەوە (پرۆلتاریا و بورژواکان)، ڤیبێر بە خاڵێکی ورد و نادیار ئاماژە دەکا کە لە پۆلێن‌کردنی کۆمەڵگا پێشەسازییەکاندا دەوری سەرەکی دەبینێ. خزمەتی ماکس ڤیبێر بەم بوارەی کۆمەڵناسی ئەوەیە کە پێناسەیەکی زاتی لە چەند بواری چین‌بەندی کۆمەڵایەتیدا ناسیوە و پێمانی ناساندووە. کۆمەڵناسان زۆرتر واتای پێگەی ئابووری-کۆمەڵایەتی بۆ ئاماژە بە ئاوێتەیەک لە چین‌بەندی کۆمەڵایەتی بە کار دەبەن کە بنەمای لە سەر ڕەهەندەجۆراوجۆرەکانی نایەکسانی کۆمەڵایەتی داڕێژراوە (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## پێگەی بەدەستهاتوو / achieved status

بە گشتی، پێگەکان لە کۆمەڵگادا بە دوو دەستە دابەش دەکرێن: پێگەکان یا لە ڕێگای هەوڵ و کۆششەوە بە دەستهاتوون و پێی دەڵێن پێگەی بەدەستهاتوو، یاخۆ وەکوو میراتی هەر لە کاتی بە دونیا هاتنەوە لە گەڵ تاکدا بوون کە پێی دەڵێن پێگەی پێ‌سپێردراو. پێگەی بەدەستهاتوو شوێنگەیەکە کە بە هۆی ئەندێشە و لێهاتوویی و کۆشەوەی تاکەوە بە دەست هاتووە یان لە دەست دراوە (کار، ئاستی خوێندن، یاری و هتد). بە واتایەکی‌تر، پێگەی کۆمەڵایەتی تاکەکان بەرهەمی هەڵس‌وکەوتی کۆمەڵایەتی خودی ئەو کەسانەیە. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە، تاکێک کە

تووشـی مـادە سـڕکەرەکـان هـاتووە، یـان بۆتـە پزیشـکێکی شـارەزا، یـان خوێندکارێکی لێهاتوو، خۆی بەرپرسی ئەو شوێنگەیە کە بە دەستی هێنـاوە. دەبێ ئەم خاڵەش لەبەرچاو بگرین کە هێزە کۆمەڵایـەتییـەکـان لـە دیـاری کردنی ئەم پاگانەدا دەورێکی گرینگیان هەیە.

بۆ وێنە منداڵی کرێکارێک کە بە خوێنـدن و کۆشـەوە و هـەوڵـی زۆرەوە توانیویە ببێتە پزیشکێکی شارەزا و پسپۆڕ و بەم بۆنـەوە شـوێن و چۆنییـەتی ژیانی خۆی بگۆڕێ و لە گەڕەکی دەولەمـەنـدانی شـاردا دابنیشـێ و ببێتـە خاوەن پێگەیەکی بەرزی کۆمەڵایەتی، ئـەو پێگـە، پێگـەی بـەدەسـتهاتووە. پزیشک لە هەموو شوێندا پێگەیەکی کۆمەڵایـەتی بـەرزیـان هـەیـە، بـەڵام گەیشتن بە ئاوەها شوێنێک لە ژیاندا پێویسـتی بـە کۆشـەوە و هـەوڵـی زۆر هەیە.

### پێگەی پێسپێردراو / ascribed status

ئەم واتایە باس لە شوێنگەیەک دەکـا کـە تـاک تێیـدا هاتۆتـە دونیـاوە و گەشەی کردووە. بە واتایەکیتر، پێگەی پێسپێردراو هـەڵومـەرجێکـە کـە تاک لە بنیات نان و داڕشتن و بەدیهێنانیدا هیچ دەورێکی نـەبـووە (وەکـوو: رەگەز، تەمەن، نەتەوە، تەندروستی، پیری، لەکارکەوتوویی، ناتوانی زەیـنـی و هتد). بۆ وێنە، سـپی پێسـتەکـانی ئـەمریکـا نـە بـە بۆنـەی کارێکـەوە کـە جێبەجێـی دەکـەن (پێگـەی بـەدەسـتهاتوو)، بـەڵـکوو بـە بۆنـەی رەنگـی پێستیانەوە (پێگەی پێسپێردراو) خاوەن پێگەیەکی بەرزی کۆمەڵایەتین.

### پێگەی سەرەکی / master status

هەندێ لە پێگەکان لە چاو پێگەکانیتـر، بایـەخێکـی زۆرتریـان هـەیـە. پێگەی سـەرەکـی بریتیـە لـە پێگـەیـەک کـە بـۆ روون کـردنی پێناسـەی

## پێگەی سەرەکی

کۆمەڵایەتی بایەخێکی ئەوتۆی هەیە و زۆرجار بنەمای ژیانی تاک لە سەر ئەو پێگەیە دادەمەزرێ. کاری زۆربەی خەڵکی، پێگەی کۆمەڵایەتییان دیاری دەکات، چونکە کاری تاکەکان تا رادەیەکی زۆر نوێنەری پێشینەی کۆمەڵایەتی و ئاستی خوێندن و داهاتیانە. بەرزترین ئاست بۆ بەناوبانگ بوونی تاک، دەتوانێ شازادە یان شابانوو بوون بێ. بە پێچەوانەی ئەوەش هەندێ نەخۆشی دەتوانن وەکوو پێگەی سەرەکی تاک رەچاو بکرێ. بۆ وێنە زۆربەی خەڵکی خۆیان لە نەخۆشانی شێرپەنجە یان ئەیدز دەپارێزن، ئەوەش تەنیا لە بەر جۆری نەخۆشییەکەیانە. لە هەندێ کۆمەڵگادا ژنان تەنیا لە بەر ژن بوونیان (بەبێ سەرنجدان بە توان و لێهاتوویییەکانیان)، تووشی ئاستەنگ و پێگەی نزم دێن.

رەچەڵەک و نەتەوەش لەو تایبەتمەندییانەن کە دەتوانن پێگەی کۆمەڵایەتی تاک دیاری بکەن. زۆرن ئەو کەمینانەی کە لە ولاتانی ئەورووپی و ئەمریکیدا بەبێ سەرنجدان بە توان و لێهاتوویییەکانیان، تەنیا بە گوێرەی رەچەڵەک و نەتەوەیان پێناسە دەکرێن. واتە: نەتەوە یان رەچەڵەک پێگەی سەرەکی ئەم کەسانە دێتە ئەژمار ( *benjamin, L; 1991*).

تاکەکان دەتوانن هاوکات، لە چەن پێگەی جۆراوجۆردا بن. بۆ وێنە ژنێک دەتوانێ مکزیکی بێ و لە ئەمریکادا بژی و ئەندازیاری شارسازی بێ و خێزانی پیاوێکیش بێ و هەروەها دایکی منداڵ و منداڵی ژن و پیاوێک بێ. بەڵام هەندێ جار تەنیا پێگەیەک دەتوانێ پیشاندەری پێناسەی کۆمەڵایەتی تاک بێ. پێگەی سەرەکی بریتیە لە شوێنگەیەکی کۆمەڵایەتی کە هەموو یان هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی تاک لە بەرچاو ناگرێ، یان ئاوڕ لەو کارانەی کە لە ژیاندا جێبەجێیان دەکا ناداتەوە (*Hughes, E. C; 1945*). بۆ وێنە: کەسێک کە خاڵی لە نێو سیستەمی حکوومەتدا دەسەڵاتێکی زۆری

بچووکی هەیە.

## پێگەی کۆمەلایەتی / social status

پێگە، بریتیە لە جێگا و هەل‌ومەرجێکی کۆمەلایەتی کە تاک لە نێو گرووپ یان لە نێو چینی کۆمەلایەتی گرووپێکدا، لە چاو گرووپەکانی‌تردا بە دەستی دێنێ. پێگە و هەل‌ومەرجی کۆمەلایەتی تاک، ماف و بەرهەمەندیەکانی تاک لە نێو کۆمەلگادا دیاری دەکات. بۆ وێنە مامۆستایەکی زانکۆ کاتێ لە گەل گرووپە کارییەکانی‌تر هەلسەنگێندرێ، پێگەیەکی بەرزی لە نێو کۆمەلگادا هەیە. کەچی لە نێوان کۆلێژەکانی زانکۆیەکدا، پێگەیەکی رێکخراو هەیە کە بە گوێرەی ئاستی زانستی و ماوەیەک کە خەریکی کار بووە دیاری دەکرێ (کوئن؛ ١٣٨٧).

یەکێک لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی تاک ببێتە خاوەن پێگەیەکی بەرزی کۆمەلایەتی، مال و سامانە. ئەو کەسانەی کە لە بنەمالەیەکی ئەریستۆکرات و خانەدانن، هەرچەند کە ئەو سامانەی کە پێشتر بوویانە لە دەستیان داوە، بەلام هێشتا لە لایەن خەلکەوە رێزیان لێ‌دەگیرێ. هەروەها بنەمالە دەولەمەندە کۆنەکان، بە سووکی سەیری دەولەمەندە نوێکان دەکەن و پێیان دەلێن «نۆکیسە (new money)» (گیدنز؛ ١٣٨٥).

## پێواندن / survey

پێواندن یەکێک لە شێوازەکانی توێژینەوەیە؛ لەم شێوازەدا ئەندامانی کۆمەلەی ئاماری (نموونە) بە پرسیارەکانی توێژەر وەلام دەدەنەوە. ئەم وەلامدانەوە یان لە رێگای پڕکردنەوەی پرسیارنامەیە یاخۆ بە شێوازی راستەوخۆ توێژەر لە گەلیان دیمانە دەکات.

پێواندن بە دیاری کردنی کەسانێک کە نوێنەری گرووپی بەرباسن و

هەروەها دیاری کردنی ئەو پرسیارانە کە دەبێ لێیان بپرسرێ دەست پێدەکرێ. هەروەها لە پێواندندا مەرج نییە هەموو کات تاکەکان بابەتی توێژینەوە بن، بەڵکوو گرووپ، ڕێکخراو یا تەنانەت سەرجەمی کۆمەڵگا دەتوانێ ببێتە بابەتی لێکۆڵینەوە. دەکرێ لە پێواندن بۆ تاقی کردنەوەی بابەتگەلی روون و ئاشکرا یان تاقی کردنەوەی بیردۆزەکان یاخۆ دانانی بیردۆزی نوێ بەهرە وەربگیرێ. گەر توێژینەوەکان وا پیشان بدەن کە ئەو پێوەندییە کە پێشتر ڕەچاو کراوە لە نێوان ئەم گرووپی بەرباسدا هەیە، ئەو بیردۆزە پەسند دەکرێ و گەریش بەڵگەی ئاشکرا و روون بۆ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو بیردۆزە دەست نەکەوێ، لە ڕاست و دروست بوونی ئەو بیردۆزە گومان دەکرێ. مەبەست لە پێواندن، روون کردنی ئاستی گۆڕانی وەڵامەکانە؛ لە پێواندندا هەر پاژ لە زانیارییەکان نوێنەری بگۆڕێک، واتە ڕادەیەک بۆ دیاری کردنی جیاوازی وەڵامەکانە. بۆ وێنە: لە پێواندنەکاندا ڕەگەزی (جنسیەت) هەر وەڵامدەرێک دەستنیشان دەکرێ. لەم بابەتەدا بگۆڕی ڕەگەز تەنیا دوو وەڵامی بۆ هەیە: ژن یان پیاو. گەر پێواندن تەنیا سەبارەت بە یەک ڕەگەز بێ، ڕەگەز نەگۆڕە و وەکوو بگۆڕ لە پێواندنەکەدا سەیری ناکرێ (بیکر؛ ١٣٨٧).

## measurement / پێوان

لە کۆمەڵناسیدا ئەم زاراوەیە سەبارەت بە پرۆسەیەک بە کار دەبەن کە تێیدا بایەخی بگۆڕێک، لە نێو چەمکێکی ئاشکرادا، دیاری دەکرێ. پێواندنی هەندێ بگۆڕ -وەکوو زۆر یا کەم بوونی داهات لە کاتی دانی پیتاکدا- کارێکی ئاسانە. بەڵام پێوانی زۆربەی بگۆڕەکان لە کۆمەڵناسیدا کارێکی دژوارن. بۆ وێنە چۆن دەتوانین چینی کۆمەڵایەتی کەسێک دیاری بکەین؟ ڕەنگە بتانەوێ بە گوێ دان بە شێوازی ئاخاوتنی ئەو کەسە، یان دیتنەوەی

شوێن و گەڕەکی ژیانی، یان سەرنج دان بە شێوازی جل و بەرگ لە بەر کردنی، چینی کۆمەڵایەتی کەسێک دیاری بکەن. هەروەها ڕەنگە بە گوێرەی داهات، کار یان پلەی خوێندنی ئەو کەسە رای خۆتان بڵێن.

کۆمەڵناسان بە چاکی دەزانن کە دەکرێ هەموو بگۆڕەکان لە زۆرتر لە یەک ڕێگاوە تاقی بکرێنەوە. ڕەنگە داهاتی زۆر ببێتە هۆی ئەوەی کە کەسێک لە چینی سەروودا دابنرێ؛ بەڵام گەر ئەم داهاتە لە ڕێی فرۆتنی ترۆمبیلەوە هاتبێتە دەست (واتە کارێک کە زۆربەی خەڵک تایبەت بە چینی ناوەندی و یاخۆ تەنانەت بە کاری چینی کرێکاری دەزانن) دیسان دەکرێ بە ئەندامێکی چینی سەروو بێتە ئەژمار؟ یاخۆ گەر کەسێک پاش دوایی هاتنی قۆناغی ناوەندی واز لە خوێندن بێنێ، دەکرێ بڵێین ئەو کەسە لە چینی خوارووی کۆمەڵگایە؟ بۆ چارەسەر کردنی ئاوەها کێشەیەک، کۆمەڵناسان بە شێوازێکی شیاو (هەرچەن تا ڕادەیەک خۆڕایانە)، هەرسێ بگۆڕی داهات، خوێندن و کار بۆ پیشان دانی چینی کۆمەڵایەتی تاکەکان، کە پاگەی ئابووری-کۆمەڵایەتی پێ دەڵێن، لەبەر چاو دەگرن و لە توێژینەوەکانی خۆیاندا چێژی لێ دەگرن. هەروەها کۆمەڵناسان لە گەڵ کێشەی پێوەرێک بۆ پێوانی هەزاران و بگرە میلیۆنها کەسێک ڕووبەڕوون کە چینی کۆمەڵایەتی خۆیان بە گوێرەی یەکێک لەو بگۆڕانە (ئاستی خوێندن، کار، داهات) دەپێون. پێوان، هەموو دەم خۆڕایانەیە، چونکە بەشێک لە بایەخی هەر بگۆڕێک بەستراوە بە پێناسەیەک کە لەو بگۆڕە دەدرێتە دەست (پێناسەیەک کە بە پێی ئەوە کۆمەڵناس دەتوانێ گەلالەی پرسیارنامەیەک بۆ نموونەی کۆمەڵەی ئاماری خۆی دابڕێژێ) (بیکر؛ ١٣٨٧).

### پیودان (شێوە)/ norm

پێودانەکان، بریتین لە یاسا و شێوازگەلی هەڵسوکەوتی هاوبەش لە

بارودۆخگەلی تایبەتدا. بەپێچەوانەی **بەهاکان**، کە بۆچوونگەلی **ئینتزاعین**، پێودانەکان یاساگەلێکن کە بە خەلکی فێر دەکەن کە لە هەلومەرجی تایبەتدا دەبێ چی بکەن، چی بلێن وو چۆن بیر بکەنەوە. بۆ وێنە، نیشتمانپەرستی بەهایەکە، کەچی رێزگرتن لە ئالای ولات، پێودانە. پێودانەکان چۆنییەتی هەلس‌وکەوتی خەلکی روون دەکەنەوە. لە راستیدا پێودانەکان، رێنمای سەرجەمی کردەوەکانی ئێمەن: رێورەسمی بەدنیاهاتن و مردن، دابونەریتی زەماوەند، شەڕ کردن، خواردن، لە بەر کردن، کات و ساتی گالتە کردن و ... .

هەندێ لە پێودانەکان بۆ خەلکی پیرۆزن و لادان لەو پێودانانە یاخۆ سووکایەتی پێ کردنیان لە بیری کەسدا ناگونجێ. زۆرتر بەم پێودانانە دەلێن **داموودەستوور**. هەندێ لە پێودانەکان زۆر پیرۆز نین، بەلام بناغەی لە نێو چاند و کولتووری کۆمەلگایە و خەلکی بە شێوەیەکی ناخۆئاگا خوویان پێوە گرتووە و پێی دەلێن **رێسا**. وەکوو سلاو کردن کاتێک دەرۆینە نێو ژوورێکەوە، یاخۆ لە نێو پاسدا جێگە خالی کردن بۆ بە سالاچووان. ئەو پێودانانەش کە وەکوو دەستوور دەنووسرێن، پێی دەلێن **یاسا**.

پێودانەکان بە گوێرەی هەر نەتەوەیەک جیاوازن. بۆ وێنە، لە نێو کورداندا کچێک تا باب و بنەمالەی ئیزن نەدەن، ناتوانێ لە گەل کوڕێکدا کە خۆی حەزی لێیە، زەماوەند بکات، کەچی لە ولاتانی رۆژاواییدا ئاساییە. یاخۆ لە نێو موسولمانانداا کچی شوو نەکردوو ناتوانێ لە گەل پیاوێکدا کە خۆشی دەوێ، پێوەندی سێکسی هەبێ؛ لە راستیدا پەردەی کچێنی، بۆ بنەمالەی کچ وو بۆ خودی کچ وەکوو ئاوڕوو و تەنانەت تابۆیە. کەچی لە نێو رۆژاواییاندا بە پێچەوانەی ئەمەیە. یاخۆ رەنگە لە چاندی ئێمەدا پرسین لە تەمەنی ئافرەتێکدا کارێکی ئاسایی بێ، کەچی لە چاندی زۆربەی ولاتانی رۆژاواییدا پرسیارێکی نائاساییە. ئەم نموونانە پێمان پیشان دەدەن کە

پێودانەکان چلۆن کار دەکەن. کەواتە، پێودانەکان بریتین لە دەستوور و چاوەڕوانیگەلێک کە کۆمەڵگا بە هۆی ئەوانەوە رەفتار و هەڵسوکەوتی ئەندامەکانی خۆی رادێنێ.

هەندێ لە پێودانەکان بە جۆرێک قەدەغە کردنن و لە خەڵکی چاوەڕوان دەکرێ کە توخنی ئەو کارانە نەکەون. هەروەها پێودانەکان نە تەنیا لە چاندێکەوە بۆ چاندێکیتر جیاوازییان هەیە، بەڵکوو لە نێو یەک کۆمەڵگا و یەک چاندیشدا لە چینێکەوە بۆ چینێکیتر جیاوازییان هەیە.

## پێوەندی ئەرکی / functional relationship

پێوەندی ئەرکی بە پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی دەبێژرێ کە بنەمای لە سەر پێوەندی کارلێکی دابەش کردنی کار لە کۆمەڵگادا دارێژراوە.

## پێوەندی کۆمەڵایەتی / social contact

پێوەندی کۆمەڵایەتی ئاماژە دەکات بە چۆنییەتی لایەنگری تاکەکان لە پێوەندی لە گەڵ یەکتردا. ئەم لایەنگرییە بۆ دەسپێکردنی کارلێکی کۆمەڵایەتی پێویستە. پاژە سەرەکییەکانی پێوەندی کۆمەڵایەتی-وەکوو ئەو شتەی کە لە کارلێکدا دیارە- بریتین لە **روانگەکان** و **بەهاکان**. گەر ئەم روانگە و بەهایانە تەکووز کرابێتن و بووبێتنە یەک، دەتوانین دەور و رۆڵەکانیش بە پاژی سەرەکی لە پێوەندی کۆمەڵایەتیدا بزانین.

ئەم زاراوە سەرەتا لە نێو بەرهەمی کۆمەڵناسانی ئەمریکی وەک سمۆل، پارک و بۆرگسدا بەهرەی لێ گیراوە. سمۆل لە بەرهەمەکەیدا کە لە ژێرناوی *کۆمەڵناسی گشتی*دا بلاوی کردەوە، بەم چەشنە ئەم زاراوەیە پێناسە دەکات: «رێگاگەلی جۆراوجۆر کە خەڵکی پێکڕا دەبەستێتەوە». پارک و بۆرگس نووسیان: «دەکرێ پێوەندی بە قۆناغی یەکەمی کارلێکی

کۆمەڵایەتی و دەسپێکی قۆناغەکانی‌تر بزانرێ».

وتەی سەرەوە وامان پێ پیشان دەدەن کە پێوەندی کۆمەڵایەتی، پێوەندییەکە لە نێوان تاکەکان و گرووپەکاندا و پێش‌مەرجێکە بۆ رۆیشتنە نێو کارلێکی کۆمەڵایەتیوە. ئەم زاراوە تا رادەیەک راستە، بەڵام زۆریش سەرسەریانەیە. ئەمە وەکوو ئەوەیە کە بڵێین: «پێوەندی بیۆلۆجیکی، پێوەندی نێوان روەک یان ئاژەڵانە». جەوهەری پێوەندی کۆمەڵایەتی، هەمان پێوەندی نێوان تاکەکانە. ئەم تاکانە بە گوێرەی روانگە و بەها و هەروەها (بە سەرنجدان بەوەی بەهاکان لە نێو دەورەکاندا رێک‌وپێک دەبن و دێنە دی) بە گوێرەی دەورەکانیانەوە پێکڕا پێوەندییان هەیە. کەواتە بە راشکاوی دیارە کە ئاوەها لایەنگرییەکی دوولایەنە، نەتەنیا پێش‌مەرجی رۆیشتنە نێو کارلێکی کۆمەڵایەتییە، بەڵکوو مەرجی مانەوە و بەردەوام بوونە (گولدو کولب؛ ١٣٨٤). بڕوانە: **بەها؛ کارلێکی کۆمەڵایەتی؛ دەور؛ روانگە**.

## پێوەندی گاڵتەجاڕانە/ joking relationship

پێوەندی گاڵتەجاڕانە پێوەندییەکە لە نێوان دوو تاک یا هەندێ جار گرووپدا کە لەم پێوەندییەدا یەکێک بە هۆی نەریتێکەوە کە ئیزنی پێ‌دەدا (یا هەندێ جار ناچاری دەکا) گاڵتە بە کەس یا کەسانی‌تر دەکات و سەر دەنێتە سەریان؛ ئەوەش کە گاڵتەی پێ دەکرێ، بۆی نییە زیز و زویر بێ. هەندێ جار گاڵتەکردن، دوو لایەنەیە. شێوازەکانی گاڵتەکردن زۆر لێک جیاوازان، بەڵام سووکایەتی (کە لە بابەتەکانی‌تردا بەرگری لێ کراوە) و داگیر کردنی سامان، بە شێوازە ئاساییەکانی گاڵتە دەزانرێن. پێوەندی گاڵتەجاڕانە، ئاوێتەیەکە لە دۆستی و دوژمنی، تەنانەت هەندێ جار دەبێتە مشتو مڕ، هەرچەند دەبێ لە شەڕ و

پێکدادان دووری بکرێ. گریۆل دەڵێ: جێنــو دان بــە یــەکتــری دەبێتــە هۆی نەمانی دوژمنایەتی و گرینگترین ئەرکی ئەم پێوەندییە «پالاوتن»ە؛ واتە پالاوتنی دۆستایەتی لە دوژمنایەتی (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## taboo / تابۆ

گشتی‌ترین واتای زاراوەی تابۆ دەگەڕێتەوە بۆ قەدەغەی ئایینی:

پاش سێهەمین سەفەری کاپیتان کۆک بوو کە بۆ یەکەم جار وشەی تابۆ هاتە نێو زمانە ئەورووپییەکانەوە. ئەو شتانەی کە کۆک لە پۆلێنزیدا چاوی پێکەوتبوو —وەکوو هەڵس‌وکەوت لە گەڵ سەرۆک هۆزەکان، قوربانی کردنی مرۆڤەکان یان کەسانێک کە دەستیان بە تەرمێکەوە دابوو- واتایەکی «پیرۆز»ی دا بە وشەی تابۆ. بۆیە پاش ماوەیەک تابۆ بۆ باس لەو شت یان کردەوانە کە پیرۆزن یاخۆ نزیک کەوتنەوەیان قەدەغەو حەرامە بەکار برا.

لەهەمان کاتدا واتای تابۆ وەکوو سیستەم یان دامەزراوەیەکی لێ هات کە بۆ رێک‌وپێک کردنی کۆمەڵگای بەرباس، بەهرەی ئایینی و کۆمەڵایەتی بوو. لێرەوە بوو کە واتای کۆمەڵناسانەی تابۆ پتر سەرنجی پێدرا.

ماوەیەکی زۆری نەبرد کە تابۆ لە نێو کۆمەڵناسیدا جێی خۆی کردەوە. سەرنجی زۆر دەدرایە واتای دوو رەهەندەی تابۆ، هەرچەند کە هەندێ جار تێگەیشتن لەم واتا دووپاڵووە، زۆر جیاواز بوو. وەکوو ئەوەی کە لە بارێکەوە ئەم زاراوە واتای «پیرۆز»و «پاک»ی بوو و لە بارێکی‌ترەوە واتای «پیس»، حەرام و «پڕمەترسی». هۆی ئەم دوو رەهەندیەش لە واتای ئەم وشەیەدا ئەوەیە کە بیروبۆچوونی کۆمەڵناسان وایە کە لە پۆلێن کردنی سەرەتایی بابەتەکاندا پێشکەوتێ نەهاتبووە دەست. لە تابۆدا دوو واتا هەیە کە بە پێشکەوتنی شارستانییەت لە یەکتر جیاکەوتوونەتەوە: ١) پیرۆز ٢) پیس و سپڵۆت. فرۆید رەهەندێکی‌تریش بۆ تابۆ پێناسە دەکا کە بریتیە لە کۆمەڵە دەستوور و حوکمێکی کۆمەڵایەتی کە پارێزەرێکی ئایینی دەیهێنێتە دی تا تاکەکان بە هۆی وازوازیەکانی بەشی ناوشیاریانەوە تووشیاری نەبن.

دوورکیم تابۆ بە حەرامکراوە ئایینییەکان پێناسە دەکا و دیاردەکەشی بە رێزگرتن لە شتە پیرۆزەکان دەزانێ، ئەوەش لە بەرانبەر حەرامکراوە

سیحراوییەکاندایە کە پێوەندی بە کارو باری دونیاییەوە هەیە. حەرام‌کراوە ئاینییەکان دەستوورگەلێکی یەکجاری و بەبڕشتن، کەچی حەرام‌کراوە سیحراوییەکان تەنیا دابو نەریتگەلێکی بەکەڵکن (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

ماڵکۆم هەمیلتۆن لە کتێبی کۆمەڵناسی دیندا لە زمان ستاینێرەوە دەگێڕێتەوە کە ئاگاداری لە تابۆ و ڕێ‌ڕەسمەکان، تەنانەت ئەو کاتەش کە پیشاندەری دزەکردنی بەشێک لە پیسییە، تا هەنووکەش بەردەوام بووە و ناتوانین بڵێین کە ئەم ڕێو ڕەسم و تابۆوانە، پاشماوەی خولە سەرەتاییەکانن. سەردەمی ویکتۆریایی رابێرتسۆن سمیتیش تەژی لە تابۆ بوو. هەندێ شتی زۆر ئاسایی (وەکوو پاتۆڵ)، لەم سەردەمەدا نەدەکرا لە نێو کۆڕو کۆبوونەوەڕەسمیەکاندا ناوی لێ ببرێ. هەرچەند ئاوەها تەوەرێک، تایبەتمەندی تابۆیی نییە، بەڵام دەتوانین بڵێین کۆمەڵگا هاوچەرخەکانیش، لە واتایەکی بەرفراواندا تابۆیان هەیە، هەرچەند لێرەدا کەمتر بڕەویان سەندووە (همیلتون؛ ١٣٨٧).

جیاوازی نێوان تابۆ لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکان و کومەڵگا سەرەتاییەکاندا لەوەدایە کە لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا وابیر ناکەنەوە کە لە بەرچاو نەگرتنی تابۆ دەبێتە هۆی چارەڕەشی، کەچی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا وایان بیر دەکردەوە کە هەرکەس سنووری تابۆ ببڕێ، تووشی چارەڕەشی دێ. رادکلیف براون، ئاماژە بەم ڕەهەندەی تابۆ لە نێو کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا دەکات (همیلتون؛ ١٣٨٧).

## تابۆی زینا لە گەڵ مەحرەمەکان / incest taboo

یەکێک لەو تابۆوانەی کە لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا باوە، تابۆی زینا لە گەڵ مەحرەمەکانە. بە گوێرەی ئەم تابۆیە، کەس ناتوانێ لە گەڵ ئەندامانی خێزانی ناوکی (وەکوو دایک، باوک، برا، خوشک) یان خێزانی فراوان

(وەکوو: دایە گەورە، بابەگەورە، خاڵ و مام و پوورو پلک و ...) پێوەندی سێکسی بێ.

## thatcherism / تاچێریسم

لە بریتانیادا تا سەدەی نۆزدەهەم، پارتەکان وەکوو ڕێکخراوەگەلێک دەزاندران کە تەنیا کەڵکیان کۆکردنەوەی سەرنج و لایەنگری خەڵک لە کاتی ڕووداو یان قەیراندا بوو. هاوکات لە گەڵ گۆڕانی پارتەکان بۆ ڕێکخراوگەلێکی سەقامگرتوو و بەهێز، ئەم بیرەش هاتە ئاراوە کە لایەنگری لە ڕێبەرایەتی پارت، دەتوانێ کەڵک و قازانجی زۆری تێدا بێ. بە درێژایی سەدەی بیستەم زۆرتر دوو پارتی سەرەکی بریتانیا (پارتی کرێکار و پارتی پاراستنخواز) بە سەر بریتانیادا دەسەڵاتیان هەبوو و هەر یەکە هانی دەدا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کۆمەڵگا بەرەو لای خۆی و خەریکی ڕکەبەرێ بوون.

لە ١٩٩٧دا پارتی کرێکار توانی ببووژێتەوەو سەرنجی دەنگدەران بەرەو لای خۆی ڕاکێشێ، کەچی پارتی پاراستنخواز ڕووی لە کزی نا. هۆی لاواز بوونی پارتی پاراستنخواز دەگەڕێتەوە بۆ سێ دەیەی لەمەو پێش؛ واتە پاش ئەوەی تاچێر هات و لە سەر جێگای سەرۆک وەزیراندا پاڵی داوە. مارگارێت تاچێر لە ١٩٧٩ تا ١٩٩٠ بوو بە سەرۆک وەزیرانی بریتانیا و ئاڵو گۆڕێکی زۆری هەم لە کارو باری ئابووری و هەمیش لە حکوومەتدا هێنایەدی (گیدنز؛ ١٣٨٦). ئەم گۆڕانکارییانە ئەوەندە بەرچاو بوون کە وەکوو ڕێبازێکی هزری ناوی تاچێریسمیان بە سەردا دانا. تاچێریسم بریتی بوو لە سیستەمێک لە باوەڕە سیاسیەکان کە بناغەی لە سەر بازاڕی ئازاد و تاکگەرایی ئابووری داڕێژرابوو. بۆ وێنە، تا بەرلەوەی تاچێر هەوساری دەسەڵات بگرێتە دەستەوە، تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە خەڵکی بابەتگەلی تەندروستی و پەروەدەیانلە ڕێی مۆدێلی بازاڕی ئازادەوە بۆ پێشبینی

دەکرا. رەنگە بکرێ بڵێین کە پێداگری پارتی کرێکاری بریتانیا لە ساڵی ١٩٩٧دا لە سەر بازاڕی ئازاد و کاریگەری ئەم بازاڕە بە سەر رەهەندە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا، لە بیرو بۆچوونەکانی تاچێرەوە سەرچاوە دەگرێ (عضدانلو؛ ١٣٨۴).

مارگارێت تاچێر بۆ کەم کردنی باری سەرشانی دەوڵەت دەستی دا بە تایبەتی کردنی کارخانە و پیشەسازییە دەوڵەتییەکان و تەنانەت تەلەفوون، ئاو و کارەبا و گاز و هێڵی ئاسنیشی دابە کەرتی تایبەت. مەبەستی لەم کارە رزگاری لە گوژمەی زۆری راگرتنی ئەم بەشانە و هەروەها دەرباز بوون لە بۆرۆکراسی دەست و پێگری بریتانیا بوو. هەروەها هانی دا کە دەوڵەت کەمتر لە کار و باری بازاڕدا دەست تێوەر بدات و وەکوو وڵاتی ئەمریکا کارو باری بازاڕ بۆ خودی بازاڕ دابنێ.

خاتوو تاچێر لە یەکێک لە گوتارەکانیدا گوتبووی کە «من ئافرەتێک نیم کە لە قسەی خۆم پاشگەز بمەوە»، بێگومان یەکێک لە گرینگترین هۆکانی مانەوەو بەردەوام بوونی خاتوو تاچێر، کەسایەتی و ئاکاری بەرزی ئەو خاتوونە بوو. هەرچەند کە بۆچوونی شەڕانی تاچێر نەیتوانی لە دڵی زۆربەی ناتەباکانیدا جێی خۆی بکاتەوە، بەڵام توانی وەکوو رێبەرێکی نەتەوەیی رێز و حورمەتێکی زۆری بۆ بەدەست بێنێ. کاتێ جزیرەکانی فۆلکلۆند بە هۆی ئەرتەشی ئارژانتینەوە داگیر کران، تاچێر ملی بەم داگیر کردنەنەدا؛ ئەمەش خۆی دەنگدانەوەی هەمان کەسایەتی تایبەتی تاچێر بوو (گیدنز؛ ١٣٨٦).

## تاک/ individual

تاک وەکوو ناو، هاوواتایەکە بۆ «کەس» یا «بوونەوەری مرۆیی» و بەشێوەی ئاوەڵناو (واتە: تاکی) بریتیە لەمەی کە بابەتی باس لێکراو یەکەیەکی جیاواز و زەقە، وەکوو «بوونەوەرێکی مرۆیی تاک».

لـە نووسـراوەکـانی زانسـتەکۆمـەلایـەتییـەکانـدا، وشـەی تـاک، واتـا سەرەتاییەکەی خـۆی لـە دەسـت داوە و ئـەمرۆکـە واتـای «کـەس»ی لـێ هەلدەگیرێ. هەربەو جۆرەی کە ل.فۆن ولیس و هـ.بیکێـر دەلـێن «ئێمـە نامانەوێ بلێین مرۆڤ یەکەیەکی دابەش نەکراوە، بەلکوو ئێمـە دەلـێن کـە مرۆڤ بوونەوەرێکی تاقانە و یەکتایە».

لادانێکی بچووک لە کەلـک وەرگـرتن لـەم زاراوەیـە لـە نووسـراوەکـانی رابێـرت.ا.پـارک و بـورگێس لـە کتـێبی *دەسـپێکێک بـە سـەر زانسـتی کۆمەلناسیدا*، بەدی دەکرێ. ئەوان دەلێن: «کەس تاکێکە کە خاوەنی پێگە بێ. ئێمە وەکوو تاک دێینە نێو ئەم جیهانەوە؛ پێگەی کۆمەلایـەتی بـەدەس دێنین و دەبینە کەس». کەچـی لـە چـەن پـاراگراف پـاش ئـەوەدا زاراوەی «تاک» و «کەس» بە یەک مانا بەکار دەبات. لاسوێلیش ئاوەها واتایەکی لـە گوتاری *کەس، کەسایەتی، گـرووپ و کولتـووردا* بـەکـار هێنـاوە: «کـەس، تاکێکە کە خـۆی لـەوەی کـە وەکـوو کـەسـانیتـر بـێ دەپـارێزێ». بـەلام لاسوێلیش وەکوو پارک و بورگس لە سەرانسەری وتارە کەیدا تـاک و کـەس بە یەک واتا بەکار دەبات (دِوی؛ ١٩٦٤).

### crime / تاوان

لە باسی خۆکوژی و تاوانناسیدا دوورکایم کاری بناغـەیـی ئـەنجـام داوە. هەم لە دابەش کـردنی کـاری کۆمـەلایـەتی و هـەم لـە بنـەماکـانی رەوتی کۆمەلناسیدا، دوورکایم دەسـتی داوە بـە بـاس لـە سـەر هـەنـدێ تـەوەری تاوانناسانە:

١) ئێمە کردەوەیەک بە بۆنەی ئەوەوە کە تاوانە لۆمـە ناکـەیـن، بـەلـکوو چونکە لۆمەی دەکەیـن، دەبێتـە تـاوان. سـوقرات لـە دادوەری ئاتنیـەکانـدا تاوانبار بوو، کەچی لە دادوەری ئێمەدا تاوانبار نییە.

٢) تاوان دیاردەیەکی «نۆرماڵە»، چونکە رق و نەفرەتێ کە لە سۆنگەی کردەگەلی تاوانبارانەوە، وەکوو تاوان لە نێو کۆمەڵگادا دێنە دی، لە هەموو شوێن و لە لای هەموو کەس بە یەک جۆر نییە.

٣) «سزادان زۆرتر بە مەبەستی تەمبێ تاکە ئابڕوودارەکانەوە ڕەچاو کراوە» تا هەستی یەکگرتوویی پتەوتر کاتەوە، نە بۆ تەمبێ و ڕاهێنانی تاوانباران. تۆڵە کردنەوە دەتوانێ تا ڕادەیەک بەرگری لە تاوان کردن بکا، بەڵام چونکە هەستی رق و نەفرەت لە کردەیەک کە شیاوی لۆمەیە لە هەندێ لە تاکەکاندا لاوازە، ناتوانین بڵێین تۆڵە کردنەوە دەتوانێ بە تەواوی تاوان لەناو دەبا.

٤) تاوان کاتێک مانای خۆی پێدەدرێ کە بە گوێرەی یاسا سزای بۆ ڕەچاو کرابێ. سزای یاساییش کاتێ دەتوانێ بوونی هەبێ کە کردە تاوانبارانەکان بە وردی پێناسە کرابێتن. ڕەنگە کردەیەک بە دزێو بزانرێ، بەڵام سزای بۆ ڕەچاو نەکرێ (ڕۆڵەی نەشیاو و تاکی لووتبەرز تەنانەت لە توندترین دۆخیاندا بە تاوانبار نازانرێن) (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

لە پێناسەیەکی گشتیدا تاوان بریتیە لە لادان لەو ڕێسا و نۆرمانەی کە یاسا چەسپاندوونی و بە هۆی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە لایەنگرییان لێ دەکرێ و دەپارێزرێن. تاوان، لادانێکی ڕەسمییە کە بە هۆی حوکمێکی فەرمییەوە سزای بۆ ڕەچاو کراوە.

لە ڕاستیدا، هۆی ئەوەی کە ئێستا لە بیردۆزی کۆمەڵناسی لادانـدا توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زۆر کۆکراوەتەوە، هەمان پرسیارێک بوو کە سەرەتا دوورکایم هێنایە کایەوە. دوورکایم ڕای وابوو کە بەرفراوانی رق و قین لە لادان، لە نێوان هەموو خەڵکدا یاسامەند و یەک جۆر نییە، بەڵام لە نێوان هەندێ لادان و تاوان و پێگەی کۆمەڵایەتیدا پێوەندییەک بەدی دەکرێ. دزی زۆرتر کاری تاکەکانی خوارووی کۆمەڵگایە. لادانی ئێخە سپییەکان

(لادانی کارمەندەکان) بە گوێرەی گوتەی ساتێرلەند، زۆرتر کاری چینی ناونجی و سەرووی کۆمەڵگایە. بیردۆزی مێرتۆن ئەوەیە کە نەبوونی نەفرەت لە کردە دزێوەکان (وەکوو ئەوەی دوورکایم دەیگوت) هەم دەرەنجامی پێڕەوی ناتەواو لە بەها کۆمەڵایەتییەکانە و هەمیش ئاکامی پێڕەوی زۆر کردن لە بەهاکانە. لە کۆمەڵگای ئەمریکا و هەروەها کۆمەڵگاکانی تردا، سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی، لە بەها گرینگەکۆمەڵایەتییەکانە. بەڵام ئامرازو هۆکاری گەیشتن بەو سەرکەوتنانە بە یەکسانی لە ناو خەڵکدا دابەش نەکراون. گەر ئەم بەهای سەرکەوتنە زۆر بۆ تاک بەدەرەوونی کرابێتەوە، کەچی هۆکاری گەیشتن بەو سەرکەوتنە بۆ تاک ئامادە نەکرابێ، دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوەی کە تاک هانا بباتە ئەو هۆکارانەی کە کۆمەڵگا رقی لێیە. کەواتە تاکێک کە هەلی گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتنەکانی بۆ نەڕەخسێ، ناچار دەبێ یەکێک لەم سێ کارە هەڵبژێرێ: یەکەم ئەوەیە کە تاک ویست و حەزی بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، سەرکوت بکا؛ دووەم پاشەکشێ کردنە لەو ئامانجانەی کە سەرەتا بوویە؛ سێیەم شۆڕش کردنە دژ بەو یاسا و پێوەرانە.

بەگوێرەی ئەو باسەی کە کرا، چونکە لادان لە گەڵ ئازار و سزای یاسایی رووبەڕوو دەبێ، دەبێتە رووداوێکی دەگمەن. ئەو کەسانەی کە هەست بە نائۆمێدی و تێکشکان دەکەن، دەتوانن پەنا ببەن بە دوورەپەرێزی و خەریکی گۆشەگیری بن، یاخۆ بە هانا بردنە بەر داهێنان، ئابڕووی کۆمەڵایەتییان بپارێزن. هەروەها داهێنانی لادەرانە گەر لە گەڵ هەلومەرجی شیاو رووبەڕوو نەبێ، رەنگە بگەڕێتەوە بۆ سەر رێگای راست. وەکوو ئەو چیرۆکەی کە ساتێرلەند دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: دوو گەنجی تاوانبار دەستیان دا بە دزی و پۆلیس کەوتە دوویان. یەکێکیان کە بالای بەرزتر و هەنگاوەکانی بەرزتر و پاکانی بەهێزتر بوون، هەلات و خۆی دەرباز کرد. پاش دەرباز بوون لە کاری

خۆیدا راماو تێگەیشت کە چ کارێکی پڕ مەترسی کردووە و رەنگ بوو بکەوێتە دەست پۆلیس، بۆیە لە کردەی خۆی پاشگەز دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەر رێی راست. ئەویتریان دەکەوێتە دەست پۆلیس و لە زینداندا لە گەڵ گرووپێکی تاوانکار ئاشنا دەبێ و پاش رزگار بوون دەست دەدا لە دزی چەکدارانە (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

لادان لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیە، بەلام جۆری ئەم لادانەکان بە گوێرەی پانتایەک کە یاسا تێیدا دەسەلاتی هەیە و دەسڕاگەیشتن بە سەرچاوە یاساییەکان و هێزی یاسا لە نێو چینە جۆراوجۆرەکاندا، جیاوازە. بە بڕوای بیردۆزدانەرانی ململانێ، هێزی دەسەلات لە ژێر رکێفی کەسانێکدایە کە خاوەنی سامان، دەسەلات و هێزی کۆمەلایەتین. ئەو کەسانە دەتوانن بەرگری لە لادان بکەن و رێکخراو و دامەزراوەیەک بۆ بەربەست کردنی ئەم تاوانانە رێک بخەن. لەم سۆنگەوە نابێ پێمان سەیر بێ کە دامەزراوە و رێکخراوەکانی بەرگری لە لادان، تەنیا لە سەر لادانی هەژاران و بێدەسەلاتاندا جەخت دەکەن.

## تاوانە رقاوییەکان / hate crimes

ئەم واتایە سەبارەت بەو تاوانانە بە کار دەبرێ کە مەبەستیان سووکایەتی یان لەناو بردنی ئەندامانی گرووپی کەمینەیەکە کە کەوتوونەتە بەر رق و قینی تاوانباران. بە ڕای مێرتۆن، دووچاوەکیخوازانی دەمارگرژ، پتر لە هەر گرووپێکیتر دەست دەدەن بەم چەشنە تاوانانە. توێژینەوەکانی جەک لێڤین و جەک مەکدیڤیت پیشان دەدەن کە لە نێوان سالانی ١٩٨٣ و ١٩٨٧دا زۆرتر لە ٤٥٠ تاوانی رقاوی لە شاری بوستۆندا رووی داوە ( *Levin, J & J. McDevitt*). نزیک بە ٦٠% ئەم تاوانانە هەڵمەت بردن بۆ کەسانێک بووە کە لەو شوێنانەدا وا تاوانباران دەمارگیریان لە سەریان بووە، خەریکی

پیاسە و ترۆمبیل ئاژووتن و هاتوچۆ بوون. لێکۆڵینەوەکانی ئەم دوو کۆمەڵناسە پیشان دەدەن کە ٢/٣ی هەڵمەتبەران کەمتر لە ٢٩ ساڵ تەمەنیان بووە، ١٠٨ تاوان لە لایەن سپیپێستانەوە دژ بە ڕەش پێستان بووە و ٩٥ تاوان لە لایەن ڕەشپیستانەوە دژ بە سپیپێستان؛ هەروەها ٣٠% ئەوانەی کەوتوونەتە بەر ئەم هەڵمەتانە، ئافرەت بوون.

ئیڤان لایت دەڵێ کە هەرچەند ئەنگێزەی تاوانە ڕقاوییەکان زۆرتر دەمارگرژی دژ بە کەمینەکانە، بەلام دەتوانێن لە نێو هۆکارە ئابوورییەکانیشدا هەندێ سەرچاوە بۆ ئەم تاوانانە بدۆزینەوە (*Light, I; 1990*). بۆ وێنە: لە کاتی قەیرانە ئابوورییەکاندا هەندێ لە سپیپێستان هۆی بێکاری خۆیان سیاسەتی دووچاوەکی پازیتیڤ دەزانن کە لایەنگری لە قازانجی کەمینەکان دەکا؛ ڕەشپیستەکان هۆی چارەڕەشی خۆیان بە سپیپێستە دەمارگیرەکان دەزانن.

بە گوێرەی هەواڵێک کە فەرمانداری ناوچەی ساکسۆنی لە ئاڵمانیادا دەری کرد، لە نێوان سالانی ١٩٩١ و ٩٢دا ١٢٤٤ کەس بە لادانی ڕقاوی تاوانبار کرابوون. ٩٦% ئەم تاقمە پیاو بوون، ٢/٣ ئەم کەسانە هەژدە ساڵ و کەمتر لە هەژدە ساڵ تەمەنیان بوو. ٥٠% لەم کەسانە بەر لە تاوان کردن، خواردنەوەی ئەلکولداریان خواردبووەوە. ٩٠% تاوانەکان لە نزیک شوێنی ژیانی تاوانبارەکانەوە (نزیک بە ١٢ میل) ڕووی دابوو. خوێندنی ڕەسمی ٩٨% ی تاوانکاران کەمتر لە پۆلی دەهەم بوو. ئەوەی لەم هەواڵەدا سەرنجڕاکێش بوو ئەوە بوو کە تەنیا ٢٠%ی تاوانباران بێکار بوون یان وازیان لە خوێندن هێنابوو. ٨٠% ئەم کەسانە یەکەم جار بوو کە دەستیان بەم کارانە دەدا. تەنیا ٣٠% لەم کەسانە پاکانەی ئایدیۆلۆژیکی ڕاستخوازانەیان

بۆ تاوانەکەیان هێنابووەوە (*Marshal, T; 1993*). ئەم ئامارە دواییانە پیشان دەدەن کە مەبەستی تاوانبارانی رقاوی بە تەنیا مەبەستی ئایدیۆلۆژیکی نییە و هۆکاری‌تر لەم چەشنەی لادانە بەشدارن.

## تاوانە کۆمپانیاییەکان / corporate crimes

ئەم واتایە بۆ ئەو لادانانە بەکار دەبرێ کە شەریکەیەک بۆ رکەبەرێ و ململانێ لە گەڵ کۆمپانیاکانی‌تر و بۆ بەدەست هێنانی بازاڕ و گەیشتن بە قازانجێکی زۆرتر ئەنجامی دەدا. ئەم لادانە، وەکوو هەمان لادانی ئێخە سپییەکانە. بۆ وێنە: ئەم کەسانە بە بۆنەی پێگەی کۆمەلایەتی یان دەسەلاتێک کە لە نێو سیستەمی حکوومی و ئیداریدا هەیانە، دەست دەدەن بە بەرهەمهێنانی کالایەک کە پێوەرگەلی تەندروستی تێیدا رەچاو نەکراوە. هەروەها بە هۆی دەسەلاتێکەوە کە هەیانە، پیتاک نادەن و پارەی زۆر کۆوە دەکەن. خالی سەرنجڕاکێش لەم چەمکەدا ئەوەیە کە پۆلیس بە کێشەی ئەم شەریکانە راناگا، بەلکوو هەندێ کارگێری ئیدارەکان پێیان ڕادەگەن کە دەسەلاتێکی زۆریان نییە. چونکە ئەم «ئێخە سپی» و خاوەن شەریکانە خۆیان لە ریزی بڕیاردەرانی سیستەمی ئابووری-رامیاری کۆمەلگان، بە ئاسانی خۆیان لە سزا و تۆلەی یاسا دەرباز دەکەن (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

گەری سلاپێر و ستیڤ تۆمبز(١٩٩٩) بە توێژینەوەلە سەر چەندوچوونی لادانی شەریکەکان، بەم دەرەنجامە گەیشتن کە تاقمێک لە شەریکەکان ئەو یاسا و دەستوورانەی کە سەبارەت بە خۆیانە، بەرێوەی نابەن. بەبڕوای ئەم دوو کەسە، تاوانی شەریکەکان تەنیا بە دوو «هەرمێی کرمۆل» دوایی نایە، بەلکوو گشتگیر و بەربلاوە. توێژینەوەکان پیشانیان داوە کە کۆمپانیاکان شەش جۆرە تاوانیان لێ دەوەشێتەوە: لادان لە یاسا ئیدارییەکان (کاغەزبازی و خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارەکان)، لادان لە یاسا

ژینگەییەکان (پیس کردنی ژینگە و گوێ نەدان بە یاسا و سنوورەکان)، لادان لە یاسا ماڵییەکان (زەغەڵکاری بۆ نەدانی پیتاک یان دانی بەرتیل)، لادان لە یاساکانی کار (هەل و مەرجی نەشیاوی کار، دەرکردنی هێزەکانی کار)، لادان لە یاساکانی بەرهەمهێنان (گوێ نەدان بە چۆنییەتی بەرهەم)، هەروەها چالاکی بازرگانی نەشیاو و نەگونجاو (شێوازی دژ بە رکەبەرێ، پڕوپاگەندەی ناڕاست) (گیدنز؛ ١٣٨٦).

شێوازی بەقوربانی کردن لە لادانی کۆمپانیاکاندا روون و راشکاو نییە. هەندێ جار قوربانی ئاشکرا هەیە؛ وەکوو کارەساتی ژینگەیی، بۆ وێنە: دەلاندنی کارخانەی بوال لە هێند. بەلام زۆربەی قوربانییەکانی لادانی کۆمپانیاکان، خۆیان بە قوربانی نازانن. چونکە لە لادانە سوننەتیەکاندا قوربانی و لادەر زۆر لێک نزیکن؛ بە دەگمەن کەسێک نەزانێ کە تێیانهەڵداوە. بەلام لە تاوانی کۆمپانیاکاندا مەودای کات و شوێن دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆربەی قوربانییەکان خۆیان بە قوربانی نەزانن؛ یاخۆ رەنگە نەزانن کە چلۆن دەتوانن داوای مافی خۆیان بکەن (گیدنز؛ ١٣٨٦).

## تاوانی ئێخەسپییەکان / white-collar crimes

هەرچەند زۆربەی لادانەکان دەخرێنە ئەستۆی گەنجان یان پیاوانی لاوی چینی خوارووی کۆمەڵگاوە، بەلام لە راستیدا تەنیا ئەم کەسانە نین کە تووشی لادان دەبن و لە یاسا لادەدەن. زۆر لە دەوڵەمەندان و دەسەلاتداران دەست دەدەن بە لادانگەلێک کە پانتای کارەکەیان و هەروەها ئەنجامی کارەکەیان زۆر لە لادانی هەژاران بەرفراوانترە.

سەرەتا ئێدوین ساتێرلەند (١٩٤٩) بوو کە تاوانی ئێخە سپییەکانی پێناسە کرد. واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لەو لادانانەی کە ئەندامانی چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگا ئەنجامیان دەدەن. ئەم زاراوە پانتایەکی زۆر لە

لادانەکان دەگرێتە نێو بازنەی خۆی، وەکوو زەغەڵکاری بۆ نەدانی پیتاک، فرۆش بەپێچەوانەی یاسا، گزیکاری ماڵی، دزی، چێکردن و فرۆتنی کاڵاگەلی مەترسیدار. هەڵسەنگاندن و دابەش کردنی لادانی ئێخەسپییەکان لە جۆرەکانی‌تری لادان دژوارترە. زۆربەی ئەم لادانانە لە ئامارە فەرمییەکاندا پیشان نادرێن (گیدنز؛ ۱۳۸٦).

## تۆتالیتاریزم / totalitarianism

تۆتالیتاریزم بۆ ناونانی هەندێ لە رژیمە سیاسییە هاوچەرخەکان بەکار دەبرێ و بریتیە لە تەشەنەی دەسەڵاتی حکوومەتێک لەنێو سەرجەمی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا. ئایدیۆلۆژی یان بزاڤێک کە لایەنگری تەشەنەی ئاوەها دەسەڵاتێک بێ، توتالیتری پێ دەڵێن. ستامێر لە قامووسی کۆمەڵناسیدا دەڵێ: «تەنیا لە شوێنێکدا دەتوانین باس لە توتالیتر بکەین کە بزاڤێکی گشتگیر کە رێبەرایەتییەکەی لە دەست کەمینەیەکی سیاسی یا رەوتێکی ملهۆڕانەدا بێ و بە کەڵکوەرگرتن لە قۆرخکردنی دەسەڵات و سیستەمی حکوومەتی دیکتاتۆری، دەسەڵاتێک پێک بێنن کە بتوانێ بە سەر هەموو لایەن و رەهەندەکانی کۆمەڵگادا زاڵ بێ» (گولدو کولب؛ ۱۳۸٤).

زاراوەی توتالیتر دژ بە زاراوەی پلۆرالیستە کە بۆ پێناسەی حکوومەتی رامیاری کۆمەڵگا پیشەسازی و نوێکان بەکار دەبرێ. چونکە پێناسەی زاراوەی توتالیتاریزم یان دەوڵەتی توتالیتر ئاسان نییە، هەندێ لە نووسەران لە هەندێ بابەتی لێڵی وەکوو رژیمی فرانکیستی سپانیا، بەجێی توتالیتر، زاراوەی حکوومەتی ئۆتۆریتە پێشنیار دەکەن (بودون و بوریکو؛ ۱۳۸۵).

یەکێک لەو پێناسانەی کە لە رژیمی توتالیتر کراوە، ئەم شێوە حکوومەتە، لە شێوەکانی‌تر جیادەکاتەوە. لەم پێناسەیەدا شەش تایبەتمەندی بۆ حکوومەتی توتالیتر رەچاو کراوە کە بریتین لە: ۱) خاوەنی ئایدۆلۆژییەکی

توتالیتر و ئامۆژەیەکی رامیارین کە سەرجەمی خەڵکی دەبێ پێڕەوی لێ بکەن، ۲) پارتێک کە گوێڕایەڵی ئەم ئایدۆلۆژییەیە و زۆرتر بە هۆی تاکێکی ملهۆڕەوە رێبەری دەکرێ، ۳) پۆلیسی نهێنی زۆر پێشکەوتوو بۆ دیتنەوە و سەرکوت کردن و لەناو بردنی تاک یان گرووپە ناتەباکان لە گەڵ حکوومەت، ٤) هەروەها قۆرخ و کۆنترۆڵی دەزگاگەلی راگەیاندنی گشتی، ٥) کۆنترۆڵی چەک و تەقەمەنی، ٦) کۆنترۆڵی هەموو رێکخراوەکان بەتایبەت رێکخراوە ئابوورییەکان.

دوو کەس لە مارکسیستەکان بەهرەیەکی وردو رێزبینانەیان لەم زاراوەیە بردووە. نویمان رژیمی ناسیونالیستی ئاڵمانیا بە «ئابووری قۆرخکراوی توتالیتر» پێناسە دەکا و بە وردی دەست دەدا بە لێکدانەوەی ئامۆژەی حکوومەتی توتالیتر، وەکوو دەوڵەتێک کە بە گوتەی گوبلز «هەموو رەهەندەکانی ژیانی گشتی دەگرێتەوە» (باتامور، کیرنن، میلی‌بند؛ ۱۳۸۸).

دەوڵەتە توتالیترەکان لە بەرانبەر کۆنترۆڵ و چاودێری بە سەر بیرو هزر و هەست و هەڵس‌وکەوتی رۆژانەی خەڵکی، بەڵێنی حکوومەتێکی دەسەڵاتدار، ئاسۆی روون و هەست بە بەختەوەری دەدەن. بەڵام لە ئاوەها هەلومەرجێکدا، واتە لە هەلومەرجێکدا کە پەسنی توندوتیژی دەکرێ و خەڵکی بە ئاسانی دەکەونە بەر ئازار و ستەمی حکوومەت، دەوڵەتیش بۆ خۆی یان بە هۆی توندو تیژییەوە (وەکوو رژیمەتوتالیترەکانی ئاڵمانیا، ئیتاڵی و کامبووج)، یان بە هۆی کۆشەوە بۆ گۆڕانی بارودۆخی کۆمەڵگا (وەکوو یەکیەتی سۆڤییەت) تووشی فەوتان دێ.

## totem / توتم

ئەم زاراوە لە وشەیەکی ئۆجیبواییەوە (هۆزی ئەلگۆنکین لە ئەمریکای باکوور) وەرگیراوە و بە شێوازی جۆراوجۆری وەکوو توتم، تاتام و دودایم

نووسراوه. بۆیه سەرەتا هەست دەکرا تایبەته به سوورپێستەکانی باکووری ئەمریکا. بەڵام له سالی ۱۸٤۱ەوه ئاشکرا بوو که له نێو خەڵکی ڕەمەکی ئۆسترالیاشدا دامەزراوەیەکی ئاینی لەم چەشنه هەیه. پاش ئەوه بوو دوورکایم تێگەیشت که توتمپەرستی شێوازی سەرەتایی ژیانی ئاینییه و دەستی دا به توێژینەوەیەک لەسەر ئەم بابەته و له کتێبێکدا به ناوی *شێوەسەرەکییەکانی ژیانی دینی* ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی خۆی بڵاوکردەوه.

به بڕوای دوورکایم، توتمپەرستی ساکارترین شێوازی ئاینه و ئەم بۆچوونه له بیری دوورکایمدا زۆرترین بایەخی هەیه (آرون؛ ۱۳۸۶). پاشان دوورکایم دەست دەدا به توێژینەوه و وردبوونەوه له سەر توتمپەرستی خەڵکی ڕەمەکی ئۆسترالیا. باس له ڕێکخراوی کلانی کۆمەڵگا ڕەمەکیەکانی ئۆسترالیا دەکا. پێوەندی نێوان کلان و ئاژەڵ یان ڕوەک پیشان دەدا. توتمەکان له پەیکەرەیەکی داری یان بەردیدا پیشان دەدرێن و چونکه ئەم پەیکەرانه نوێنەری وێنەیەکی پیرۆزن، بۆ خۆشیان به پیرۆز دەزانرێن. هەر توتمێک به هۆی تابۆی جۆراوجۆرەوه دەوره دراوه و دەپارێزرێ (همیلتون؛ ۱۳۸۷).

له سیستەمی هزری توتمیدا چونکه هەموو شتەکان له گەڵ توتمی کلاندا پێوەندییان هەیه، ئەوانیش بەهرەیەکیان له پیرۆز بوون بردووه. بۆ وێنه باران، برووسکه، هەور، تەرزه، زستان و هتد، هەموویان له گەڵ کلانی قالاو له نێو هۆزی ئۆرۆنتادا پێوەندییان هەیه (همیلتون؛ ۱۳۸۷).

واتایەک که زۆرتر باری کۆمەڵناسانەی هەیه، له کاری رابێرتسۆن-سمیتدا هاتەدی که توتمیزمی پێوەندی دەدا به قوربانی و جێژنه نەتەوەییەکانەوه. هەندێ له نووسەران (وەکوو: توتن، گولدێن، وایزێر و وێستێر مارک) دان به چۆنییەتی ویژدانی توتمدا نانێن (گولدو کولب؛

(١٣٨٤).

## تۆڕ (شەبەکە)/ network

ئەم واتایە بۆ میتۆدی پێوەندی یا ڕاگەیاندنی هەواڵ لە نێوان ئەندامانی گرووپێکدا بەکار دەبرێ. تۆڕ بریتیە لە هەوداگەلی پێکچنراو کە دەبێتە هۆی پێوەندی (ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ) ئەندامانی گرووپ لە گەڵ یەک. پێوەندی و گەیاندنی هەواڵ لە نێوان ئەندامانی گرووپێکدا قەد بە یەک جۆر نییە. هەندێ لە ئەندامان لەچاو ئەندامانیتر پێوەندییەکی زۆرتریان هەیە. چەندوچوونی ئەم پێوەندییە وا لە ژێر کاریگەری پێوەندیگەلی فەرمی یا نافەرمی و هەروەها پێکهاتەی پێوەندییەکانی نێوان ئەندامانی گرووپ، دۆز و ئارمانجەکانی گرووپ و جیاوازی پێگەی‌کۆمەلایەتی تاکەکان. کاناڵی پێوەندی نێوان تاکەکانی گرووپ بە گوێرەی گۆڕانی کاری گرووپ، تووشی گۆڕان دێ.

تۆڕەکان یەکێک لە کەرتە ناسراو و ئاشناکانی ژیانی ڕۆژانەمان پێک دێنن. بۆ وێنە کاتێک دوو خاوەن کارگە لە میوانییەکدا لە گەڵ یەک ئاشنا دەبن، کارتەکانیان دەگۆڕنەوە و لە سەر کاروبار و شوێنگەی کۆمەلایەتی خۆیان دەدوێن، لە ڕاستیدا هەر دووکیان دەستیان داوە بە بەرفراوان کردنی تۆڕی پێوەندییەکانی خۆیان. کاتێک بە شوێن کارێکدا دەگەڕێن، سەرەتا دەڕۆینە لای کەسانێک لە نێو تۆڕی پێوەندییەکانماندان؛ تا هەم سەبارەت بەو کارەی کە دەمانەوێ زانیاریمان پێ بدەن و هەمیش ئەگەر کارێکیان لە دەست هات بۆمانی جێبەجێ بکەن. لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا دیتنەوەی کارێکی باش، پێویستی بە پێوەندی لە گەڵ کەسانێک هەیە کە لەنێو دامودەزگا حکوومییەکاندا پێوەندی زۆریان هەبێ. زۆرتر لەم ولاتانەدا بۆ گەیشتن بە کاروبار و پێگەی باشی کۆمەلایەتی، بوونی تۆڕێکی بەرفراوان لە

پێوەندییەکان کاریگەری زۆرترە تا لێهاتوویی و شارەزایی خودی تاک.

تۆڕی پێوەندی نێوان تاکەکان بە چوار کەرت دابەش دەکرێ:

١- *تۆڕی پێوەندی دەسەودایەرەکان* (clique network): ئەم تۆڕی پێوەندییە، تۆڕێکی زۆر ئاڵۆزە کە تێیدا هەمووان پێکەوە پێوەندییان هەیە و بە زۆرتر بوونی ئەندامان ئاڵۆزی تۆڕەکە زۆرتر دەبێ. بۆ وێنە گەر ئەم تۆڕە لە a و b و c و d و e پێک هاتبێ، هەمووی ئەمانە لە گەڵ یەک -نەک بە هۆی یەکەوە- پێوەندییان هەیە.

٢- *تۆڕی پێوەندی خولگەیی* (orbit network): لەم تۆڕی پێوەندییەدا، بۆ وێنە c لە ناوەندایە و a و b و d و e تەنیا لە گەڵ c پێوەندییان هەیە نەک لە گەڵ یەکتر.

٣- *تۆڕی پێوەندی زنجیرەیی* (chain network): لەم تۆڕی پێوەندییەدا کە وەکوو ئاڵقەکانی زنجیر پێکڕا بەستراون، a لە گەڵ b و b لە گەڵ c و هەر بەو چەشنە تا دەگاتە d لە گەڵ e پێوەندی هەیە. بە واتایەکی ساکارتر، پێوەندی ئەمانە وەکوو ئاڵقەکانی زنجیرە کە پێوەندی یەکەم ئاڵقە لە گەڵ ئاڵقەی سێیەم بە هۆی ئاڵقەی دووەمەوەیە.

٤- *تۆڕی پێوەندی بازنەیی* (ring network): لەم تۆڕی پێوەندییەدا پێوەندی ئەندامان وەکوو ڕۆیین بە سەر لێواری بازنەیە. ئەم پێوەندییەش زنجیرەییە، بەڵام بە پێچەوانەی تۆڕی زنجیرەیی، لە سەر هێڵێکی ڕاست نین، بەڵکوو لە سەر بازنەیەکن کە لە کۆتاییدا دەگەنەوە بە یەک.

## **توندوتیژی / violence**

«شەڕی هەموو لە گەڵ هەموو»دا کە بە وتەی هابز باس لە بارودۆخی ئێستا دەکا، یارمەتیمان دەدات تا واتای توندوتیژی باشتر بۆمان ڕوون بێتەوە. واتای هابزی بارودۆخی ئاسایی، لە چوار بابەتدا ڕاڤە دەکرێ: یەکەم

ئەوەی کە مرۆڤەکان حەز و داخوازی یەکسانیان هەیە، ڕەنگە هۆی ئەم یەکسانییە ئەوەبێ کە بەدیهاتنی داخواز و حەزەکانی مرۆڤ دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی حەزێکی‌تر لە دەروونیاندا. دووەم مرۆڤەکان ملهۆڕو بێبەزەیین؛ سێیەم ئەو شتانەی کە دەتوانن ئەم داخوازانەی بۆ بەدی بێنن، بە دەگمەن دەست دەکەون؛ چوارم ئەوەیە کە تێکەڵ بوونی حەز و بەدەگمەن دەست کەوتنی ئەو داخوازانە، مرۆڤەکان دەخاتە خانەی ململانێیەکی بەردەوامەوە. هیچ تاکێک ئەوەندە توان و هێزی نییە کە دەسەڵاتی خۆی بە بەردەوامی بەسەر کەسانی‌تردا داسەپێنێ. پایەدار نەبوونی ململانێی نێوان مرۆڤەکان، هەر یەکەیان تووشی مەترسی «فەوتان لە لایەن کەسانی‌تر» دەکات.

توندوتیژی شتێکی جیاواز لە زۆرە. پادشایەک کە هابز لە یۆتۆپیاکەیدا دایدەنێ و بە ژیری و هۆزانی خۆیەوە لە نێوان کاربەدەستانی رامیاریدا ئاشتی دادەمەزرێنێ، خاوەنی زۆر و دەسەڵاتە، بەڵام توندی نانوێنێ. بەکار بردنی زۆر بۆ بەرەنگاری لە لادەران و تاوانباران و زۆربێژان و ئەوانەی مافی هەژاران پێشێل دەکەن، دوایین ڕێگەچارەی دامەزراندنی حکوومەتی دادوەرانەیە. لە ڕێبازی مارکسیدا بە تایبەت لە جۆری لنینیستیدا، دیکتاتۆری پرۆلیتاریا بەناچار لە گەڵ زۆر ئاوێتەدەبێ، بەڵام ئەم زۆرنواندنە توندوتیژی نییە؛ چونکە بە مەبەستی دوایی‌هێنانی چەوساندنەوە و دامەزراندنی نەزمێکی ڕەوای کۆمەڵایەتییە کە تێیدا پێیداویستییەکانی ئەندامانی کۆمەڵگا دابین دەکرێ. هەرچەند دەبێ سەرنج بدرێتە ئەوەی کە ئەم زۆرنواندنە چۆن دەگاتە توندوتیژیەک زۆر توندوتیژتر لەوەی کە لنین و هاوڕێیانی بە نیازی لابردنی بوون (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥). بەگشتی لە حکوومەتە ئایدیۆلۆجیکیەکاندا کە دەرمانی هەموو پرس و کێشە و گیروگرفتێکی کۆمەڵگا، پێشتر ئامادە کراوە، ڕێگا و جێگا بۆ ئازادییە تاکەکەسییەکان زۆر بەرتەسکە و سنووردارە. ئەمە لە ئێرانیشدا کە

## توندو تیژی

حکوومەتێکی دینی و ئایدۆلۆجیکیە، بە راشکاوی پیشـان دراوە. حکوومـەت بە مەبەستی گەیشتن بە حکوومەتێکـی دادوەرانـەی دیـنی، دەسـتی داوە و ئێستاش دەست دەدات بە قاتوقڕکردنی لایەنە ناتەباکـان لـە گـەڵ خـۆی، یاخۆ تەنانەت لەگەڵ گرووپە تەباکانی خۆی کـە رەخنـە لـە هـەنـدێ بـیرو بۆچوون و شێوازی حکوومـەت دەگـرن، بـەتوندوتیژییـەکـی زۆرەوە رەفتـار دەکات و بەرەنگاریان دەبێتەوە و سەرکوتیان دەکات.

توندوتیژی هەموو رەهەنـدەکـانی ژیـانی کۆمـەڵایـەتی گرتۆتـەوە و لانی کەمی ژیانی کۆمەڵایەتی پێک دێنێ. تەنانەت لە نێو جڤاکە هێـور و ئـارام و تەکووزەکانیشدا مەترسی لێکهەڵوەشـانی ئـەو هـێمنی و ئاشـتییە هـەیـە. هاتنە کایەی ئەم مەترسیە دوو هۆکاری سەرەکی لێک جیاوازی هـەیـە کـە بریتین لە: لە لایەکەوە توندوتیژی کاتێـک خـۆی دەنوێنـێ کـە کـۆنترۆڵ و چاودێری لاواز بووبێ، یاخۆ ئاستی رۆشنبیری و تێگـەیشـتنی تـاک یـا ئـەو گرووپە کۆمەڵایەتییە «خـراپ بـەکۆمـەڵایـەتی بووانـە» زۆر نـزم بـێ. لـەم بۆچوونەدا دەکرێ توندوتیژی بە هەڵـسوکـەوتێکـی «نائـەقڵانی» پێناسـە بکرێ. لەم روانگەدا هۆی توندی نواندن کەموکووڕی و گرێیە دەروونییەکانی تاک یان گرووپە کە بە مەبـەسـتی دەربـڕینی نـاڕەزایـەتی لـە سیسـتەمـی کۆمـەڵایـەتی، خۆیـان دەنـوێنن. لـە لایـەکـیترەوە توندی یـەکێـک لـە سەرچاوەکانی دەسەڵاتە کە دەتوانێ لاوازەکـان بێنێتـە ژێـر ئـاوزینگی ئـەو کەسانەی کە گیانیان تووشی مەترسی دەکەن. لەم رەهەندەدا توندی وەکـوو گرێیەکی دەروونی کە دەمی کردبێتەوە نییـە، بـەڵـکوو وەکـوو رێگـەچـارەو شـێوازێک بـۆ حکوومـەت دەزانـرێ. لـەم بارودۆخـەدا تونـدی دەبێتـە سەرەکیترین هۆکاری «شانتاژ» و لەم رێگەوە لەزگ و لێبڕاوترین کەس کـە لە باری جەستەییەوە بەهێزترین کەس نییە، دەتوانێ بە سەر رەقیبـەکـەیـدا زاڵ بێ. توندوتیژی گەر لەجێی خۆیدا و بـە چـاکی بـەهـرەی لـێ بگـیرێ،

دەتوانێ بەرگری لە بەکاربردنی زۆر بکات (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

لانیکەم دوو بۆچوون لە سەر توندی هەیە کە بریتین لە توندی نارێسایی (ئانۆمی) و ئەویتریان توندی ستراتیژی. مەبەست لە نارێسایی (یا ئانۆمی) واتای بەرفراوانی ئەم زاراوەیە و بریتیە لە بارودۆخ یان سیستەمێکی نۆرمی کە هەموو یا بەشێک لە دەسەلات و لێهاتوویەکەی خۆی دۆڕاندبێ. لەم بارودۆخەدا تاکەکان تووشی سەرلێشێوان دەبن و نازانن چ ئەرکێکیان لە ئەستۆیە و لە ڕەوابوونی ئەو ئەرکانەی ناچارن جێبەجێی بکەن، دڵنیا نین؛ یاخۆ کاتێ هەست دەکەن مافیان پێشێل کراوە، بۆ ئەستاندنی مافیان نازانن روو لە چ بەرپرسایەتییەک بکەن. توندوتیژی نارێسایی لە سۆنگەی تەشەنەی پێوەندییە ناکۆکەکان لە بەشە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگاوە دێتە دی.

لە راڤەی توندی نارێساییدا ئاماژە بە ڕەهەندی جۆراوجۆر کراوە: توندی دەبێتە هۆی بەدیهاتنی قازانج و بۆچوونی دژبەیەک و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی لێکهەڵوەشانی کۆمەڵگا.

لە درێژەی دۆخی ئاسایی بیردۆزی هابزدا، توتالیتاریزمی مۆدێرن وەکوو «دژی توندوتیژی» لە نێو وازهێنان یا لاواز بوون یاخۆ ئاڵوگۆڕی دەسەلاتی رامیاریدا سەرهەڵدەدا. بەلام بیردۆزدانەرانی نوێی تووتالیتاریزم لە ئێستبدادی هابزی جیاوازن. بۆ ئەمان هێمنایەتی کاتێک دێتەدی کە سەرجەمی خەڵکی گوێڕایەڵی دەسەلات بن. بۆ ڕێبەرانی تووتالیتر، توندوتیژی بریتیە لە بەکار بردنی ڕەوای زۆر (کە بە گوێرەی نیازەکانی گەیشتن بە ئامانج، بەناوی ڕەشکوژی و دیکتاتۆری پرۆلتاریا ناوی لێدەبرێ). لە کۆمەڵگای توتالیتردا توندوتیژی بارودۆخێکی نائاسایی و کاتی نییە، بەڵکوو بارودۆخی ئاسایی و بەردەوامە، چونکە نەتەنیا ئاخێزگەی دەسەلاتی رامیارییە، بەڵکوو گرینگترین سەرچاوەی دەسەلاتی توتالیترە.

مەرج نییە هەر دەسەلاتێکی رامیاری توتالیتر بێ. کەواتە، واتا و کردەی

ڕەوابوونی ئەقلانی-یاسایی بە نیازی گشتگیر کردنی کارەکانی حکوومەتـە و دەسەڵات لە ژێر پاوان و قۆرخی چین یا بەرەیەکی سیاسی تایبەتـدا دەربـاز دەکات. بە گوێرەی ئەم باسە، ڕەوا بوونی ئـەقـلانی-یاسـایی لـە سـەر ئـەم گریمانەیە بنیات نراوە کە دەستو پێوەندەکانی حکوومەت دەتوان کەڵک لـە دەسەڵات و زۆر وەربگرن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بەو مەرجەی کە ئـەو توندی نواندنە لە چوارچێوەی یاسا بە دەر نەبێ. کەواتە دەبێ تونـدیوتیـژی لە گەڵ زۆرداری جیا بکرێنـەوە و لانی کـەم هـەر سـزادانێک کـە لادەر بـە ڕاشکاوی دانی پێدا نەنێ، وەکوو داسەپاندنێکی نایاسایی بزانرێ. هەرچـەنـد ئەم بۆچوونە توندڕەوانەیـە سـەبـارەت بـە سـەربـەخـۆیی تـاک، تـەنیـا لـە ڕوانگەیەکی ئانارشیستیدا کە تاک سەر بۆ سنوورەکـانی یاسـا نـەوی ناکـات شیاوی لایەنگرییە.

بـە گشـتی تونـدوتیژی بریتیـە لـە بـەکـار بـردنی نایاسـایی زۆر. لـە کۆمەڵگایەکدا کە زۆر بە پێودانی یاسا کۆنترۆڵ نەکرێ، توندوتیژی دێتەدی. هەروەها کۆمەڵگایەک کە توندوتیژی بە سەریـدا زاڵ بـێ، کۆمـەڵـگا نییـە، بەڵکوو ناکۆمەڵگایە (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

## توندوتیژی خێزانی / family violence

توندوتیژی خێزانی واتایەکە بۆ ئاماژە بـەو ئازارانـەی کـە تـاک لـە بـاری دەروونی، جەستەیی و سێکسییەوە لە نێو خێزاندا تووشی دەبێ. ڕەنگە ئـەم باسە سەیر بێ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لـە نێـو هـەنـدێ لـە وڵاتانـدا خێزان پاش ئەرتەش و پۆلیس بە تونـدوتیژترین دامـەزراوەی کۆمـەڵایـەتی دەزانرێ (سروستانی؛ ١٣٨٧). تا چەن دەیەی لەمەو پێش خێزان بە ناوەندی خۆشەویستی و ئاشتی و دۆستایەتی دەزانرا، هەرچەند زۆرکەس ڕاسـتەوخـۆ هەندێ توندوتیژییان لە نێـو بنـەماڵـەکانـدا دەدی، بـەڵام کـەس بـە وردی

سەرنجی پێ نەدەدا و بیری نەدەکردەوە کە ئاستی ئەم توندوتیژیانە چەنـدە. خەڵکی پێیان وابوو ئەم توندوتیژییانە زۆرتر لە نێو ئەو خێزانانەدا کە ئاسـتی رۆشنبیریان خوارترە یـاخۆ تووشـی نـاکۆکی هـاتوون و بـە نیـازن لـەیـەک جیابنەوە هەیە یاخۆ لەنێو ئەو خێزانانەی کە لە بـاری داهاتـەوە دەسـکورتن روو دەدا؛ تا ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٦٢دا هێنری کەمپ لە وتارێکدا بـە نـاوی «سـێندرۆمی منداڵـی لێـدراو» (*Battered Child Syndrom*)، باسـی لـەو منداڵانە کرد کە لە لایەن دایک و بابیانەوە کەوتوونەتە بـەر شـەق و لێـدان. ئەم وتارە دەسپێکێک بوو بۆ زنجیرە تۆژینەوەیەک سەبارەت بـە تونـدوتیژی لە نێو خێزاندا. چەند ساڵی خایاند تا بە شێوازێکی تەکووز و رێکوپێک ئەم باسە تۆمار بکرێ. لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتـای حـەفتاکانـدا تـۆژەران سەرنجیان دایە پێوەندییە واقیعیەکـانی نێـو خێـزان. بـە سـەرسـوورمانەوە ئەنجامی تۆژینەوەکان روونیان دەکردەوە کە بە پێچەوانەی بۆچوونەباوەکـان، نە تەنیـا ئـەو خێزانانـەی کـە تووشـی کێشـە هـاتوون لـە گـەڵ منداڵـیان توندوتیژی دەکەن، بەڵکوو ئـەو خێزانانـەی کـە لـە رواڵـەتـدا زۆر هـێمن و گونجاون، بە گوێرەی ئەندامانیان توندوتیژی دەنوێنن. توندوتیژی نواندن لـە نێو خێزانـدا، لـە گـەڵ هۆکـاری وەکـوو رادەی داهـات، ئاسـتی خوێنـدن و چۆنییەتی دابەش کردنی کار لە نێو خێزاندا پێوەندییەکـی روون و ئاشـکرای نییە و بـەبـێ سـەرنجـدان بـەو هۆکارانـەی کـە بێـژران، لـە نێـو زۆربـەی خێزانەکاندا-دارا و نەدار، خوێندەوار و نەخوێنـدەوار- تونـدوتیژی لـە گـەڵ ئەندامان هەیە (اعزازی؛ ١٣٨٨).

گرینگترین جۆرەکانی توندوتیژی خێزانی بریتین لە: ١) هاوسەر ئـازاری، ٢) منداڵ ئازاری، ٣) بە ساڵاچوو ئازاری.

**هاوسەر ئازاری**: زۆرتر رووداوێکی پیاوانەیە و بە شێوەی ژنئـازاری خـۆی پیشان دەدا. هەرچەند هەندێ بەڵگەش بە دەستەوەیە کە لە لایەن هەنـدێ

له ژنانه‌وه پیاوئازاریش هه‌یه. هه‌ندێ له‌و هۆكارانه‌ی كه ده‌بنه هۆی ژن ئازاری بریتین له: ١- باوه‌ڕ به ده‌سه‌لاتی پیاوانه‌و ئه‌وه‌ی كه پیاوان ده‌بێ هه‌موو كات ژنانیان له ژێر ركێفدا بێ؛ ٢- ناتوانی و بێ‌هێزی ژن له باری ئابوورییه‌وه؛ ٣- باوه‌ڕ به‌وه‌ی كه ده‌وری ژنان له نێو خێزاندا ته‌نیا ماڵدارییه و هیچی‌تر؛ ٤- بۆچوونی نیگه‌تیڤی ژنان سه‌باره‌ت به خۆیان؛ ٥- باوه‌ڕ به‌وه‌ی كه ژنیش وه‌كوو منداڵه؛ ٦- باوه‌ڕ به‌وه‌ی كه سیسته‌می دادوه‌ری لایه‌نگری له پیاوان ده‌كات (سروستانی؛ ١٣٨٧).

به گوێره‌ی ئاماره‌كانی وه‌زاره‌تی ناوخۆی ئێران، هه‌ندێ جار ناكۆكی نێو خێزان و ئازاری ژنان له لایه‌ن پیاوانه‌وه، هۆی خۆكوژی ٤١% ژنانی ئێرانییه. هۆی سه‌ردانی ٢٤% ژنان له پزیشكی یاسایی، توندوتیژی مێرده‌كانیانه (وزارت كشور؛ ١٣٨٣).

هاوسه‌ركوژی دوایین راده‌ی هاوسه‌ر ئازارییه، كه تێیدا ژنان به هه‌ر هۆیه‌ك له لایه‌ن مێردیانه‌وه ده‌كوژرێن. هۆوه سه‌ره‌كییه‌كانی هاوسه‌ركوژی له ئێراندا بریتین له: مێرد كردنی ژنان له منداڵیدا، به زۆر به مێردانی كچان، خه‌یانه‌تی ژن به پیاو، تووڕه بوونی له‌پڕونه‌كاوی ژن و پیاو و كۆنترۆڵ نه‌كردنی تووڕه‌ییه‌كه‌یان، خانووگومانی و به‌خیلی پیاو، بوونی یاسای سنووردار بۆ جیابوونه‌وه‌ی ژن له پیاو، درێژ خایاندنی دادوه‌ری و نه‌بوونی ده‌سته‌به‌رێكی یاسایی گونجاو بۆ به‌رگری له توندوتیژی پیاوان (آشوری و معظمی؛ ١٣٨١).

**منداڵ ئازاری**: هه‌نووكه توندوتیژی له نێو خێزاندا پێناسه‌یه‌كی ته‌واو و گشتگیری بۆ نییه. له زۆرێك له ولاتاندا ته‌مبێی جه‌سته‌یی منداڵ به توندوتیژی نازانن. به‌لام توێژینه‌وه‌كان پیشانیان داوه كه ته‌مبێیه بێ‌زیانه‌كان كه هیچ ئازارێك به جه‌سته‌ی منداڵ ناگه‌ینن، به‌ره‌به‌ره ده‌بنه هه‌لس‌وكه‌وتێكی توندوتیژ و پڕ له ئازار (اعزازی؛ ١٣٨٨). منداڵ ئازاری

جۆرێکی جیاواز لە توندوتیژی خێزانییە کە ساڵانە چەن میلیۆن قوربانی بەجێ دێڵێ. لە زۆربەی وڵاتاندا بە تایبەت ئەمریکا، منداڵ ئازاری بۆتە کێشەیەکی گشتگیر. ئەو منداڵانەی کە لە گەڵ زڕبابیان دەژین، زۆرتر تووشی مەترسی منداڵ ئازاری دەبن. بەڵام دایک و بابە خوێنییەکانی منداڵیش بە شێوازی جۆراوجۆر منداڵەکانیان دەخەنە بەر ئازار و توندوتیژی.

منداڵان وزەیەکی زۆریان هەیە، بە گوێرەی لۆجیکی گەورەکانیان نابزوێنەوە، زۆرجار بنەماڵە تووشی کێشە دەکەن و دایک و بابیش هەندێ جار بەبۆنەی کێشە و گرفت و گوشاری دەر و ناوەوەیماڵەوە تووشی سەرئێشە دەبن و منداڵەکانیش بە یەکێک لە سەرچاوەکانی گوشار دەزانن و هەموو ماندووبوون و ئازارەکانی‌تر بە سەر منداڵی کەم دەسەڵاتدا دەڕژێنن.

ئازاری سێکسی منداڵ زۆرتر لەوەی کە لە نێو دەزگاکانی ڕاگەیاندندا باس دەکرێن، تەشەنەی سەندووە. هەرچەند منداڵانی کوڕ زۆرتر توندوتیژییان لە گەڵ دەکرێ، بەڵام کچان زۆرتر تووشی ئازاری سێکسی دەبن (٨٥% کچان و ١٥% کوڕان لە ئەمریکادا) (سالومون، ١٩٩٢-وەرگیراو لە: سروستانی؛ ١٣٨٧). هەندێ لە توێژینەوەکان واپیشان دەدەن کە دە تا بیست لە سەتی ژنان لە منداڵی و لاوەتیدا لە لایەن باب یان زڕبابیانەوە تووشی ئازاری سێکسی هاتوون. ئەم ژمارە بۆ پیاوان لە نێوان یەک تا سێ لە سەت بووە (میزلمن، ١٩٩٠- وەرگیراو لە سروستانی؛ ١٣٨٧).

بەڵام زۆربەی منداڵ ئازارییەکان لە نێو خێزاندا بریتین لە تەمبێی جەستەیی منداڵان لە لایەن دایک و بابیانەوە. زۆربەی منداڵ ئازارییەکان لەو ڕادەیەدان کە ئاسەواری زۆر کەمیان لێ بەجێ دەمێنێ و کەمتر منداڵ تووشی برین و مردن دێ.

سەروستانی سێ هۆ بۆ منداڵ ئازاری دەسنیشان دەکا کە بریتین لە: ١- توندوتیژی نێوان وەچەکان: ئەو دایک و باوکانەی کە خۆیان لە منداڵیدا

تووشی توندوتیژی هاتوون، له رووبه‌ڕوو بوون له گه‌ڵ کێشه‌ی راهێنانی منداڵدا رایان وایه که توندوتیژی به زه‌برترین هۆکاره بۆ په‌روه‌رده و راهێنانی منداڵ. هه‌رچه‌ند مه‌رج نییه ئه‌و که‌سانه‌ی له منداڵیدا که‌وتوونه‌ته به‌ر توندوتیژی له گه‌وره ساڵیدا خۆیان توندوتیژی بنوێنن.

٢- هۆکارێکی کاریگه‌ری‌تر له منداڵئازاریدا بریتییه له ئه‌و باوه‌ڕه گشتییه‌ی که ته‌مبێی جه‌سته‌ی شێوازێکی گونجاوه بۆ راهێنانی منداڵان.

٣- هۆکاره‌کانی‌تر بریتین له نه‌داری، دووره‌په‌رێز بوون له کۆمه‌ڵگا، بێکاری، کێشه‌و ئاژاوه‌ی نێو خێزان و نه‌خوێنده‌واری که هه‌موویان گوشاری زۆر ده‌خه‌نه سه‌ر خێزان که ئه‌نجامی ده‌بێته منداڵ ئازاری (سروستانی؛ ١٣٨٧).

**به ساڵاچوو ئازاری**: هه‌ندێ جار دایک و باوکه به ساڵاچووه‌کان ده‌که‌ونه به‌ر توندوتیژی منداڵه‌کانیانه‌وه. لێدان و سووکایه‌تی و ئازاری به ساڵاچووه‌کان له لایه‌ن گه‌نجان و لاوانه‌وه دیارده‌یه‌کی که‌م وێنه نییه. سه‌روستانی له هاید ده‌گێڕێته‌وه که هه‌موو ساڵێ پتر له سێسه‌د دایک و باوک له لایه‌ن منداڵه‌کانیانه‌وه ده‌کوژرێن (هاید، ١٩٩٢).

هۆکانی به‌ساڵاچوو ئازاری به‌م چه‌شنه راڤه ده‌کرێن: یارمه‌تیدانی به‌ساڵاچووان زۆرجار کارێکی ئه‌سته‌م و دژواره، به تایبه‌ت بۆ تاقمێکی نیوه‌ته‌مه‌ن که که‌وتوونه‌ته نێوان دوو پرۆسه‌ی دژواری راهێنانی منداڵان و چاودێری له دایک و باوکی به‌ساڵاچوو. تۆژینه‌وه‌کان پیشانیان داوه که زۆربه‌ی به‌ساڵاچوو ئازارییه‌کان له چه‌شنی هاوسه‌ر ئازارین. زۆربه‌ی به ساڵاچووان پتر له‌وه‌ی که له لایه‌ن منداڵه‌کانیانه‌وه بخرێنه به‌ر ئازار و سزادان، به هۆی هاوسه‌ره‌کانیانه‌وه ئازار ده‌درێن. زۆربه‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی که ئازاری به ساڵاچووان ده‌ده‌ن، له باری ماڵییه‌وه پێویستیان به قوربانییه‌کانی خۆیان هه‌یه یاخۆ له هه‌ندێ که‌مایه‌سی جه‌سته‌یی یان ده‌روونی ئازار

دەبینن، بەم بۆنەوە ناتوانن بە چاکی چاودێری لە نەخۆشی بەساڵاچوویان بکەن. بەم بۆنەوە دەتوانین بڵێین کە هۆکانی پیرئازاری بریتین لە گوشاری دەروونی، کێشە و چەڵەمە لە کەسایەتی تاکدا و هەروەها نیازی مالی بە قوربانی. هەروەها تێچووی عاتیفی و جەستەیی چاودێری لە بەساڵاچووان زۆرتر لە قازانجی ماڵییانە (تیو، ۲۰۰۱- وەرگیراو لە: سروستانی؛ ۱۳۸۷).

## تویژبەندی کۆمەڵایەتی/ social stratification

سیستەمی تویژبەندی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگایەکدا هەیە کە نابەرانبەری کۆمەڵایەتی تێیدا وەکوو دامەزراوەیەک دەرهاتووە. ئەم دامەزرانە بە چەشنێکە کە کۆمەڵگا دەکاتە چینگەلی لێک جیاواز، چینگەلێک کە ئەندامانی بۆ گەیشتن بە دۆز و ئامانجێکی یەکسان، هەل و دەرفەتی یەکسانیان نییە. لە سیستەمی تویژبەندی کۆمەڵایەتی بەسراودا، پێگەی کۆمەڵایەتی تاک بە هۆی شوێنگەی تاک لەنێو زنجیرەی پێگەکاندا کە بە میرات پێیگەیشتووە، دیاری دەکرێ و لێهاتووییەکانی تاک لە دیاری کردنی ئەو پێگەیەدا هیچ کاریگەرییەکی نییە. بەپێچەوانەی ئەوە، لە سیستەمی تویژبەندی کراوەدا، شوێنگەی تاک بەستراوە بەو دەستکەوتانەی کە بە کۆششەوە پێیان گەیشتووە و تاک دەتوانێ لە پەیژەی پێگە کۆمەڵایەتییەکان هەڵبەزێ یان دابەزێ. مارکس و ماکس ڤیبێر پتر لە نووسەرانیتر ئەم زاراوەیانە لەنێو نووسراوەکانیاندا هێناوە و وەکوو ئامرازێک بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان بەهرەیان لێی گرتووە. تویژبەندی کۆمەڵایەتی لە نووسراوەکانی مارکسدا، بە گوێرەی خاوەنێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دیاری دەکرێ و جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانیتر لەم هۆکارەوە سەرچاوە دەگرن و بەگوێرەی ئەو ئامرازانە لە پێوانە دەدرێن. بەلام ماکس ڤیبێر، بۆ شیکردنەوە و راڤەی تویژبەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بێجگە لە

هێزی ئابووری سەرنجی داوەتە هێزەکانی تری وەکوو هێزی رامیاری و پێگەی کۆمەڵایەتی.

ئەمڕۆکە لە کۆڵینەوە کۆمەڵناسانەکاندا زۆرتر سەرنج دەدرێتە را و بۆچوونەکانی پارسۆنز. بەڕای ئەو، توێژبەندی کۆمەڵایەتی بریتیە لە پێگە و شوێنگەی جۆراوجۆر و لێکجیاوازی ئەو تاکانەی کە پێکهێنەری سیستەمی کۆمەڵایەتین و سەیر کردنی ئەو تاکانە وەکوو ژێردەست و بالادەست لە پێوەندی لە گەڵ یەکدا و لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە، بایەخێکی بەرچاوی هەیە.

## توێژینەوە (لێکۆڵینەوە) / research

واتای لێکۆلینەوە بریتیە لە کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە بابەتێکی واقیعی و راڤە و لێکدانەوەی ئەو زانیاریانە، کە بە هۆی شێواز و رەوتی نوێوە بەڕێوە دەبرێ. ئەوەی کە پێی دەڵێن توێژینەوەی زانستی، رێگایەکە کە ئەم قۆناغانە دەگرێتەوە:

١) هەڵبژاردنی بابەت: بیری یەکەم بۆ توێژینەوە و لێکۆلینەوە سەبارەت بە بابەتێکی کۆمەڵایەتی، دەتوانێ لە خوێندنەوەی گۆڤارێکەوە سەرچاوە بگرێ، یان دەتوانێ بە هۆی باس و وتو وێژ لە سەر بابەتێکی وانەیی، یان رووداوێکی مێژوویی، یاخۆ بە هۆی ئەزموونێکی تاکەکەسیەوە بە بیری توێژەردا تێپەڕێ. کۆمەڵناسان بە دووی بابەتێکدا دەگەڕێن کە یان زۆرتر بەرباسی ئەندامانی کۆمەڵگایە، یان لە باری هزریەوە سەرنجیانی راکێشاوە.

٢) چاوخشانێک بە سەر ئەدەبی بابەتدا: قۆناغی دووەم لە توێژینەوەدا، چاوخشانە بە سەر ئەدەبی بابەتی توێژینەوەدا. ئەم کارە ناچار توێژەر بەرەو کتێبخانەکان یان ئەو شوێنانەی کە شوێنی کۆوەکردنی ئاکامی توێژینەوەگەلی پێشوون رادەکێشێ. توێژەر دەیەوێ بزانێ تا چ رادەیەک لە سەر ئەو بابەتەی کە دەیەوێ لە سەری بکۆڵێتەوە، کەسانیتر کۆڵاونەتەوە.

توێژەرانی‌تر چۆن لە سەر ئەم بابەتە تۆژیونـەتـەوە و چ وەلامێکیـان بـۆ ئـەو پرسانە دیوەتەوە و هەروەها چ پرسیارێک بۆ ئەوان گرینگ و پڕبایەخ بووە.

٣) گەلالە کردنی بابەتەکە: قۆناغی سێیەم کە کۆمەڵناسان پێـی دەڵـێن گەلالە کردنی بابەت، بریتیە لەوەی کـە تـوێژەر ئـەو زانیاریانـەی بـە هـۆی وردبوونەوە لە ئەدەبی بابەت و چاوخشان بـە سـەر توێژینـەوەکـانی‌تـردا بـە دەستی هێناوە، بیکاتە پرسیارگەلێک کە شیاوی توێژینەوەکەی بـێ. پاشـان دەتوانێ دەست بدا لە گەلالە کردنی گریمانە. پاشـان بگـۆڕە سـەربـەخـۆ و ناسەربەخۆوەکانی گریمانەکەی جیا دەکاتـەوە و دەسـت دەدا بـە پێناسـەی هزریان تا بتوانێ پرسیارنامەکەی خۆی ئامادە بکات.

٤) بەدیهێنانی گەلالەی توێژینەوە: قۆناغی چوارم بڕیاردانە سەبـارەت بـە شێواز یان شێوازەکانی کۆکردنەوەی داتاکان و کەڵک وەرگرتن لەو داتایانـە. بە واتایەکی‌تر، گەلالەی توێژینـەوە بریتیـە لـە هـەڵـبژاردنی شـێوازێک بـۆ توێژینەوە، ڕەوتی هەڵبژاردنی نموونە و شێوازەکـانی هـەڵسـەنگانـدنی ئـەو زانیاریانە.

٥) کۆ کردنەوەی زانیاری و داتاکان: ئەم قۆناغە سەرەتای کاری مەیـدانی و کردەیی توێژەرە. پرسیارنامەکان بۆ نموونەی کۆمەڵگای ئاماریەکەی بەڕێ دەکا، یان بۆ دیمانە دەڕواتە لایان.

٦) شرۆڤە و لێکدانـەوە ی داتاکـان: کـۆ کردنـەوەی زانیـاری و داتاکـان، زۆرجار دەبنە هۆی ئەوەی ئەنجام و ئاکامێکی چاوەڕوان نەکراو بێتە دەست. پۆلێن کردنی زانیاریەکان بە دەستەگەلی جیاواز و ڕاڤـە و لێکدانـەوەی ئـەو زانیاریانە یەکێک لە گرینگترین قۆناغـەکـانی توێژینـەوەیـە. لـەم قۆناغـەدا گریمانـەکـان یـا ڕەت دەکرێنـەوە یـاخۆ دەچـەسـپێندرێن، یـا بـێ وەلام دەمێننەوە.

٧) دیتنەوەی دەزگایەکی بلاو کردنەوە: پاش دوایی هاتنی لێکۆڵینەوەکە،

توێژەر دەسکەوتەکانی خۆی یان لە ڕێگای خوێندنەوەی وتار لە نێو لێژنەیەکدا، یان ناردنی وتارەکەی بۆ گۆڤارێکی زانستی، یان چاپ و بڵاو کردنەوەی کتێبێک دەخاتە بەردەست هەمووانەوە. لە ڕاستیدا ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە پرسیاری نوێ بە بیری بیرمەندانیتردا تێپەڕێ و هانیان دەدا بۆ توێژینەوەی زۆرتر لە سەر ئەو بابەتە.

٨) چێ‌کردنەوە: واتە دووپاتە کردنەوەی لێکۆڵینەوەکە لە لایەن توێژەرێکیتر و لە گەڵ گرووپێکی هاوچەشنیتر و لە کات و شوێنێکیتردا. ئەم کارە ڕەنگە ببێتە هۆی گۆڕان لە گریمانە و شێوازەکانی توێژینەوەدا (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## تەلاق (جیابوونەوە)/ divorce

واتای تەلاق، دوایی هاتنی پێوەندی ژن و مێردایەتییە. هەندێ جار مەبەست لە تەلاق، دەربڕینی پووچەڵ بوون، واتە دان نیان بەسەر ئەم خاڵەیە کە پێوەندی ژن و مێردی لەناودا نەبووە. هەروەها لەباری یاساییەوە جیابوونەوە بریتیە لە هەڵوەشاندنی گرێبەستی پێوەندی نێوان ژن و مێرد.

هەندێ جار زاراوەی جیابوونەوە، ئاماژە دەکات بە جیابوونەوەی جەستەیی هاوسەرەکان، بەبێ ئەوەی کە هیچ گۆڕانێک لەو پێوەندییە یاساییەی کە بە هۆی هاوسەرێتییەوە لەنێوان ژن و مێرددا هاتووەتە دی، بێتە گۆڕێ. واتە جیابووونەوە یا تەلاق، جیابوونەوەی سۆزدارانە یا عاتیفییە لەنێوان ژن و مێرددا (مەعن خەلیل؛ ٢٠٠٧).

لە باری یاساوە بۆ جیابوونەوە، سەرەتا پێویستە کە لایەنێک کە خوازیاری جیابوونەوەیە، هاوسەرێتی خۆی بسەلمێنێ. گەر هاوسەرگیری یاسایی یا ئایینی نەبێ، تەلاقیش هیچ واتایەکی نییە. لە کۆمەڵناسی بەراورددا، دژواری پێناسەی هاوسەرێتی لەو کولتووره لێک‌جیاوازانەدا کە خراونەتە بەر ڕاڤە و

لێکۆڵینەوە، بە رادەیەک زۆرە کە ناتوانین بگەین بە بۆچوونێکی یەکسان و گشتگیر سەبارەت بە تەلاق.

لەروانگەی کۆمەڵناسییەوە واتای جیابوونەوە هەندێ جار لە تەلاق جیایە. بارێنز کە پێوەرێکی بۆ تەلاق خستۆتە بەردەست و بەگوێرەی پێوەرەکەی ئەو هاوسەرەکان ئیزنی هاوسەرگرتنی نوێیان هەیە، لە سەر ئەم بابەتە جەخت دەکات کە «رەنگە لە هەندێ کۆمەڵگادا جیاکردنەوەی تەلاق و جیابوونەوە زۆر ئەستەم بێ». شنایدرێر بەوردی لە سەر جیاوازی نێوان جیابوونەوە (جیابوونەوە لە خواردن و هاونوێنی) و تەلاق دەکۆڵێتەوە: «هەندێ جار جیاوازییەکی لاوەکی لە نێوان پێوەندی ژن و مێردی و هەندێ پێوەندی یاسایی کە بە هۆی هاوسەرگیری یاساییەوە دێتە ئاراوە، هەیە. واتە جیابوونەوەی جەستەیی ژن و مێرد، بەم مانایە نییە کە پێوەندی یاسایی نێوان ئەو دوو کەسە هەڵوەشاوە و ئەرک و مافێک کە یاسا بۆیانی رەچاو کردووە و لە هەمبەر یەکدا هەیانە، پووچەڵ بۆتەوە» (داگلاس؛ ١٩٦٤).

بە گشتی هەرچەند زانینی واتا و پێناسەی تەلاق دەورێکی زۆری لە راڤەکانیتردا هەیە، بەلام خێزانی ئەم چەرخە ناوەند و مەکۆیەکە بۆ ئارامش و هێمنایەتی و ئاسوودەیی. ژن و مێرد لە خێزانی ناوکیدا مەبەستیان لە هاوسەرێتی، گەیشتن بە ئاسوودەگی دەروونی و جێنسی و هەروەها منالدار بوونە. ئەمەی کە بۆچی خێزانەکان دەگەنە ئەو ئاستەی کە بڕیاری لێک جیابوونەوە دەدەن، گرینگییەکی تایبەتی هەیە. بێشک زۆر هۆکاری کۆمەلایەتی، ئابووری و کولتووری و دەروونی دەبنە هۆی تەلاق. گرینگترین ئاسەوار و زیانی تەلاق، تووشی مندالانی ناو خێزان دێت. خێزانی ناوکی بە پێچەوانەی خێزانی فراوان، پەروەردە و چاودێری لە منداڵی خستۆتە ئەستۆی هەم دایک و هەم باوک. لە خێزانی فراواندا بە گشتی هەموو گەورە ساڵەکان بەرپرسایەتی پەروەردە و گەشەی منداڵیان لە ئەستۆ بوو. بۆ وێنە،

دەوری مام یان خاڵ لە گەڵ دەوری باب بۆ منداڵ زۆر جیاواز نەبوو. واتە ئەوانیش بە هەمان رادە خۆیان بە بەرپرسی راهێنانی منداڵی برا یا خوشکیان دەزانی. هەروەها لە خێزانی فراواندا هەر تاکێک لە هەر تەمەنێکدا ئەرکێکی ئابووری لە ئەستۆ بوو؛ لە راستیدا منداڵدار بوون بۆ کار لە بەشی ئابووری و بەرهەمهێنان بوو. بە پێچەوانە لە خێزانی ناوکیدا منداڵ هیچ ئەرکێکی ئابووری لێ چاوەڕوان ناکرێ. دایک و باب نەتەنیا ئەرکی دابین کردنی نیازە ئابوورییەکانی منداڵیان لە ئەستۆیە، بەڵکوو ئەرکی دابین کردنی نیازە دەروونییەکانی منداڵیشیان لە ئەستۆیە (اعزازی: ١٣٨٨). بەم بۆنەوە تێکچوونی خێزانی ناوکی گرینگترین و بەزەبرترین کاریگەری بە سەر منداڵدا هەیە؛ چونکە منداڵ رەنگە تەنیا سەرچاوەو کانی هێمنایەتی و خۆشەویستی خۆی لە دەست بدات. بەم بۆنەوە ناسینی هۆکارەکانی هەڵوەشانی خێزان و تەلاق، گرینگیەکی تایبەتی هەیە. بۆ ئەم مەیەستە فالسام، کۆمەڵناسی ئەمریکی هەوڵی داوە کە هۆکارەکانی قەیرانی ژن و مێردایەتی لەم خاڵانەدا راڤە بکات:

١- هۆکاری شوێنگەیی و ناکەسێتی (غیر شخصی) وەک لەشساغی، بارودۆخی ئابووری، دەستێوەردانی خزمان، لەدایکبوونی منداڵی نەویستراو و....

٢- کەم کورتی کەسی و کەسێتی (فردی و شخصیتی) لە یەک یان هەردوو هاوسەردا؛ وەکوو نەخۆشی دەروونی، نەزۆکی، مەیلە جینسییە لادەرەکان، گیرۆدە بوون بە ئەلکول یا مادە سڕکەرەکان و جۆرەکانی لادانی دەروونی.

٣- جیاوازی و لێکنەچوون لە باری هزری، کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئایینی و رامیاری و هونەری و هەندێ هەستۆکی تایبەت.

٤- نەگونجانی دەورەکان، وەک ئارەزووە نایەکسانەکانی هەردوو هاوسەر

و ناتوانی هەر یەک لە هاوسەرەکان لە پێکهێنانی ئارەزوو و داخوازەکانی لایەنی‌تر (محسنی؛ ٢٠٠٦).

بەگشتی، سەقامگیرنەبوونی پێوەندی ژن و مێردایەتی کە ئەنجامی دەبێتە تەلاق و لێک جیابوونەوە، خێزان لە ئەرکەکانی خۆی دادەبڕێ و بە تایبەت منداڵ تووشی زیان دەکات. زیانەکانی تەلاق بۆ هەر سیستەمێکی خێزان جیاوازە، بەلام زیانی بۆ خێزانی ناوکی ئێجگار زۆرتر لە خێزانی فراوانە. چونکە هەروەک ئاماژەی پێکرا، خێزانی ناوکی بریتیە لە دایک و باوک و منداڵ. بە جیابوونەوەی دایک و باوک، خێزان بەتەواوی لێکهەڵدەوەشێ و منداڵ تووشی ئاژاوە و سەرلێشێوان دەکات. کەچی لە خێزانی فراواندا تەلاق نابێتە هۆی هەڵوەشانی خێزان و خێزان بەبێ هیچ گرفتێک ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ دەکات.

خەڵکی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا زۆرتر لە خەڵکی کۆمەڵگا نوێیەکان لە تەلاق کەلکوەردەگرن. توێژینەوە لە سەر چل کۆمەڵگای ساکار (هەشت کۆمەڵگای ئاسیایی، هەشت کۆمەڵگای ئۆقیانووسییە، هەشت کۆمەڵگای ئەفریقی، هەشت کۆمەڵگا لە ئەمریکای باکوور و هەشت کۆمەڵگا لە ئەمریکای باشوور) پیشان دەدات کە تەلاق لە بیست و چوار کۆمەڵگا لەم چل کۆمەڵگایەدا، زۆرتر لە نەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا بووە (آگبرن و نیم‌کوف؛ ١٣٥٢). بەلام دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە لە هەندێ لە جڤاکەکاندا تەلاق بە کارەساتێکی نالەبار و نەگونجاو دەزانرێ. بۆ وێنە لە کۆمەڵگای خۆماندا ژنی تەلاقدراو بەڕێزەوە سەیری ناکرێ. لە راستیدا ژنی تەلاقدراو هەموو کات والەژێر پەردەی گۆمانەوە. ئەم زەختە کۆمەلایەتییە بۆتە هۆی: یەکەم زۆربوونی تەمەنی هاوسەرگیری و دووەم، کەمتر بوونی رێژەی تەلاق. دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە لەم سالانەی دواییەدا، بە هۆی کەمتربوونی رێژەی ئەم زەختە کۆمەلایەتییە، رادەی تەلاق و

هەڵوەشانی خێزانەکان زۆرتر بۆتەوە.

## تەندروستی/ health

تەندروستی زاراوەیەکی گشتگیرە کە سەبارەت بە پانتایەکی بەرفراوان لە هەڵس‌وکەوتەکانی مرۆڤ بەکار دەبرێ؛ بەڵام نە لە ڕەهەندێکی یەکساندا بەکار دەبرێ و نە واتاکەی سنوورێکی دیاریکراوی هەیە. واتە، مەرج نییە مانای ئەم زاراوەیە هەم بۆ تەندروستی جەستەیی و هەمیش دەروونی یەکسان و وەک یەک بێ. هەروەها پێوەرێکی تایبەت بۆ پیشان دانی جیاوازی نێوان تەندروستی و دۆخە مرۆییەکانی‌تر وەکوو نەخۆشی، نییە. بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە هاوکات لە گەڵ ئاڵوگۆڕی زانستدا، گۆڕانی بە سەردا هاتووە.

بە بڕوای زۆربەی کۆمەڵناسان، تەندروستی بە هەمان ڕادەیەک کە بابەتێکی بایۆلۆجیکییە، بابەتێکی کۆمەڵایەتیشە. لە لای ئەم کۆمەڵناسانەوە، تەندروستی جەماوەرێک، بەهۆی تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو جەماوەرەوە پێک دێت. شێوازەسەرەکییەکانی تەندروستی بریتین لە:

١- خەڵکی ئاستی تەندروستی خۆیان بە هەڵسەنگاندن لە گەڵ کەسانی‌تر دەپێون: پێوەرەکانی تەندروستی لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی‌تر جیاوازە. بۆ وێنە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ئەفریقا نەخۆشی پێستی یاز (yaws) ئەوەندەباوبوو کە بە شتێکی ئاسایی دەزاندرا. بەم بۆنەوە هەندێ جار تەندروستی بریتی بوو لەوەی کە تاک ئەو نەخۆشییەی کەسانی‌تر هەیانە، ئەمیش بێتی.

٢- خەڵکی زۆرجار تەندروستی هاواواتا لە گەڵ ئاکار بەکار دەبەن: زۆربەی خەڵکی بەسووکی و بەگومانەوە سەیری ئەو کەسانە دەکەن کە نەخۆشییەکی جنسیان هەیە؛ بەتایبەت نەخۆشییەک کە کەسانی‌تریشی

تووش بکەن. هەندێ لەو ولاتانەی کە کۆچەران وەردەگرن، بەر لـەوەی کـە ڤیزا بدەن بە کەسێکی بیانی، بۆ بەرگری لە هەندێ نەخۆشی وەکوو ئەیـدز و سفلیس، تاقیان دەکەنەوە تا لە تەندروستییان دڵنیا بـن. بـە واتایـەکـی‌تـر، بۆچوونەکان سەبارەت بە تەندروسـتی بـریتین لـە شـێوازێک لـە کۆنترۆڵـی کۆمەلایەتی کە هاندەری هاوڕاییە لە گەڵ رێسا کولتوورییەکانی کۆمەڵگا.

٣- پێوەرەکانی تەندروستی بە درێژایی مێژوو ئاڵوگۆڕیان بـەسـەردا دێ: لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەندێ لە پزیشکە بەناوبانگەکان بـەرگرییـان لە رۆیشتنی ژنان بـۆ زانکـۆ دەکـرد. بـاوەڕی ئـەو پزیشـکانە ئـەوە بـوو کـە خوێندنی بالا زیان بە مێشکی ژنان دەگەینێ. هەندێ پزیشکی‌تر رایان وابوو کە شاوەت هێنانەوە بە دەست، بۆ تەندروستی مەترسی هەیە. بەلام ئەمڕۆکە کۆمەڵەی پزیشکان ئەم بۆچوونانە بە هەڵە دەزانن. بەپێچـەوانـە، نزیـک بـە شەست ساڵی پێش، هەندێ لە پزیشکەکان خەڵکیان سەبارەت بە مەترسـی جگەرەکێشان ئاگەدار دەکردەوە. کەچی ئەمڕۆکە کۆمـەڵـگای پزیشـکەکـان کێشانی هەر چەشنە دووکەڵێک بە مەترسییەکـی گـەورە بـۆ تـەندروسـتی خەڵک دەزانن.

٤- تەندروستی و پێوەرەکانی ژیان پێوەندییەکی راسـتەوخۆیـان پێکـەوە هەیە: جڤاکە هەژارەکان بەردەوام خەریکی مشتومڕ لە گەڵ خراپی خۆراک و نەبوونی پاک و خاوێنی لە ژینگەیاندان؛ هەژاری لەم جڤاکانەدا بۆتە هـۆی زۆرتر بوونەوەی رادەی نەخۆشییە پـەتـادارەکـان. گـەشـەی پیشـەسـازی سەرنجێکی زۆر ناداتە تەندروستی تاکەکان و زۆر جار بۆتە هـۆی دابـەزیـنی ئاستی ژیانی خەڵکی.

٥- تەندروستی لە گەڵ نابەرانبەرییە کۆمەلایەتییەکان پێوەندی هەیە: لە هەموو کۆمەڵگاکاندا خەڵکی بە یەکسانی کەڵک لە سەرچـاوە گشـتییەکـان وەرناگرن. تەندروستی جەستەیی، دەروونی و کۆمەلایەتی دەوڵەمەنـدان لـە

چاو هەژاراندا زۆر باشترە. ئەم نایەكسانییە لە هەمان كاتی لە دایكبووندا بە ژمارەی زۆری مردن لە نێو خێزانە هەژارەكاندا خۆی دەنوێنێ. لە چاو خەڵكی هەژاردا دەوڵەمەندەكان بەختی زۆرتریان بۆ تەندروستی و دووری لە كارەساتەكان هەیە.

## technology / تیكنۆلۆجی

بۆ ئەم زاراوەیە دوو واتا دەستنیشان كراوە:

١) لەنێو كۆمەڵگا سەرەتاییەكان، نەتەوە دواكەوتووەكان و هەروەها لەنێو خولەكانی بەر لە مێژوو یان مێژووی بەرلە پیشەسازیدا، هەروەها لە بواری مێژینەناسی و ئێسنۆگرافیای كۆمەڵایەتیدا، ئەم زاراوەبریتییە لە كۆمەڵە زانستی باو كە بۆ چێ كردنی سەرجەمی نیازەكانی ئەو كۆمەڵگا لە رێی پەرژانە سەر كاری دەستی (بێجگە كارگەلی ئایینی، سیحربازی، سەربازی و چێشتلێنان) بۆ دەرهێنان یان كۆوەكردنی هەر جۆرە ماكێك (بێجگە لەو مەوادەی كە بۆ خۆراك یان بۆ رێ و رەسمی ئایینی بەهرەی لێ دەگیرێ) بەكار دەبرێ.

٢) لە نێو ئەو كۆمەڵگایانەی كە پیشەسازین یاخۆ خەریكن دەبنە پیشەسازی، ئەم زاراوە بریتیە لە هەموو یان زۆربەی ئەو زانستانەی كە تایبەتن بە: ئا- بنەما و دەسكەوتە زانستییەكان، ب- پرۆسە پیشەسازییەكانی كۆن و نوێ، كانی وزە و ماكەكان و شێوازەكانی گواستنەوەو راگەیاندن كە یارمەتی بەرهەمهێنان یان چاكسازی كالا و خزمەتگوزاری دەكەن.

لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا ئەم زاراوە پێوەندییەكی زۆر نزیكی بە واتای ئەم زاراوەیە لە زمانی یوونانیدا بوو. لە فەرهەنگی ئاكسفۆرددا بۆ ئەم زاراوەیە ئاماژە بە كتێبێك دەكا كە لە ١٧٠٦دا بلاو كراوەتە و لەژێر ناوی:

*پێناسەیەک لە هونەرەکان، بە تایبەت هونەرە میکانیکییەکان*، ناوی لێ دەبا.

کۆمەڵناسان ئەم زاراوەیە ئەوەندە بەرتەسک دەکەنەوە کە تەنیا ئاماژە دەکا بە پرۆسە پیشەسازییەکان لەو جڤاکانەی کە ئێستا پیشەسازین یان خەریکی بەپیشەسازی بوونن. لەم دوایانەدا ئەم زاراوەبەرتەسکتر کراوەتەوە و ئا) لە جیاوازی نێوان «بەکارهێنانی پیشەسازی دەرەنجامەکانی زانست» کە کاری «تەکنیکناسان» و «ئەندازیاران»ە و هەروەها «زانست» یان «زانستی رەها» باس دەکا. ب) بریتیە لە چالاکی زانستی بۆ چاکسازی میتۆد و کەرەسە پیشەسازییە کۆنەکان بەبێ ئاوڕدانەوە لە بنەما زانستییەکان، واتە مەیل بە «چێکردن و داهێنانی شتمەک و پرۆسەگەلی نوێ، یاخۆ چاکتر کردنی کەرەستە و پرۆسەکانی رابردوو». پ) بریتیە لە -بە تایبەت لە نووسراوەی ئەمریکییەکاندا- کۆمەڵەیەک لە زانست و لێهاتوویی کە رێنوێنی داهێنان و پێشکەوتنە تەکنیکییەکانە (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

### amalgamation / تێکەڵاوی

یەکێک لە میتۆدەکانی پێوەندی ناو گرووپی، تێکەڵ بوونە. لە کۆمەڵناسیدا واتای ئەم زاراوەیە ئەوەیە کە خەڵکێکی زۆر بە سەربهورد و رەگەز و نەتەوەی جیاوازەوە، لە دەوری یەکدا کۆوە دەبن و کۆمەڵگایەکی تێکەڵ پێک دێنن. لە نێو ئەندامانی جۆربەجۆری ئەم کۆمەڵگایەدا، پێوەندی ژن و مێردی پێک دێ و لەم بنەماڵە نوێیانەدا کولتوور و ژینی جۆراوجۆر ئاوێتە دەبن و مرۆڤگەلێکی نوێ، بە کولتوور و تایبەتمەندی نوێوە دێنە دی. بۆ نموونە، کاتێ پورتۆگالیەکان برازیلیان داگیر کرد، بە بۆنەی ئازادییەکی رێژەیی کە لە وێدا بوو، سوورپێستە ئەمریکییەکان و پورتۆگالییەکان و کۆیلە رەشپێستەکان لە نێو یەکدا تێکەڵ بوون و بنەمای کولتوورێکی نوێیان دارشت. تۆرەمە و کولتووری ئێستای خەڵکی برزیل، ئاکامی چوارسەد ساڵ

تێکەڵ بوونە.

لە ئەمریکای باکووردا دێرتر ئـەم رووداوە رووی دا؛ چونکـە سـەربـەسـتی رەچەڵەکی دێرتر لە ئەمریکـای باشـوور هاتـە دی. کولتـووری ئـەمریکییـە ئافریقاییەکانی ئەمڕۆ بە ئەنجـامی ئاوێتـەبـوون و تێکـەڵاوی دێتـە ئـەژمـار؛ بڕوانە: **ئاسیمیلەبوون**.

## sectarian community / جڤاکی دەستەو تاقمەکان

ئەم زاراوەیە بە گرووپێکی جوگرافیایی دەڵێن کە لە گرووپ و ئایینەکانی‌تر دابڕاون و بە جیاواز لەوانی‌تر دەژین و خۆیان بە ئەمەگدار و گوێڕایەڵی ئایینێکی تایبەت (وەکوو ئیسلام یان مەسیحیەت) دەزانن. هەروەها ئەم گرووپانە پێوەندییەکی پتەویان لە گەڵ بنەماڵە و هۆزەکانیان هەیە(*U. S. Department of the Army, 1989*). بۆ نموونە، لە ساڵی ۱۹۲۰دا فەرانسە بە تێکەڵ کردنی جڤاکی دەستەکانی لوبنان، کۆماری لوبنانی پێک هێنا. ئەم کارە بە تێکەڵ کردنی جڤاکی دەستەکانی بەشی باکووری کێوەکانی لوبنان (زۆرتر ئەو مەسیحیانەی کە لە سەدەی حەڤدەوە لەو ناوچەیە نیشتەجێ ببوون)و جڤاکی دەستەکانی بەشی باشووری کێوەکانی لوبنان (زۆرتر موسوڵمانە سوننەکانی ناوچەی ترابلۆس و سەیدا و سەور) و جڤاکی دەستەکان کە لە دۆڵ و دەربەندەکانی عەککار و بوقاعدا دەژیان (زۆرتر موسوڵمانانی شیعە) بە ئەنجام گەیشت. مەبەستی فەرانسە لەم کارە، پێک هێنانی ولاتێک بوو لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا کە هەم لە باری ئابوورییەوە سەربەخۆ بێ و هەمیش زۆربەی دانیشتوانی مەسیحی بن.

## technological determinist / جەبرخوازی تیکنۆلۆژیک

بریتیە لە کەسێک کە بڕوای وایە مرڤ خاوەنی هیچ جۆرە سەربەستی و ئازادییەک نییە و سەرلەبەری هەڵسوکەوتی لە سۆنگەوەی داهێنانە تیکنۆلۆژیکییەکانەوە کۆنترۆل دەکرێن. زۆربەی کۆمەڵناسان ئەم بۆچوونە پەسند ناکەن و مرۆڤ بە گیانداریکی ئازاد دەزانن. هەرچەند کە تیکنۆلۆژییە نوێکان شێوازی ژیانی مرۆڤیان تووشی گۆڕان کردووە، بەلام مرۆڤ بەبێ رامان و بیرکردنەوە خۆی ناداتە دەست ئەم داهێنانە مادییانەوە. بەپێچەوانە، مرۆڤ بۆ ئافراندن و بەکار هێنانی ئەم داهێنانە نوێیانە خاوەنی را و بۆچوونە

و بە گوێرەی را و بۆچوونی خۆی هەڵیاندەبژێرێ و بەکاریان دەبا. گەر مرۆڤ توانی ئافراندنی تیکنۆلۆژیای نوێیان هەیە، توانی تێکدانی ئەم داهێنانەشی هەیە.

## جیاوازی کۆمەلایەتی / social differentation

جیاوازی بریتیە لە ١) پرۆسەی جیابوونەوە و هەلاواردن و بە پیشەیی بوون؛ بەدەست هێنانی شێواز و ئەرکی تایبەت؛ ٢) هەروەها هەرچی لە سۆنگەی ئەم پرۆسەوە بێتە دی.

لە بایۆلۆجیدا واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لە پرۆسەیەک کە بە چاکسازی یان گۆڕانی بەشێکی تایبەت، گیاندار بۆ ئەنجامدانی ئەرک و فانکسیۆنێکی تایبەت ئامادە دەکات.

ئەم واتا بایۆلۆجیکییە دەورێکی زۆری بوو لەوەی کە ئەم زاراوەیە بباتە نێو کۆمەڵناسی تەکامولی سەدەی نۆزدەهەمەوە.

جیاوازی کۆمەلایەتی زاراوەیەکی گشتییە کە زۆرتر ئاماژە دەکات بە : ١) پرۆسەیەک کە لە سۆنگەیەوە تاک یان گرووپەکان دەوری لێک جیاواز یان پسپۆڕانە یاخۆ پلە و پاگەی شیاو بۆ ئەم دەورانە دەگرنە ئەستۆ؛ ٢) دەرەنجامی ئاوەها پرۆسەیەک. بەرهەمی کلاسیک لەم بابەتەدا کتێبی *جیاوازی کۆمەلایەتی* نووسینی سی. سی. نۆرتە. نۆرت دەڵێ کە «جیاوازییە گرینگەکۆمەلایەتییەکان چوار جۆرن: جیاوازی لە دەورو ئەرکدا، جیاوازی لە پلەو پاگەدا، جیاوازی لە کولتووردا و جیاوازی لە حەز و قازانجدا».

لەم سالانەی دواییدا مەیلێکی دووبارە بۆ هەلاواردنی واتای جیاوازی کۆمەلایەتی و **پۆلێنی کۆمەلایەتی** سەری هەڵداوە. وادیارە کە ئەم واتا دواییە، لە راڤە گرینگەکاندا بەگوێرەی بارودۆخێک پێناسە کراوە کە تێیدا «ماف و بەهرەی پێگەکانی نێو کۆمەڵگا دەبێ نایەکسان بن». رەخنەگران لە

وەڵامدا گوتوویانە کە ئەمە فرمووڵێکە بۆ جیاوازی کۆمەڵایەتی کە دەرەنجامی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا خۆی دەنوێنێ و جیایە لەو چینبەندییەی کە باس لەو کۆمەڵگا پۆلێنکراوانە دەکا کە «بەردەوام و لە درێژایی تەمەنی چەن تۆرەمەدا دەگەنە ئاستێکی بەرز لە ئامانجە مادیەکان، دەسەلات و ڕێزو حورمەتی کۆمەلایەتیدا» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## جیهانی سێیەم / third world

بناوانی ئەم زاراوەیە دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونێکی کۆنی فەرانسی کە کۆمەڵگایان بە سێ پاژ دابەش دەکرد. ئەو سێ پاژە بریتی بوون لە: یەکەم- خانەدانان و دەرەبەگان، دووەم- پایەدارانی کلیسا، سێیەم- خەڵکی رەمەکی. لە چاخی نوێدا، بە تایبەت پاش شۆڕشی مەزنی رووسیا لە ١٩١٧دا ئەم زاراوەیە بۆ کەرتبەندی ئەورووپا بەکار برا. رۆژاوای ئەرووپا و ئەو ولاتانەی لە گەڵ ئەمریکا پێوەندییان هەبوو، بە ناوی «جیهانی یەکەم» و رۆژهەلاتی ئەورووپا و ئەو ولاتانەی لە گەڵ یەکیەتی سۆڤییەت پێوەندییان هەبوو بە ناوی «جیهانی دووەم» و ولاتانی هەژاریش بە ناوی «جیهانی سێیەم» ناو دەبران. هەڵوەشانی یەکیەتی سۆڤییەت بوو بە هۆی لەناوچوونی واتای جیهانی دووەم. بەم بۆنەوە هەنووکە کۆمەڵناسان لە گەڵ دوو واتای جیهانی یەکەم، واتە ئەو ولاتە پێشکەوتووانەی کە لە باکووری هێڵی ئێستوادا دەژین و جیهانی سێیەم یان ئەو ولاتە هەژار و نەدارانەی کە لە باشووری هێڵی ئێستوادان، رووبەڕوون.

لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا کە زۆربەی خەڵکی لە گوندەکاندا دەژین، ئاستی بێکاری و بێکاری نادیار زۆر لە سەرەوەیە و کۆچی ناوخۆ و مەودای نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان زۆرە. بە پیشەسازی بوون پێشکەوتێکی ئەوتۆی نییە و ئەوەش کە هەیە، زۆرتر مۆنتاج و پیشەسازییە بچووکەکانە کە

ئەوەش زۆر جار ناگاتە رادەیەکی شیاو و لەبار. لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەمدا دوو دیاردە سەرنجی پێ دەدرێ:

یەکەم) گۆڕانی کۆمەڵگا و بەدیهاتن و بە زانستی کردنی پەروەردەی نوێ کە دەبێتە هۆی گۆڕانی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا.

دووەم) نوێ کردنەوەی کۆمەڵگا بە کەڵکوەرگرتن لە تیکنۆلۆجی، بەم مەبەستەی کە بەهرەی تاکەکان زۆرتر بێتەوە. لە راستیدا ئەم زاراوە لە واتای بە پیشەسازی بوون یاخۆ «گەشەی پێکهاتەی پیشەسازی» نزیک دەکەوێتە (آشفتە تهرانی؛ ١٣٨۴).

مەبەست لە گەشەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، گەیشتن بە جۆرێک رۆنێسانس و ژیانەوەی سەرجەم رێکخراوەکانی سیستەمی ئابووری-کۆمەڵایەتییە.

بەشێکی زۆر لە وڵاتانی جیهانی سێیەم تووشیاری کەم خۆراکی یان خراپی خۆراکن. بە گوێرەی راگەیندراوەکانی فائۆ (F. A. O)، نزیک بە ٤/١ خەڵکی ئەم وڵاتانە لە بەر کەم خۆراکی رەنج دەکێشن. ئامارەکانی یوونیسێف (UNICEF) پیشان دەدەن کە ٤٥٠ تا ٥٠٠ میلیۆن لە خەڵکی جیهان تووشیاری کەم خۆراکی درێژخایەنن و ساڵانە ٥٠ میلیۆن کەس بە هۆی کەم خۆراکییەوە دەمرن (آشفتە تهرانی؛ ١٣٨۴). کۆمەڵناسان بۆ پێناسە کردنی وڵاتانی جیهانی سێیەم ئاماژەیان بە دە تایبەتمەندی کردووە: ١- زۆربوونی ژمارەی ساوایان، ٢- زۆربوونی رادەی مردن، ٣- کورت بوونی تەمەنی ناونجی تاکەکان، ٤- کەم خۆراکی یان خراپی خۆراک، ٥- زۆر بوونی رادەی نەخوێندەواران، ٦- زۆر بوونی ژمارەی جووتیاران بە رێژەی ژمارەی کرێکارانی پیشەسازی، ٧- بێکاری (بێکاری درێژخایەن، نادیار و کەم کاری)، ٨- گەشە نەسەندنی چینە ناونجییەکان، ٩- کار کردنی ئەو منداڵانەی کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی یاسایی بۆ کار کردن، ١٠- بەشداری

نەکردنی خەڵکی لە کارە گشتییەکاندا.

لە ئێراندا تەنیا بابەتێک کە لەم ساڵانەی دواییەدا گۆڕانی بە سەردا هاتووە، کەم بوونەوەی رادەی مردنە؛ ئەمەش بۆتە هۆی زۆربوونی لە ڕادە بەدەری جەماوەری ئێران.

لە ساڵانی پاش شۆڕشی ئێران، ڕێژەی زۆربوونی جەماوەری ئێران گەیشتە ٣/٥%؛ واتە پاش دە ساڵ جەماوەری ئێران گەیشتە نزیک بە دوو بەرانبەر. پاش ئەوەهان درا تا بەرگری لە زۆربوونی جەماوەر بکرێ و ئێستا ئەم ڕێژەیە گەیشتۆتە ٢/٥%؛ واتە هەر ساڵ دوو میلیۆن کەس لە خەڵکی ئێران زیاد دەبێ. کەچی بارو دۆخی ئابووری و کۆمەلایەتی و بژیوی خەڵکی، زۆرتر نەبووە و تەنانەت بە هۆی ناکۆکی ئێران لە گەڵ وڵاتانی پێشکەوتوو، ئێران تووشی قەیرانی ئابووری هاتووە و هەر ساڵ باری ژیانی خەڵکی زۆرتر دادەبەزێ و بەرەو خراپتر بوون دەڕوا.

بانکی جیهانی بە گوێرەی داهاتی سەرانە، وڵاتانی جیهانی سێیەم بە سێ بەش دابەش دەکات:

١- ئەو وڵاتانەی کە داهاتیان کەمتر لە ٥٠٠ دۆلارە؛ وەکوو چین، هیند، بەنگلادیش، سریلانکا و ئەفغانستان، چاد، وڵاتانی ناوەند و ڕۆژاواو باشووری ئەفریقا؛ وەکوو سوومالی، مووزامبیک و ... .

٢- دووەم ئەو وڵاتانەن کە داهاتیان لە نێوان ٥٠٠ تا ٩٠٠ دۆلارە. وەکوو لە ڕۆژهەلاتی ئەفریقا، زیمباوە و زامبیا، لە ڕۆژاوای ئەفریقا نیجریە و کامرۆن، لە باشووری ئاسیا، تایلەند و فیلیپین و ئەندوونزی.

ئەو وڵاتانەی کە داهاتی سەرانەیان لە نێوان ٩٠٠ تا ٢٥٠٠ (و هەندێ جار تا ٤٠٠٠) دۆلارە؛ وەکوو گواتمالا، پیرۆ، کووبا، شیلی، برزیل، تورکیا، عەراق، ئێران (آشفته تهرانی؛ ١٣٨٤).

لەم چەن دەیەدا هەندێ وڵاتی جیهانی سێیەم وەکوو کووریای باکوور،

تایوان، سەنگاپوور و هۆنگ‌کۆنگ لە باری ئابووریدا گەشەیەکی بەرچاویان بووە. ساڵی ١٩٥٠ داهاتی سەرانە لە کووریای باکوور ٣٥٠ دۆلار بووە و رادەی تەمەنیان ٥٠ ساڵ و زۆرتر لە ٨٠ لە سەدی خەڵکی لە گوندەکاندا دەژیان. پاش چل ساڵ، واتە لە ١٩٩٠دا داهاتی سەرانەیان گەیشتە ٢٩٠٠ دۆلار، رادەی تەمەنیان گەیشتە ٦٩ ساڵ و تەنیا ٢٥ لە سەتی خەڵکی خەریکی کشت‌وکاڵ بوون (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## چارەنووس/ predestination

هەرچەند کە چارەنووس واتایەکی دینییە، بەڵام بە بۆنەی مەیلی ماکس ڤیبێر بۆ بەهرەوەرگرتن لە واتا دینییەکان لە پێکهاتن و گەشەسەندنی سەرمایەداری مۆدێرندا، ئەم زاراوە هاتۆتە نێو مەڵبەندی دەسەڵاتی کۆمەڵناسیەوە. یەکێک لە پرسەسەرەکییەکان بۆ زۆربەی کۆمەڵناسان ئەوەیە کە ئایا سەرمایەداری پیشەسازی، سیستەمێکی ئابووری ئەقڵانییە؟ مارکس و ڤیبێر دوو وەڵامی دژ بە یەک و جیاوازیان بۆ ئەم پرسیارە هەیە. بە رای ڤیبێر، سەرمایەداری پیشەسازی لە خۆیدا ئەقڵانییە، چونکە لە رێگاگەلێکی ئەقڵانییەوە لە دووی قازانجی زۆرتردایە. بەڵام مارکس، سەرمایەداری بە ئانتی‌تێزی ئەقڵانییەت دەزانێ و دەڵێ ئەم سیستەمە ئابوورییە، لە پێکهێنانی نیازە سەرەکی و سەرەتاییەکانی مرۆڤدا شکستی هێناوە.

پرسیارێکی‌تر کە لێرەدا دێتە گۆڕێ ئەوەیە کە سەرمایەداری چلۆن هاتە دی؟ بە بڕوای ماکس ڤیبێر، سەرمایەداری میراتی هزری کالڤینیزمە (وبر؛ ١٣٨٧). کالڤینیزم بریتی بوو لە لقێکی دینی مەسیحی کە لە لایەن جۆن کالۆنەوە بنیات نرا (١٥٠٩-١٥٦٤). کالۆن بە پشت‌بەستن بە ئیلاهیاتی دامەزراوەدینییەکانی مەسیحییەت، حکوومەتی قەشەکان یاخۆ

خواسالارییەکی سنووورداری لە ژنێڤدا بنیات نا. ئەم حکوومەتە ئاینیە بوو بە هۆی ئەوەی کە جۆرێک کلیسای چاککراوی ئایینی پرۆتستان بەدی بێت. کالڤینیزم لە سەر دەسەڵاتی رەهای خودا بە سەر چارەنووس و ژیانی شارستانی و کلیساییدا جەختی دەکرد (هینلز؛ ١٣٨٦). بە گوێرەی ئایینی کالڤین، خودا بژاردەکانی خۆی داسپاردووە تا لە دونیادا بە زۆری کاربکەن و سامانی زۆر کۆوە بکەن، هەرچەند کە نابێ لەو سامانە کەڵک وەربگرن. بە گوێرەی ئەم ئایینە، بژاردەکان ناچارن کە بەم چەشنە هان بدەن و بژین، چونکە ئەمەلە چارەنووسیاندا نووسراوە. بە بۆچوونی ڤیبێر، بۆچوونی کالڤین بە ژیان، بۆچوونێکی تەکووز و ئەقڵانییە (وبر؛ ١٣٨٧). لە ئەندێشەکانی کالڤیندا هاتووە کە خودا بەختەوەری و رزگاری لە چارەی هەندێ کەسدا نووسیوە و چارەڕەشی و نەهاتی لە چارەی هەندێ‌تردا. هەروەها چارەنووسی هەرکەس لە رۆژی لە دایک بوونیدا نووسراوە و کەس ناتوانێ گۆڕانی بە سەردا بێنێ و کەس نازانێ لە داهاتوودا چی بە سەر دێت. بەم بۆنەوە، ژیانی پێڕەوەکانی کالڤین، بە هیوا بە رزگاری هەتاهەتا و ترس لە دوایینەهاتنی چارەڕەشی تێدەپەڕا. بۆ چارەسەر کردنی ئەم ترسە بێ‌بڕانەوەیە، پێڕەوانی ئەم ئایینە هانیان دا تا نیشانەیەک بۆ بەختەوەری دوارۆژیان ببیننەوە. نیشانەی بەختەوەری هەتاهەتایان لەوەدا دەزانی کە گەر کەسێک لەم دونیایەدا بەختەوەر و بێ‌نیاز بێ، لەو دونیاش هەروا دەبێ. بۆیە ژیانیان بۆ بەختەوەری و سەرکەوتن لەم دونیایەدا تەرخان کرد و ئەقڵانییەت و تەکووزی و کاری دژوار و بەردەوامیان بە ئەرکی ئاینی خۆیان دەزانی. مەبەستیان لە کۆوەکردنی ئەم سامانە زۆرو زەوەندەیە، نە رابواردن بوو و نە یارمەتی هەژاران؛ چونکە لە لایەکەوە رابواردن و تەوەزەلی و تەن‌پەروەریان بە گوناحێکی گەورە دەزانی و لە لایەکی‌تریشەوە، هەژاری هەژارانیان بە هۆی نارەزایەتی خوداوەند لە هەژاران دەزانی. بڕوانە: **پارێزگاری دونیایی**.

بەڕای ڤیبێر، کالڤینیستەکان بە سەرمایەدانانی دووبارە بۆ قازانجی زۆرتـر، بناغەی سەرمایەدارییان دارِشـت. کـەچـی بـە پێچـەوانـەی ئـەم بـیردۆزە، کاتۆلیکەکان روانگەیەکی مونفەعیلیان سەبارەت بە دونیا بوو و هیوا بە ژیانی بەختەوەر لەو دونیا بە سەر ژیانی ئەم دونیایەیاندا زاڵ بـوو. بـەپێچـەوانـەی کالڤینیستەکان کە بۆ کۆوەکردنی سـامان و مالـی زۆرتـر، ئـەنگێـزەیـەکـی دینییان بـۆ هـاتبووە کایـەوە، کاتۆلیکـەکـان سـامانی دونیاییـان بـۆ دوارِۆژ بەبێ کەڵک دەزانی. بەم بۆنەوەبوو کە ڤیبێر بەم دەرئـەنجـام گـەیشـت کـە سەرمایەداری پیشەسازی سەرەتا لەو شوێنانەدا هاتەدی کە کالڤینیستەکـان دەسەڵاتێکی زۆرتریان بوو.

## چینەژێرینەکان/ underclass

لە هەموو کۆمەڵگایەکدا بە هۆی بزاوتە کۆمەڵایەتییەکانەوە، خەڵک بەرەو چینە سەروو یا خوارووەکان لە گەڕدان. بو وێنە، هـەرچـەنـد لـە پێکهاتـەی چینایەتی ئەمریکا لە دەیەکانی ١٩٨٠دا، ژمارەی ئەو کـەسـانەی کـە بـەرەو چینە سەرووەکان لە هەڵبەزیندا بوون، زۆرتر لە ژمارەی ئەو کـەسـانە بـوون کە بۆ چینە خوارووەکان دابەزین (*Hout, M; 1988*- وەرگـیراو لـە: عضـدانلو: ١٣٨٤)، بەڵام چینە خوارووەکان هەم زۆرتر پـەرەیـان سـەنـد و هـەم زۆرتـر دابەزین. ئەم تەشەنە کردنی هەژارییـە تووشـی ئـەو کـەسـانە دەهـات کـە پێکهێنەری چینەژێرییەکان بوون (*Jencks, C; 1991*- وەرگیراو لە: عضـدانلو: ١٣٨۴). لە ئەنجامدا ئەگەر چینێکی نوێ لە ئەمریکادا هاتۆتەدی، ئەوە هەمان چینی ژێرینە. بەڵام بەڵگە بۆ ئەوەی کـە ئایـا دەتـوانین چینـە ژێرییـەکـان وەکوو چینێکی نوێ لە پێکهاتەی چینایەتی زیاد بکەین، بە دەسـتەوە نییـە. بە سەرنج دان بەوەی کـە زاراوەی چینـە ژێرییـەکـان، زاراوەیـەکـی نوێیـە، زۆربەی خەڵکی وای بۆ دەچن کە ئەو دیاردەیـە کـە بـە هـۆی ئـەم زاراوەوە

پێناسە دەکرێ، دەبێ نوێ و تازە بێ. بەلام هەر بەو جۆرەی کە جێنکس ئاماژەی پێ دەکات، ئەم واتایە، هەمان واتایەک کە کۆمەلناسان «چینە خوارووەکان»ی پێ دەلێن، دەخاتەوە بیر. لە لای جێنکسەوە ئەم دوو واتایە ئاستێکی بەرز لە بێکاری، نەخوێندەواری، مندالانی بێباب، توندوتیژی، نائۆمێدی و سەرلێشێوان دێننەوە بیر (هەمان سەرچاوە). کەواتە، چینی ژێرین، نە وەکوو چینێکی نوێ، بەلکوو وەکوو زۆربوونی ژمارەی کەسانێک دەزانرێ کە نە تەنیا لە خوارترین ئاستی پێگەی چینایەتیدان، بەلکوو لە باری رەفتاری کۆمەلایەتیەوە زۆر ناتەواون.

ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی جیاوازی نێوان چینە ژێرییەکان لە گەل چینە خوارووەکانی‌تر، هەلس‌وکەوتی دژە کومەلگای ئەم کەسانەیە ( *Auletta, K; 1982*- وەرگیراو لە: عضدانلو: ۱۳۸۴). لەم رووەوە لە لای زۆربەی کۆمەلناسان، چینەژێرییەکان لە لایەکەوە بریتین لە ژێرکۆمەلەیەک لە هەژاران و لە لایەکی‌ترەوە کەسانێک کە هەلس‌وکەوت و شێوەی ژیانیان بە چەشنێک لە گەل هەژاری دەگونجێ. چینە ژێرییەکان کەسانێکن کە لە لێواری کۆمەلگادان و ژیانیان بە هۆی یارمەتییەکانی دەولەت یان لە رێی کاری ناڕەواو دژ بە یاساوە بەڕێوە دەچێ. بە گشتی پێنج گرووپ لە خەلکی کە لە چینە ژێرینەکاندان بریتین لە: ۱) لادەرانی نێو شەقامەکان کە بە راشکاوی لە گەل بەهاکانی کۆمەلگادا ناکۆکی و دژایەتی دەکەن، ۲) فرۆشێنەرانی مادە سڕکەرەکان و دەلالانی نامووس و قوماربازەکان کە هەرچەند بە دزەوە خەریکی کارن، بەلام توندوتیژی نانوێنن، ۳) تاکە ئارام و بێکێشەکان کە هیچ کەلکێکیان نییە و بە تەواوی دەسندەخۆری حکوومەتن، ٤) کارەسات لێکەوتووان و لەترمە لێداوانێک کە بە هۆی خواردنی ئەلکۆل و مادە سڕکەرەکانەوە بوونەتە هەژاری بێخانوبەرە، ٥) گرووپی پێنجم ئەو بێخانووانەن کە مۆرکیان لێ دراوە و لە مافە کۆمەلایەتی و رامیارییەکان

بێبەش کراون. ئەندامانی ئەم گرووپە بۆ دەست دان بە هەر کارێکی دژ بە یاسا و کۆمەڵگا ئامادە و تەیارن کە تەنانەت بکوژن یا بکوژرێن.

بێجگە لە هەندێ لە بێخانووەکان کە لە شەقامەکانی ناوەڕاستی شار یا لە نێو گەڕەکەکانی نزیک بە شوێنی کەسب و کاردا دەژین، زۆربەی ئەندامانی چینەژێرینەکان لەو گەڕەکاندا دەژین کە کاولن یاخۆ خەریکی کاول بوونن. ئەو کەسانە لە رادەبەدەر هەژار و بێکارن و زۆربەیان چاوەڕوانی یارمەتییەمالییەکانی دەوڵەتن. ئەم کەسانە هەم لە باری کۆمەڵایەتی و هەمیش جەستەییەوە گۆشەگیرن و لە کۆمەڵگا تەریک کەوتوون و بە هۆی کەم و کووڕی لە باری لێهاتوویی و شارەزایی کاری و کۆمەڵایەتییەوە، ناتوانن بارودۆخی خۆیان بگۆڕن. ئەندامانی چینە ژێرییەکان، زۆربەیان وازیان لە خوێندن هێناوە و بێکارن و بەبێ سەرنجدان بە بارودۆخی ماڵیان، منالیان دەبێ و بەردەوام یاسا و رێسا کۆمەڵایەتییەکان دەخەنە ژێر پێ (عضدانلو؛ ١٣٨۴).

## چینی ئێخەسپی/ white-collar class

چینی ئێخەسپی، لە بەرانبەر چینی کرێکاری ئێخەشین کە بە دەست کار دەکەن، ئاماژە دەکات بە چینێک لە کارمەندانی نزم پایە کە کاری هزری و نیوە پسپۆڕانەیان لە ئەستۆیە. بەگشتی ئەم زاراوەیە باس لە پایەنزمانی چینی ناونجی دەکات کە لە باری ئابوورییەوە سەربەخۆن. هەروەک ئار. سنتێزر کارمەندانی پسپۆڕ و بەڕێوەبەران جیادەکاتەوە و ئەم زاراوەیە بۆ «کارمەندانی نووسینگەیی، کرێکارانی فرۆشندە، فرۆشندەکان، کرێکارانی نیوە پسپۆڕ و تکنیسیەنەکان» بەکار دەبات. بێنهام پێناسەیەک لە هەمان چەشن رادەنێ: «لەخوارترین لێواری چینی ناونجی، نزیک بەو سنوورەی کە کرێوەرگرانی کارە دەستییەکان لەوێوە دەست پێدەکەن، گرووپێک لە

کرێکاران هەن کە پێیان دەڵێن کرێکارانی ئێخە سپی». بێنهام سێ پێوەر بۆ ئەم چینە هەڵدەژمێرێ: ١) کرێکار دەبێ لە بەشی خزمەتگوزاریدا بێ، ٢) بپەرژێتە سەر کاری هزری، ٣) تایبەتمەندی و دانستەکانی، تایبەتمەندی پسپۆڕانە نەبن.

ئەم واتا هەرچەند واتای ئاسایی ئەم زاراوەیە پیشان دەدات، هەندێ جار تا ئەو جێگا پەرە دەستێنێ کە لە گەڵ چینی «ناونجی نوێ» هاوواتا دەبێتەوە. بۆ وێنە سی. رایت میلز لە تۆژینەوەکەیدا سەبارەت بە چینی ناونجی ئەمریکا، هەموو ئەو کەسانەی کە نە خاوەن کارن و نە کاری دەستی دەکەن، دەخاتە ریزی ئێخە سپیکانەوە؛ وەکوو بەڕێوەبەران و پسپۆڕان و بەڕێوەبەرانی فرۆش و کارمەندانی نووسینگەیی.

هەندێ جار ئەم زاراوەیە لە گەڵ «مووچەخۆر» بەرانبەر دەزانرێ. ئەم واتایە کەمتر پەسند دەکرێ، چونکە لەباری تەکنیکییەوە دەبێتە هۆی هەڵاواردنی ئەو کارمەندانەی کە کرێ وەردەگرن و کەچی کاری دەستی ناکەن.

زۆرتر را لە سەر ئەمەیە کە گرووپی ئێخە سپیکان، زۆرتر پێکهێنەری توێژێکن، نەک چینێک. لەروانگەی خاوەنێتییەوە، خەڵکی ئێخەسپی نین لە نێوان سەرمایە و کاردا؛ پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم کەسانە لە باری خاوەنێتییەوە، زۆرتر لە هەمان پێگەی مزبگیران دەکا (لاکوود؛ ١٩٦٤).

## چینی کۆمەڵایەتی/ social class

واتای چین یەکەم جار لە لایەن ئابووریزانانی کلاسیکەوە -بەتایبەت ریکاردۆ و ئادام سمیت- بەکار براوە. چین دەکرێ بە کۆمەڵەیەک لە تاکەکان پێناسە بکرێ کە لە باری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە شوێنگەی چوونیەکیان هەیە. بەڵام بەم پێیەش پێناسەی جۆراوجۆر و لێکجیاواز

## چینی کۆمەڵایەتی

سەبارەت بە چینی کۆمەڵایەتی هەیە. جۆری ئەو پێناسانە بە جۆری روانگەی تاکەوە بەستراوە.

پاش ئابووریزانانی کلاسیک زۆرترین باس لە سەر چینی کۆمەڵایەتی تایبەت بە مارکسە. گرینگی کاری مارکس و پاش ئەو ڤیبێر –هەرچەند جیاوازییان پێکەوە هەیە- لەوەدایە کە سەرنجیان داوەیە پێکهاتەیەکی نوێی چینی کۆمەڵایەتی کە لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا سەری هەڵدابوو. مارکس زۆرتر لە سەر پرۆلتاریای پیشەسازی و ڤیبێر لەسەر سەرمایەداری پرۆتستان کۆڵاونەتەوە.

مارکس ئەم زاراوەیەی لە بەرهەمی مێژوونووسانی فەرانسی لە سەدەی نۆزدەهەم و ئابووریزانانی بریتانی سەدەی هەژدەهەم هەڵگرتووە. مارکس لە توێژینەوەکانی خۆیدا بە تایبەت لە *ئایدۆلۆجی ئاڵمانیدا*، بەم دەرەنجامە گەیشتووە کە چینەکان بەرهەمی دابەش‌کردنی کاری کۆمەڵایەتین و هەموو فۆرمبەندییە ئابووری-کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی پێوەندی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان پێک هاتوون. ئەم پێوەندییانەش لە سەر خاوەنێتی و نەبوونی خاوەنێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دامەزراون و هەردەم دەسەلاتداری و زاڵبوونی چینە خاوەن ئامرازەکان بە سەر ئەو چینانەی کە خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنان نین پیشان دەدەن (احمدی؛ ۱۳۸۲).

مارکس بە پێچەوانەی ئابووریزانانی کلاسیک سەرهەڵدانی چینەکانی سەرمایەداری و پرۆلتاریای بە رووداوێکی کاتی دەزانی. هەروەها هۆی دابەش بوونی کۆمەڵگای بە چینگەلی جۆراوجۆر، لە شێوازی بەرهەمهێنانـدا دەزانی، لە کاتێکدا ئابووریزانەکلاسیکەکان هۆی بەدیهاتنی چینی کۆمەڵایەتیەکانیان بە شێوازی دابەش کردنی کار دەزانی. مارکس لە بەرگی سێیەمی کتێبی سەرمایەدا باس لە سێ چینی جیاواز دەکات: «یەکەم چینی زەویندار کە کرێی زەوینەکانیان وەردەگرن، دووەم سەرمایەدارەکان

کە قازانجی سەرمایەکەیان وەردەگرن و سێیەم چینی کرێکار کە کرێی شان و پیلیان وەردەگرن» (کوزر؛ ۱۳۷۰). پاش دامرکانی شۆڕشی پیشەسازی، زەویدارەکان و سەرمایەدارەکان پێکڕا ئاوێتە بوون و چینێکی نوێیان بەدیهێنا. ئەندامانی ئەم چینە هەرچەند هەریەکە و لە بوارێکی کۆمەڵایەتی جیاوازەوە سەریان هەڵدابوو، بەڵام هەموویان بۆچوونێکی سەرمایەدارانەیان بوو.

بایەخی روانگەکلاسیکەمارکسیەکان بەبۆنەی رووداوەکانی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەوە خرانە بەر گومان و دڕدۆنگی. ئەنجامی ئەم دڕدۆنگییە بوو بە سەرهەڵدانی پاشمۆدێرنیزم و پاش سوشیالیزم (ملک؛ ۱۳۸۷).

بێجگە لە روانگەی مارکسی سەبارەت بە چینی کۆمەڵایەتی، روانگەی جۆراوجۆری تر هەیە. گورویچ دەڵێ: «پێناسە نامارکسیەکانی چینی کۆمەڵایەتی ئێجگار زۆر و جۆراوجۆرن و پێوەری جۆراوجۆریان بۆ پێناسەی چینی کۆمەڵایەتی هەیە، وەکوو داهات، پیشە، سامان، لێهاتوویی، ئەرکی کۆمەڵایەتی و شێوازی ژیان و هتد» (گورویچ؛ ۱۳٦۹). بەبڕوای گورویچ هەموو ئەو پێناسە نامارکسیانە رەهەندێکی هاوبەشیان هەیە، ئەوەش ئەو تایبەتمەندی و پێوەرانەیە کە بۆ ئەو پێناسانە بەکار براون و هەموویان دەتوانن بەردەوام بن و هیوایەک بە گۆڕانیان تێدا بەدی ناکرێت؛ کەچی پێناسەی مارکس لە چینی کۆمەڵایەتی، باس لەو پێوەرانەی دەکات کە لە هەلومەرجی تایبەتی مێژووییدا هاتوونەتەدی و بەگۆڕانی ئەو هەلومەرجانە، ئەو چینە کۆمەڵایەتیانەش گۆڕانیان بە سەردا دێ.

گرینگترین نوێنەری روانگەی نامارکسی سەبارەت بە چینی کۆمەڵایەتی ماکس ڤیبێرە. ڤیبێر وەکوو مارکس باوەڕی بەوەنەبوو کە چینی کۆمەڵایەتی هۆی سەرەکی نابەرانبەری کۆمەڵایەتییە. بەڵام لەم بارەدا لە گەڵی هاوڕایە کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری پیشەسازیدا پێوەندی ئابووری دەوری

## چینی کۆمەڵایەتی

سەرەکی لە بیچم دان بە نابەرانبەری نێوان تاک و گرووپەکان هەیە.

پارێتۆش بەجێی چینی کۆمەڵایەتی، بە واتای مارکسی، واتای چینی دەسەلاتدار (بژاردەکان) و چینی ژێردەسەلات دادەنێ. مووریس هالبواکس لە پێناسە کردنی چینی کۆمەڵایەتیدا جەخت لە سەر ئاگەداری چینایەتی دەکات. ئەو چینە رامیاری، یاسایی و ئابوورییەکان لە چینە کۆمەڵایەتییەکان جیادەکاتەوە. هۆی جیاوازی چینە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان لە جیاوازی لە نیازەکانیان دەزانێ و بە پێچەوانەی مارکسیستەکان، بۆ دیاری کردنی چینی کۆمەڵایەتی بایەخ بە شێوازی بەکارهێنانی کالا بەرهەمهاتووەکان دەدات تا خاوەنێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان. سوروکین یەکێکتر لەو کۆمەڵناسانەیە کە پێناسەیەکی نامارکسی لەمەڕ چینی کۆمەڵایەتی هەیە. بەبڕوای سوروکین چینە کۆمەڵایەتییەکان بریتین لە:

١- ئەو گرووپانەی کە لە باری یاساییەوە بۆ هەمووان کراوەن، بەلام لە راستیدا نیوە بەستراون.

٢- جەخت لە سەر یەکگرتوویی دەکەن.

٣- لە گەڵ چینەکانیتر ناتەبا و ناکۆکن.

٤- تا رادەیەک رێکخراون.

٥- بەرێژەی یەکیەتی و بوونی خۆیان تا رادەیەک ئاگەدارن (گورویچ؛ ١٣٦٩).

لە کۆمەڵناسی ئەم دوو دەیە دواییەدا چینی کومەلایەتی بە سەرنج دان بە جنسییەت، نەتەوە و ... بۆتە یەکێک لە بەشەکانی **توێژبەندی کۆمەڵایەتی**. ئەم جیاوازییانە نە تەنیا پێکڕا بەستراون بەڵکوو وان لەژێر کاریگەری بەجیهانی بووندا، کە هەم رەهەندی ئابووری هەیە و هەم رەهەندی کولتووری.

## چینی کۆمەڵایەتی ئینتزاعی/ abstract social class

ئەم واتایە سەبارەت بە چینێک بەکار دەبرێ کە ئەندامانی تا رادەیەک بەرێژەی هەست و نیازەهاوبەشەکانیان ئاگەدارییان هەیە، بەلام بەرادەی پێویست یەکگرتوو و یەکجۆر نین کە بکرێ لەنێو گرووپ یا کۆمەڵەیەکدا دابنرێن. لە لایەکیترەوە، ئەم چینە لە گەڵ دەستەبەندییە کۆمەلایەتییەکانیتر کە توێژەران بۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆیان پۆلێنیان کردووە، جیاوازی هەیە. ئەندامانی ئەم چینە زۆرتر نازانن کە ئەندامی یەک گرووپی کۆمەلایەتین. نموونەیەک کە دەتوانین بۆ ئەم چینە بیهێنینەوە، لایەنگرانی گوڵ و شینایی، ژنانی ماڵدار، گەنجان و هتدن. جۆرج هێربێرت مید یەکەم کەس بوو کە لە کتێبی زەین، خود و کومەڵگادا لەم زاراوەیە کەڵکی وەرگرت.

## government / حکوومەت

حکوومەت بریتیە لە پرۆسەی حوکمداری کردن. واتە: چاودێری بە سەر خەڵکی و گەلالەکردنی شێوازی هەڵس‌وکەوت بۆ خەڵکی (گولدو کولب؛ ١٣٨٤). هەروەها حکوومەت، ناوەندی سیستەمێکی رامیارییە. حکوومەت دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتییە کە بەکار بردنی زۆر و توندی لە کۆمەڵگای بۆ خۆی قۆرخ کردووە و لەم ئامرازە بۆ ناچار کردنی خەڵکی بۆ شێوازێکی تایبەت لە هەڵس‌وکەوت و گوێڕایەڵی لە بەرانبەر یاسا و پێوەرێکی تایبەتدا لە ناوچەیەکی تایبەتی جۆگرافاییدا بەهرە وەردەگرێ. حکوومەت گشتگیرترین دامەزراوەی کۆمەڵگایە. بێجگە لە حکوومەت هیچ دامەزراوەیەکی‌تری کۆمەلایەتی (یەکیەتی کرێکاران، دامەزراوە ئاینی و پەروەردەکان و هتد) هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا ناخاتە ژێر رکێف و دەسەلاتی خۆی.

هەروەک بێژرا، حکوومەت کۆمەڵەیەک لە دەزگا و دامەزراوە کۆمەلایەتییەکانە کە کاری دابین کردنی پێوەندی نێوان چینەکۆمەلایەتییەکان و پاراستنی نەزم و هێمنایەتی کۆمەڵگای لە ئەستۆیە. بەلام ئەم دامەزراوانە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بوونیان نەبووە. کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بە بۆنەی یەکگرتوویی و وێکچوونێکی مەزنەوە کە لە نێوانیاندا بووە، بەبێ پێڕەوی کردن لە کەس یان رێکخراوێکی تایبەت ژیاون و تەنیا لە کاتی رووداوێکی گەورەی وەکوو جەنگدا کە پێویست بووە هێزەکانی کۆمەڵگا کۆوە بن و لە یەک سەنگەردا راوەستن، کەس یان کەسانێکی شاز و هەڵکەوتە لە لایەن خەڵکەوە بۆ رێبەرایەتی هەڵبژێردراون و پاش دوایی هاتنی شەڕ، هەموو شت و هەموو کەس گەڕاونەتەوە بۆ سەر جێگای سەرەکی خۆیان. هەروەکوو چۆن لە جیهانی گورگ و ئەسپ و مەیموونسدا رێبەرایەتی کارێکی کاتییە. خەڵکی رەمەکی جەزیرەکانی

ئاندامان (*Andaman*) و خەڵکی تییەڕا دێلفوئێگۆ (*Tierra del fuego*) و هۆزی بووشمەن (*Bushman*) نموونەی کۆمەڵگای بێحکوومەتن .(*Thomas, W. I; 1973*)

بێنیازی کۆمەڵگای سەرەتایی بە حکوومەت، چەن هۆی هەیە: ١) بچووک بوونی گرووپ؛ ٢) خاوەنێتی گشتی؛ ٣) نەریتپەرستی زۆر (آگ برن، ١٣٤٧).

یەکێک لە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی حکوومەت بەهرەوەرگرتن لە «زۆرە». زۆر و دەسەڵات دیاردەیەکە کە حکوومەت بۆ کۆنترۆڵ و چاودێری بە سەر خەڵکدا بەهرەی لێ دەگرێ. هەندێ جار حکوومەت بە دامەزراوەکانیتری کۆمەڵگا ئیزنی کەڵکوەرگرتن لە زۆر دەدات، بەڵام ئەم ئیزنە بە تەواوی سنووردارە و چەندوچوونی ئەم بەکارهێنانە لە لایەن خودی حکوومەتەوە دیاری دەکرێ. بۆ وێنە: ڕەنگە باب یان دایکی بنەماڵەیەک بۆ ڕاهێنانی منداڵانی لە زۆر بەهرە وەربگرێ، بەڵام ئیزنی ئەوەیان نییە لە سنوورێکی دیاریکراو تێپەڕن. گەر دایک یان باوکێک بە فراوانی بۆ ڕاهێنانی منداڵانی لە زۆر بەهرە بگرێ، ئەو ڕەفتارەی پێی دەڵێن منداڵ ئازاری و بە کردەوەیەکی دژ بە یاسا دێتە ئەژمار. بەگشتی، گەر ئامرازی زۆر لە لایەن دامەزراوەیەک بێجگە لە حکوومەتەوە بەکار بگیرێ، نایاساییە. زۆربەی ئەو توندوتیژییانەی لە کۆمەڵگادا دەکرێن، لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکوومەتن، بۆیە بە تاوان و لادان دەزانرێن. هەرچەندە تاوان و لادان لە کۆمەڵگادا تەشەنە کا و پەرە بستێنێ، پیشاندەری ئەوەیە کە دەسەلاتی حکوومەت ڕووی لە کزی ناوە. لە ئاوەها هەڵومەرجێکدا بوونی حکوومەت تووشی مەترسی دێ. کاتێ کەسانێک کۆوە بن و یاسایی بوونی حکوومەتێک بخەنە بەر گومانەوە، یاخۆ لە ئامرازی زۆر و توندو تیژی بۆ تێکدانی حکوومەت بەهرە وەربگرن و نیازی ئەوەیان بێ بۆ خۆیان سیستەم و حکوومەتێکی نوێ

بنیات بنێن، ئەو کۆمەڵگا تووشی ڕاپەڕین و شۆڕش هاتووە.

بەکار بردنی زۆر دوایین ئامرازێکە کە حکوومەت کەڵکی لێ دەگرێ. بە گشتی، هەرچەند نیاز بە بەکاربردنی زۆر کەمتر بێ، ئەوە پیشان دەدات کە دامەزراوەی حکوومەت باشتر و چاکتر توانییە ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات و خەڵکی دانیان بە سەر یاسایی بوونیدا ناوە. بەکاربردنی زۆر بە چەشنی دڵخوزا و پێشبینی نەکراو، لە تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی ئۆتۆریتەو ملهۆڕە. ئەم حکوومەتانە دەیانەوێ بە ترس و دڵەڕاوکێ ئەندامانی کۆمەڵگا بێننە ژێر ڕکێفی خۆیان.

بێجگە لە زۆر ئامرازێکی‌تر کە حکوومەتەکان کەڵکی لێ دەگرن، وتو وێژە. وتو وێژ بە هەموو شێوازێکیەوە، وەکوو ئامرازێکی کاریگەر نە تەنیا بۆ پاراستنی بارودۆخی باوی نێو کۆمەڵگا، بەڵکوو بۆ چێ کردن، تێکدانی پێکهاتە و تەنانەت چاکسازی کۆمەڵگاکان بەهرەی لێ دەگیرێ. بەکار بردنی ژیرانەی وتو وێژ یەکێک لە ئامرازەپێویستەکانی پێوەندی نێوان خەڵک و حکوومەتەکانە. کەواتە، زۆر و وتو وێژ دوو ئامرازی گرینگن کە حکوومەت بۆ چاودێری و کۆنترۆلی ئەندامانی نێو کۆمەڵگا بەهرەیان لێ دەگرێ. تێکەڵ بوونی ئەم دوو ئامرازە دەتوانێ گۆڕانکاریەکی قووڵ و بنەمایی لە پێوەندی نێوان خەڵک و حکوومەتەکاندا بێنێتە دی. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە توێژینەوە و لێکدانەوەی وتو وێژ، قەد تەواو نابێ، مەگەر ئەوەی کە پێوەندی لە گەڵ «زۆر» و «توندو تیژی»دا لێکبدرێتەوە. وتو وێژ و زۆر پێکەوە و بە یارمەتی یەک دەتوانن ببنە هۆی چاکسازی، گۆڕان و ڕێکو پێک‌کردنی سنووره کۆمەڵایەتییەکان، زنجیرەی پێگە ئابووری، ڕامیاری، کومەڵایەتی و کولتوورییەکان و تەکووز کردنی دامودەزگاکان و میتۆدەکانی خوو و خدە ڕامیاری و ئابووری و کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان.

زۆر (واتە: کردەوەو ڕەفتارێک کە گەڵ توندو تیژی تێکەڵ بێ) ئامرازێکە

کە بە شێوەی جۆراوجۆر لە خزمەت تاکەکان و گرووپەکانی کۆمەڵگادایە و بە شێوەی جۆراوجۆر بەهرەی لێ دەگرن. بەلام زۆرتر لە لایەن کەسانێکەوە بەکار دەبرێ کە خاوەن دەسەلاتێکی فەرمین. ئەم کەسانە لەم کەرەسە بۆ گوێڕایەڵ کردنی تاکەکان و بەرگری لەو شتەی کە «لادان»ی پێ دەڵێن، بەهرە وەردەگرن. بەم بۆنەوە خاوەنانی ئەم کەرەسەیە (زۆرتر حکوومەتەکان) لە لایەکەوە هان دەدەن نەزم و هەلومەرجی هەنووکەیی کۆمەلگا بپارێزن و لە لایەکیترەوە هان دەدەن دەسەلاتی خۆیان بپارێزن و دەسەلاتەکەیان بە یاسایی پیشان بدەن (هێزی کەلکوەرگرتن لەو سەرچاوە کەم وێنانەی کە هەموو کەس پێی خۆشە بەهرەیان لێ بگرێ). ئەم سەرچاوە دەگمەن و گشتخوازانانە هەر ئەوانەن کە ماکس‌ڤیبێر لە سێ گرووپدا ریزیان دەکا: سامان، هێز، وەج و ئاوڕوو؛ هەروەها بابەتی‌تری وەکوو پەروەردە، زانیاری، تەندروستی و ئاسوودەگی و هتد.

زۆر، هەروەها دەتوانێ لە لایەن بژاردەکانی کۆمەلگاوە -کە دەسەلاتیشیان هەیە- بۆ کاریگەری بە سەر گۆڕانێکی گرینگی کۆمەلایەتی بەکار ببرێ: وەکوو بەهرە گرتنی راستەوخۆ لە توندوتیژی بۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانەی کە لە دەرەوەی سنووری ولاتدان (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

لەم سەردەمەدا حکوومەت وەکوو سیستەمێکی زۆر ئالۆز دەرهاتووە و زۆر کاری گرینگ و بەربلاوی گرتۆتە ئەستۆ. سێ هۆکاری سەرەکی لەم گۆڕانەدا بەشداریان بووە کە بریتین لە:

١- بەرفراوانی مەلبەندی ژێر دەسەلات: گەشە سەندنی هەندێ لە حکوومەتەکان و یەکگرتوویی هەندێ لە هۆزە جۆراوجۆرەکان، بۆتە هۆی هاتنەدی حکوومەتگەلی بەربلاو بە پانتایەکی زۆرەوە.

٢- ئالۆز بوونی ژیانی کۆمەلایەتی: هەنووکە لە دونیادا کەمتر ولاتێک هەیە کە تەنیا لە یەک نەتەوە (nation) هاتبێتە دی. هەندێ لە

حکوومـەتـەکـان خـەڵـکێکی زۆر لـە نـەتـەوەو ئـایین و کولتـوور و زمـانی جۆراوجۆریان لەنێو بازنەی خۆیاندا گرتووە.

٣- گۆڕانی بەردەوام: کۆمەڵگاکانی ئێستا بـە هـۆی پیشـەسـازی نوێـوە، هەردەم خەریکی گۆڕانن. ئەم گۆڕانە بەردەوامە کێشەیەکی بێبڕانـەوەی بـۆ حکوومەتەکان هێناوەتە ئاراوە. بۆ وێنە داهاتنی ترۆمبیل و باو بوونی، ئەرکی نوێی وەکوو چێ کردنی ڕێگاوبانی شـیاو و تـەکـووز کـردنی هـاتوچـۆ بـۆ حکوومەتەکان هێناوەتە دی (آگ برن، ١٣٤٧).

ئەم هۆکارانە بوونەتە هۆی دژواری و ئاڵۆزی ئەرکەکـانی حکوومـەت، بـە چەشنێ کە حکوومەتەکانی ئێستا وەکوو حکوومەتەکانی پێشـوو نـاتوانن بـە ئاسانی و بەبێ کێشە هێمنی و ئاسایش و ڕێکوپێکی بۆ ژیانی کۆمـەڵایـەتی خەڵک دابین بکەن.

### خزمایەتی / kinship

ئەم زاراوە سەبارەت بە پێوەندیەکی کۆمەڵایەتی بەکار دەبرێ کە بنەمـای لە سەر پێوەندی خوێنی، هاوسەرگیری، یا بە منداڵگیرییـەوە دانـراوە. ئـەو تاکانەی کە ئاوەها پێوەندییەکیان هەیە، خزمایەتی پێکدێـنن. هـەرچـەنـد خێزان بە یەکێک لە بنەما سەرەکییەکۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان لە هەموو جڤاکەکاندا دەزانرێ، بەڵام ئەم پرسـە کـە چ کـەسـانێک لـە ژێـر چـەتـری پێکهاتەی خزمایەتیدا دادەنرێن، لە کۆمەڵگایەکـەوە بـۆ کۆمـەڵـگایەکـیتـر جیاوازە. خزمایەتی پێوەندییـەکـی کۆمـەڵایـەتییـە کـە بنـەمـای لـە سـەر بەندیواری خزمایـەتییـەوە دانـراوە و کولتـووری کۆمـەڵـگا جـۆری ئـاوەهـا پێوەندییەک روون دەکاتەوە. کولتووری کۆمەڵگا یەکێک لەو هۆکارانەیە کـە بایەخی ئەم پێوەندییانە روون دەکاتەوە. بە واتایەکیتر، کولتووری کۆمـەڵـگا ئەرکی ئەندامە خزمەکان لە بەرانبەر یەکتردا دیـاری دەکـات و دامـەزراوە و

پێوەندی ئەندامانی دامەزراوەی خزمایەتی روون دەکاتەوە.

## self / خود

خود لە گەڵ سیستەمی فیزیۆلۆجی مرۆدا جیاوازی هەیە. خـود هـەمـان شتێکە کە دەبێ بیچم و قەوارەیەک بگرێتە خۆ و لە کـاتی بـەدونیـا هـاتنی تاکـدا بـوونی نییــە، بـەڵــکوو لــە نێــو پرۆســەی ئــەزمــوون و چالاکییــە کۆمەڵایەتییەکاندا گەشە دەکات. بەواتایەکی‌تر، خـود بریتیــە لـە بۆچـوونی تاک سەبارەت بە خۆی کە بە هۆی پێوەندی لە گەڵ پرۆسەی گەورەبـوون و بەکۆمەڵایەتی بوونەوە پێی دەگـا. تـاک بـەو جـۆرەی کـە لـە نێـو گرووپـی هاوالانیدا دەیناسن، یان بەو جۆرەی کە بە کۆمەڵایەتی دەبێ، پێناسـەیـەک سەبارەت بە خود بە دەست دێنێ.

بە بڕوای چارلز هۆرتۆن کوولی سیمای دەروونی کەسـایەتی و نـاوەنـدی زەین، هەمان خودە کە خاوەنی دوو دۆخە:

١) دۆخی زەینی خود (subjective) کە «من» دەبێتە بکەری کار.

٢) دۆخی عەینی (دیار) خود (objective) یا منی سـەرتـر یـان مـنی کراو کە رەهەندی کۆمەڵایەتی خودە (توسلی؛ ١٣٨٧).

هۆرتۆن کولی و هێربێرت مید، بە دووی ئەم پرسـەوە بـوون کـە «خـود» چۆن دێتە دی و چۆن گەشە دەسێنێ. «خود» تێگەیشـتنێکە کـە تـاک لـە سەر خۆی هەیەتی. بە واتایەکی‌تر، «خود» وەڵامێکە بۆ ئەم پرسیارەی تـاک کـە دەڵـێ: «مـن کـێم؟» لـە لێکدانــەوەکـانی کـوولی و میـددا کـارلێکی کۆمـەڵایـەتی یـەکـەم هێـزی روونکـەرەوەو دیاریکـەری «خـود»ە و هێـزە بایۆلۆجیکییەکان لە ئاستی دووەمدان. کوولی لە کتێبی *سروشـتی مـرۆڤ و سیستەمی کۆمەڵایەتیدا* دەڵێ «خود» لە رێـی کـارلێکی کۆمـەڵایـەتییـەوە دێتەدی و پێناسە دەکرێ (ریتزر؛ ١٣٨٥).

بەڕای مید «خود»یش هەروەکوو زەین دیاردەیەکی ئۆبجێکتیڤ نییە، بەڵکوو پرۆسەیەکی ژیرانەیە کە ڕەهەندی جۆراوجۆری هەیە:

١) توانایی دژکردەوە لە بەرانبەر خود بە هەمان چەشن کە کەسانیتر لە بەرانبەریدا دژکردەوەیان هەیە.

٢) توانایی دژکردەوە لە بەرانبەر خود بە هەمان چەشن کە کۆمەڵ لە بەرانبەریدا دژکردەوەی هەیە.

٣) توانایی بەشداری لە وتوویژی تاکەکەسی لە گەڵ کەسانیتر.

٤) توانایی ئاگەداربوون سەبارەت بەو شتەی کە تاک دەیڵێ و ئەرکی ئەو ئاگەدارییە بۆ ئەو شتەی کە دەبێ لە قۆناغی دواییدا جێبەجێ بکرێ.

ئەم پرۆسە، پرۆسەیەکی پەتی زەینی نییە و توانایی پێویست بۆ گەشە سەندن لە ڕێی پێوەندی کۆمەڵایەتییەوە بە دەست دێت. لەم بابەتەدا زمان بایەخی سەرەکی هەیە، چونکە بەهۆی زمانەوە دەتوانین سیمبۆلە واتادارە بێژراوەکان بەکار ببەین و ڕاڤەیان بکەین (ریتزر؛ ١٣٨٥).

لێرەدا بۆچوونی مید سەبارەت بە قۆناغەکانی بەکۆمەڵایەتی بوون بایەخی زۆریان هەیە، چونکە مرۆکان بۆ گەیشتن بە «خود»، بێجگە لە زمان پێویستیان بە شتیتریش هەیە. لە قۆناغی **نمایشیدا**، منداڵ هان دەدا کە دەوری ئەو کەسانەی بۆی گرینگن (وەکوو: دایک، باوک، برا، خوشک، مام و...) فێر بێ. ئەم قۆناغە گرینگەلە ڕەوتی ژیان منداڵدا، تێگەیشتنێکی هەمەڕەنگ لە ژیان دەداتە منداڵ. چونکە منداڵ لەم قۆناغەدا دەوری جۆراوجۆر لە کەسانی جۆراوجۆر دەگێڕێ، تێگەیشتنێکی هەمەڕەنگ سەبارەت بە خود ڕادێنێ. وەکوو ئەوەی کە منداڵ دەمێک خۆی وەکوو بابی دەبینێ و دەورەکانی ئەو لە نێو ژیانی خێزان و هەروەها ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەگێڕێ و خودێکی تایبەت تاقی دەکاتەوە؛ دەمێکیتر دەوری دایک، برا و کەسانیتر دەگێڕێ و لە هەر قۆناغدا خودی تایبەت بەو کەسە تاقی

دەکاتەوە. منداڵ دەتوانێ خۆی لە شێوازی جۆراوجۆردا ببینێ، بە هەمان چەشن کە کەسانی‌تر دەیبینن. بە گشتی منداڵ لەم قۆناغەدا تێگەیشتنێکی یەکگرتوو و یەکپارچەی لە خۆی نییە.

منداڵان بۆ بەدەستهێنانی تێگەیشتنێکی یەکگرتووتر لە خۆیان، دەبێ بڕۆنە نێو قۆناغی **یارییەوە**. بەبڕوای مید لەم قۆناغەدا منداڵ سەلماندنی دەوری **هیتری بە گشتی‌کراو** فێردەبێ. مید بۆ روون کردنەوەی ئەم بابەتە، باس لە یاری بەیس‌بۆڵ دەکات. منداڵ لەم یارییەدا لە قۆناغی **نمایشیدا**، بە ریز دەورەکانی کاپیتان، تۆپ بلاوکەرەوە، گولێر، شووت وەشێن و هتد دەگرێتە ئەستۆ. بەلام ئەم بۆچوونە یەک‌نەگرتووانە تێگەیشتنێکی گونجاو لە یاری بەیس بۆڵ ناداتە منداڵ. کەچی لە قۆناغی یاریدا منداڵ دەتوانێ روانگەیەکی گشتگیر لەم یاریە بەدەست بێنێ؛ روانگەیەک نە تەنیا لە بەیس‌بۆڵ، بەڵکوو لە سەرجەمی جیهانی کۆمەلایەتی بەدەست دێنێ و یاری پێ دەکات. ئەم روانگە، یارمەتی منداڵ دەدات بۆ گەیشتن بە بۆچوونێکی یەکگرتووتر سەبارەت بە خود. لەم جیهانەشدا مید بایەخێکی زۆرتر دەداتە هۆکارە کۆمەلایەتییەکان. بۆ پێک هاتنی خود، پێویست بە گرووپێکی کۆمەلایەتی هەیە (ریتزر؛ ١٣٨٥).

خود بەرهەمی ئەزموونەکانی تاک لە گەڵ کەسانی‌ترە. خود لە پرۆسەی **بەکۆمەلایەتی‌بوون** و لە نێو **کارلێکی کۆمەلایەتیدا** دێتە دی. بە واتایەکی‌تر، بۆچوونی ئێمە سەبارەت بە خۆمان، کاردانەوەی چۆنییەتی هەڵس‌وکەوتی خەڵک لە گەڵ خۆمانە. ئەم پرۆسە هەمان پرۆسەیەکە کە کوولی پێی دەڵێ **خودی ئاوێنەئاسا**. منداڵ لە سەرەتاوە هیچ تێگەیشتنێکی رێکخراوی سەبارەت بە پێناسە و تایبەتمەندییەکانی خۆی نییە. بەدەروونی‌کردنی ئەو پێناسانەی کە کەسانی‌تر و کۆمەڵگا لە خۆی دەکەن و پێی دەدەن، بەرەبەرە خۆی و پێگەی کۆمەلایەتی خۆی دەناسێ.

## خود

هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، کوولی دەوری زمانی لە بەدیهاتنی «خود»دا زۆر بە گرینگ دەزانی. بەبڕوای کوولی، منداڵان زۆرتر لە ڕێی زمانەوە سەبارەت بە خۆیان بیر دەکەنەوە و خۆیان وەکوو بوونەوەرێکی تایبەت، لە کەسانیتر و هەروەها لە ژینگەیان جیادەکەنەوە. هەروەک بەڕای کوولی، یەکەمین گرووپێک کە بە سەر تێگەیشتنی منداڵ لە خود کاریگەرییان هەیە، بریتین لە خێزان و گرووپی هاوالان. ئەم دووانە لە سەرەتاوە بە هۆی پێوەندییەکی زۆرەوە کە لە گەڵ منداڵ هەیانە، سەرەکیترین ئاسەوار بە سەر چۆنییەتی تێگەیشتنی منداڵ لە خود، بەجێ دێنن. هەرچەند ئەمە بەو مانایە نییە کە ئەم تێگەیشتنە تەنیا یەکجار و ئەوەش لە منداڵیدا بۆ تاک دێتە دی، بەڵکوو تاک بەردەوام و لە هەر قۆناغێکی تەمەنیدا و بە گوێرەی هەر ئەزموون و پێوەندییەکی کۆمەڵایەتییەوە کە بۆی دێتەدی، تێگەیشتنێکی نوێ سەبارەت بە خود بە دەست دێنێ.

مید دەڵێ: خود بەرهەمی کارلێکی سیمبۆلیکە. ئەم کارلێکی سیمبۆلیکە لە گەڵ کەسانیتر دەتوانێ لە ڕێی پێکەنین، ناوچاو گرژ کردن، لە ئامێزگرتن، زللە لێدان و بە تایبەت لە نێو پێکهاتەی زماندا پێک بێت. بەم پێیە خود، ڕەهەندێک لە کەسایەتی تاکە کە بریتیە لە خۆئاگایی و بۆچوونی تاک سەبارەت بە خۆی. بەڕای مید، خود لە پێوەندی لە گەڵ کۆمەڵگادا دێتەدی و سەرهەڵدەدا و ناتوانێ لە کۆمەڵگا جیاواز بێ. بەم بۆنەوە ئەم پرۆسەیە لە سێ قۆناغدا شیدەکاتەوە:

١- «خود» لە ئەزموونەکۆمەڵایەتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. خود کەرتێک لە جەستەی ئێمە نییە و لە کاتی لەدایکبووندا بوونی نییە. خود تەنیا بە هۆی ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکانەوە گەشە دەکات. نەبوونی کارلێکی کۆمەڵایەتی هیچ کۆسپێک لە هەمبەر گەشەی جەستەی مرۆڤدا بەدی

ناهێنێ، کەچی بەنەبوونی کارلێک، خود هیچ گەشە ناکا و سەرهەڵنادا.

٢- ئـەزمـوونی کۆمـەڵایـەتی شـتێک نییـە بێجگـە لـە گۆڕینـەوەی سیمبۆلەکان. بۆ وێنە مرۆڤەکان بە راشەکاندنی دەستیان یان بـە پێکـەنـین (کە سیمبۆلی مرۆیین) هەندێ واتا بـە یـەک رادەگـەیـنن کـە بـەرهـەمـی ئەزموونە مرۆییەکانیانە. رەنگە بتوانین سەگێک رابێنین کە هەندێ رەفتاری مرۆڤان بەجێ بێنێ، بەڵام بێ‌گومان لەم هەڵس‌وکەوتەدا هیچ واتایەک نییە. بەپێچەوانە، مرۆڤەکان بە هۆی رەفتاریانـەوە هـەنـدێ واتـا لـە نێـو یـەکـدا دەگۆڕنەوە و مەبەستی ئەم سیمبۆلانە بـۆ هـەموویـان ئاشـکرا و روونـە. بـە واتایەکی روونتر، هەڵس‌وکەوتی سەگ وەڵامدانەوەیـە بـە کارێـک کـە ئێـوە ئەنجامی دەدەن، بەڵام هەڵس‌وکەوتی مرۆڤ پیشاندانی ئەو شتەیـە کـە لـە مێشکیدایە و جێ‌بەجێی دەکات.

٣- بۆ زانین و تێگەیشتن لە مەبەستی هەرکەس، پێویسـتە کـە بتـوانین شوێنگەی ئەو کەسە لە روانگەی خۆیەوە سەیر کەیـن. ئێمـە دەتـوانین بـە کەڵک وەرگرتن لە سیمبۆلەکان خۆمان لە شوێنگەیەکـی‌تـردا دابـنین و لـە روانگەی کەسانی‌ترەوە سەیری بابەتەکان بکەین. ئەم تواناییـە یارمـەتیمـان دەدات کە وەڵامی کەسانی‌تر تەنانەت بەر لـە کـردەی خۆمـان، پـێش‌بـینی بکەین. بەم بۆنەوە، کارلێکی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی ئەوەی کە مـرۆڤ بـە هەمان چەشنێ کە کەسانی‌تر دەیبینن، خۆی ببینێ. ئەمە پرۆسەیەکـە کـە هێربێرت مید پێی دەڵێ «خۆ پیشاندان لە نێو دەوری کەسانی‌تردا» .

بەڕای مید، کاتی هاتنەدی خود دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی، کاتێک کە هێشتا منداڵ توانی قسە کردنی نییە و لە کاتی فێربـوونی قسـە کردنـدا خود گەشە دەکات. مید بە سەرنـج دان بـە هـەڵـس‌وکـەوتی منـداڵان دوو قۆناغی سەرهەڵدانی خود روون دەکاتەوە: قۆناغی **نمایش** و قۆناغی **یاری**.

## looking-glass self / خودی ئاوێنەئاسا

یەکەم کەسێک کە ئەم زاراوەیەی بەکار هێنا چارلز هۆرتۆن کـوولی بـوو. کوولی لە کتێبی سروشتی مرۆڤ و سیستەمی کۆمەڵایـەتیـدا ئـەم زاراوەیـە هێناوە. ئەم واتایە سەرەتا لە یەکێک لـە شـیعرەکـانی شێکسـپیێردا هـاتووە .(each to a looking glass/ reflects the other that doth pass). مەبەستی کوولی لەم زاراوەیە ئەوەیە کە بنەمای تێگـەیشـتنی خـەڵـکی لـە خۆیان لە سەر بۆچوونی خەڵک سەبارە بـە خۆیـان دانـراوە. خـەڵـکی بـەو چەشنەخۆیان دەناسن کە خەڵکی دەیانناسن. بە واتایەکی‌تر، ژیری، گێلـی، بەها و بێ‌بەهایی خود، کاتێک دیارە و خۆی دەنوێنێ کە تاک خۆی لـە چـاو کەسانی‌ترەوە ببینێ. خودی ئاوێنەئاسا بریتیە لە سێ بەش کە هەر یەکەیان لە سەر بۆچوونێکی جیاواز دانراوە: ١- بۆچوونی ئێمە سەبارەت بە روانگـەی خەڵک لە سەر ئێمە، ٢- بۆچوونی ئێمە سەبارەت بە رای خەڵـکی لـە سـەر ئێمە، ٣- هەستی ئێمە سەبارەت بە دژکردەوەی کـەسـانی‌تـر لـە بـەرانبـەر ئێمەدا. ئەمە هەمان شتێکە کە کـوولی پێـی دەڵـێ «هـەسـتی خـود-self feeling » (*cooly; 1902*- وەرگیراو لە عضدانلو؛ ١٣٨٤) بڕوانە: **خود**

## suicide / خۆکوژی

خۆکوژی تەوەر و بابەتێکی کلاسیکە لە کۆمەڵناسـیدا. بـۆ وێنـە، گـەری (guerry) و مورسێللی (morseilli) ئامارناسانی ئاکاری دەسـتیان داوە بـە لێکدانەوەی ئەم بابەتە. بەڵام ئەوەی کە زۆرتر سـەرنجـی پـێ‌دەدرێ و لـەم کتێبەدا باسی لێ‌دەکرێ، کتێبی خۆکۆژی بەرهەمی ئێمیل دوورکایمە کە لە ساڵی ١٨٩٧دا بڵاو کرایەوە. تێزەکانی دوورکایم سەبارەت بـە خۆکـوژی لـەو کاتەوە تا ئێستا چەنای چەن جـار خراونـەتـە بـەر وردبوونـەوە و لێکدانـەوە؛ بەتایبەت لە لایەن هاڵبواکسەوە لە *هۆکارەکانی خۆکـوژی*(١٩٣٠)، هـانری و

شۆرت لە کتێبی *خۆکوژی و مرۆکوژی*دا (١٩٦٤). سەرجەمی ئەم توێژینەوانە دەڕۆنە خانەی ئامارە ئاکارییەکانەوە، چونکە بابەتەکەیان لێکدانەوەی سیستەم، گۆڕانەکان و جیاوازی لە رادەی خۆکوژییەکانە کە لە ئامارە فەرمییەکاندا تۆمار کراون.

کتێبێک کە دوورکایم بۆ لێکدانەوەی کێشەی خۆکوژی تەرخانی کردووە، پێوەندییەکی زۆر نزیکی لە گەڵ دابەش‌کردنی کاری کۆمەلایەتیدا هەیە. دوورکایم دان بەسەر دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی بە شێوازی ئۆرگانیکیدا دەنێ. بەڕای ئەو ئەم دابەش‌کردنی کارە باس لە گەشەیەکی ئاسایی و پیرۆزی جڤاکە مرۆییەکان دەکات. بەڕای دوورکایم جیاوازی کار و تاکەکان، دارمانی دەسەلاتی سوننەت و نەریت، زۆربوونی بەردەوامی دەسەلاتداری ئاوەز و گەشەی بەشی تاک لە داهێناندا هەموویان جوان و پیرۆزن. بەلام بەم خاڵەش ئاماژە دەکا کە مرۆڤ لەم دونیا نوێیەدا لە چارەنووسی خۆی رەزامەند نییە و بۆ روون کردنەوەی ئەم تەوەرە ئاماژە بە کێشەی خۆکوژی دەکات، کە پیشاندەری هەندێ هۆ و تایبەتمەندی نەخۆش‌ئاسا لە رێکخراوی ئێستای ژیانی هاوبەشی مرۆڤەکاندایە.

کێشەی سەرەکی کۆمەڵگا نوێکان —وەکوو هەر کۆمەڵگایەکی‌تر- بریتییە لە پێوەندی نێوان تاک و گرووپ. هۆی گۆڕانی ئەم پێوەندییە ئەوەیە کە تاک زۆرتر لە رادەی ئاسایی زانایی بەدەست هێناوە، بە چەشنێ کە ئەم ئاگادارییە بۆتە کۆسپێک لە بەرانبەر ئەوەی کە تاک هەر جۆرە فەرمانی کۆمەلایەتی بە چاوبەسراوی بسەلمێنێ و قبووڵی بکات. لە رەهەندێکی‌ترە، ئەم جۆرە تاک‌خوازییە —کە لە خۆیدا شتێکی پەسندکراوە- هەندێ مەترسی لە گەڵ خۆی دێنێتە ئاراوە، چونکە رەنگە تاک هەندێ داخوازی لە کۆمەڵگا بێ کە کۆمەڵگا توانی هێنانەدی ئەو داخوازانەی نەبێ. لێرەدا دیسیپلینێک پێویستە کە تەنیا کۆمەڵگا دەتوانێ بە سەر تاکدا دایسەپێنێ (آرون، ١٣٨٦).

دوورکایم لەم بەرهەمەیدا ئاماژە بە چوار جۆر خۆکوژی دەکات. سازگاری بوونی تاک لە گەڵ کۆمەڵگا ئەم گەرەکە دێنێتە کایەوە کە تاکخوازی نابێ نەزۆر ناهومێد بێ و نە زۆریش خۆڕا. ئەگەر زۆر خۆڕا بێ تاکگەراییەکی توندڕەوانە دێتەدی کە دوورکایم پێی دەڵێ خۆخوازی. ئەم خۆخوازی تاک بەرەو دابڕان لە کۆمەڵگا و بەرەو دوورەپەرێزی هان دەدا و دەبێتە هۆی پەرەسەندنی **خۆکوژی خۆخوازانە**. گەر تاک ناهومێد و هیوابڕواو بێ **خۆکوژی هیترخوزانە** گەشە دەکا. لە رەهەندێکی ترەوە بۆ راگرتنی هاوسەنگی نێوان تاک-کۆمەڵگا، پێویستە کە نۆرم و رێسا کۆمەلایەتییەکان نە زۆر شێلگیرانە بن و نە زۆر ئاسانگیرانە. نۆرمە شێلگیرانەکان دەبنە هۆی **خۆکوژی چارەنووسخوازانە**. بۆ وێنە خۆکوژی لەو تەقینەوانەدا کە تاک خۆی دەکوژێ لە ریزی ئەم جۆرە خۆکوژیانەیە. نۆرمە ئاسانگیرەکان دەبنە هۆی **خۆکوژی ئانۆمی** (دورکهیم؛ ١٣٨٧).

خۆکوژی خۆخوازانە رەنگە زۆرتر لە نێو ئەو جڤاک یان کۆمەڵ و گرووپانەدا باو بێ کە تاکەکان بە تەواوی لە نێو یەکە کۆمەلایەتییەکاندا تێکەڵ نەبووبێتن. تایبەتمەندی سەرەکی ئەم جڤاکانە، تاکخوازی لە رادەبەدەریانە. دوورکایم یەکگرتوویی کۆمەلایەتی بە بەرهەمی کارلێکی کۆمەلایەتی و هێزی باوەڕە هاوبەشەکانی ئەندامانی گرووپ دەزانێ. گەر کۆمەڵگا تاکێک کە ویست و داخوازی خۆخوازانەی هەیە بخاتە ژێر گوشارەوە بە چەشنێ کە تاک هەست بکات بە زۆر لە خزمەت کۆمەڵگادایە، ئەو تاکە بەرەو خۆکوژی پاڵ پێوەدەنرێ (دورکهیم؛ ١٣٨٧). ئەم چەشنە خۆکوژیە زۆرتر لە نێو ئەندامانی چینی سەرووی کۆمەڵگادا کە هۆی زۆرتریان بۆ خۆخوازی هەیە، باوە. ئەم تاکانە بە گشتی زۆر خەمین و دوورەپەرێزن. هۆی ئەم خۆکوژییە ئەوەیە کە کومەڵگا هۆی جیایی تاک لە کۆمەڵگا پێک دێنێ و پێوەندییەکی زۆر کزو لاوازی لە گەڵ کۆمەڵگا هەیە

(دیلنی؛ ١٣٨٨).

جۆری دووەمی خۆکوژی کە دوورکایم باسی لێوە کردووە، خۆکوژی هیترخوازانەیە. هۆی ئەم جۆرە خۆکوژییە پێوەندییەکی زۆر توندو تیژە کە لە نێوان تاک و کۆمەڵگادا هەیە و لەم جۆرە یەکگرتوویییەدا تاک ناچار بە خوکوژی دەبێ. بەڕای دوورکایم هەر بەو جۆرەی کە تاکخوازی لە رادەبەدەر دەتوانێ تاکەکان بەرەو خۆکوژی پاڵپێوە بنێ، نەبوونی تاکخوازیش دەتوانێ هەمان دەرەنجامی بێت. بەگشتی ئەو تاکانەی هەڵدەستن بە خۆکوژی هیترخوازانە، ئەم کارە بە ئەرکی خۆیان دەزانن (وەکوو خۆکوژی پێڕەوانی جیمجۆنز لە جۆنزتاون و فرۆکەوانانی کامیکازەی ژاپۆنی). بەڕای دوورکایم، خۆکوژی هیترخوازانە لە نێو سێ تاقم لە تاکەکاندا باوە. یەکەم ئەو کەسانەی کە لە سەرە پیری دان یاخۆ نەخۆش و پەککەوتەن، ئەم کەسانە کاتێ هەست دەکەن بوونیان هیچ قازانجێکی بۆ کۆمەڵگا نییە، پێیان وایە کە کاتی مردنیان گەیشتووە. دووەم لە نێو ئەو ژنانەدا باوە کە مێردەکانیان مردوون و ئەمانیش خۆیان دەکوژن. سێیەم بریتیە لەو پێڕەوانەی بە هۆی مردنی رێبەریانەوە خۆیان دەکوژن (دورکهیم؛ ١٣٨٧).

خۆکوژی ئانۆمی یا نارێسایانە لە هەلومەرجێکدایە کە ئاژاوەو ئالۆزی نێو کۆمەڵگا ببێتە هۆی بەدیهاتنی ئانۆمی کۆمەلایەتی. دوورکایم ئاماژە دەکات کە بە هۆی قەیرانی ئابووری ساڵی ١٨٧٣دا لە ڤییەن، ژمارەی خۆکوژی بە گوێرەی سالانی رابردوو زۆرتر بوو (دورکهیم؛ ١٣٨٧). رادەی ئەم خۆکوژییانە بە زۆرتر بوونی تەنگو چەڵەمەکانی ژیان زۆرتر دەبن. لە بارودۆخی قەیرانە ئابوورییەکاندا چینە کۆمەلایەتییەکان سەرو ژێر دەبن، بە چەشنێ کە چینە سەرووەکانی کۆمەڵگا دێنە خوارەوە و توان و سامان و پێگەی کۆمەلایەتییان لە دەست دەدەن و ناتوانن خۆیان لە گەڵ هەلو

مەرجی نوێدا بگونجێنن. بە پێچەوانەی ئەمەش هەر دروستە؛ واتە چینە خواروەکان دێنە سەرو سامان و پلەوپێگەی نوێ بە دەست دێنن و لە بەهرەوەرگرتن لەو سامانە تووشی کێشە دەبن. بە گوێرەی ئەو هەواڵو راپۆرتانەی کە لە دەستدان، زۆربەی ئەو کەسانەی کە بە هۆی بەختەوە سامانێکی زۆریان لە کێبەرکێدا بردۆتەوە، ژیانیان بە هۆی ئەو سامانەوە تێکچووە و فەوتاوە.

دوورکایم سەبارەت بە جۆری چوارەمی خۆکوژی، واتە خۆکوژی تەقدیرخوازانە، تەنیا لە پەراوێزی یەکێک لە لاپەڕەکاندا ئاماژەیەکی پێ کردووە. ئەم جۆرە لە هەلومەرجێکدا دێتە کایەوە کە چاودێری توندوتیژی کۆمەلایەتی، لە گەڵ سنووردار کردنی دەرەکییەوە هاوڕێیە. کاتێ ئەم سنووردار کردنە زەخت و گوشار دەخاتە سەر کۆمەڵگا، خەلکی هەست بە نائارامی و بێقەراری دەکەن و دەگەن بەو باوەڕەی کە قەد ژیانیان باشتر نابێ و رۆژبەڕۆژ بەرەو خراپتر بوون دەڕوا. هەر ئەم باوەڕە بەرەو خۆکوژی پاڵیان پێوە دەنێ (دیلنی؛ ١٣٨٨).

**خۆکوژی ئانۆمی** / **anomic suicide** : بڕوانە: **خۆکوژی**

**خۆکوژی چارەنووسخوازانە** / **fatalistic suicide** : بڕوانە: **خۆکوژی**

**خۆکوژی خۆخوازانە** / **egoistic suicide** : بڕوانە: **خۆکوژی**

**خۆکوژی هیترخوازانە** / **altruistic suicide** : بڕوانە: **خۆکوژی**

**خوێندن** / **schooling**

واتای ئینگلیزی school لە سەر زاراوەی Leisureی یوونانی کە بە

واتــای کــاتی ئــازاد یــان کــاتی بێکاریــە ســەرچــاوەی گرتــووە. خوێنــدن ڕێکخراوێکی فەرمییە کە وا لەژێر چاودێری ماموستایان و فێرکارانێ کــە لــە باری زانست و لێهاتووییــەوە راهــاتوون و نــۆرم و ڕێســا و بــەهــا و کولتــووره کۆمەلایەتییەکان لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تــر رادەگــوێزن. ئــەمڕۆکــە لــە زۆربەی ولاتانی دونیا و بە تایبەت لە ولاتانی پیشــەســازی و پێشــکەوتــوودا زۆربەی خەلکی بیست سالی سەرەتای تەمەنیان خەریکی خوێندن دەبن. تا چەن دەیەی لەمەو پێش رۆیشتن بۆ قوتابخانە و خوێندن تایبەت بە چــینی سەرووی کۆمەلگا بوو و بە پێگەیەکی کۆمەلایەتی دەهاتە ئەژمار.

لە جڤاکە بچــووک و ســەرەتاییــەکانــدا، بنــەمــای بــەرهــەمهێنــانی ئــەم کۆمەلگایانە لە سەر کشتوکاڵ دانرابوو، ژیــان و مانــەوەی ئــەنــدامانی ئــەم جڤاکانە بەسترابوو بە ناسینی روەک و ئاژەڵ و زەوی و ژینگەی سروشــتیان. بەسالاچووانی ئەم کۆمەلگایانە بۆ گواســتنەوەی ئــەم زانیاریانــە بــۆ وەچــەی داهاتوو، زۆریان هان دەدا. بە گەشەسەندن و گەورەتربــوونی کۆمــەلــگاکان، تاکەکان ناچار بوون بەجێی ئەم زانستە گشتییانە، هان بــدەن بــۆ فێربــوونی زانستێکی تایبەت سەبارەت بە لایەنی کاری خۆیان. زۆربەی کاتی ئەندامانی کۆمەلگا سەرەتاییەکان بۆ ئەو کارانەی تەرخان دەکرا کە زۆریان پێویست بە فێربوون و راهاتن نەبوو؛ تەنیا کەمینەیەک لە دەولەمەندان ئەو هەلەیــان بــۆ دەڕەخســا تــا کاتیــان بــۆ فێربــوونی هونــەر، مێــژوو و زانســت تــەرخــان بکەن(عضدانلو؛ ١٣٨۴).

## خێزان / family

خێزان گرووپێکن کە بە هۆی خزمایــەتی راســتەوخــۆوە لــە گــەل یــەک پێوەنــدییان هــەیــە و ئــەنــدامانی گــەورەسالــیان بــەرپرســی چــاودێری لــە منداڵانن. بە بڕوای پارسۆنز، کۆمەلناسی ئــەمریکــی، خێــزان دوو ئــەرکــی

سەرەکی هەیە کە بریتین لە: بەکۆمەڵایەتی کردنی سەرەتایی و سەقامگیر کردنی کەسایەتی (پارسۆنز ؛ ١٣٦٣). بەکۆمەڵایەتی کردنی سەرەتایی پرۆسەیەکە کە نۆرم و ڕێسا کولتوورییەکانی کۆمەڵگایەک کە منداڵ تێدا هاتۆتە دونیاوە و تێیدا گەشەی کردووە و گەورە بووە، بە منداڵان فێر دەکات. چونکە ئەم پرۆسە لە ساڵانی سەرەتایی منداڵییەوە دەست پێدەکا، بنەماڵە گرینگترین و یەکەمین قۆناغی گەشە و گەورە بوونی مرۆڤە. سەقامگیر کردنی کەسایەتی (*personality stabilization*) بە واتای دەورێکە کە خێزان لە لایەنگری و پشتگیری سۆزدار لە ئەندامانی گەورەساڵی خۆی لە ئەستۆی دەگرێ. بە هاوسەر بوون لە لایەن ژنان و پیاوانی پێگەیشتووەوە بریتییە لە بڕیار و پەیمانێک بۆ پشتگیری لە کەسایەتی هەردوو لایەن. لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا دەوری خێزان بۆ سەقامگیر کردنی کەسایەتی ژن و پیاو بایەخ و گرینگییەکی بەرچاوی هەیە. چونکە خێزانی ناوکی لە خزمانی بەربڵاوی خۆی دوور دەکەوێتەوە و ناتوانێ وەکوو خێزانەکانی بەر لە بە پیشەسازی بوون، لەم پێوەندییە خزمایەتییانە بەهرە وەربگرێ.

لەم سەردەمەدا وادیارە کە ڕوانگەی پارسۆنز لە بڕەو کەوتبێ و ئەو بایەخ و بەها پێشووەی خۆی لە دەست دابێ. بیردۆزە ئەرکخوازانەکان، چونکە پاکانە بۆ شێوازی دابەش کردنی کاری بنەماڵە لە نێوان ژن و پیاودا دەکەن و زۆر بە شتێکی ئاسایی پیشانی دەدەن، بە توندی کەوتوونەتە بەر ڕەخنەوە. بەڵام گەر ئەم بیردۆزانە لە ڕووبەری مێژوویی و ئاسایی خۆیاندا بخەینە بەر وردبوونەوە، تا ڕادەیەک باشتر تێیان دەگەین (گیدنز؛ ١٣٨٦).

لە بەرهەمەکانی ئەنگلسدا، پێشتر لەوەی کە کۆمەڵناسان بیردۆزەکانی خۆیان سەبارەت بە خێزان ڕابگەینن، بە ناتەباییەکانی نێو خێزان ئاماژە کراوە. بیرو بۆچوونەکانی ئەنگلس بە تایبەت بۆ بەدەست هێنانی ئازادی

ژنان، زۆر کاریگەر بوو. پرسیاری سەرەکی بۆ ئەنگلس ئەوەبوو کە هاوسەرگیری و خێزان چلۆن هاتوونەتە دی؟ چ ئاڵو گۆڕێکیان بە سەردا هاتووە؟ ئێستا چۆنن و داهاتوویان چۆن دەبێ؟ ئەنگلس تەکامولی خێزانی لە گەڵ تەکامولی کۆمەڵگا و بەدیهاتنی خاوەنێتی تایبەت لە بەرانبەر خاوەنێتی گشتییەوە، هاوکات زانیوە. بگار لە چەن هاوسەرییەوە بۆ تاک هاوسەری بە دەسکەوتێکی بەنرخ دەزاندرا و بوو بە هۆی کۆوە بوونی سامانێکی زۆر. چونکە مرۆڤ توانی بەرەبەرە بە سەر ژینگەیدا زاڵ بێ و ئەم زاڵ بوونە لە سۆنگەی کەوی کردنی ئاژەڵان و ئاژەڵدارییەوە هاتەدی. پیاو کە پاش دابەش کردنی کار لە گەڵ ژنان بەرپرسی دابین کردنی گۆشت لە ڕێی راووشکار بوو، لە پیاوی راوچییەوە دەوری خۆی بۆ پیاوی ئاژەڵدار گۆڕا و بەرە بەرە بوو بە خاوەنی گەلەیەک کە لە ژێر دەسەلاتی خاوەنێتی تایبەتی پیاودا بوو. لەم شێوازەدا، بە جیابوونەوەی پیاو لە ژن، گەلە کە -پیاو خاوەنی فەرمی بوو- دەبووە بەشی پیاو و ژن هیچ بەشێکی لێ نەدەبرد. بەلام لەم سەردەمەشدا هیشتا مافی دایکی بە سەر مافی باوکیدا زاڵ بوو؛ واتە پیاو هیچ مافێکیان سەبارەت بە منداڵیان نەبوو، بەم بۆنەوە پیاو نەیدەتوانی گەلەکەی بۆ هیچ کەس بە میرات بەجێ بێڵێ. لەم خێزانانەدا تەنیا دایک دیار بوو و باوک بە شێوەیەکی لاوەکی و نادیار پێناسە دەکرا. بەلام دواتر پیاو بە بۆنەی شوێنگەیەکی تایبەتەوە کە بووی (خاوەنێتی گەلە)، توانی یاسای میرات بردن تێک بدا و پشتی باوکی و میراتی باوکی بە سەر پشتی دایکی و میراتی دایکیدا داسەپێنێ. ئەنگلس ئەم گۆڕانە بە «شکستی جیهانی-مێژوویی ڕەگەزی مێیینە» ناو لێ دەبا. بە بڕوای ئەنگلس یەکەمین ستەمی چینایەتی، لەنێو خێزان و لە ستەمی پیاو لە ژنەوە دەست پێدەکا؛ پیاو کە دەست دەدا بە چەوساندنەوە ژن و داگیرکردنی زۆربەی مافەکانی خێزان و بێوەری کردنی ژن لە مافەکانی خۆی، بناغەی کۆیلەداری و

## خێزان

خاوەنێتی تایبەت و کۆمەڵگای چینایەتی دادەڕێژێ (ئەنگلس، وەرگیراو لە: اعزازی: ١٣٨٨).

بە بڕوای ئەنگلس، تەک هاوسەری، بە واتای سەرکەوتنی ژن نەبوو، بەڵکوو بە مانای خاوەنێتی پیاو لە نێو خێزان و بەرهەمهێنانی منداڵان — منداڵانێ کە باب خاوەنیان بوو و بە میراتبەری باب دەهاتنە ئەژمار. تەک هاوسەری پیشاندەری سەرکەوتنی تەواوی خاوەنێتی تایبەت بە سەر خاوەنێتی بەکۆمەڵ، سروشتی و سەرەتایی بوو. هەروەها ئەنگلس تەک هاوسەری بە ئاشتی نێوان ژن و پیاو نازانێ، بەڵکوو بە سەرەتای بەکۆیلە کردنی ژن لە لایەن پیاو دەزانێ (هەمان سەرچاوە).

بۆچوونی مارکسی سەبارەت بە خێزان و دەوری ژنان لەنێو خێزاندا، دەورێکی بەرچاوی لە سەرهەڵدانی بیردۆزی فیمینیزمدا گێڕاوە. فیمینیزم بە ڕەخنە گرتن لە بنەماڵە، وەکوو مەڵبەندێکی نایەکسان و نابەرانبەر، کاریگەرییەکی زۆری بە سەر کۆمەڵناسی خێزاندا بوو. لە ١٩٦٥دا بێتی فریدان، فیمینیستی ئەمریکی یەکەم کەسێک بوو دەستی کرد بە نووسین سەبارەت بە «پرسێک کە ناوێکی نییە» -نائۆمێدی و خەم و پەژارەیەک کە زۆربەی ژنانی دەڤەری شارەکانی ئەمریکا تووشی بوون و هەستیان دەکرد کە ئەسیری بازنەیەکی بەتاڵ و بێبڕانەوەی ماڵ و مناڵدارین. کەسانیتر ئەم باسەیان درێژە پێدا و هانیان دا تا دیاردەی «ژنی لە بەند» باشتر بناسن (گیدنز؛ ١٣٨٦).

لە درێژایی دەیەکانی حەفتا و هەشتادا، ڕوانگەی فیمینیستی بە سەر زۆربەی باس و توێژینەوەکانی خێزاندا زاڵ بوو. ئەگەرچی پێشتر کۆمەڵناسی خێزان زۆرتر سەرنجی دابۆوە پێکهاتە و گۆڕانی مێژوویی خێزانی ناوکی و بەربڵاو و بایەخی پێوەندییە خزمایەتییەکان، فیمینیزم توانی سەرنجی هەمووان بەرەو ناوی خێزانەکان و لێکدانەوەی ئەزموونی ژنان لە ناو

بنەماڵەدا بگێڕێتەوە. فمینیستەکان هانیان داوە تا ئەم بۆچوونە لە سەر خێزان بخەنە ژێر پرسیارو گومانەوە کە دەیانگوت خێزان بریتیە لە کۆمەڵەیەکی هاریکاری و هاوقازانج کە بەرەو دۆزێکی هاوبەش لە گەڕدایە. دەیانویست ئەم راستییە پیشان بدەن کە بوونی دەسەلات و هێزی نایەکسان لە نێو خێزاندا پیشاندەری ئەوەیە کە هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵە زۆرتر لەوانیتر قازانجیان پێ دەگات.

لە درێژەی بیردۆزەکانی کۆمەڵناسی خێزاندا دەبێ سەرنجێک بدەین بە بیردۆزەکانی «دژ بە دەسەلات». بیرۆکەی «دژ بە دەسەلات» کە سەبارەت بە کۆمەڵگا باسی دەکرد، هانی دەدا کە دەسەلاتی دەولەت لە مەڵبەندەکانی ژیان، بەتایبەت بەشی پەروەردەی رەسمی کورت کاتەوە. لە خێزاندا دەسەلاتی باوکی وەکوو هۆکارێک لە بەرچاو دەگیرا کە پشتگیری لە دەسەلاتی دەولەت دەکرد. لە بیرمەندانی ئەم بیردۆزە دەتوانین ماکس هۆرکهایمێر و ویلهێلم رایش ناوبەین، ئەم دوو کەسە هەرچەند دوو روانگەی لێک جیاوازیان بوو، بەلام بەرەنگاری دەسەلاتی باوک لە نێو خێزاندا بوون. رەخنەی ئەم کەسانە لە خودی دەسەلات نەبوو، بەڵکوو رایان وابوو کە بە گۆڕانی پێوەندییە کۆمەلایەتییەکان، بیچمەکانی دەسەلاتیش گۆڕانیان بە سەردا هاتووە. شێوازی کۆنی دەسەلاتی خێزانی، شیاوی سیستەمی باوکسالاری پێشوو بوو. بەلام چونکە پێوەندییە کۆمەلایەتییەکانی خولی پێشوو نەماون، دەسەلاتی باوک سالار لەم سەردەمەدا نە تەنیا بەکەڵک نییە، بەڵکوو دەبێتە هۆی ئەنجامی نالەباریش (اعزازی؛ ١٣٨٨).

### خێزانی ئاوێتە / blended family

خێزانی ئاوێتە یەکێک لە بەرهەمەکانی جیا بوونەوەی ژن و پیاو لە

یەکترە. لە هەموو کۆمەڵگایەکدا ژن و پیاو بە هۆی جۆراوجۆرەوە لێکتر دادەبڕێن. زۆربەی ئەم ژن و پیاوانەی کە لە یەکتر جیادەبنەوە، دیسان لە گەڵ ژن یا پیاوێکی تردا ژیانی هاوبەش دەسپێدەکەنەوە. بۆ وێنە لە ئەمریکادا لە هەر سێ ژن کە لە مێردیان جیادەبنەوە، دوو ژن دیسان مێرد دەکەنەوە و لە هەر چوار مێرد کە لە ژنیان جیادەبنەوە، سێ پیاو دیسان ژن دێننەوە (*Cherlin, A. J; 1992*- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨٤). بە گوێرەی تۆژینەکان، لە ئەمریکادا لە هەر دە هاوسەر کە لە یەک جیابوونەتەوە، هەشتیان خاوەنی منداڵ بوون(*Kantrowitz, B; 1989*). بیچم و قەوارەی ئەم خێزانە نوێیانە، جیاوازن. بۆ وێنە، دایکێک بە یەک یا چەن منداڵی مێردی پێشووی، لە گەڵ زڕبابیان (مێردی نوێی دایکیان) دەژین. یاخۆ مێردێک بە یەک یا دوو منداڵ کە لە ژیانی پێشووی ماونەتەوە، لە گەڵ زڕدایکی منداڵانی (ژنی نوێی باوکیان) پێکەوە دەژین. یاخۆ پیاوێک لە گەڵ منداڵانی ژنی پێشووی و ژنێک لە گەڵ منداڵانی مێردی پێشووی پێکەوە دەژین و خێزانێکی نوێ پێک دێنن. بەم خێزانە دەڵێن خێزانی ئاوێتە.

ئانتۆنی گیدنز ئەم چەشنە خێزانە بە *خێزانی ناتەنی* (stepfamilies) یا *خێزانی دووبارە چێکراو*(reconstructed family) ناو دەبا. گیدنز دەڵێ: ئاشکرایە کە بەدیهاتنی خێزانی ناتەنی، دەبێتە هۆی گەشە سەندنی خێزانی فراوان کە هەندێ قازانج و چاکەی لە گەڵدایە. بەڵام دەبێ ئاگەدار بین کە دژواری و کێشەی تایبەت بە خۆی هەیە. لەلایەکەوە بۆ ئەم منداڵانە دایک یان باوکێکی خوێنی هەیە کە کاریگەرییەکی زۆری بە سەر منداڵەکەیدا هەیە. لە لایەکی ترەوە پێوەندی و هاریکاری لە نێوان ئەو تاکانەی کە جیابوونەتەوە و دیسان ژنیانن هێناوە یا مێردیان کردووە، سنووردار و پڕ لە ناکۆکی و ناتەباییە. کێشەیەکی تر کە لە گەڕدایە ئەوەیە کە خێزانی دووبارە چێکراوەکان ئاوێتەیەکە لە منداڵانێک بە رابردوو و روانگەو بۆچوونی جیاواز

و هەندێ جار دژبەیەکەوە. هەر یەک لەم مندالانە رەنگە پێناسەیەکی جیاوازیان بۆ هەڵس‌وکەوتی پەسندکراو هەبێ. چونکە مندالانی ئەم خێزانانە لە دوو خێزانی جیاوازەوە هاتوون، رەنگە دژایەتی و ناکۆکی لە روانگەکانیاندا بێ (گیدنز؛ ١٣٨٦).

## خێزانی تێکەڵ / compound family

ئەم واتایە باس لە خێزانێک دەکا کە بەرهەمی چەن مێردی یان چەن ژنییە. لەم خێزانانەدا دوو یان ژمارەیەکی زۆرتر لە خێزانی ناوکی بە یەک ژن یان پیاوی هاوبەشەوە خێزانێکی تێکەڵ پێک دێنن.

## خێزانی تەک سەرپەرشت / single parent family

لە سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ بەم لاوە ژمارەی ئەو خێزانانەی کە تەنیا دایک یان باوکیان هەیە، نزیک بە دووبەرانبەر بۆتەوە. ئەم ژمارە لە سالی ١٩٩١دا گەیشتە دوازدە میلیۆن خێزان ( *Ahlburg, D. A; and C. J. De Vita: 1992*، وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨٤). لە سالی ١٩٩٢دا نزیک بە بیست‌و حەوت مندال لە نێوو خێزانێکدا دەژیان کە تەنیا یەک سەرپەرشتیان (تەنیا دایک یان باب) بوو. ئامارەکان وا پیشان دەدەن کە ٥٠% لە هەموو مندالە ئەمریکییەکان (و ٨٠ لە سەتی مندالانی ئەمریکی کە رەچەلەکیان ئەفریقییە) بەر لە گەیشتن بە تەمەنی هەژدە سالان، ماوەیەک لە نێو خێزانی تەک سەرپەرشتدا ژیاون.

ئەم خێزانانە یا بەرهەمی لێک جیابوونەوەن یاخۆ بەرهەمی پێوەندیە سێکسییە نارەسمییەکانی بەر لە هاوسەرگیرین. نزیک بە ٨٥% ئەم خێزانانە تەنیا دایکیان سەرپەرشتیانە. نزیک بە ٥٠% ئەم خێزانانە لە ژێر هێڵی سنووری هەژاریدا دەژین. ئەم ژمارە بۆ ئەو خێزانانەی کە هەم دایکیان هەیە

و هەم باوک، ١٠ لـە سـەتـە (McLanahan, S. L; and K. Booth; 1989- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨٤). یەکێک لە هۆکانی ئەم هەژارییە، کـەم بـوونی رادەی داهاتی ژنانە لە چاو پیاواندا. دایکانی گەنج و نیـوەتـەمـەن، یـان ئـەو ژنانەی کە خوێندن و ئەزموونی کاریان زۆر کەمترە، بە ئەستەم بتوانن بڕۆنـە نێو بازاڕی کارەوە. یارمەتییەکان باوک تەنیا دەتوانـێ ١٠% داهـاتی خێزانـە تەک سەرپەرشتە سپی پێستەکان و ٣/٥% داهاتی خێزانە تەک سەرپەرشتە ڕەش پێستەکان دابین بکا. ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە تەک سەرپەرشتەکـان هیچ یارمەتییەک لە باوکەکانیان وەرنـاگرن و یارمـەتیـە حکوومییـەکـانیش ناتوانن لە دەست هەژاریان دەربازیان بکەن. هـەروەهـا دایکـانی تـەنیـا، بـە ڕێژەی دایکانی ئاسایی، پێوەندییـەکـی چاکیـان لـە گـەڵ منـداڵانیان نییـە (هەمان سەرچاوە). بەڕێژەی ئەو منداڵانـەی لـە نێـو خێزانـە ئاساییەکانـدا دەژین، منداڵانی خێزانە تەک سـەرپـەرشـتەکـان ئامـانجی خوێنـدنیان زۆر کەمترە، واز لە خوێندن دێـنن، زۆرتـر تووشـی لادانی کۆمـەڵایـەتی دەبـن، خێراتر ژن دێنن یا مێرد دەکەن و منداڵدار دەبن، خێراتر لە هاوسەریـان جیـا دەبنەوە و لە سەردەمی گەورەساڵیدا بە هەژاری دەمێننەوە.

## خێزانی خوێنی (یان هاوپشت) / consanguine family

بە پێچەوانەی خێزانی ژن و مێردی، کە جەخت لە سەر پێـوەنـدی ژن و مێردی دەکات، واتای خێزانی هاوپشت بەو خێزانانە دەبێژرێ کـە پێـداگری سەرەکی لە سەر پێوەندی خوێنی نێوان باوک، دایک، منداڵ، خوشـک و بـرا دەکەن. لەم سۆنگەوە پێوەندی خوێنی ئاوەها خێزانێک لـە پێـوەنـدی ژن و مێردی، سەرتر و بەنرخترە. ئـەم خێزانانـە زۆرتـر بیچمـی خێـزانی فـراوان دەگرنە خۆ.

### خێزانی ژن و مێردی / conjugal family

خێزانی ژن‌و مێردی بریتیە لەو خێزانانەی کە بەجێی پێوەنـدی خـوێنی، پێداگری لە سەر پێوەندی ژن و مێردی دەکەن. ئەم خێزانانە لە ژن و مێـرد و منـدالانی زگـورد و قـازاخ پێـک هـاتوون. گـەر لـە نێـو ئـەم خێزانانـەدا خزمانی‌تریش بژین، پلەو شوێنگەیان لـە ریـزی دووەمیندایـە. خێزانـە ژن‌و مێردییەکان بیچمی خێزانە فراوانەکان ناگرنە خۆ. ئەم جۆرە خێزانە، باوترین جۆری خێزان لە شارە گەورەکانی دونیایە و لە نێو خێزانە ناونجییـەکانیشـدا هەر ئەم شێوازە باوە.

### خێزانی فراوان / extended family

کۆمەڵناسان ئەو خێزانانەی کە لە چـەن خێـزانی نـاوکی کـە پێـوەنـدی خوێنی بە سەریاندا زاڵە، بەناوی خێزانی فراوان ناودەبـەن. خێـزانی فـراوان زۆرتر تایبەتمەندییەکانی خێزانی خوێنی هەیە تا خێزانی ناوکی. لە خێزانی فراوانـدا ئـەنـدامانی چـەن وەچـەی لێـک جیـاواز پێکـەوە دەژیـن؛ وەکـوو دایەگەورە و باوەگەورە و مام و خاڵ و پوور و برا و خوشک و برازاو خوشـکەزا و مندالانی مام و خاڵ و پوور و برا و خوشک و ... .

خێزانی فراوان لەم تایبەتمەندییانـەدا یـەکسـانن: خێـزان یـەکـەیـەکـی بەرهەمهێنان و هەروەها بەهرەوەرگر بـوو کـە سیسـتەمـی دابـەش کـردنی کالاش بوو. گرینگترین بەرهەمی خێزان، خۆراک و پاش ئەوە چـێ کـردنی پۆشەن و خانوو بووە. ئەم یەکە خاوەنی زنجیرەیەک لە پلە و پێگەکان بوو و هەموو ئەندامان لە تەمەنی خوارەوە لە پرۆسەی بەرهەمهێنانـدا بـەشـداریان دەکرد. چونکە چالاکی ئەندامانی خێزان پێویستی بە راهێنان لـە شـوێنێکی تایبەتدا نەبوو، تەنیا شێوازی فێرکردنی ئەندامان، لـە رێـی روانـین و سـەیـر کـردن و سـەرپـەرشـتی گـەورە سـالانەوە بـوو. خێـزانی فـراوان بـە هـۆی

چالاکییەکانی خۆیەوە دەیتوانی پێداویستییەکان خۆی دابین بکات، هەرچەن لەقۆناغێکی سەدەکانی ناوەڕاستدا لە گەڵ بەرهەمهێنانی پێشکەوتوو ڕووبەڕوو دەبین، بەلام هێشتا لە م قۆناغەشدا پێداویستیە گرینگەکان، وەکوو خۆراک و پۆشەن، لە نێو خودی خێزاندا دێنە بەرهەم. بۆ ئەم ناوەندە بەرهەمهێنەرە ئابوورییانە، هێزی کار هەم بۆ بەرهەمهێنان بۆ نیازی خێزان یا بۆ فرۆتن لە بازاڕدا بە چەمکێکی گرینک دەزانرا. بەم بۆنەوە کەسانێک کە لە بەرهەمهێنانی خانوویدا بەشداریان بوو، بە بەشێک لە خێزان دەهاتنە ئەژمار (اعزازی؛ ١٣٨٨).

بابی خێزان خاوەنی دارایی و سامانی خێزان بوو و لە ڕێی میراتەوە مندالانیتر دەبوونە خاوەن سامان. هەندێ جار زەوییە میراتییەکان دابەش نەدەکران. ئەم خاوەنێتییە دەسەلاتێکی زۆری بە باوک دەبەخشا. دەسەلاتی باوک و ژیان بە هۆی داراییەکانی خێزانەوە، هۆی مانەوەی ئەندامانی خێزان لە دەوری یەک بوو. باوک بە گوێرەی دەسەلاتی بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا، بەردەوامی ژیانی خێزانی مسۆگەر دەکرد. خاوەنێتی باوک بە سەر سامان و داراییەکاندا، چەکێکی کاریگەر بوو بۆ گوێڕایەڵ کردنی مندالان لە بەرانبەر باوکیانەوە. هەڕەشەی مندالان بە دەرکردن و بێبەری کردن لە میرات، بنەمالەی دەخستە بەر گوشار و ئاستەنگێکی پڕمەترسییەوە. چونکە لە لایەکەوە بوونی ئەندامانی خێزان وەکوو هێزی بەرهەمهێنان پێویست بوو، هەم دیتنەوەی کار لە شوێنێک بێجگە لە نێو خێزاندا زۆر دەگمەن بوو. بەم بۆنەوە بەرهەمهێنانی خێزانی و هەروەها هەلومەرجی بەرهەمهێنانی کۆمەلایەتی، نیازی بە یەکگرتوویەکی زۆر هەبوو (هەمان سەرچاوە).

هاوسەر گرتن زۆربەی جار لە لایەن دایک و باوکە بە سالاچووە شارەزاکانەوە ڕێک دەخرا و حەزو ئارەزووەکانی کوڕ و کچ زۆر جێگەی

گرینگی و بایەخ پێدان نەبوون (موحسنی؛ ۲۰۰٦). تەمەنی هاوسەرگری زۆرتر لە ئەمڕۆ بوو. کوڕ دەبوایە توانی دابین کردنی ژیانی هاوسەرەکەی بێ، پاشان ژن بێنێ، کەچی گەیشتن بەم رادەیە تەنیا پاش بیست و پێنج ساڵ ژیان بۆیان دەلوا. رەنگە گرینگترین هۆی دێر ژنهێنانی کوڕان، کەمایەسی ئابووری بووبێ. هەروەها سەرەکیترین مەبەست لە هاوسەرگری، بەپێچەوانەی ئەمڕۆکە، بۆ منداڵدار بوون و بەرهەمهێنانی هێزی ئابووری و بەهێز کردنی هێزی خێزان بووە. هەروەها چونکە کوڕ وەکوو هێزی سەربازی و هێزی بەرهەمهێنان و فراوانتر کردنی خێزان دەوری دەگێڕا، لە چاو کچدا بەهایەکی زۆرتری پێدەدرا (اعزازی؛ ۱۳۸۸).

### خێزانی فراوانی نوێ / new extended family

لەم یەک دوو دەیەی دواییەدا خێزانە فراوانەکان (بڕوانە : **خێزانی فراوان**) و ئەو خێزانانەی کە ئەندامانی چەن بەرەی جۆراوجۆر پێکڕا دەژین، خەریکی گەشە سەندن بووە. زۆربوونەوەی گوژمەی ژیان، بە تایبەت لە ناوچە شارستانییەکاندا هاوکات لە گەڵ زۆرنەبوون یاخۆ تەنانەت دابەزینی ئاستی داهاتەکان، بۆتە هۆی ئەوەی کە لاوان نەتوانن بە ئاسانی خێزانێکی نوێ پێک بێنن. زۆرێک لە گەنجان پاش دوایی هێنان بە خوێدنی بالا، یاخۆ پاش جیابوونەوە لە هاوسەریان، دەگەڕێنەوە بۆ نێو خانووی دایک و باوکیان و لە گەڵ ئەواندا دەژین. بە گوێرەی ئاماری ساڵی ۱۹۹۲، سێ چوارەمی ژنان و پیاوانێ کە لێکتر جیابوونەتەوە، لە گەڵ دایک و باوک و خزمەکانیان دەژین (*U. S. Bureau of Census; 1992*- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ۱۳۸۴). کۆمەڵناسان بەم خێزانانە دەڵێن خێزانی فراوانی نوێ.

### خێزانی ناوکی / nuclear family

## خێزانی ناوکی

خێزانی ناوکی ئەم سەردەمە، ڕەنگە لە خێزانی بورژوازی سەدەکانی هەژدە و نۆزدەوە سەرچاوەی گرتبێ. هاوکات لە گەڵ تەکامولی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، لە ئەورووپادا جۆرێکی تایبەت لە خێزان هاتەدی کە بە ناوی خێزانی بورژوازی دەناسرا. هەرچەند ژمارەی ئەم خێزانانە کەم بوو، بەڵام بە هۆی جۆراوجۆرەوە وەکوو شێوازێکی شیاو لە لایەن هەموو کۆمەڵگاوە پەسند کراو دانی پێدا نرا.

خێزانی بورژوازی بریتی بوو لە بەشێک لە خێزانەکانی سەرەتای بە پیشەسازی بوون کە ژیانی خۆیان بە هۆی هەندێ داهاتی نەگۆڕی وەکوو کرێ و بەهرەی سەرمایەوە دابین دەکرد. لەم خێزانانەدا ژیان و کار بە تەواوی لێکتر جیاواز بوون، بەڵام بە پێچەوانەی خێزانی کرێکاری، خێزانی بورژوازی لە باری ئابووریەوە کۆک و پۆشتە بوون. واتە: لەم خێزانانەدا هەرچەند پیاو نانهێنەری ماڵ بوو، بەڵام وەکوو سەرپەرشتی خێزانی کرێکاری ناچار نەبوو کاتێکی زۆر بۆ کار کردن تەرخان بکات و کەمتر لە گەڵ خێزانیدا رابوێرێ. لە خێزانی بورژوازیدا بە بۆنەی جیابوونی شوێنی کار و ژیان، بۆ یەکەم جار ژن و منداڵ لە کێشەکانی کار و ژیانی ئابووری بە دوور بوون و شوێنێکی ئاسوودە و هێمنیان بۆ ژیان تاقی کردەوە. خانوو بووە شوێنێکیتایبەت کە تێیدا دۆستایەتی و خۆشەویستی و هەستە تاکەکەسییەکان بایەخ و گرینگییەکانی ئەوتۆیان پێ درا (اعزازی؛ ١٣٨٨).

بە پەسند کردنی ئەم شێوازی ژیانە لە لایەن زۆربەی خەڵکی شارەکانەوە، بە تایبەت لە ئەمریکای پاش شەڕی جیهانی دووەم، پەرەی زۆری پێدرا و باوک وەکوو نانهێنەری خێزان لە دەرەوەی ماڵ لە بەیانیوە تاکوو ئێوارە خەریکی کار دەبوو و ئێوارەش دەگەڕایەوە بۆ نێو خێزانی و کاتێکی زۆری لە گەڵ خێزانیدا بە سەر دەبرد. دایک خۆی بە بەرپرس دەزانی کە ژیانێکی هێمن و ئاسوودە بۆ مێرد و مندالانی پێک بێنێ. بەڵام پاش سەرهەڵدانی

فیمینیزم، ئەم رەوتە تووشی کۆسپ و تەگەرە هات و رەخنەی زۆری لێ‌گیرا و لە ئەنجامدا ژنیش وەکوو پیاو لە دەرەوەکاری دەکرد و پێکەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵ و کاری ماڵیشیان پێکەوە جێبەجێ دەکرد (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

بە گشتی ئەم شێوازە لە زۆربەی وڵاتان و شارەگەورەکانی دونیادا باوە و لایەنگری زۆری لێ‌دەکرێ و بە شێوازێکی پەسندکراو دەزاندرێ.

## خێزانی یەکسانخواز / equalitarian family

ئەم زاراوە باس لەو خێزانانەی دەکا کە هەموو ئەندامانیان ماف و بەشی یەکسانیان هەیە و کەس سەرتر و رەواتر لە کەس نییە. لەم خێزانەدا باوک هەمان شوێنگەی دایک و منداڵەکانی هەیە؛ کوڕ هەمان پێگەی کچی هەیە و کارەکانی خێزان بە هاوبیری و راوێژی ئەندامانەوە جێبەجێ دەکرێ. دەتوانین بڵێین کە زۆربەی خێزانەکان لە وڵاتانی پیشەسازی و پیشکەوتوودا خێزانی یەکسانی‌خواز یان خێزانی دیمۆکراتیکن.

## دابەشکردنی کار/ division of labor

بەڕای دوورکایم، یاسای دابەش‌کردنی کار مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەلام تەنیا لە سەدەی هەژدەبەم لاوە بوو کە کۆمەڵگاکان هانیان دا ئەم یاسایە باشتر بناسن؛ یاسایەک کە هەر لە مێژەوەبەسەریاندا زاڵ بوو و کەچی ئەمان ئاگایان لێ نەبوو. بێ‌گومان هەر لە کۆنەوە هەندێ لە زانایان بایەخی ئەم یاسایەیان زانیوە. بەلام ئادام سمیت یەکەم کەسێک بوو کە هانی دا بیردۆزی دابەش‌کردنی‌کار دابڕێژێ. هەر ئەو ئەم زاراوەیەشی داهێنا و دواتر ژینەوەرناسان ئەم زاروەیان لە زانستە کۆمەلایەتییەکان بە ئەمانەت گرت (دورکایم؛ ١٣٨٤).

بەبڕوای دوورکایم، دابەش‌کردنی کار باس لەوە دەکات کە کارەکان بە گوێرەی لێهاتوویی و شارەزایی تاکەکانەوە دابەش دەکرێن و هەر تاکێک ئەرکێکی پێ‌دەسپێردرێ تا نیازەکانی نێو کۆمەڵگا دابین بکات. هەرچەند جەماوەری کۆمەڵگایەک زۆرتر بێ، ئەو کۆمەڵگا میکانیزەترە و بەم بۆنەوە دابەش‌کردنی کار تێیدا ئاڵۆزترە. دابەش‌کردنی کار، ئامرازێکی هزرییە کە کۆمەڵناسان بۆ لێکدانەوە و راڤەی کۆمەلایەتی بەهەرەی لێ وەردەگرن. گریمانەی کۆمەڵناسان ئەوەیە کە دابەش‌کردنی کار لە هەموو جڤاکێکدا هەیە. لەو جڤاکانەی کە هێشتا نەبوونەتە پیشەسازی و زۆربەی خەڵکەکەی نەخوێندەوارن، تەمەن و رەگەزی تاکەکان (ژن یان مێرد بوون) لە دابەش‌کردنی کاردا دەوری سەرەکی دەگێڕێ. لە کۆمەڵگا پیشەسازی و پیشکەوتووەکاندا، دابەش‌کردنی کار شێوازێکی ئاڵۆز دەگرێتە خۆ. بەبڕوای دوورکایم لە کۆمەڵگا پێش‌پیشەسازییەکاندا سوننەت و نەریت وەکوو چیمەنتۆیەکە کە ئەندامانی کۆمەڵگا پێکڕا دەبەستێتەوە. لە راستیدا شتێک کە دوورکایم پێی دەگوت «ویژدانی بەکۆمەڵ»، بە رادەیەک بەهێزە کە ئیزن نادا خەڵکی بە ئاوەژووی یاسا و پێوەرە کۆمەلایەتییەکان -کە هەموو

ئەندامان دانی پێدا دەنێن- ببزووونەوە. دوورکایم بەم چەشنە یەکگرتوویییە کە لە سەر «ویژدانی گشتی» دامەزراوە، دەیگوت یەکگرتوویی میکانیکی.

مارکس دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی بە «سەرجەمی شێوازە نایەکسانەکانی کاری بەقازانج، کە لە بواری نەزم، جۆر و چەشنەوە لێک جیاوازن» (سەرمایە، بەرگی ۱) پێناسە دەکا.پاشان دەلێ کە دابەشکردنی کار بەم چەشنە، مەرجی پێویستە بۆ بەرهەمهێنانی کالایەک، چونکە بەبێ ئەو کارانەی کە پێوەندیان پێکەوە هەیە و لێکجیاوازن، هیچ کالایەک نایەتە بەرهەم کە لە بازاڕدا ئاڵوگۆڕ بکرێ. بەلام بەرهەمهێنانی کالا، مەرج نییە بۆ بوونی دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی؛ کۆمەلگا سەرەتاییەکان هەرچەند بەرهەمەکانیان نەدەبوونە کالا، کەچی خاوەنی دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی بوون. بەم بۆنەوە دەبێ ئاماژە بە دوو جۆر دابەشکردنی کار کە زۆرر لێک جیاوازن، بکرێ: یەکەم، دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتییە کە بریتیە لە سیستەمێکی ئالۆز لە هەموو شێوازە بەکەلک و جۆراوجۆرەکانی کار کە دەبێ سەربەخۆ لە یەکتر بە دەستی بەرهەمهێنەرانی تایبەت بە ئەنجام بگات؛ واتە: دابەشکردنی کار لە مامەلە لە نێوان سەرمایەدارە جیاو تاک و سەربەخۆ و رەقیبەکاندا (لە سەرمایەداریدا). دووەم، دابەشکردنی کار لە نێوان کرێکاراندا، کە هەر یەکەیان کارێکی جیاوازیان هەیە و هەموو کارەکانیشیان پێکرا ئەنجام دەدەن. ئەوەی دێتە بەرهەم، پرۆسەی کۆمەلایەتی کاری بە کۆمەلە. ئەم دابەشکردنی کار لە بەرهەمهێنانە، وا لە نێوان سەرمایە و کاردا لە نێو پرۆسەی بەرهەمهێناندا و هەرچەند لە گەڵ دابەشکردنی کار لە مامەلەدا پێوەندی هەیە، بەلام ئاخێزگە و رەوتی گەشەسەندن و تەکامولیان زۆر لێک جیاوازن (باتامور، کیرنن، میلیبند؛ ۱۳۸۸).

دابەشکردنی کار، نە وەکوو داتایەکی سروشتی، بەلکوو وەکوو

زانیارییەکی ئەقلانی و ڕێکخراو و زانستی، لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای مرۆییە، بەڵام هەندێ زۆر و مەترسی بە سەر ئەم جڤاکانەدا دادەسەپێنێ کە بە گشتی ناتوانین بڵێین گرانتر لەو زۆر و جەبرانەیە کە بەهۆی نەبوونی دابەش‌کردنی کار و پیشەیی بوونی کارەکانەوە تووش دێن. ئەم ئاواتەی کە هەرکەس بتوانێ هەر کارێک لە هەر کاتدا کە پێی خۆش بوو ئەنجامی بدات، بە ڕاشکاوی ئاواتێکی یۆتۆپیاییە؛ چونکە هەم گوژمە و هەم ئەو کاتەی کە بۆ فێربوون تەرخان دەکرێ، سەرنجی پێ نەدراوە و هەمیش گوێ بەوە نەدراوە کە ئەم بازدانە لە کارێکەوە بۆ کارێکی‌تر، گوژمەی زۆر دەبات. پارسۆنز ئەم باسەی بە «سڕینەوەی جیاوازی» (de-differentiation) ناو لێدەبرد و دەکرێ ئەم بارودۆخە بە بازدان لە خەیاڵدا شرۆڤە بکرێ.

گەر بمانەوێ دابەش‌کردنی کار لە قۆناغی هەنووکەیی (بە واتای دوورکایم لە قۆناغی ئۆرگانیکیدا) و لە بەشی چالاکییە تەکنیکی-ئابوورییەکاندا بخەینە بەر وردبوونەوە، دەبینین کە دابەش‌کردنی کار، دوو جۆرە جەبری کۆمەڵایەتی بە سەر ئەو ئەندامانەی کە کاری تێدا دەکەن، دادەسەپێنێ: یەکەم لە نێوان کارگێڕانی پرۆسەی بەرهەمهێناندا زنجیرەپێگەیەکی بنەمایی بەدی دێنێ؛ دووەم کارگێڕان لە «کەسانی‌تر» جیا دەکاتەوە. ناوەرۆکی ئەم جیاوازییە زۆر وردبینانە نییە. ئایا مەبەست ئەوەیە کە بەرهەمهێنەرانی ڕاستەقینە، هەمان کارگێڕان یا کریکارانی دەستین؟ ئایا ناتوانین بڵێین کەسانی‌تر-واتە ئەوانەی کە گەلالەدادەڕێژن، ئەوانەی کە بڕیارەکان دەدەن یان ئەوانەی کە چاودێری بە سەر پرۆسەی بەرهەمهێناندا دەکەن- بەرهەمهێنەری ڕاستەقینەن؟ هەروەها، کارگێڕان بە گوێرەی پێناسەکان، ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە خۆیان گەلالەیان بۆ دانەڕشتووە و لە زۆربەی کاتەکاندا تەنانەت خۆیان هەڵیان‌نەبژاردووە. کەواتە چالاکییەکانی بەرهەمهێنان، پێویستیان بە هاوڕایی و هاودەنگی شارەزایانی

تەکنیکی، ئیداری و بازرگانی هەیە. بەڕێوەبردنی بنکەکان، تەنانەت گەر ناویشیان «کۆمەڵەی سەربەخۆ» بێ و لە چاودێری خاوەنان و بازاڕ و دەوڵەت دەرباز بن، دیسان پێویستیان بە شارەزایی تەکنیکی، قازانج و ئەنگیزە هەیە و هیچ شتێک ناتوانێ دەستەبەر بێ کە ئەندامانێ کە بە پێگەی کۆمەلایەتی یەکسانەوە دابەش کراون، بە ئاسانی بتوانن بگەن بە یەکدەنگی.

تێگەیشتن لە جیاوازی نێوان «کارگێڕان» و «کەسانی‌تر» (مەبەست گەلالەداڕێژان، ئەندازیاران، چاودێران و بەڕێوەبەرانە) بەرەبەرە دژوارتر دەبێ؛ چونکە کەسانی‌تر نە وەکوو چاودێران، بە سەختگیر دەناسرێن و نەوەکوو چاودێرانی بەزاکوون هەڵس‌وکەوت دەکەن، بەڵکوو زۆرتر دەوری کارناسان، راوێژکاران یاخۆ دەوری ناوبژیکەر لە نێوان لایەنەکانی پرۆسەی بەرهەمهێنان دەگێڕن. دوورکایم قبووڵ کردنی نۆرم و رێساکان لە پێوەندییە کارییەکاندا، بە رێگە چارەیەکی سست و لاواز دەزانێ، بەلام لە ئەنجامدا لە بەرانبەر ئاژاوەی دابەش‌کردنی کارەوە بە کاریگەر و چارەساز ناوی لێ‌دەبات (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

## property / دارایی

دارایی لە گشتی‌ترین واتایدا ئاماژە دەکات بە خاوەنێتی یان ئەو شتانەی کە بە سامانی کەسێک دەزانرێن. ئەم واتایە نوێیە کە هاوکات لە گەڵ داهاتنی دامەزراوەکانی خاوەنێتی تایبەتدا داهاتووە. وشەی «دارایی» سەرەتا تەنیا لە سەدەی شازدەهەمدا کەڵکی لێ‌دەگیرا و وشەی دارایی بە مانای ئەنگلیزییەکەی لە سەدەی هەژدە بە دواوە بەکار براوە.

لە کۆمەڵناسیدا ئەم زاراوە باس لە پانتایەکی بەربلاو لە تایبەتمەندیگەلێک دەکات کە بە گوێرەی ئەم هۆکارانەی خوارەوە گۆڕانی بە سەردا دێ: ١) چۆنییەتی و رادەی مافی دارایی، ٢) تەوەر و چەمکەکانی

دارایی، ٣) بیچمەکانی دارایی.

١- مافەکانی دارایی بریتین لە: ئەو سەربەستیانەی کە بۆ شێوازی خەرج کردن و بڕیار دان سەبارەت بە سامان هەیە؛ وەکوو سپاردنیان بە کەسیتر لە ڕێی دیاری، فرۆتن، وێران کردن، یا بە میرات بەجێهێشتنی سامانی وەکوو ئاژەڵە کەوییەکان، باخ، زەوی، ئاو، یاخۆ داراییە نامادییەکان وەکوو: کرێ، مافی چاپکردنەوە و شتی لەم چەشنە.

٢- چەمک و بابەتی دارایی بە گوێرەی چەندوچوونی کۆمەڵگاکان جیاوازە:

ئا) لە نێوان هۆزە سەرەتاییەکاندا جۆرێک خێوەتی لێڵ لە مافە هاوبەشەکانی تاک، خێزان و کۆمەڵگا بە سەر زەویندا هەیە.

ب) لە جڤاکە دەرەبەگەکاندا واتاگەلی ئاغایانە و رامیاری لە گەڵ یەکدا تێکەڵاون: «دارایی بەجێی خاوەنێتی، ئاغایی، دەسەڵاتداریێتی و ... دادەنرێ. بەم بۆنەوە هەم بریتیە لە مافەکانی مالکانە و هەمیش زۆرێک دەسەڵاتی رامیاریتر».

پ) بە مەبەستی خوێندنەوەی بەراوردی دامەزراوەی دارایی، م.گینزبێرگ پێناسەیەکی گشتگیر ئاراستە دەکات: «دارایی وەکوو دامەزراوەیێک بریتیە لە کۆمەڵەیەک ماف و بەڵێنی کە پێوەندی نێوان تاک یان گرووپەکان لە بواری چاودێریان بە سەر شتمەکە مادديەکان (یا نامادی وەکوو مرۆڤ) دیاری دەکات». پێوەندی دارایی لە نێوان «بابەتە کۆمەڵناسانەکانی کردەی ئابووری» ڤیبێردا، وەکوو شێوازەکانی خاوەنێتی ماف سەبارەت بەو سەرچاوانەی کە لە قازانجی ئابووری بەهرە دەبەن، خۆی دەنوێنێ.

٣- چۆنییەتی ئەو بوونەوەرەی کە مافەکانی دارایی پێ دەدرێ، جۆرەکانی دارایی یا سیستەمەکانی خاوەنێتی لێکتر جیا دەکاتەوە؛ وەکوو: تاکی یان تایبەت، گشتی یا شەریکەیی و خاوەنێتی گشتی (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## دام و دەستوور/ mores

ویلیام گراهام سامنێر کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەمریکی، بڕوای وایە کە بۆ بەردەوامی *ژیانی کۆمەڵگا*، هەندێ *لە* پێودان و نۆرمەکان *لە ئاست* پێودانەکانی‌تر گرینگترن (*Sumner, W. G, 1959-orig. 1906*). سامنێر بۆ سەلماندنی بیردۆزەکەی خۆی، لە واتای دامودەستوور کەڵک وەردەگرێ. ئاماژەی ئەم واتایە بە پێوەرگەلێکی شیاو و گونجاوە کە چۆنییەتی هەڵس‌وکەوتی ئەندامانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن. مەبەستی سامنێر ئەو پێودان و نۆرمانەن کە بۆ درێژەدان بە ژیانی کۆمەڵایەتی پێویستن. ئەم دامودەستوورانە بۆ کۆمەڵگا زۆر پێویستن و دەسدرێژی یاخۆ لادان لێیان لە گەڵ بەرەنگاری و ناڕەزایەتی خەڵکی ڕووبەڕوو دەبێ. سامنێر دەڵێ بە بۆنەی گرینگی ئەم نۆرمانەوە، خەڵکی یەکگرتوویەکی تایبەتیان لەم بابەتانەدا هەیە تا باشتر بەرگرییان لێ بکرێ. هەروەها ئەم دامودەستوورانە لەو پێودانانەن کە هەموو کەس لە هەموو شوێن و ساتێکدا دەگرنەوە. بڕینی سنووری ئەم دامودەستوورانە لە گەڵ بەرەنگاری توندو تیژی خەڵک ڕووبەڕوو دەبێ؛ وەکوو پێوەندی سێکسی نێوان گەورەسالان و منداڵان، دەخرێتە ڕیزی **لادانی کۆمەڵایەتی** و هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بەرگری لێ دەکەن.

## دانستەی کولتووری/ culture trait

دانستەی کولتووری دەکرێ وەکوو بچووکترین یەکەی کولتووری بزانرێ کە بۆ ناسین بەکار دێت. دانستەی کولتووری هاوڕێ لە گەڵ کۆمەڵەی کولتووری، بیچمی کولتووری، میتۆدی کولتووری و ناوچەی کولتووری چەن‌واتایەک بوون کە لە دەیەکانی ١٩٢٠دا، ڤیسلەرو کەسانی‌تر لە لێکدانەوەی مێژوویی داتا کولتوورییەکاندا چێژیان لێ‌وەرگرت. واتای «دانستە» بۆتە هۆی ئەوەی کە بکرێ سیاییەک لە توخمە کولتوورییەکان

ئامادە بکرێن، هەروەها ئـەو هـەلـەی رەخسـاندووە کـە ئـەرکـی دامـەزراوە گەورەکانیش راڤە بکرێن (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## داوی دیمۆگرافیک / demographic trap

دیمۆگرافان ئەم زاراوەیە بۆ پیشاندانی هەلومەرجێک بـەکاردەبـەن کـە زۆربوونی جەماوەر دەبێتە هـۆی لـەنـاو چـوونی وزە و ورە ژینگـەییـەکـانی کۆمەلگا. کەمبوونەوەی رادەی مردنی مندالانی نۆرەس و چاودێری نەکـردن بە سەر منالدار بوون لە هەندێ لە ولاتانی جیهانی سێیەمدا -کە خـەریکـی گەشە سەندنن- بۆتە هۆی زۆربوونی خێرای دانیشتوانی ئەم ولاتانە. هەندێ لە دیمۆگرافیستەکان رایان وایە کە ئەم پرۆسەیە رەنگە ببێتە هۆی تووشـیار بوونی ئەم ولاتانە لە نێو داوی دیمۆگرافیک. واتـای ئـەم زاراوەیـەش بریتیـە لـەوەی کـە زەخـت و گوشـاری دانیشـتوانی ئـەم ولاتانـە دەولـەت بـەرەو لەناوبردنی جەنگل و لێـرەوارەکـان پـال پێـوە دەنـێ تـا بتـوانن زەویوزاری کشتوکال دابین بکەن. بەهرەوەرگرتنی نائاسایی و لە رادەبەدەر لـە زەوی و زارەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەرەبەرە زەوییەکان بایر و بێکەلک کەون و سەرچاوەکانی ژینگە بەرەو فەوتان برۆن. کاستاریکا و نێپال لەو ولاتانەن کـە تووشی داوی دیمۆگرافیک هـاتوون (*Durning, A. B; 1990*- وەرگـیراو لـە: عضدانلو). هەرچەند هێشتا سەبارەت بە ئێران لێکۆلینەوەیەکی ورد و تەکـووز جێبەجێ نەکراوە، بەلام بەلگەکان وامان پێ پیشان دەدەن کە ئێـرانیش لـە سەرەتای تووش هاتن بەم داوەدایە.

## داهێنانی سەربەخۆی هاوکات
## simultaneous-independent invention

بە بڕوای وایت لێزلی، کاتێ بنەمای کولتووری ئامـادەی داهێنانێـک بـوو،

خەڵک بیانەوێ یان نە، ئەو داهێنانە دێتە دی. بۆ سەلماندنی ئەم بیردۆزەی خۆی لە زاراوەی داهێنانی سەربەخۆی هاوکات چێژی وەرگرتووە. مەبەست لەم زاراوەیە هەلومەرجێکە کە تێیدا دوو یان سێ داهێنانی هاوجۆر لە بازنەیەکی کاتی نزیک بە یەکدا (هەندێ جار بە مەودای چەن رۆژ یاخۆ چەن مانگ) دێنە دی. لە کتێبەکەی خۆیدا کە لە ژێر ناوی: *زانستی کولتوور: خوێندنەوەیەکی مرۆڤ و شارستانییەت*، بە ١٤٨ داهێنان ئاماژەی کردووە کە بیردۆزەکەی ئەو دەسەلمێنن. برێ لەم داهێنانانە بریتین لە: تلێگراف، ماتۆری کارەبا، مایکرۆفۆن، تەلەفۆن، مایکرۆسکۆپ، گەمیەی هەلم و فڕۆکە. بە بڕوای لێزلی بنەمای کولتووری ئەم جڤاکانەی کە ئەم داهێنانەیان تێدا هاتۆتەدی، ئامادەی ئاوەها رووداوێک بووە. بە واتایەکی تر داهێنانێک وەکوو گلۆپ و فڕۆکە، تەنانەت گەر ئەدیسۆن و برایانی وایتیش نەهاتایەتنە دونیاوە، دەهاتنە دی. وایت حاشا لە لێهاتوویی داهێنەران ناکا، بەلام بڕوای وایە کە دەبێ ئەم کەسانە لە کات و شوێنێکدا لەدایک ببن کە هەلومەرجی پێویست بۆ بەدیهاتنی ئەم داهێنانەی تێدا بێ. بە واتایەکی تر، ئەم کەسانە دەبێ لە نێو کۆمەڵگایەکدا بێنە دونیاوە و گەشە بکەن و پێ بگەن کە بنەمای کولتووری ئەو کۆمەڵگایە ئامادەی هاتنە دی ئەو داهێنانە بێ(*White, L. A;1949*).

## dysfunction /دژەئەرک

رابێرت مێرتۆن بێجگە ئەو سەرنجەی کە بە ئەرکی ئاشکرا و پیوار دابووی، زاراوەیەکی تر دێنێتە کایەوە بەناوی دژەئەرک. هەر بەو جۆرەی کە تاکەکان، گرووپەکان و رێکخراوەکان ئەرکی لێک جیاوازیان لە ئەستۆیە، رەنگە هەریەک لەمانە ئاژاوەیەک لەنێو سیستەمدا بێنێتەدی. بەم بۆنەوە، دژەئەرک، ئەرکێکی نەگونجاوە کە دەبێتە هۆی بشێونە لە نێو سیستەمدا.

بەڕای مێرتۆن، دەرەنجامی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان هەموو جار پازیتیف نییە، بەڵکوو هەندێ جار دەسکەوتی نەگونجاو و نەشیاویان هەیە. هەروەها هەر بەو جۆرەی کە ئەرکەکان بە ئاشکرا و پیوار دابەش دەکرێن، دژە ئەرکەکانیش بە دژە ئەرکی ئاشکرا و پیوار دابەش دەکرێن (مرتون؛ ١٩٦٨).

### دژه کولتوور/ counterculture

ئەم زاروەیە ئاماژە بەو وردە کولتوورانەی دەکات کە بە راشکاوی لە گەڵ نۆرم و بەهاکانی کولتووری پەسندکراودا ناکۆکی و دژایەتی دەکەن و خوازیاری لەناوچوون و جێگری ئەو کولتوورەن. لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەندێ گرووپی کەمینە هەن کە تایبەتمەندییەکانیان بە پێچەوانەی رەوتی گشتی کۆمەڵگایە. هەر ئەم جیاوازییە لە کولتووردا دەبێتە هۆی دابڕانی ئەم وردە کولتوورانە لە گەڵ بەشەکانی‌تری کۆمەڵگا (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

لە سەرەتادا کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان و ئەو کۆمەڵناسەی کە لە گەڵ قوتابخانەی پزیشکی دەروونی لە بریتانیادا ناکۆک بوون (لە سالانی ١٩٦٠) ئەم زاراوەیان بە مەبەستی روونکردنەوەی خۆپیشاندانە گشتییەکانی چەند گرووپێک لە خەڵکی و بە تایبەت رۆشنبیران لە ولاتانی پێشکەوتووی پیشەسازیدا هێنایە ئاراوە. دۆزی ئەم گرووپانە بەرپاکردنی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بوو بە مەبەستی گۆڕانی خێراو گشتی کۆمەڵەی کولتووری زاڵ بە سەر ولاتە پێشکەوتووەکاندا. لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا بابەتی وەکوو بزاڤە دژە ئاکادیمییەکان، سینەما نهێنییەکان، گرووپانی لایەنگری لە ئازادی سێکسی و ... هەموویان لە دیاردەی دژەکولتوورن (موحسنی؛ ٢٠٠٦).

### دووپاته کردنەوە / replication

هەندێ لە تۆژەران بۆ ورد بوونەوەو لێکدانەوەی ئاکامی توێژینەوەکانیان و

هەروەها بۆ ئەمەی کە بزانن ئاکامی لێکۆڵینەوەکەیان لە کۆمەڵگایەکی گەورەتریشدا هەمان کاریگەری هەیە یان نە، توێژینەوە و تاقی کردنەوەکانی خۆیان دووپاتە دەکەنەوە. کەواتە، دووپاتە کردنەوە، بریتییە لە توێژینەوەیەکی دووبارە لە گەڵ گرووپێکی هاوچەشندا و لە کات و شوێنێکی جیاوازدا (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## دووجەمسەری بوونی جنسییەت/ gender polarization

ساندراڵ بێم لە ناملیکەیەکی خۆیدا بەم چەشنە دوو جەمسەری بوونی جنسییەت پێناسە دەکات: دووجەمسەری بوونی جنسییەت بریتییە لە رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە پێناوی جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاودا (*Bem, S. L; 1993*- وەرگیراو لە: عضدانلو). بە واتایەکی تر، جنسیەتی تاکەکان لە گەڵ هەموو شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییاندا (وەکوو: شێوازی جلوبەرگ لە بەر کردن، دەورە کۆمەڵایەتییەکان و داخوازە جنسییەکان) پێوەندی هەیە. بۆ پیشان دانی ئەمەی کە چلۆن شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە پێناوی ئاوەها جیاوازییەکدا رێکخراوە، ئالیس بامگارتنێر پاپاجۆرجیۆ لە ساڵی ۱۹۸۲دا دەستی بە توێژینەوەیەکی مەیدانی لە نێوان تاقمێک لە قوتابخانەکاندا. ئالیس لە قوتابیەکانی دەپرسی کە گەر لە بیچمی رەگەزی بەرانبەردا بهاتایەتنە دونیاوە، ژیانیان چ جیاوازییەکی بوو؟ وەڵامی قوتابیەکان پیشاندەری فامی کولتووری بەدەرروونی کراوی بۆچوونەکان سەبارەت بە چۆنییەتی هەڵس‌وکەوتی هەر رەگەزێک بوو. کوڕەکان بە گشتی باوەڕیان وابوو کە گەر کچ بایەتن، ژیانیان بە چەشنێکی نیگەتیف تووشی گۆڕان دەهات. بۆچوونی کوڕەکان ئەوەبوو کە چالاکییەکانیان زۆر کەمتر دەبووەوە. هەروەها پێیان وابوو کە گەر کچ بن دەبێ زۆرتر بپەرژێنە سەر خەملاندنی خۆیان و بۆ دیتنەوەی مێرد هەوڵێکی زۆرتر بدەن و گەر

تووشی دەسدرێژی و توندوتیژی بن، کەمتر دەتوانن بەرەنگاری لە خۆیان بکەن. هەندێ لە وڵامەکان بەم چەشنە بوون:

- هاوکات لە گەڵ رۆیشتن بۆ زانکۆ، هانم دەدا کە هاوسەرێک هەڵبژێرم.
- رۆژانە کارێکی زۆرم نەبوو و خەریکی یاری منداڵانە دەبووم.
- خۆمم زۆر جوان دەکرد و تووکی هەموو لەشمم دەتاشی.
- دەبوایە فێربم کە چلۆن رووبەڕووی گەنجانی مەست و دەسدرێژیکەر بمەوە.
- نەمدەتوانی لە گەڵ خۆم چەقۆیەک هەڵبگرم.
- لە کاتی چاک کردنەوەی ترۆمبیلدا نەمدەتوانی یارمەتی بابم بدەم.

بە پێچەوانە، کچەکان رایان وابوو کە گەر کوڕ بایەتن کەمتر تووشی هەڵخڕانی هەستیان دەبوون. چالاکی زۆرتر و سنووی بەرفراوانتریان بوو. پێوەندییەکی زۆرتریان لە گەڵ بابیان بوو و وەکوو کالایەکی جنسی سەیر نەدەکران. هەندێ لە وڵامی کچەکان بەم چەشنە بوو:

- کاتی رووبەڕوون لە گەڵ رووداوەکان پشوودرێژتر بووم.
- بەیانیان دەمتوانی زۆرتر بخەوم و ناچار نەبووم بۆ رۆیشتن بۆ قوتابخانە زوو هەستم تا خۆم جوان کەم.
- پێوەندییەکی نزیکم لە گەڵ بابم بوو، چونکە دەبوومە ئەو کوڕەی ئەو ئاواتی بوو.
- نگەرانی دەسدرێژی نەبووم.
- خەڵکی بایەخیان دەدایە بڕیار و باوەڕەکانم.

دەبێ دانی پێدا بنین کە ئەم بۆچوونە سەبارەت بە پێوەندی ژیانی کۆمەڵایەتی بە رەگەزەوە، بۆ خوێندکارانی زانکۆش هەیە. لەم رووەوە دەگەین بەم دەرەنجامەی کە ئەم جۆرە بۆچوونانە کە لە سەردەمی منداڵییەوە بەدەرروونی دەکرێن، کاریگەرییەکی زۆریان بە سەر ژیانی

کۆمەلایەتیدا (هەلبژاردنی لقی خوێندن، هەلبژاردنی کار، راهێنانی مندال و هتد) دەبێ.

### دووچاوەکی / discrimination

دووچاوەکی یەکێک لەو زاراوانەیە کە پێوەندی لە گەل دەمارگیری هەیە، بەم جیاوازییەوە کە دەمارگیری بۆچوون و روانگەیە، کەچی دووچاوەکی هەلس‌وکەوت و رەفتارە. دووچاوەکی جۆرێک هەلس‌وکەوتی نابەرانبەرە لە گەل گرووپ یان کەسانێک. بناغەی ئەم هەلس‌وکەوتە نابەرانبەرە لە گەل گرووپ و دەستەکان، لە سەر هەندێ تایبەتمەندی **پێ‌سپێردراوی** وەکوو رەنگی پێست، ئایین، نەتەوە، رەگەز یان چینی کۆمەلایەتی دارێژراوە، نەک لە سەر تایبەتمەندیگەلێک وەکوو لێهاتوویی، وزە و توان، یان ئەو کارانەی لە رابردوودا ئەنجامیان داوە. دووچاوەکی هەلس‌وکەوتێکە بۆ نکوولی کردن لە هەل‌ومەرجی یەکسان بۆ کەمینەکانی کۆمەلگا تا نەتوانن لە بەهاکانی نێو کۆمەلگا (وەکوو خوێندن، تەندروستی، سامان و هتد)بە یەکسانی بەهرە وەربگرن. ئەم زاراوە زۆرتر بۆ راڤەی شێوازی هەلس‌وکەوتی زۆرینەی زالی نێو کۆمەلگا لە گەل کەمینەی بێ‌دەسەلاتدا بە کار دەبرێ. بەم بۆنەوە دووچاوەکی بە هەلس‌وکەوتێکی دژبە ئاکار و دژ بە دیمۆکراتیک دەزانرێ.

رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەم چەشنە دووچاوەکی پێناسە کردووە: «دووچاوەکی بریتیە لە هەر چەشنە هەلس‌وکەوتێک کە بنەمای لەسەر سەرتری بە هۆی تایبەتمەندیگەلی سروشتی و کۆمەلایەتییەوە بێ و هیچ پێوەندیەکی بە ئاستی لێهاتوویەکانی تاک، گونجاو بوون یان نەبوون لە باری کۆمەلایەتییەوە نەبێ» ( *United Nation Commision on Human Rights, 1949*).

### دووچاوەکی تاکەکەسی / individual discrimination

بریتیە لەوکردە ئاشکرایانەی کە تاکەکان بە بۆنەی بێبایەخ زانینی ئەندامانی گرووپی کەمینەوە، دژ بە گیان و سامان و هەلە کۆمەلایەتییەکانیان جێبەجێی دەیکەن.

### دۆکیوومێنتەکانی ژیان / documents of life

ئەم واتا ئەو بەلگانە دەگرێتەوە کە تاک لە درێژایی ژیانیدا کۆیان دەکاتەوە یاخۆ دروستیان دەکا (وەکوو نامە، بیرەوەری، وێنە، فیلم و ژیاننامە). شێوازی کۆمەلناسی مێژووی ژیان، پاش بلاو بوونەوەی کتێبێک دەستی پێکرا کە بەر لە شەڕی یەکەم (١٩١١) لە لایەن لەهستانییەکی نیشتەجێی شیکاگۆوە بلاو کرایەوە. ئەم کتێبە بوو بە دنەدەر و هاندەری توماس و یەک لە هاوکارانی تا لە شێوازی مێژووی ژیان بۆ باشتر تێگەیشتن لە پرسە کۆمەلایەتییەکان کەلک وەربگرن. ئەم دوو کەسە پاش هەشت سال توێژینەوە و وردبوونەوە لە سەر ژیانی جووتیارە لەهستانییەکان کە بۆ ئەورووپا و ئەمریکا کۆچیان کردبوو، کتێبێکی زۆر بەناوبانگیان لەم بوارەدا بلاو کردەوە (*Thomas, W. I; & F. znaniecki; 1958*). ئەم کتێبە باس لە لێکهەلوەشانی ژیانی کۆمەلایەتی نێوان جووتیارە کۆچەرە لەهستانییەکان دەکات. هەرچەند زانیارییەکانی ئەم کتێبە بایەخێکی زۆریان بۆ کۆمەلناسان نییە، بەلام شێوازی توێژینەوەی نووسەرەکانی بایەخێکی زۆری هەیە. بە بڕوای زۆربەی کۆمەلناسان، ئەم کتێبە خالێکی زۆر گرینگە لە شێوازی توێژینەوەگەلی کۆمەلناسیدا، چونکە شێوازی توێژینەوەی لە کتێبخانەکاندا هێنایەدەرو بەرەو توێژینەوەی مەیدانی پالی پێوە نا. ئەم کتێبە یەکەمین بەرهەمی ئەزموونی و توێژینەوەییە لە کۆمەلناسی ئەمریکادا کە بە گوێرەی بەلگەدەولەتییەکان، داکیۆمێنتە

ڕێکخراوەییەکان، بەڵگەکانی ژیان و سەرچاوەگەلی‌تر دەستی دا بە لێکدانەوە و شرۆڤەی هۆی لێک‌هەڵوەشانی گرووپێکی کۆمەڵایەتی.

لە نێوان ئەو بەڵگانەی ژیان کە دیتنەوەیان بۆ کۆمەڵناسان زۆر دژوار بوو، ئەو نامانەدیاربوون کە خەڵکی بۆ یەکتریان دەنووسین. کتێبی *جووتیاری لەهستانی لە ئەورووپا و ئەمریکادا* (The polish Peasant in Europe and America)، هەنووکە گرینگترین و ڕەنگە تەنیا کتێبێکیش بێ کە تێیدا زۆرترین کەڵک لەم نامانە وەرگیراوە. نووسەرانی ئەم کتێبە لە توێژینەوەکانیاندا تێگەیشتن کە نامەی زۆر لە نێوان لەهستان و کۆچەرانی لەهستانی لە ئەمریکادا ئاڵوگۆڕ کراوە. بەم بۆنەوە لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی شیکاگۆدا ئاگەداریەکیان دەرکرد کە هەرکەس یەک لەو نامانەمان بۆ بێنێ، بۆ هەر نامە دە تا بیست سێنتی ئەمریکییان پێ دەدرێ. بەم چەشنە توانییان سەتان نامە کۆوەکەن (٧٦٤ نامە). ئەم نامانە لە بەرگی یەکی ئەو کتێبەدا کە بوو بە هەشتسەد لاپەڕە، لە چاپ درا(عضدانلو؛ ١٣٨۴)؛ بڕوانە: **مێژووی ژیان**.

## دونیاگەری / secularization

گەشەی زانستە ئەزموونییەکان و تاقی‌کردنەوەی هەموو ئەو پرسانەی مرۆڤ بە درێژایی هەزاران ساڵ بە چاوی سیحر و ئەفسوونەوە سەیریانی دەکرد، بیری مرۆڤی بەرەو ئەم بۆچوونی ماکس‌شیلێرە پاڵ پێوە نا کە بارودۆخی کۆمەڵگای نوێی بە «سڕینەوەی جادوو و ئەفسوون لە جیهان» (آشتیانی؛ ١٣٨٣) ناو لێ‌دەبرد و مەبەستی ئەمە بوو کە ئیتر مرۆڤ لە نێو جیهانی سیحر و ڕازو نهێنیدا ناژی و هێزە نهێنی و سەرووسروشتییەکان گەمارۆی مرۆڤ و جیهانیان نەداوە.

بەشێکی زۆر لە نووسەران و بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەم، فەوتانی

دینیان لە کۆمەڵگای نوێدا پێش‌بینی کردبوو. تایلۆر، مارکس، فرۆید و فریزێر، پێش‌بینییان کردبوو کە بە داسەپانی زانست بە سەر شێوازی بیرو هزری کۆمەڵگای نوێدا، دین دەفەوتێ و هیچی لێ نامێنێ. ئەو بیرمەندانەش کە بە شێوازێکی ئەرک‌خوازانەتر سەیری دینیان دەکرد، پێش‌بینیان کردبوو کە دین بەم چەشنە سوننەتی و ئاساییە نامێنێ و باوەڕێک جێگای دەگرێتەوە کە لە سەر بنەمای سەرووسروشتی بنیات‌نەنراوە. کۆنت دینێکی نوێی لە سەر بناغەی پێوەرە ئەقلانی و زانستییەکان داهێنا و گوتی: ئەم دینە نوێیە، بۆشایی دینی سوننەتی پڕ دەکاتەوە. دوورکایم لە بەهاکانی شۆڕشی فەرانسەدا سەرچاوەکانی سەرهەڵدانی ئەرکێکی نوێ و هاوسەنگ لە گەڵ دینی دەسنیشان کردبوو.

بەڵام ژمارەیەکی هەرە زۆر لە نووسەران و بیرمەندانی نوێتر، ئەم بۆچوونانەیان ڕەت کردۆتەوە و باوەڕیان ئەوەیە کە دین وەکوو رابردوو بە بەشێکی گرینگ لە کۆمەڵگای نوێ دێتە ئەژمار؛ هەرچەند ڕەنگە هەندێ لە روانگە تایبەتەکانی دین گۆڕانێکی بەرچاویان بە سەردابێ. بۆ وێنە بێلا (١٩٧١) دەڵێت کە واتای دونیاگەری، پاژێک لە بیردۆزی کۆمەڵگای نوێیە کە لە بنەڕەتدا لە کاردانەوەی بزاڤی ڕۆشنبیری لە بەرانبەر سونەتی دینی مەسیحییەوە سەرچاوە دەگرێ؛ هەمان سوننەتێک کە لایەنگرییەکی مەعریفەیی زۆر تۆخی هەیە و باوەڕی بە بۆچوونێکی فەرمی و پەسندکراوە. بە بڕوای بێلا، بیردۆزی دونیاگەری پەرەئەستێن، وەکوو دیرۆکێک کە لە باری دەروونیەوە راڤەیەکی یەکگرتوو لە واقیع دەداتە دەست، تا رادەیەک کەڵکی هەیە. بە بڕوای بێلا، ئەم بیردۆزە بە جێی ئەوەی کە بیردۆزێکی زانستی بێ، لە راستیدا ئامۆژەو تیۆرییەکی ئاینییە. هەروەها دەڵێ: بە سەرنج‌دان بەوەی کە دین ئەرکی کۆمەڵایەتی زۆر گرینگی لە ئەستۆیە، دیسان دەگەڕێتەوە بۆ ناوەندی کاری کولتووریمان. لەم ساڵانەی دواییەدا

بیرمەندانێکی زۆر بەهۆی سەرهەڵدانی بزاڤی ئایینی جۆراوجۆر بە تایبەت بنەماگەری دینیەوە، بەم دەرەنجامە گەیشتوون (کرییپێن، ١٩٨٨؛ داگلاس، ١٩٨٣؛ گێلەنسێر، ١٩٧٧؛ گلاک و بێلا، ١٩٧٦؛ گریلی، ١٩٧٣؛ هادێن، ١٩٨٧؛ لاکمەن، ١٩٦٧ و ١٩٩٠؛ مارتین، ١٩٦٩ و ١٩٩١؛ ستاک و بین‌بریج، ١٩٨٥؛ ڤیتنو، ١٩٧٦). بەڕای ئەم بیرمەندانە هەرچەند کۆمەڵگای نوێ لە سەر ئەقلانییەت و بنەمای زانستی و تیکنۆلۆجیک دانراوە، بەلام دین، تایبەتمەندی بەرز و هێزا و گرینگی خۆی لە دەست نادات (همیلتون؛ ١٣٨٧).

ئەم پرسەی کە ئایا کۆمەڵگای نوێ بە دونیایی بووە یا لە ئاسانەی بەدونیاییبووندایە، بەستراوە بەواتایەک کە لە دین هەمانە. هۆی سەرەکی ناکۆکی نێوان پرسی دونیاگەری، هەمان جیاوازی بیرمەندانە لە سەر پێناسەیەک کە لە دینی دەکەن. ویلسۆن دەڵێت: ئەوانەی کە لە روانگەیەکی ئەرکخوازانەوە سەیری دین دەکەن، کەمتر دان بە دونیاگەریدا دەنێن، کەچی ئەوانەی کە لە رەهەندی زاتییەوە سەیری دەکەن، زۆرتر دەیسەلمێنن. هەندێ کەسی‌تر پێناسەیەکی بەرفراوان و بەربلاو لە دین دەدەنە دەست، بە چەشنێ کە هەموو دەم شتێک هەیە کە ناوی دینی بەسەردا بنرێ. ئەم نووسەرانە دونیاگەری رەت دەکەنەوە. بەلام ئەم بۆچوونەش خۆی کێشەی زۆر دێنێتە کایەوە.

مالکۆم هەمیلتۆن لە کتێبی کۆمەڵناسی دیندا (١٩٩٥) دەڵێ کە: شاینێر سەبارەت بە دونیاگەری توێژینەوەیەکی ئاماری تێر و تەسەلی کردووە. شاینێر بۆ ئەم زاراوەیە ئاماژە بە شەش واتا دەکات کە بریتین لە: یەکەم) پێوەندی بە نەمانی دینەوە هەیە. بەم چەشنەی کە سیمبۆلەکان، تیۆرییەکان و دامەزراوە ئاینییەکانی پێشوو، بەها و بایەخیان لە دەست دەدەن و لە ئاکامدا رێگا بۆ کۆمەڵگای بێ‌دین ئاوەلا دەبێ. دووەم) پێوەندی

بە سازگاری زۆرتر لە گەڵ ئەم دونیایە هەیە. بەم چەشنەی کە سەرنجی مرۆڤەکان لە هۆکارە سەروو سرووشتیەکانەوە جیا دەبێتەوەو بەرەو لای پێداویستییەکانی ژیانی دونیایی و پرسەدونیاییەکان بادەداتەوە. بە گوێرەی ئەم واتایە، رەهەند و داخوازە دینییەکان لە گەڵ رەهەند و داخوازە نادینییەکان ئاوێتە دەبن، بە جۆرێ کە لێکتر جیا ناکرێنەوە. دونیا گەری لە سێیەمین واتادا) واتای جیایی دین و کۆمەڵگایە. لەم واتایەدا دین بەرەو مەڵبەندی تایبەتی خۆی پاشەکشە دەکا و تەنیا تایبەت دەبێ بە ژیانی تاکەکەسی؛ هەروەها تایبەتمەندییەکی دەروونی پێدەدرێ و دەسەڵاتداری بەسەر هەر یەک لە رەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە لە دەرەوەی مەڵبەندی دیندا بن، لە دەست دەدات. واتای چوارم) بە مانای جێنشینی بیچمەدینییەکانە لە جێی باوەڕ و دامەزراوە دینییەکان. لەم واتایەدا زانست، هەڵس‌وکەوت و ئەو پێکهاتانە کە بەدرێژایی مێژوو لە سەر باوەڕی خوداییەوە بنیات نرابوون، دەبن بە دیاردەگەلێکی دەسکردی مرۆڤ کە لە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی مرۆدان. لێرەدا لە گەڵ دینێکی بە مرۆڤی بوون رووبەڕوو دەبین. واتای پێنجم) بە مانای لادانی سەرپۆشی پیرۆزبوونە لە رووی جیهاندا. جیهان، دانستەی پیرۆز بوونی خۆی لە دەست دەدات و مرۆڤ و جیهان پێکڕا دەبنە بابەتی شیکاری هۆ و ئەقڵانی و دەستێوەردانی خودی مرۆڤ. لەم جیهانەدا هێزە سەرووسروشتییەکان هیچ دەورێک ناگێڕن. واتای شەشم) دونیاگەری بە مانای رۆیشتن لە کۆمەڵگای پیرۆزەوە بۆ کۆمەڵگای دونیایی. بەم چەشنەی کە کۆمەڵگا هەموو پاوەنەکانی بەها و بایەخە دینییەکان دەپچڕێنێ و هاوکات لە گەڵ سەلماندنی گۆڕان، سەرجەمی بڕیارەکانی لە سەر بنەمایەکی ئەقڵانی و قازانجخوازانە جێبەجێ دکات. ئاشکرایە کە ئەم واتای دونیاگەرییە، لە هەر واتایەکی تر بەربلاوترە (همیلتون؛ ١٣٨٧).

گەیشتن بەم دەرەنجامە کە ئایا کۆمەڵگا بـەرەو دونیاگـەری و دابـڕان لـە دین دەڕوا پێویستی بە راڤە و وردبوونەوە و تۆژینەوەیەکی زۆر هەیـە. دەبـێ لێمان روون بێتەوە کە ئایا کۆمەڵگاکانی رابردوو بە راستی دیندار بوون یاخۆ نە. بێشک خەڵکی کۆمەڵگا رابردووەکان بە گشتی بەو جۆرەی کـە دەڵـێن خاوەنی باوەڕێکی پتەو و قایم نەبوون. دین لـە راسـتیدا وەکـوو دامـەزراوە و بەهایەکی کۆمەڵایەتی، تایبەت بە بژاردە و هەڵکەوتەکانی کۆمەڵگا بووە؛ بـە واتایەکی روونتر، دین وەکوو دەسەڵاتێکـی کولتـووری و رامیـاری بـە سـەر خەڵکدا زاڵ بووە، نەک ئەوەی کە وەکوو باوەڕێک لە نێو توێژەکانی خەڵـکدا بڕەوی بووبێ. هەروەها جیاوزای زۆر هەیە لە نێوان دونیاگەری لە نێـو دینـە جیاوازەکاندا. بۆ وێنە دونیاگەری لە نێو ولاتانی ئیسلامیدا بەو چەشنەی کـە لە ولاتانی مەسیحیدا بووە، نەهاتۆتەدی. بزاڤی دینی و تەنانەت رادیکـاڵ لـە نێو ولاتانی ئیسلامیدا بە راشکاوی دان بە سەر ئەم پەیڤەدا دەنێن. سەبارەت بە دونیاگەری لە ولاتانی مەسیحیدا دەتوانین بڵـێین کـە ئـەم بۆچوونـە بـە جۆرێک دژایەتی بووە دژ بـە حکوومـەتی کلیسـا و هـەروەهـا دژ بـە یاسـا و پێوەرەکانی مەسیحییەت. لەم بابەتەدا نووسەرانێک وەکوو ویلسـۆن (١٩٨٢) دەڵێن: دونیاگەری هەمان سڕینەوەی مەسـیحییەت (*dechristianisation*) بووە. واتە: رابردووش بە قەدەر ئێستا هەم دونیایی بووە و هـەمـیش دیـنی. پیتێر بێرگێر دەڵێ: جیهانی ئەمـڕۆ پتـر لـە هـەمـوو خـولێکیتـر دینییـە. (*berger, P; 1977*– وەرگیراو لە: عضدانلو).

دەبێ ئەم خاڵەمان لە بەرچاو بێ کە هەرچەنـد مۆدێرنیتـە بـە دوژمـن و لەناو بەری بیچمە سوننەتیەکانی دین دەزانرێن، بەڵام مۆدێرنیتە خۆی بۆتـە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ نیازمـەنـدی، کـە خـۆی تـوانی هێنانـەدی ئـەو نیازانەی نییە (*Davie. G; 1999*). مۆدێرنیتە بەبێ ئەوەی خۆی ئاگادار بـێ، خەریکی ژیاندنەوەی سێ شێوازی جیاوازی دینە: ١– بنەماگەری، ٢– بزاڤـە

دینییە نوێکان و ٣- شێوازە نوێکانی دین، کە دینە شارستانییەکانیش دەخرێنە ریزی ئەوانەوە.

دونیاگەری لە دوو رووبەری دامەزراوەیی و تاکەکەسیدا خۆی دەنوێنێ. لە رووبەری دامەزراوەییدا، ناوەندە دینییەکان (وەکوو کلیسا) هێزی چاودێری بە سەر نۆرمگەلی وەکوو هاوسەرگیری، خوێندن، بەڕێوەبردنی یاسایان لە دەست دایە. لە دەست دانی ئەم چاودێرییانە، دەبێتە هۆی لە دەست دانی دەسەڵاتی بەرپرسانی کلیسا و لە ئاکامدا، نۆرم و هەڵو مەرجە دینییەکان جێگا بۆ رێسا و یاسا شارستانییەکان چۆڵ دەکەن. لە رووبەری تاکەکەسیدا، دین دەسەڵاتی خۆی لە سەر بڕیارە تاکەکەسییەکان لە دەست دەدات و راڤە دینییەکان لە واقعیەت، جێگای خۆیان دەدەنە راڤە زانستی و ئەقڵانییەکان.

## دەسپێکی پازیتیڤی بۆ کۆمەڵگا

## positivistic approach to society

زانستە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ، بە تایبەت زانستە کۆمەڵایەتییەکان قۆناغی جۆراوجۆریان تێپەڕاندووە تا گەیشتوونەتە ئێستا. بە بۆچوونی ئاگۆست کۆنت، فەلسەفەو هزری مرۆڤ سێ قۆناغی تێپەڕاندووە کە بریتین لە: قۆناغی ئیلاهیات، کە مرۆڤ سەرچاوەی هەموو کار و رووداوێکی لە خوداکانەوە دەزانی. مرۆڤ بە هۆی مژی باش نەمەیویەوە نەیدەتوانی لە بنج و بناوانی هۆکارەکانی ئەم جیهانەبکۆڵێتەوە و هۆی رووداوەکان بزانێ؛ ناچار هەموو کارێکی بە خودایەکەوە دەچەسپاند و بیری خۆی هێور دەکردەوە. قۆناغی دوایی، بریتی بوو لە قۆناغی سەروو سروشتی یا میتافیزیک. لەم قۆناغەدا هەرچەند مرۆڤ توانیویە باشتر پێبگا و رووداوەکان بە بەڵگەی هزری و فەلسەفییەوە روون بکاتەوە، بەلام هێشتا لەم قۆناغەشدا ناچار خەریکی لێکدانەوەی ئەو واتا هزرییانە دەبێ کە قەد ناتوانێ راست و دروست

بوونیان بسەلمێنێ؛ وەکوو خودا و رۆح. پاش ئـەم قۆناغـە، قۆنـاغی پـازیتیڤ دەگات کە مرۆڤ واز لە واتا ئینتزاعییەکان -ئەو واتایانە کە لە سەرەوەی فـام و زانینی مرۆڤدان- دێنێ و هـان دەدا زانسـتە کۆمـەڵایـەتییـەکـان، وەکـوو زانستە ئەزموونییەکان، لێ بکا و ئەوەی بە ئەزموون تاقی ناکرێتەوە، وازی لێ بێنێ. لەم قۆناغەدا، گرینگ ئەو واتایانەن کە وان لە ژێر چەقۆی نەشتەگەری مرۆڤدا.

لە راستیدا قۆناغی پازیتیڤی، لە سەردەمی هۆزان و بلیمـەتـانی یوونانـەوە باو بوو، بەڵام لەو قۆناغەدا فەلسەفەی میتـافیزیکی یـا سـەروو سروشـتی بـە سەر ئەندێشەدا زاڵتر بـوو. ئـەرەسـتوو بایـەخێکـی زۆری دەدایـە شـێوازی پازیتیڤی و هەست و ئـەزمـوونی بـەجێـی خـەیـاڵ و داڵـغە دادەنـا. بـەڵام شاگردەکانی ئەم شێوازەیان وەلاوە نا. لـە سـەدەی شـازدەهـەمـدا بـیکن و دیکارت و زانایانیتر کەڵکیان لە شێوازی ئەزموونی و پازیتیڤـی وەردەگـرت، بەبێ ئەوەی خۆیان لە نێو چوارچێوەی فەلسەفەی پازیتیڤیسمدا ببەسـتنەوە و فەلسەفەی تیۆریکی سەرووسروشتیان بە تەواوی نەخستە لاوە. هـەروەهـا بێگومان ئەندێشەکانی پاسکاڵ و کتێبی *شرۆڤەی سروشت*، نووسینی دێنیس دیدێرۆ و بەرهەمەکانی دالامبێر و تۆژینەوەکانی هیووم، لە پێکهاتنی بیری پازیتیڤیسمدا دەوری گرینگیان بووە (نراقی؛ ۲۰۰۹).

مرۆڤ بەرەبەرە لەم خاڵە گەیشت کە هێزی ئەو بـۆ گـۆڕانی دیـاردەکـان تەنیا دەتوانێ بەرهەمی زانستی ئەو لە یاساکانی سروشت بێ. بـە واتایـەکـی ساکارتر، مرۆڤ بەبێ ناسینی یاسـاکانی سروشـت، ناتوانـێ دەسـتیان تێـوەر بدات و بیانگۆڕێ. واتە، دەبێ سروشت ئیزنی ئەم دەستێوەردانەی پێبـدات. هـەمـوو زانسـتەکـان لـە قۆنـاغی منداڵـیاندا وایـان دەزانی کـە دەتـوانن کاریگەرییەکـی مـەزن بـە سـەر دیـاردەکانـدا دابنـێن. لـە رێبـازە سـەروو سروشتییەکاندا رووداو و گۆڕانە بینراوەکان، بە گۆترە و بەختەکـی دەزانـران.

کاتێ کە ئاشکرا بوو ئەم روانینە بۆش و بێواتایە، بە چەشنێکی چاوڕاوکەرانە، ئەوانەیان بە بەرهەمی کاریگەری و دەسەڵاتی ئەندێشەی تاک لە رەفتارە مرۆڤییەکاندا دەزانی. ئاوەها روانگەیەک، کردەی کۆمەڵایەتی مرۆڤی بێسنوور و لەخۆڕا پیشان دەدا. ئەم بۆچوونە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی هەموو زانستێکی وەکوو بایۆلۆجی، کیمیا، فیزیا و تەنانەت ئەستێرەناسیدا باو بوو. هەر بەو جۆرەی کە ناتوانین یاسا نەگۆڕەکانی سروشت بە گۆترە و بەختەکی بزانین، دیاردەکۆمەڵایەتییەکانیش خاوەنی یاسا و پێوەری تایبەت بە خۆیانن. هەروەکوو چۆن یاسا سروشتییەکانی زانستە وردبینانە و ئەزموونییەکان، دەتوانن داهاتووی هەر خولێک پێشبینی بکەن، کردەو تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتی و رامیارییەکانی مرۆڤیش لە یاسایەکی تایبەت پێڕەوی دەکەن. بە واتایەکی‌تر، هەمان گیانی پازیتیڤی کە بە سەر زانستەکانی‌تردا زاڵە، بە سەر لقە جۆراوجۆرەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانیشدا زاڵە. ناسین و فام کردنی ئەو یاسایانەی کە بە سەر پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا زاڵن، بنەمای زانستی مرۆڤ پێک دێنن (عضدانلو، ۱۳۸۴).

### دەستدرێژی ناموسی نادیار / hidden rape

مەبەستی مێری کاس و هاوکارانی لەم زاراوەیە ئەو دەسدرێژیە سێکسیانەیە کە راپۆرت نادرێن. بەڕای ئەوان ئەم دەسدرێژیانە بریتین لە دەستدرێژی بەسەر خزم و ئاشنایان، دۆستی کچ، یان ئەو دەسدرێژیانەی کە لە زانکۆکاندا دەکرێن (*Koss, M. P; 1987*).

### دەسەڵات /authority

لێک‌هەڵاواردنی واتای دەسەڵات و مەشرووعییەت کارێکی زۆر ئەستەمە. بەڵام کە بتوانین ئەم دوو واتایە لێک هەڵاوێرین و هەر یەکەیان بە جیاوازی

راڤە بکەین، چاکتر لە واتایان دەگەین. زاراوەی دەسەڵات (Authority) لە زاراوەی ڕوومی auctoritas وەرگیراوە کە بە واتای دەسڕاکێشانە بە سەر خەلکیدا. سەرەتا لە گەڵ واتای imperium و potestas جیا بوو، بەلام بەرەبەرە لە گەڵ پلە و پاگەی ئیمپراتۆر و حاکم ئاوێتە بوو. ئەمڕۆکە دەسەڵات بریتیە لە بەهرەمەندی لە ڕادەیەک لە هێزی فەرمی و گوێڕایەڵی خەلکی و گرتنە دەستی هەندێ بەرپرسایەتی تایبەت لە چوارچێوەو هەلومەرجی تایبەتدا. ئەمڕۆکە ئەوەی خاوەن دەسەڵات بێ، مافی حوکمڕانی هەیە (فردریک؛ ١٩٦٤).

وشەی مەشرووعییەت (legitimacy) ڕەگی لاتینی هەیە، بە واتای یاسا. دەسەڵاتی مەشرووع، دەسەڵاتێکە کە لە لایەن ئەو کەسانەی کە دەکەونە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتدارەوە، بە ڕەواو گونجاو دەناسرێ. ئاوەها دەسەڵاتێک بە یاسایی، دادوەرانە و ڕەوا دەناسرێ. بۆیە ئاوەها کەسێک بۆی دەلوێ کە لە زۆر کەلکوەربگرێ.

ماکس‌ڤیبێر سێ جۆر دەسەڵاتی دەس نیشان کردووەو لێکیهەلاواردوون: دەسەڵاتی فەرمی یان یاسایی (official authority)، دەسەڵاتی سوننەتی (traditional authority)، دەسەڵاتی کاریزماتیک (authority charismatic) (وبر؛ ١٣٨٨).

١- دەسەڵاتی فەرمی: بنەمای ئەم دەسەڵاتە لە سەر سیستەمی یاسایی و هەلومەرجی فەرمی داڕێژراوە و بە گوێرەی توانایی و لێهاتوویی ئەو کەسە دەسەڵاتێکی ڕەسمی تایبەتی پێ دەدرێ. یاسا و هەلومەرجەکان سنووری کەلکوەرگرتن لەم دەسەڵاتە ڕوون دەکەنەوە. لە بارودۆخی دەسەڵاتداری فەرمیدا، خەلکی دان بە بڕیار و فەرمانەکانی بەرپرساندا دەنێن، چونکە باوەڕیان ئەوەیە کە ئەو کەسانەی ئەم بڕیارانە دەدەن، مافی یاسایی دەسەڵاتدارییان هەیە. سەرۆککۆماری وڵاتێکی دیمۆکراتیک تا ئەو کاتەی

سەرۆک کۆمارە کە دەسەلاتی هەیە، بەلام پاش لاچوونی لەو شوێنە، دەسەلاتەکەشی دادەنێ.

٢- دەسەلاتی سوننەتی: بنەمای ئەم دەسەلاتە لە سەر پیرۆز بوونی نۆرم و ڕێسای پێشوونان دارێژراوە کە لەو ڕێگاوە تاکێک لە سەر تەختی دەسەلات دادەنێن. واتە پیرۆز بوونی کەسێک (لە ڕۆژاوادا لە سۆنگەی پیرۆز بوونی خوێن و ڕەچەڵەک، لە ڕۆژهەلاتدا لە سۆنگەی سەرنجی تایبەتی باب و کالان یان پەروەردگارەوە) دەبێتە هۆی ڕاگوێزانی دەسەلاتێک کە پێشوونان رادە و سنووورەکەیان دیاری کردووە. وەکوو: پادشای بریتانیا و تێزاری رووسیا لە سەردەمێکدا خێوی دەسەلاتێکی بێ‌سنوور بوون؛ کە ئەم دەسەلاتە بناغەی لە نێو سوننەتە حکوومی و پیرۆزەکانی ئەم دوو ولاتەدا بوو.

٣- دەسەلاتی کاریزماتیک: بنەمای ئەم دەسەلاتە لە سەر تایبەتمەندی و توانایيە تاکە کەسییەکانی ئەو کەسەدا داڕێژراوە کە فەرمان دەدات. پێڕەوانی ئاوەها ڕێبەرێک نە بە بۆنەی سوننەتەکانی دەسەلات و نە بە بۆنەی یاسا و دەستوورەکانەوە گوێڕایەڵی ئەم کەسەن، بەڵکوو تەنیا باوەڕیان بە خودی ئەو کەسەو توانایی و لێهاتوویيەکانیە. هیتلەر، مووسۆلینی و جەماڵ عەبدولناسر و لە کوردستانیشدا مەلاموستەفای بارزانی و قازی محەممەد کەسایەتییەکی کاریزمایان بوو؛ چونکە هەموو کات دەیانتوانی بە هۆی کەسایەتی خۆیانەوە جەماوەر لە دەوری خۆیان کۆ کەنەوە.

بە گوێرەی ئەو پێناسەی کە ڤیبێر بۆ کاریزمای کردووە، ناتوانین پێناسەیەکی کۆمەڵناسانە بدەینە دەست، چونکە دۆخی کاریزما دیارییەکە لە لایەن پەروەردگارەوە بە تاک دەدرێ و شتێک نییە کە بە تێکۆشان بێتە دەست و تاقمێکی زۆر کەم بەشی لێ دەبەن. ڕێبەری کاریزما دەتوانێ بە دانستە و سەرتریەک -کە لە کەسایەتی خۆیدایە- خێرایی بداتە

گۆڕانکارییەکان، یاخۆ بەر بە ئاڵوگۆڕەکان بگرێ. هەروەها دەتوانێ لە پێڕەوانی داوا بکات کە بە ئاوەژووی سوننەت و یاسا ببزوونەوە.

**دەسەلاتی سوننەتی/ traditional authority** بڕوانە: **دەسەلات**

### دەڤەری شار / suburbs

دەکرێ مێژووی شارگەری بە سێ قۆناغ دابەش بکرێ: سەرهەڵدانی شارە گەورەکان، گەشەسەندنی شارەکان، پەرەسەندنی دەڤەری شارەکان. ئەوەی سەرنجی کۆمەڵناسان، بەتایبەت دیمۆگرافەکان بەرەو لای خۆی رادەکێشێ، ئەوەیە کە سەرهەڵدانی دەڤەری شارەکان هەم بۆتە هۆی گۆڕانی پێکهاتەی جەماوەر و هەمیش بۆتە هۆی گۆڕان لە دابەش کردنی کار و هەروەها بەدی هاتنی کاری نوێ. لە دەیەی ۱۹۷۰دا نزیک بە دە میلیۆن ئەمریکی شارەکانیان بەجێهێشت و روویان لە دەڤەری شارەکان نا. لە مێژووی ئەمریکادا ئەمە یەکەمجار بوو کە خەڵک، شارەکانیان بەجێ دەهێشت و بەرەو دەڤەری شارەکان کۆچیان دەکرد (*The president's National Urban Policy Repory, 1980: ch.1*). ئەم رەوتە لە دەیەی ۱۹۸۰دا هەروا بەردەوام بوو، بەلام پاش ئەوە دیسان شارە گەورەکان کەوتنەوەسەر رەوتی پەرەسەندنەوە. لە نێوان سالانی ۱۹۸۰ تا ۱۹۹۰دا شاری ساندیاگۆ ۲٦% پەرەی سەند. ئەو شارانەی کە لەم ماوەیەدا گەشەیان سەند بریتین لە: ئێل‌پاسۆ، لۆس ئانجلێس، جەکسۆن ڤیل. بەلام شارە کەونەکانی ئەمریکا لە ناوەند و باکووری رۆژهەلاتی ئەم ولاتەدا (وەکوو شیکاگۆ، کلیۆلەند و نیۆیۆرک) لە رادەیەکی بەرچاودا دانیشتوانی خۆیان لە دەست دا. ئەم رووداوە باس لە کۆچی خەڵکی، لە زۆزانەوە بۆ گەرمیان دەکات. لە ماوەی دوو دەیەدا، گەشەی دانیشتوانی ئەیالەتەکانی باشوور و باشووری رۆژاوای

ئەمریکا زۆرتر لە دوو بەرانبەری رادەی گەشەی جەماوەری هەموو ولات بوو. لە هەمان کاتدا رادەی جەماوەری ئەیالەتەکانی باکووری ناوەندی و باکووری رۆژهەلاتی ئەمریکا وەکوو خۆی مایەوە. لە دەیەی ١٩٨٠دا ئەیالەتەکانی ئالاسکا و ئاریزۆنا و نیڤادا زۆرترین رێژەی زۆربوونی جەماوەریان بوو (٣٠%). کالیفۆڕنیا، تیگزاس و فیلۆریدا زۆرترین رێژەی وەرگرتنی کۆچەریان بوو. ئەو کەسانەی کە لە نیۆیۆرک و نیۆجێرسی کۆچیان کردبوو، گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان (*Waldrop, J; and T. Exter, 1990: 20-30*).

## لایەنگری (بێهۆ) / prejudice

لایەنگری بریتیە لە را و بۆچوونێکی نیگەتیڤ سەبارەت بە تاک، گرووپ یان چینە کۆمەلایەتییەکان. هەروەها بریتیە لە باوەڕ و بۆچوونێکی ساویلکانە و توندڕەوانە سەبارەت بە تاک یان گرووپێک لە خەلکی. رەنگە هەموومان هەست کەین کە دەتوانین بە زانینی تەمەن، رەگەز یان کاری تاکەکان، کەسایەتییان بناسین. ئەم بۆچوونەی ئێمە، پێی دەلێن پێشداوەری؛ واتە بەبێسەرنجدان بەوەی کە بابەتی بەرباسمان مرۆڤە و مرۆڤیش گیاندارێکی پێش‌بینی نەکراوە، هەست دەکەین کە دەتوانین بە زانیارییەکی سەرەتایی وەکوو تەمەن و ... کەسایەتی خەلکیش بناسین. بەم پێیە لایەنگری جۆرێک پێشداوەرییە سەبارەت بە خەلکی، ئەویش بە گوێرەی وێکچوونێکی روالەتی کە ئەو کەسانە لە گەل ئەندامانی‌تری گرووپەکەیان هەیانە. بۆچوونەکانی خەلکی کاتێک دەبنە لایەنگری کە زانیارییە نوێکان نەتوانن ببنە جێ‌نشینی زانیارییەکانی پێشوو و را و بۆچوونی تاک بگۆڕن. بۆ وێنەلە رستەی «رێبین هەرچەند خەلکی لادێیە، بەلام خوێنکاری زیرەک و زانایە»، تایبەتمەندی زیرەک و زانا بوونی رێبین، هیچ گۆڕانێکی لە بیرو بۆچوونی بێژەری ئەم رستەدا بەدی نەهێناوە. ئەم

رستە وامان پێ دەنوێنێ کە خەڵکی لادێ ناتوانن زیرەک و زانا بن. بەواتایەکی‌تر ئەو لایەنگرییە بناغەی لە سەر بۆچوونێکی کلیشەیی دانراوە.

لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، لایەنگری زۆرتر بۆ باس لە سەر گرووپە نەتەوەییەکان بەکار دەبرێ. لەم بازنەدا یەکدەنگییەکی بەرفراوان لە سەر پێناسە کردنی ئەم زاراوەیەدا هەیە: لایەنگری بووچوونێکی «نەگونجاوە» سەبارەت بە گرووپێکی نەتەوەیی (یان یەک بە یەکی ئەندامانی ئەو گرووپە). لە هەموو تەوەرەکانی‌تری ئەم زاراوەیەدا، واتای ئەم زاراوەیە بەرتەسکتر دەبێتەوە، جا ئەوە لە لایەن کۆمەڵناسانەوە بێ کە دەپەرژێنە سەر رەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم زاراوە، یان لە لایەن دەروونناسانەوە بێ کە سەرنج بەو تاکەی دەدەن کە بەو چەشنە بیر دەکاتەوە (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## لایەنگری ئایینی/religious prejudice

ئەم زاراوە پیشاندەری بایەخی ئایینە لە ژیانی تاکدا. چارلز گلۆک لە نێوان پێنج جۆری دەمارگیری ئایینیدا جیاوازی دادەنێ (*Glock, C. Y; 1959*):

١- دەمارگیری ئایینی ئەزموونی: ئەم دەمارگیرییە ئاماژەیەکە بە هێز و توانی هەستەکانی تاک لە پێوەندی لە گەڵ ئاییندا.

٢- دەمارگیری ئایینی کلیشەیی یان فەرمی: ئەم جۆرەیان ئاماژەی بە زۆربوون و دووپاتە بوونەوەی کردەئایینییەکان (وەکوو: پەرستن و رۆیشتن بۆ پەرستنگا) هەیە.

٣- دەمارگیری ئایینی ئایۆلۆجیک: ئەم جۆرەیان ئاماژەیەکە بە ئاستی باوەڕی تاک بە تیۆرییە ئایینییەکان.

٤- دەمارگیری ئایینی دوابەدوا: ئەم جۆرەیان ئاماژەیە بە دەسەڵاتو

کاریگەری باوەڕەئایینیەکان لە دیاری کردنی هەڵسوکەوتە ڕۆژانەکانی تاکدا.

٥- دەمارگیری ئایینی ڕۆشنبیرانە: ئەم جۆرە دەمارگیرییە ئاماژەیە بە زانستی تاک سەبارەت بە مێژوو و تیۆری و بیردۆزەکانی ئاینێکی تایبەت.

بە بڕوای گلۆک هەموو تاکەکان لە سەر یەکێک لەم ڕەهەندانەدا پتر لە ڕەهەندەکانی‌تر پێداگری دەکەن. بەم بۆنەوە، پێوانی ڕادەی دەمارگیری ئایینی زۆر دژوار و ئەستەمە.

## state / دەوڵەت

دەوڵەت لەو زاراوانەیە کە بە دژواری بکرێ واتایەک کە جێی پەسەندی هەمووان بێ، بۆی دابنرێ. لە ساکارترین و گشتی‌ترین واتادا بریتیە لە: تاقمێک لە خەڵکی کە لە شوێنێکدا دەژین و بۆ گەیشتن بە هەندێ داخواز و قازانجی گشتی، بە چەشنێکی تایبەت ڕێکخراون و هەندێ لە دەسەڵاتی خۆیان بە کەسانێک ئەسپاردووە تا بۆ گەیشتن بە دۆزێکی بەرزتر یەکگرتووتربن. دیارە ئەم واتایە زۆر بەرفراوانە و زۆر ڕەهەندی‌تر دەگرێتەوە. بەڵام لە کۆمەڵناسی و زانستە ڕامیارییەکاندا، دەوڵەت بریتیە لە لیژنەیێک کە ڕێبەرایەتی ڕامیاری لە ئەستۆ دەگرێ (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

بۆ ڕوون‌کردنەوەی واتای دەوڵەت، ناچارین کە ئاوڕێک لە ڕابردوو بدەینەوە و ئاو لە سەرچاوەوە هەڵێنجێنین؛ واتە، دەبێ بزانین کە ئاخێزگەی دەوڵەت کوێ بووە و هۆکانی سەرهەڵدانی دەوڵەت و ڕەوتی گەشەسەندنی ڕوون بکەینەوە.

دەوڵەتە مۆدێڕنەکان بە هۆی کەوشەنێک کە بە ڕاشکاوی دیاری و پێناسە کراوە، لێک جیادەکرێنەوە و خاوەنی سیستەمێکی ڕامیاری و ئیداری بەربڵاو و ناسراون و دەسەڵاتیان قوڕخ کردووە و لە ئەنجامدا دەتوانن بە هۆی زۆرەوە

دەسەلاتی خۆیان بنوێنن و بە سەر خەڵکدا دایسەپێنن. زۆربەی جڤاکە سەرەتاییەکان، وەکوو کۆمەڵگای بێ‌دەوڵەت ناویان لێ دەبرێ؛ چونکە خاوەنی مەڵبەندێکن کە بە روونی تخووبەکانی دیاری نەکراون و سیستەمێکی سیاسی و ئیداریبان نییە کە بە راشکاوی پێناسە کرابێ. مەڵبەندی ژێر دەسەلاتی زۆربەی ئیمپراتۆرییەکەوناراکان، بە راشکاوی دیاری کرابوو. هەورووەها حکوومەتەکانی میسر و یوونان و چین و میزۆپوتامیا بەبۆنەی سیستەمی ئیداری و رێکخراوەیەکی زۆر ئاڵۆزەوە کە بوویان، وێکچوونێکی زۆریان لە گەڵ دەوڵەتە نوێکانی ئێستا هەبوو. هەموو ئەمانە لە واتای ڤیبێریدا دەوڵەت بوون (راش؛ ١٣٨٨). واتای ڤیبێری دەوڵەت بریتیە لە جەخت لە سەر هێزو دەسەلات وەکوو واتایەکی رامیاری. ڤیبێر رای وابوو کە گرینگترین دیاردەی دەوڵەت بریتیە لە هێز و دەسەلات؛ دەسەلاتێک کە ئەندامانی کۆمەڵگایەک بۆ گەیشتن بە بەهاکانیان (وەکوو: ئاسایش، لایەنگری، بەرگری لە دوژمنان، چاودێری بە سەر هەڵس‌وکەوتی تاکەکاندا و ...) لە خۆیانی دەگرنەوەو بۆ لێژنەو ئەنجومەنێکی تایبەتی رادەگوێزنەوە (وبر؛ ١٣٨٢).

دوو بیردۆزی سەرەکی سەبارەت بە چۆنییەتی بەدیهاتنی دەوڵەت دەسنیشان کراوە کە بریتین لە: بیردۆزی ململانێ، ٢- بیردۆزێ یەکەتی‌ساز (integrative). بیردۆزی ململانێ جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە هۆی بەدیهاتنی دەوڵەتەکان، پێکدادانی تاک یان گرووپ یا جڤاکەکانە. کاکڵە و ناوەرۆکی سەرجەمی بیردۆزەکانی ململانێ ئەمەیە کە ئەو ململانێیانە کە بوونەتە هۆی هاتنەدی دەوڵەتەکان، بۆ نواندنی دەسەلاتیان بووە. بۆچوونی مارکسی لەم بارەوە ئەوەیە کە دەڵێ: دەوڵەت، بەرهەمی خەباتی چینایەتی مێژووییە کە بە بۆنەی شێوازێکی تایبەت لە بەرهەمهێنانەوە هاتۆتەدی. ئەم دوو بۆچوونە زۆرتر سەرنجیان داوەتە دەسەلات و دژایەتییەکانی نێو

کۆمەڵگا. بۆچوونێکی تر لە سەر بیردۆزی ململانێ، تیۆری گرێبەستە (contract). بە گوێرەی ئەم تیۆرییە، دەوڵەت بەرهەمی نیازی تاک بە پشتگیری و لایەنگرییە لە بەرانبەر هێزە ناتەبا و دژبە یەکەکانی نێو کۆمەڵگا. ئەمە بۆچوونێک بوو کە تووماس هابز و جۆن لۆک بەرەنگارییان لێیدەکرد (راش؛ ١٣٨٨).

بیردۆزەکانی یەکەتیساز، هاوکات لە گەڵ ئەوەی کە دان بە سەر ململانێدا دەنێن، روانگەیەکی جیاواز ئاراستە دەکەن. ئەم بیردۆزانە دەبنە دوو دەستە: ١) یەکەتییەک کە بەبۆنەی سنووردار بوونی کۆمەڵگاوە دێتەدی، ٢) یەکەتییەک کە دەبێتە هۆی قازانجی رێکخراوەیی. بیردۆزی سنووردار کردن هان دەدا کە پیشان بدات چلۆن ئەو دەوڵەتانەی بە هۆی کۆسپ و لەمپەری سروشتی وەک کێو و رووبار و دەریا و بیابان و هتدەوە ناتوانن زیادەی دانیشتوانیان بۆ دەرەوەکۆچ بدەن، ناچار دەبن کە رێکخراوێک بە ناوی دەوڵەت بنیات بنێن.هەروەها ئەو قازانجەی کە لە سۆنگەی رێکخستنی دانیشتوانی کۆمەڵگایەکەوە دێتە دەست، یەکێک تر لەم هۆوانەیە (راش؛ ١٣٨٨). رێکخستنی ئەندامانی کۆمەڵگا و بەدیهێنانی دەوڵەت دەبێتە هۆی پەرەسەندنی کاری کۆمەڵایەتی و بازرگانی و بیناسازی و نژیارڤانی. کۆوەبوونی سەرمایە لە نێو کۆمەڵگادا هەل بۆ بەدیهاتنی سەرمایەداری دەرەخسێنێ و کۆمەڵگا بەرەو دەوڵەتی مودێرن پاڵ پێوە دەنێ.

بە گشتی تەنانەت ئەو نەریتە هزرییانەش، وەکوو مارکسیزم و ئانارشیزم کە بە توندی رەخنەیان لە دەوڵەت گرتووە، دیسان بە وردی و تەکووزی باس لە سەر دەوڵەت دەکەن. لە راستیدا دەبێ بڵێین کە هەنووکە زۆربەی بیرمەندان و زانایانی رامیاری و کۆمەڵناسی و تەنانەت ئەوانەش کە بۆچوونی مارکسییان هەیە، بە نیازی دیتنەوەی واتایەکی نوێ لە چەمکی دەوڵەتن.

مەبەست ئەوە نییە کە پێشتر باس لە سەر ئەم واتایە خرابووە لاوە؛ بەڵکوو واتای دەوڵەت لە هەندێ لە ولاتە ئینگلیزی زمانەکاندا زۆر باسی لێ نەدەکرا. جێگای سەرسوورمانە کە هەرچەند زۆر ئاوڕ لە واتای دەوڵەت نەدەدرایەوە، کەچی باس لە ئەرک و کاری دەوڵەت زۆر گەرم بوو. دەبێ ئەوەش بڵێین کە باس لە واتای دەوڵەت لە ولاتانی ئاڵمانیا و فەرانسە و ئیتالیدا هەروا بڕەوی بووە، کەچی لە بریتانیا و ئەمریکادا زۆر نەپەرژاونەتە سەر ئەم بابەتە.

ئاندرۆ ڤینسێنت (وینسنت؛ ١٣٨٥) چوار هۆ بۆ وردبوونەوە لە واتای دەوڵەت هەڵدەژمێرێ کە بریتین لە: یەکەم لە باری کردەیی و پراکتیکییەوە کەمتر بتوانین بیر لە ولاتێکی بێدەوڵەت بکەینەوە. بوونی دەوڵەت بێجگە لەوەی کە باس لە بوونی کۆمەڵێک دامەزراوە و ئەنستیتۆ دەکات، بریتیە لە بوونی هەندێ روانگە و شێوازی هەڵسوکەوت و کردەیەک کە بە کورتی شارستانێتی (civility) پێدەڵێن.

دووەم ئەوەیە کە دەوڵەت ناوەندێکی پاسیڤ و بێلایەن نییە کە بە گۆترە هاتبێتەدی. دەوڵەت خاوەنی هەندێ تایبەتمەندی کۆن و سوننەتییە کە بە درێژایی مێژوو و بەرەبەرە گەشەی‌سەندووە. بەلام بە تەواوی گەیشتن لە بیچم و پێکهاتەی دەوڵەت پێویستی بە فام کردنی بیردۆزە یاسایی و رامیارییەکانی نێو ئەم تایبەتمەندیانەیە. بڕێ جار ئەم تیۆریزە کردنانە پێویستیان بە پێشینەی ئەو تایبەتمەندییانە هەیە، بەچەشنێک کە پاش بەدیهاتنی پێکهاتەکان لە چۆنییەتی بەدیهاتنیان بگەن. بەلام هەندێ جار خودی ئەم بیردۆزانە بوونەتە هۆی بەدیهاتنی دامەزراوەیەکی تایبەت.

سێیەم ئەوەیە کە واتای دەوڵەت بۆ خۆی ئالۆزی و لێڵییەکی سەرنجڕاکێشی هەیە، بە تایبەت لە پێوەندی لە گەڵ واتاگەلی‌تری وەکوو کۆمەڵە، کۆمەڵگا، نەتەوە، حکوومەت، پادشایی، دەسەلاتداریێتی و هتد.

زۆرجار ئەم واتایانە لە گەڵ واتای دەوڵەت تێکەڵ دەبن. هۆی تێکەڵ بوونی ئەم واتایانە، سەرنج نەدانە بە ئەرکە جۆراوجۆرەکانی ئەم زاراوانە لە بوارە هزرییە جیاوازەکاندا (وینسنت؛ ١٣٨٥).

بە گشتی، دەوڵەت بەو واتایەی کە ئەمڕۆکە باوە، دیاردەیەکی نوێ و تازە داهاتووە. لە رۆژگارانی رابردوودا ژیانی ئاسایی و رۆژانەی خەڵکی لە گەڵ سیاسەت تێکەڵاو بوو. خەڵکی بە ئاسانی نەیاندەتوانی لە نێوان سیاسەت و خزمایەتی، سەربازی و ناسەربازی، ئەرکی کۆمەڵایەتی و یاسا جیاوازی دابنێن. ئەرکەکانی تاک وەکوو سەرپەشتی خێزان و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی وەکوو سەرۆکی هۆز و شەڕکەر، بە یەکسان دەزانران. بە سەرهەڵدانی دەوڵەت، بوارە تایبەت و گشتییەکان لە یەک دابڕان و دامەزراوە رامیارییە پسپۆڕییەکان گەشەیان سەند (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## دەوڵەتی کامەرانی/ welfare state

بەئاوەژووی دەوڵەتی لانی کەم، دەوڵەتی کامەرانی، دەوڵەتێکە کە حکوومەت بە تێوەگلاندنی خۆی لە نێو بەشی تەندروستی، پەروەردە، چێکردنی خانوو، ئاسایشی کۆمەڵایەتی و هتد، دەیەوێ باری ژیانی خەڵکی باشتر بکات. دەوڵەتی ئاسوودەیی، دژکردەوەیەکە لە بەرانبەر ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ کێشە تاکەکەسییەکان بەرهەمی هەلومەرجی کۆمەڵایەتین و رای وایە کە تەنیا بە هۆی کردەی کۆمەڵایەتییەوە چارەسەر دەکرێن.

ئاڵمانیا یەکەم وڵاتێک بوو کە بەرنامەی بیمەی تەندروستی و وەنیشتەیی (تەقاعودی)، لە دەیەی ١٨٨٠دا داهێنا و جێبەجێی کرد. لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمدا (١٩١٤) زۆربەی هەرە زۆری وڵاتە ئەورووپییەکان ئەم بەرنامەیان بەڕێوە دەبرد. پاش دوایی هاتنی شەڕی یەکەم (١٩١٨) وڵاتە ئەورووپییەکان درێژەیان بەم بەرنامەیە دا و هەروەها بیمەی بێکاریشیان لێ

زیاد کرد و پارەیەکی زۆریان بۆ خەرج کرد. لە سەرەتای دەیەی ۱۹۳۰دا دەوڵەتی ئەمریکا دەستی دا بە ئەنجامی ئەم بەرنامەیە. دەوڵەتەکانی کامەرانی، هەم لە ولاتانی دیمۆکراتیک و هەمیش لە ولاتانی نیوە سوشیالیستیدا (وەکوو سوید و ئۆتریش) گەشەیەکی بەرچاویان سەندووە (اسکاکپول؛ ۱۳۷٦). هەرچەند روانگە و بۆچوونی زۆر سەبارەت بە ئەرک و کار و سنوورەکانی دەستێوەردانە حکوومییەکان جیاوازن، بەڵام ئەم باوەڕەی کە دەوڵەت دەبێ هۆی ئاسوودەیی هاوولاتیانی خۆی دابین بکات، لە لایەن هەمووانەوە پەسند کراوە (*Myles, J; 1989*– وەرگیراو لە: عضدانلو).

یەکێکتر لە خاڵە گرینگەکان سەبارەت بە دەوڵەتی ئاسوودەیی، لە ئەستۆگرتنی نەزمی ئابوورییە. بەرلە رووبەڕوو بوون لە گەڵ دابەزینی بەتەوژمی ئابووری (لە دەیەکانی ۱۹۳۰ و ۱۹٤۰دا) حکوومەتی ولاتە سەرمایەدارییەکان پێیان خۆش بوو کە ئاوڕ لە بارودۆخی ئابووری نەدەنەوە و هیچ خۆیانی تێنەگلێنن. بەڵام کاتێک لە گەڵ بێکاری، ئاوسانی ئابووری، هەژاری، تێکشکاوی بازرگانان و تاجرەکان رووبەڕوو بوون، ناچار بوون کە لە کاری ئابووریدا دەستوەربدەن. مەبەستی گەلاڵەی نوێی فرانکلین رۆزڤۆلت، لەژێرناوی New Deal (مامەڵەی نوێ)و هەروەها بەرنامەگەلی هاوچەشنن لە ولاتانی رۆژاوادا ئەوە بوو کە بە هۆی بووجەی دەوڵەتەوە، ئابووری نەتەوەیی رێکو پێک بکەن. دۆزی سەرەکی ئەم گەلاڵەیە ئەوە بوو کە: گەر دەوڵەت کار بۆ خەڵکی دابین بکات، ئەوانیش پارەیەکی زۆرتر بە دەست دێنن و دەتوانن خەرجی بکەن. کە خەڵک پارەیەکی زۆرتریان بۆ خەرج کردن بوو، داخوازی بۆ کالا و خزمەتگوزاری زۆرتر دەبێ؛ بنکەئابوورییەکان گەشە دەکەن و کارو کەسبی نوێ بەدی دێت؛ بەدیهاتن و گەشەسەندنی ئەم بنکانە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوانیش کارمەندی زۆرتر دابمەزرێنن. هەروەها حکوومەت دەتوانێ بۆ پاراستن و کارکردنی هەندێ لە کەرتە

ئابوورییەکان، بەرهەمەکانیان بکڕێت و پیتاکێکی کەمتریان لێ بستێنێ. ئەم بۆچوونە بوو بە هۆی ئەوەی کە بەرنامەکانی ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی حکوومەتەکان (بیمەی بێکاری، قەرز دان بە بنەماڵە نیازمەندەکان و ...) بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش زۆر بێتەوە.

زۆربەی خەڵکی ئاسایی وابیردەکەنەوە کە ئەرکی دەوڵەتی ئاسوودەیی یارمەتی ماڵی و خۆراکییە بە هەژاران. ئەم بۆچوونە تەنیا بەشێک لە راستی دەگرێتەوە. حکوومەت لە وڵاتە پیشەسازییە مودێڕنەکاندا ئەرکی بەرەنگاری و پاراستنی سامان، تەندروستی، پەروەردە، خانوو، هەل و مەرجی کار، ئاسایشی هەموو هاووڵاتیانی بە دارا و نەدارەوە لە ئەستۆیە. یارمەتی گەیاندن بە هەژاران تەنیا بەشێک لەو کارانەیە کە دەوڵەتی ئاسوودەیی جێبەجێی دەکات. دەوڵەتی ئاسوودەیی دەبێ ئاسانکاری ئاسوودەیی و خزمەتگوزاری و ئاسایشی دەوڵەمەندەکانیش دابین بکات.

### دەوڵەتی لانیکەم/ minimal state

ئەمە دەوڵەتێکە کە تەنیا ئەرکی حکوومی بریتیە لە پاراستنی سەربەخۆیی نەتەوەیی (بەرگری) و ئاسایشی ناوخۆ. دەوڵەت هیچ لە ئازادییە تاکەکەسییەکاندا دەستوەر نادات، مەگەر ئەوەی کە دڵنیا بێ هێمنی و ئاسایشی نەتەوەیی تووشی مەترسی هاتووە. خاڵی بەرانبەری ئەم دەوڵەتە، دەوڵەتی کامەرانیە.

### دەوڵەتی نەتەوەیی/ nation-state

ئاخێزگەی سەرەکی ئەم زاراوەیە ئەورووپا بووە و پاش گرێبەستی ئاشتی ڤێستفالیا (westphalia) لە ١٦٤٨دا و پاش دوایی هاتنی شەڕە سیسالانەکانی ئەرووپا، بە چەشنی فەرمی دانی پێدا نرا. لەوە بە دوا زۆربەی

وڵاتـانی جیهـان، لـە نێـو سـنوورێکی تایبـەتـدا خۆیـان لـە گـەڵ ئـاوەهـا سیستەمێکدا گونجاند. کێشە و پرسی ئاوەها سیستەمێک لەوکاتەوە دەستی پێکرا کە چەن نەتەوەی جیاواز، لە نێو سنوورەکانی دەوڵـەتێکـدا لـە دەوری یەک کۆوە کران. هەندێ لەم کەوشەنانە بە هۆی وڵاتە کۆلۆنیالیسـتەکانـەوە دیاری کراون: وەکوو زۆربەی وڵاتە ئەفریقییەکـان و بـەشـەکـانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەندێ‌تر لەم سنوورانە بە هۆی هێرش و داگیرکـردنی دراوسـێکانیانەوە دیـاری کـراون. لـە هـەر دوو جۆردا ناتەبایی و نایەکسانی کولتووری و نـەتـەوەیـی دەتوانـێ ببێتـە هـۆی بەدیهاتنی کێشە و پرسی جۆراوجۆری ڕامیاری. لـەم سـەدەیـەدا کـە تێیـدا دەژین، بینەری هەڵوەشانی وڵاتـانی یـەکیـەتی سۆڤـییەت و یووگوسـلاوی بووین، کە سەردەمێک لە ڕیزی وڵاتانی پیشەسازی بەهێز و سـەقـامگرتوودا بوون؛ کەچی ئێستا بوونەتە یەکەگەلی بچـووکتر و یـەکسـانتری دەوڵـەت-نەتەوە، یا دەوڵەتی نەتەوەیی. هەروەها دەبیـنین کـە لـە وڵاتـانی عێـراق و ئێران و تورکیا و سووریادا بـە درێژایـی ئـەو سـالانەی کـە بـەڕێـوە بـردن و ئیدارەی ئەم وڵاتانە کەوتۆتـە دەسـت تـورک و عـارەب و فـارس، نـاکۆکی و ناتەبایی نێوان ئەم نەتەوانە نەبڕاوەتە. ڕاستە دەسەڵاتداری بەشی هەرە زۆری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دەست حکوومەتی عوسمانیدا بـوو، بـەڵام شـێوازی ئیدارەی ئەم حکوومەتانە بە چەشنێک بوو کە کەمتر لە کارو بـاری نـاوخۆی نەتەوە جۆراوجۆرەکاندا دەستیان وەردەدا و هەر نەتەوەیەک وەکوو وڵاتێکـی نیوەسەربەخۆ، ئەرکی حوکمداری خۆی لە ئەستۆی خۆیدا بوو. پاش شـەڕی جیهانی یەکـەم و هـەڵـوەشـانی ئیمپراتـۆری عوسمـانی و دابـەش کـردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە لایەن بریتانیا و فەرانسـەوە، ناکۆکییـەکـانی نێـوان کورد و دراوسێیەکانی پەرەی سەند؛ بە چەشنێک کە ئەنجامی ئەم ناتەباییـە دابەش بوونی وڵاتی عەراق بووە. ڕەنگە لـەم سیسـتەمـە فیدراڵـییەدا کـورد

هێشتا لە ژێر چەتری عەراقدا بێ، بەڵام بێ گومان داهاتووی ئەم دابەش بوونە، دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردییە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەم پرۆسەیە، واتە دابڕانی کورد لە تورک و فارس و عەرەبی سوریا، بۆ ئێران و تورکیا و سووریاش پێش‌بینی دەکرێ. بێ‌شک ئەم دابڕانە ئاکامی ناتەبایی نەتەوەیی و کولتووری نێوان نەتەوە جیاوازەکانە کە لە نێو بازنەی سنووری وڵاتێکدا کۆوە کراون.

بە پێچەوانە، سیستەمی دەوڵەتی نەتەوەیی بوو بە هۆی سەرهەڵدانی ئەو شتەی کە ئەمڕۆکە پێی دەڵێن ناسیۆنالیزم یا نەتەوەخوازی. نەتەوەخوازی بریتیە لە ئەمەگداری و دڵسپاردنی هاووڵاتیان بە نەتەوەکەیان. بە بڕوای مارکس، کرێکاران دەبێ بەجێی ئەمەگدار بوون بە نەتەوە، ئەمەگداری چینەکەیان بن؛ بەڵام لە کردەدا ئەم ڕاستییەپیشان درا کە لە کاتی پێویستدا کرێکاران زۆرتر لایەنگر و ئەمەگداری نەتەوەیانن تا چینەکەیان.

خاڵێکی‌تر کە دەبێ سەرنجی پێ‌بدرێ و لەبەرچاو بگیرێ ئەوەیە کە هەرچەند هێز و وزەی نەتەوایەتی دەبێتە هۆی سەرکەوتن و پێشکەوتن، بەڵام هەندێ جار حکوومەت هان دەدات بۆ ئەوەی کە هەرچەند گوشارێکی زۆریش بە سەر هاووڵاتیاندا بێ، بەڵام بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی لە گەڵ حکوومەتانی‌تر ڕێک‌نەکەوێ.

## دەنگدان (هەڵبژاردن) / election

مەبەست لە دەنگدان، پرۆسەیەکە کە تاقمێ لە خەڵکی، یەک یان چەن کەس بۆ وەئەستۆ گرتنی هەندێ ئەرک و پلە و پاگە هەڵدەبژێرن.

گەر ژمارەی کاندیداکان پتر لە ژمارەی ئەو ئەرک و بەرپرسایەتییە بێ کە بڕیارە بخرێنە ئەستۆی کاندیداکانەوە، هەروەها گەر ژمارەی دەنگدەرانیش زۆر بن، یاخۆ بەرپێوار بوون و نهێنی بوونی دەنگدانەکە زۆر گرینگ بێ،

باشترین شێواز، هەمان شێوازی دەنگدانە.لە دەنگداندا دەنگدەران ئەنـدامانی پارلەمان یاخۆ هەر ئەنجومەنێکیتر هەڵدەبژێرن.

لە دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمان کـە ژمـارەیـەکـی زۆر لـە خەڵک دەبێ دەنگ بدەن، وا باوە کە دەنگدانەکە لە ماوەیەکی درێژدا –نابـێ کەمتر لە رۆژێکی تەواو بێ- بـەڕێـوە دەبـرێ. بـەرپرسـەکـانی حکوومـەت دەنگدانەکە لە نێو قوتابخانەکان یاخۆ لە بینا گشتییەکانـدا بـەڕێـوە دەبەن. دەنگدەرانیش بۆ دەربـڕینی رای خۆیـان بـۆ ئـەو شـوێنانە دەڕۆن. بـۆ هـەر دەنگدەرێک بەڵگەیەک رەچاو کراوە تا ناوی کاندید یان کاندیدەکانی خـۆی تێیدا بنووسێ. ئەم کارە –واتە پڕ کردنەوەی بەڵگەکە- زۆرتر لە نێو هـۆدەی دەنگدا کە هۆدەیەکی چوار تەنیشت گیراوە بەڕێوە دەبرێ تا کەس نـەتوانـێ سەیری چۆنییەتی پڕکردنەوەکەی بکات. پاش پڕکردنـەوە، پـەڕەکـەی دەق دەکا و لە نێو دەفرێکیدا دادەنێ. پـاش دوایـی هـاتنی دەنگـدان، بـەڵـگەی دەنگەکان لە لایەن نوێنەرانی کاندیداکانەوە دەژمێردرێن و نوێنەرەکانیش بە سەر ژماردنەکەدا چاودێری دەکەن تـا دەنگـەکـان بـە چـاکی بژمێـردرێن و بەڵگەی زەغەڵ نەخرێتە نێو دەنگەکانەوە.

چەن جۆر دەنگدان هەیە. رەنگە دەنگدەر تەنیا بە یەک کەس دەنگ بـدا، یاخۆ رەنگە بە چەن کەس دەنگ بدا (لە کاتێکدا کە چـەن ئـەرک و پلـە بـۆ تەر خان کردن بێ)؛ یان رەنگە سـیایی کاندیـداکان بـە ریـز بنووسـرێ. لـە هەندێ کۆمەڵگای یەک پارتیدا تەنیا ناوی یەک کەس لە نێـو بـەڵـگەکانـدا بووە و دەنگدەر ناچار بووە یان دەنگەکەی خۆی پووچەڵ کاتـەوە یـاخۆ هـەر بەو کەسە دەنگ بدات. ئاوەها بابەتێک بەدەنگدان نایەتە ئەژمار.

لە بارو دۆخی ئێستای دونیادا، خەڵکی زۆرتر دەنگ بە پارتـەکـان دەدەن تا کەسایەتییەکی تاک.

چونکە زۆربەی دەنگدانەکان لە ژێر کاریگەری پارتەکاندا بە ڕێوە دەبرێن-

بە چەشنێک کە هیچ کاندیدێک بێجگە لە کاندیدی پارتەرامیارییەکان، هیوای سەرکەتنی بۆ نییە- بۆیە پڕۆسەی هەڵبژاردنی کاندیدەکان لە لایەن پارتەکانەوە، خۆی دەبێتە دەسپێکێکی گرینگ بۆ دەنگدانی رەسمی کە تێیدا دەنگدەران لە نێوان پارتەکاندا خەریکی هەڵبژاردن دەبن. لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا دەنگدان کارێکی ناوخۆیە و وەکوو ئەوەیە کە پارتێک خەریکی کارو باری تایبەتی خۆی بێ. بەڵام لە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بە گشتی گرینگییەکی زۆر دەدەنە هەڵبژاردنی کاندیدەکان و پارتەکان دەنگدانێکی سەرەتایی بەڕێوەدەبەن. لە زۆربەی ئەیالەتەکانی ئەمریکادا رێکوپێک کردنی دەسپێکی دەنگدان بە گوێرەی یاسا و لە لایەن بەرپرسایەتییە دەوڵەتییەکانەوە بەڕێوە دەبرێ (گولد؛ ١٣٨٤).

## دەنگۆ/ rumor

واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لە هەواڵ و دەنگ و باسێکی ناڕاست کە بە شێوازێکی نافەرمی لە نێو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە. دەنگۆ سەبارەت بە خەڵک یاخۆ ئەو رووداوانەیە کە خەڵکی تامازرۆی بیستنیانن. خەڵکی لە کاتی قەیران، سانسۆری زۆر، سەرکوتی رامیاری یاخۆ ئەو کاتانەی کە لەژێر زەخت و گوشاری دەروونی و رۆشنبیرانەدان، زۆر بۆ وەرگرتنی دەنگوباسی ناڕاست یان دەنگۆ تەیارن و بۆ خۆیان لە بڵاوکردنەوەیدا بەشداری دەکەن. لە ئاوەها هەلومەرجێکدا ئەوان پێیان خۆشە کە دان بە هەموو یان بەشێک لەو دەنگوباسانەدا بنێن. دەنگۆکان دەورێکی سەرەکییان لە هەڵسوکەوتی رامیاری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و ئابووری خەڵکدا هەیە. حکوومەتەکان زۆرجار لە دەنگۆ بۆ زانینی را و بۆچوونی خەڵکەکەیان کەڵکوەردەگرن تا بە گوێرەی ئەو بۆچوونانە، رەوتی خۆیان ببەنە پێشەوە. بۆ وێنە ئەم دەنگۆیە لەنێو کۆمەڵگادا بڵاودەبێتەوە کە لە ساڵی داهاتوودا نرخی بنزین دوو

بەرانبەر دەبێتەوە. ئەگەر خەڵکی لە بەرانبەر ئەم دەنگۆیە هیچ دژکردەوەیەکیان نەبێ، رەنگە نرخی بترین گرانتر بکرێ و بەرپرسە حکوومییەکان بە چەشنێکی فەرمی ئەو گران بوونە رادەگەینن. بەلام گەر ئەم دەنگۆیە لە گەڵ دژایەتی و نارەزایەتی خەڵک رووبەڕوو بێ، رەنگە حکوومەت لە کردەی خۆی بۆ گرانتر کردنی بەنزین پاشگەز بێتەوە و تەنانەت رەنگە یەکێک لە بەرپرسەکان بە چەشنی فەرمی رابگەینێ کە گران کردنی بەنزین دەنگۆیە و حکوومەت ئاوەها نیازێکی نییە.

بەگشتی لە ئێراندا ئەم شێوازە زۆر باوە و دەتوانین بڵێین کە خەڵکی پێی راهاتوون. حکوومەت هەرجار بۆ کارێکی ئابووری یان رامیاری کە دەیەوێ ئەنجامی بدات، دەنگۆیەک بلاو دەکاتەوە، وەکوو گران کردنی هەندێ کالای پێویست بۆ ژیانی خەڵکی. بۆ وێنە دەوڵەت دەنگۆیەک دەردەکا کە نرخی فلان کالا دوو بەرانبەر دەبێتەوە، پاش ماوەیەک یەکێک لە بەرپرسەکان لە تەلەفزیۆندا رادەگەینێ کە ئەم دەنگۆیە درۆیە و ئەو کالا دوو بەرانبەر نابێتەوە و تەنیا ٥٠% نرخی گران دەبێت. خەڵکی وەکوو ئەوەی کە نرخی ئەو کالایە دابەزیبێ، زۆر شادوشوکر دەبن و خۆشحاڵن لەوەی کە نرخی ئەو کالایە بەجێی ١٠٠%، تەنیا ٥٠% گرانتر بووە. ئەو شێوازە بە رادەیەک لە ئێراندا دووپاتە کراوەتەوە، کە بۆ زۆربەی خەڵکی بە ئاسانی پێش‌بینی دەکرێ.

### دیاردەکانی هێلانەی خاڵی/ empty nest syndrome

هەندێ لە توێژەران لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامەی کە قەیرانی نیوەنەتەمەنی ژنان لە گەڵ ئەو قەیرانەی پیاوان لەم تەمەنەدا تووشی دەبن، جیاوازە. هۆی نارەزایەتی ئافرەتان لەم تەمەنەدا ئەوەیە کە منداڵانیان باڵەوازە دەبن و هێلانەکەیان بەجێ دێڵن و

هەریەکەیان دەڕۆن بە دووی کارو باری خۆیاندا، کەچی لەم لاشەوە، مێردەکانیان هێشتا خەریکی کاری خۆیانن. لەم بارودۆخەدا، ژنان هەست بە بۆشاییەک لە ژیانیاندا دەکەن.

بۆ روون کردنەوەی ئەم بابەتە پێویستە کە سەرنجێک بدەینە ئەو دابەشکردنەی کە شالا ئیعزازی لە کتێبی کۆمەڵناسی خێزاندا هێناویە. تەمەنی خێزانی ناوکی بە پێی ئەو دابەش کردنە دەبێتە شەش کەرت کە بریتیە لە: ١) هاتنەدی، کە لەم قۆناغەدا کچ و کوڕی لاو پێکەوە ژیانی هاوبەش هەڵدەبژێرن. تەمەنی کوڕی ئێرانی لەم قۆناغەدا ٢٤/٦ ساڵە و تەمەنی کچ ٢٠/٩ ساڵ؛ ٢) پەرەسەندن، لەم قۆناغەدا بە لە دایک بوونی یەکەم منداڵ کە پاش دوو یا سێ ساڵ دوای ژیانی هاوبەش دێتە دونیاوە، خێزانی دوو کەسی پەرە دەستێنێ و دەبێتە سێ کەس. دایک زۆرتر سەرقاڵی راگەیشتن بە منداڵە و ئەو هەل و کاتەی کە بەر لە مناڵداربوون هەبووی، نایمێنێ؛ دایکی ئێرانی لەم قۆناغەدا تەمەنی وا لە نێوان ٢٣-٢٤ساڵدا؛ ٣) گەشەی تەواو، لەم قۆناغەدا کە منداڵی دووەم و هەندێ جار سێیەم لەدایک دەبن، تەمەنی دایک دەگاتە ٢٨ ساڵ. ئەم قۆناغە بۆ دایک زۆرترین سەرقاڵی هەیە. دایک هەموو خەم و پەژارەیەکی دەبێتە منداڵەکانی. ئەم قۆناغە بە قۆناغی دایکی چالاک دەناسرێ و دایک بۆ ماوەی ٢٠-٢٥ ساڵ لە حەوتەدا نزیک بە ٨٤ کاتژمێر کار دەکات. کارەکانی بریتین لە ماڵداری، بردن و هێنانی منداڵ بۆ قوتابخانە، راگەیشتن بە خوێندنی منداڵان، چاودێری بە سەر راهێنان و پەروەردەی منداڵان (سگالن؛١٣٧٠)؛ ٤) چوونەوە یەک، لەم قۆناغەدا یەکەم منداڵ زەماوەند دەکات و ماڵی بابی بەجێ دێڵێ. نەختێ لە کارەکانی دایک کەمتر دەبێتە و دایک بە منداڵانی تری زۆرتر رادەگات. لەم قۆناغەدا چونکە منداڵان گەورەتر و سەربەخۆترن، دایک هەل و کاتی زۆرتری هەیە و دەتوانێ خەریکی کاری تر

بێ؛ ٥) بەتەواوی هاتنەوەیەک، لەم قۆناغەدا دوایین منداڵیش زەماوەند دەکات و دەڕوا. لەم قۆناغەدا دایک ئەرکەکانی پێشووی زۆر کەمتر دەبنەوە و کەچی هەندێ ئەرکی نەگۆڕی وەکوو چێشتلێنان و خاوێنکردنەوەی ماڵ هەر درێژەی هەیە، بەڵام ئیدی منداڵانی ماندوو و برسی نین کە خێرا بێنە سەر سفرە و چێشتەکەیان بخۆن، یاخۆ بە یاری کردن خانووەکە پیس بکەنەوە؛ ٦) دوایی هاتن، لەم قۆناغەدا بە گوێرەی ئەوەی کە هیوا بەژیان لەنێو پیاواندا کەمتر لە ئافرەتانە، پیاو دەمرێ و ژن بە تەواوی تەنیا دەمێنێتەوە و ئەویش پاش دوو یان سێ ساڵ دەمرێ و نامەی خێزان بە تەواوی دەپێچرێتەوە و دوایی دێ (اعزازی؛ ١٣٨٨).

بە سەرەنج دان بە تەمەنی خێزانی ناوکی و ئەرکی دایک لەنێو خێزاندا کە بۆ ماوەی ٢٠-٢٥ ساڵ خەریکی چاودێری و ڕاهێنان و بەخێو کردنی منداڵانە، لە قۆناغی هاتنەوەیەک و بەتەواوی هاتنەوەیەکدا دایک کە ئەرکەکانی تووشی گۆڕان دێن و سەرقالیەکەی پێشووی نامێنێ، تووشی بۆشاییەکی دەروونی دێ و بەرەو کزی و ژاکان دەڕوا. لەم قۆناغەدا تەمەنی دایک لە نێوان ٤٥-٤٧ ساڵدایە، دیارە هێشتا تەمەنی بە سەرنجدان بە هیوای تەمەن کە بۆ ژنان نزیک بە ٧٠ ساڵە لە ئێراندا، نزیک بە ٢٥-٣٠ ساڵی ماوە. دایک هەست بەوە دەکات کە پلە و پاگەی لە نێو خێزاندا هاتۆتە خوارەوە و ئەو تواناییەی کە پێشتر بووی نەیماوە.

گرینگترین کێشەی ئەم ژنانە پڕکردنەوەی کاتەکانیانە. چونکە کاری ماڵ ناتوانێ هەموو کاتیان پڕبکاتەوە. لە دەیەکانی ٦٠ و ٧٠ی زایینیدا بۆ یەکەم جار پزیشکەکان تێگەیشتن کە ژمارەیەکی زۆر و سەرنجڕاکێش لە ژنانی نێوە تەمەن بە هۆی هەندێ ئێش و نەخۆشییەوە کە هیچ هۆیەکی ئاشکرای نەبوو، بە زۆری سەردانی پزیشکەکان دەکەن. ئەمە بوو بە هۆی تۆژینەوەیەک لە سەر ئەم تەوەرە. تۆژەران تێگەیشتن کە ئەم نەخۆشیانە

هیچ هۆیەک بێجگە بێکاریان بۆ نییە و تەنیا کێشەی ژنان ئەوەیە کە نازانن چلۆن کاتی خۆیان بە کار و چالاکی جۆراوجۆر پربکەنەوە (فریدن؛ ۱۹۷۰). سەرەتا تۆژەران پێیان وابوو کە ئەمە ناکۆکییەکی دەروونی ئافرەتانەیە؛ کەچی لەم سالانەی دواییەدا کە ژنانیش زۆرتر هەلی کار لە دەرەوەیان بۆ رەخسا، تێگەیشتن کە ئەو ژنانەی لە دەرەوەی ماڵ کار دەکەن، تووشی ئەم بۆشاییە نایەن. بەم جۆرە تێگەیشتن کە ئەم ئاڵۆزی و ناکۆکییە بە بۆنەی بێکاری و بێکەلکیەوە بوو کە ئافرەتان تووشی دەهاتن، نەک ئەوەی کە نەخۆشییەکی دەروونی ژنانە بێ (گلن؛ ۱۹۷۵).

## دیالکتیک/ dialectic

مێژووی رەسمی واتای دیالکتیک دەگەڕێتەوە بۆ کانت، بەلام بە گشتی لە سەردەمی هێگڵ و پاش ئەو بە هۆی بەرهەمەکانی مارکسەوەبوو کە واتای دیالکتیک لە لایەن هەمووانەوە پێشوازی لێدەکرێ و واتایەک لە پێوەندی راستەوخۆ لە گەڵ زانستە کۆمەلایەتییەکانی پێدەدرێ.

لە ئاسەوارەکانی هێگڵدا وەکوو بەرهەمەکانی مارکس، واتای دیالکتیک و واتای دژایەتی کە لە گەڵیدایە، فرە واتایین؛ بەلام لە هەردوو حاڵەتدا واتای دیالکتیک بریتیە لە پەیدۆزی بنەڕەتی دیاردە کۆمەلایەتییەکان. بەم چەشنەی کە ئەکتەرە کۆمەلایەتییەکان لە رێی هەمان ئارمانجێک کە بە دوویدا دەڕۆن، دەتوانن هەڵومەرجێکی جیاواز یا تەنانەت دژ بەو دۆزەی کە دەیانویست، بەدی بێنن. لە دیاردەناسی رۆحدا، هێگڵ لە وێنەی کۆیلە و خاوەن کۆیلەدا ئاوەها پرۆسەیەک باس دەکات: خێوی کۆیلە دەیەوێ کە کۆیلەکەی، ئەو وەکوو خاوەنی خۆی بناسێ، بەلام بە هۆی هەمان ویستەوە، دان بە مرۆڤایەتی کۆیلە و هاوزات بوونی خۆی و کۆیلەدا دەنێ (بودون و بوریکو؛ ۱۳۸۵).

بە گشتی مەبەست لە دیالکتیک بریتیە لە گەڕان بە دووی راستەقینە لە

ڕێی باس و وتووێژەوە. دیالکتیک لە ئینگلیزیدا هاوواتایە لـە گـەڵ زاراوەی لۆجیک؛ هەروەها ئاماژە دەکات بە شەڕە قسەی لۆجیکی.

دیالکتیک –کە ڕەنگە لە ئەندێشەی مارکسیدا پتر لە هەر تـەوەرێکـی تـر باسی لە سەر کرابێ– دوو بابەتی سەرەکی دێنێتە ئاراوە کە باسی فەلسـەفی مارکسیستی لە سەر دەڕوا: واتە کاکڵەی ئەو باسەی مارکس لە هێگڵی قەرز کردووە و ئەم بۆچوونەی کە مارکسـیزم بـۆ خـۆی زانسـتێکە. لـە نـەریـتی مارکسیدا گشتی‌ترین جەخت و پێداگرییەکان لە سەر ئەم واتایە بـریتین لـە ۱) وەکوو شێواز و ڕەوتێک، هەروەها باوترین شێوازی زانستی کە دیـالکتیکی مەعریفەناسی (epistemology) وەکوو نموونەیـەک دێنێتـەوە؛ ۲) کۆمـەڵـە یاسا یا بنەمایەک کە لە سەر بەشێک یان سەرجەمی واقعییەت فەرمانڕەوایی دەکات، واتە دیالکتیکی ئێگزیستانسیالیستی؛ ۳) بزاوتنی مێژوو، دیالکتیـک لە سەر پێوەری پێوەندی. هەر سێکی ئەم بابەتانـە لـە مارکسـیزمدا دیـارن. بەڵام پارادایمەکانی بریتین لە بیرو ڕا دەربڕینەکانی مارکس لە *سـەرمایـەدا*، فەلسەفەی سروشت کە ئەنگلس لە ئانتی‌دوورینگدا دێنێتیە ئاراوە؛ هەروەهـا هێگلیـانیزمی دەرەوەی هێگڵـی لووکـاچ، خـولی سـەرەتاییـە لـە مێـژوو و ئاگەداری چینایەتی؛ پەرتووکێ کە دەکرێ بە بەڵگەکانی بنیات‌نـانی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانی مارکسی، ماتریالیسمی دیالکتیکی و مارکسـیزمی ڕۆژاوای بزانین (باتامور، کیرنن، میلی‌بند؛ ۱۳۸۸).

## دیمۆكراسی / democracy

دیمۆکراسی سیستەمێکی ڕامیارییە کە جەخت لە سەر ئەوە دەکـات کـە دەسەڵات لە دەستی خەڵکدا بێ. ئەم زاراوە لە زمانی یوونانییەوە سـەرچـاوە دەگرێ و لە دوو بەشی Demo (خەڵک) و Kratein (حکوومـەت کـردن) پێک هاتووە. کەواتە لە باری زاراوەییەوە دیمۆکراسی بریتیە کە حکوومەت و

دەسەڵاتداریتی خەڵکی بە سەر خۆیاندا، یاخۆ حکوومەت بە سەر کۆمەڵگایەکدا بە هۆی ئەندامانی خودی ئەو کۆمەڵگاوە (عضدانلو، ۱۳۸۴).

دیمۆکراسی لە گشتی‌ترین واتایدا ئاماژە دەکات بە شێوازی ژیانی کۆمەڵگایەک کە بە هەر تاکێک ئەو مافە دەدرێ تا لە بەهاکانی ئەو کۆمەڵگایەدا بە چەشنێکی سەربەستانە بەشداری بکات. بە واتایەکی‌تر، دیمۆکراسی بریتیە لە شوێنگەی ئەندامانی کۆمەڵگا بۆ بەشداری سەربەستانە لەو بڕیارانەی کۆمەڵگا کە راستەوخۆ لە گەڵ هەندێ رەهەندی ژیانی تاکی و کۆمەڵی ئەندامان پێوەندی هەیە. بەرتەسکترین و سنووردارترین واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لە مافی بەشداری ئەندامانی کۆمەڵگایەک لە بڕیارە رامیارییەکانی کۆمەڵگا (گولدو کولب؛ ۱۳۸٤).

لە باری مێژووییەوە زاراوەی دیمۆکراسی لە سنووردارترین واتاوە بەرەو گشتی‌ترین واتا هاتووە. هەرچەند پێشتر هەندێ واتای گشتی‌تر هەبوون، بەڵام زۆرتر پێوەندییەکی ئەوتۆیان لە ناودا نەبووە. تا ئەو جێگای کە دیمۆکراسی پێوەندی بە بیردۆزێک سەبارەت بە حکوومەتەوە بێ، دوو واتای سەرەکی بۆی دەستنیشان کراوە کە رەنگە لە گەڵ یەک ناتەبا بن. یەکێک لە واتاکان جەخت لە سەر فەرمانبەرداری لە ویستی خەڵک دەکات، واتای دووەمیش پێداگری لە سەر بەشداری سەربەستانەی یەک‌بە یەکی تاکەکان لە هاتنەدی ئەم ویستانەدا دەکات. بێ‌شک ئەو واتایە کە ئەمڕۆکە دیمۆکراسی هەیەتی، جیاوازییەکی زۆری لە گەڵ ئەو واتا سەرەتاییەی کە لە یووناندا بووە، هەیە. بەئاوڕدانەوەیەک بۆ حکوومەتی ئاتین ئەم راستییەمان لێ روون دەبێتەوە:

لە ناسینی ناوەرۆکی دیمۆکراسیدا، پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە بزانین کاتێک دەڵێن حکوومەتی ئاتین بەر لە سەدەی پێنجەمی بەر لە زایین دیمۆکراسی بووە، ئایا ئەو دیمۆکراسییە لە گەڵ ئەم دیمۆکراسییەی ئەمڕۆ

که له وڵاتانی رۆژاوادا هه‌یه، وه‌کوو یه‌کن یان نه؟ بێ‌گومان نه. له نێوان ئه‌م دوو جۆره دیمۆکراسییه‌دا جیاوازییه‌کان زۆر زه‌قن. له رژیمی ئاتیندا دیمۆکراسی راسته‌وخۆ و بێ‌ناونجییه. لێژنه‌ی هاووڵاتیان که ژماره‌ی ئه‌ندامانی (نه نوێنه‌ره‌کانی) قه‌د پتر له بیست‌هه‌زار که‌س نه‌بووه، راسته‌وخۆ و به گوێره‌ی زۆرترین ده‌نگه‌کان بۆ کاره گشتییه‌کانی کۆمه‌ڵگادا بڕیاریان ده‌دا. له ئاتیندا مافی هاووڵاتی بوون تایبه‌ت به ژنان و پیاوانی سه‌ربه‌سته و کۆیله‌کان و بیانیه‌کان هیچ به‌شدارییه‌کیان تێدا نییه. هه‌ر به‌و چه‌شنه‌ی که هه‌ڵبژاردنی به‌رده‌وامی «پریکلس» وه‌کوو «ئیسـتراتێژ» پیشان ده‌دات که دادوه‌ره‌کان له به‌ڕێوه‌بردنی کارو باری ده‌وڵه‌تدا ده‌سه‌ڵاتێکی زۆریان بووه؛ ئه‌م راستییه له روانینی یه‌که‌مدا و له چه‌شنی هه‌ڵبژاردنیاندا ده‌رناکه‌وێ. ئه‌مانه به پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی که رۆسۆ پێداگری له سه‌ر ده‌کات، به‌رپرسانی ساکاری حکوومه‌ت نین، به‌ڵکوو زۆربه‌یان خه‌ڵک‌خه‌ڵه‌تێن یا خاوه‌ن کاری رامیارین. به‌م چه‌شنه، حکوومه‌تی ئاتین دیمۆکراسییه‌کی راسته‌وخۆیه و هاووڵاتیان که که‌مینه‌یه‌ک له سه‌رجه‌می دانیشتوانن، راسته‌وخۆ ده‌سه‌ڵاتداری ده‌که‌ن.

ریمۆن بۆدۆن له فه‌رهه‌نگی کۆمه‌ڵناسی ره‌خنه‌گرانه‌دا ده‌ڵێ: بێنیامین کۆنستان (١٧٦٧-١٨٣٠) ئه‌م شێوازه دیمۆکراسییه له گه‌ڵ ئه‌و شته‌ی له ناوه‌نده رامیارییه‌کانی ئه‌ورووپای نوێدا دیاره، به جیاواز ده‌زانێ. دیمۆکراسییه‌ئه‌ورووپیه‌کان پلۆرالیستن (چه‌ند پارتین) و نوێنه‌ران به نوێنه‌رایه‌تی خه‌ڵکه‌وه حکوومه‌ت ده‌که‌ن. له‌م دیمۆکراسییانه‌دا به هۆی هۆکاره‌کانی چاودێرییه‌وه، جڵه‌وی حکوومه‌تکه‌ره‌کان له ده‌ستی خه‌ڵکدایه. له‌م رژیمه رامیارییه‌دا دابه‌ش کردنی کار، پێشکه‌وتووه و کۆمه‌ڵگای شارستانی -که تێیدا چینی ناوه‌ندی چه‌ندایه‌تی بیرو ڕاکان و قازانجه‌کانیان به ڕه‌وا ده‌زانن- هاتۆته دی (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

کۆنستان دەیەوێ بە پیشان دانی جیاوازی نێوان دیمۆکراسی راستەوخۆ (ئاتینی) و دیمۆکراسی نوێنەرایەتی، چییەتی و ناوەرۆکی ملهۆڕی دیمۆکراسی راستەوخۆ لە واتای رۆسۆیی ویستی گشتیدا ئاشکرا بکات و لە کردەدا پەسنی دیمۆکراسی بە شێوازی بریتانی بکات. دیمۆکراسیەک کە کۆنستان لایەنگری لێ دەکا، لە دیمۆکراسی بریتانی و ئەمریکییەوە سەرچاوەدەگرێ و دەتوانین پێی بڵێین دیمۆکراسی لیبراڵ و واتا رۆسۆییەکەی بە ناوی دیمۆکراسی رادیکاڵ ناو ببەین.

جیاوازییەک کە لە نێوان ئەم دوو جۆرە دیمۆکراسییەدا هەیە، هەم پێوەندی بە بنەما رێکخراوەییەکانەوە هەیە و هەمیش بە چۆنییەتی سیستەمی ئەنستیتۆکانەوە. گەر لە روانگەی زنجیرەی پێگەکانی ئەو بەهایانەوە سەیری بکرێ کە بەڵێنی بەدیهاتنیان دەدرێ، دیمۆکراسییەکان ناچارن دەست بدەن بە پۆلێن کردنی دروشمەکانی شۆڕشی مەزنی فەرانسە؛ واتە: ئازادی، بەرانبەری، برایەتی. لە دیمۆکراسی لیبراڵدا گرینگتر لە چەمکەکانی تر، ئازادییە؛ واتای ئازادی ئەوەیە کە دەوڵەت مافی ئەوەی نییە کە تەگەرەیەک بخاتە نێو سەربەخۆیی ئەندامانی کۆمەڵگا و لە نێو بازنەی قازانجە تاکەکەسییەکانیدا دەستوور بدات؛ مەگەر بە هۆی قازانجێکی گشتییەوە کە راست و دروستبوونی لە لایەن هەمووانەوە دانی پێدا نرابێ. لەم جۆرە دیمۆکراسییەدا یا بە هۆی ئەوەوە کە هەل‌و مەرجێکی گونجاو بۆ هاتنەدی سەربەخۆیی و ئازادییە تاکەکەسییەکان هەیە، یا بە هۆی ئەوەوە کە بە نیازە هەل‌ومەرجی پێویست بۆ گەیشتن بە حکوومەتی کەسایەتییە شیاوەکان بێنێتەدی، بەرانبەری بە مانای نەبوونی سەرتری (میراتی و بنەماڵەیی)، وەکوو بەهایەک سەیری دەکرێ. لە دیمۆکراسی لیبراڵدا، برایەتی بە واتای بوونی کۆمەڵگایەکی هاودڵ و یەکگرتوو لە باری رامیاریەوە، وەکوو بەهایەکی کۆمەڵایەتی دەزانرێ؛ چونکە یەکگرتوویی دەرئەنجامی رێز

و بایەخێکە کە تاکە بەرانبەر و سەربەستەکان بۆ یەکتری دایدەنێن؛ نـە بـەو بۆنەوە کە ئاکامی هاوڕەنگی کوێرکوێرانە لە گـەڵ کۆمـەڵـگایە، چونکـە ئـەم یەکگرتوویيە لە بنەڕەتدا لێڵ و گوماناوییە.

لـە زنجـیرەی پێگـەی بـەهاکـانی دیمۆکراسـی رادیکاڵـدا، بـەرانبـەری بایەخێکی بەرچاوی پێدەدرێ. لەم جۆرەدا، سەربەستی چونکە بناغەیـەکـی خانەدانی و ئەریستۆکراتانەی هەیـە، بـە بـەهـا نـازانرێ. برایـەتی بـەجێـی هاوکاری و گرێبەست، وەکوو نیشتمانپەرستی خـۆی دەنوێنـێ و ئـازادی و جیاوازییە تاکەکەسییەکان تا جێگایـەک رێـی پـێ دەدرێ کـە پـەیکـەرەی رامیاری تووشی مەترسی نەکات. گەر بمانەوەی بە زمانی مۆنتێسکیۆ بلێین، بنەڕەتی دیمۆکراسی لیـبراڵ لـە سـەر نـەرمـی و پشـوودرێژییە و بنـەمـای دیمۆکراسی توندڕەوانە لە سەر هێژایی (virtu) دانراوە، کە گرینگی ئـەرکـە گشتییەکان لە سەر هەر جۆرە قازانجێکی تاکـەکـەسـی و تایبـەتـدا دابـین دەکات.

لـە بـاری تـەکـووز کـردنی نـاوەنـدەکـان یـا سیسـتماتیک کـردنی ئەنستیتۆکانەوە، دیمۆکراسی لیبراڵ لە سەر هاوسەنگی هێـزەکانـەوە بنیـات نـراوە کـە بـە ئـامرازی چـاودێری و کـۆنترۆڵ دابـین دەکـرێ. دیمۆکراتـە توندڕەوەکان لایەنگری کۆڕێکن کە بە هۆی ئەو کۆڕەوە بتوانن حکوومەت - کە شتێک بێجگە لە لێژنەیەکی کارگێڕی نییە- لە کاتی پێویسـتدا لاببـەن. داخوازی دیمۆکراسی توندڕەوانە هـەمـان شـتێکە کـە کاتێـک توکویـل لـە سەردەمی سەرۆککۆماری جەکسۆندا سەردانی ئەمریکای کـرد، پێـی گـوت «ملهۆڕی چینی زۆرینە» (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

ولاتانی پیشـەسـازی و مۆدێـرن بـە گشـتی پێشـوازییەکـی زۆریـان لـە دیمۆکراسی لیبراڵ کرد و بەهرەیەکی زۆریان لێی برد. گەشە و پەرەسەندنی ئابووری و حکوومەتی دیمۆکراتیک دوو تەوەرن کە لە تەنشت یـەکـدا رێگـا

دەبڕن؛ چونکە هەردووکیان بۆ پەرەسەندیان پێویستیان بە هاوولاتیگەلێکی سەربەست و خوێندەوار هەیە. سەربەستی دەبێتە هۆی داهێنان و ئافراندن، داهێنانیش گەشەی ئابووری لە دوایە. بە هاتنە سەر کاری دیمۆکراسییەکی لیبرال، ئۆتۆریتە و ملهۆڕی، ڕەوا بوونی خۆی لە دەست دەدا و دەسەلاتی ڕەسمی-یاسایی -کە ئەقلانیشە- جێگای دەگرێتەوە. لە پرۆسەی دەنگدانی ئازاددا خەلکی، نوێنەرە فەرمییەکانی خۆیان هەلدەبژێرن و ئیزنیان پێ دەدەن تا لە چوارچێوەی یاسایەکدا کە خۆیان لە تۆمار کردنیدا بەشداریان بووە، داخوازەکانیان بۆ پێک بهێنن.

هەروەک دەبینین لەم سالانەی دواییەدا دیمۆکراسی لیبرال گەشەیەکی ئەوتۆی بووە و لانی کەم لە سالانی ١٩٨٩ تا ناوەڕاستی ١٩٩٣ لە ئەفریقا پتر لە بیست ولات هانیان داوە تا سیستەمێکی پەڕلەمانی لە ولاتی خۆیاندا دابمەزرێنن. ئانتۆنی گیدێنز بۆ وەلامدانەوە بەم پرسیارە کە «بۆچی ئەمڕۆکە دیمۆکراسی بۆتە بابەتێکی گرینگ و سەرنجڕاکێش؟» دەلێت: بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە دوو وەلامی لێک جیاواز و تەنانەت دژ بە یەک هەیە. یەکەمیان بریتیە لە وەلامێکی ئاسایی. ئەمە هەمان وەلامی فرانسیس فۆکۆیامایە، هەرچەند تەنیا تایبەت بەو نییە. بۆچوونی ئاسایی سەبارەت بە گەشە سەندنی دیمۆکراسی بریتیە لەنەمانی بابەتە مێژووییەکانیتر؛ فۆکۆیاما لەم وەلامە بەرەنگاری فەلسەفی دەکات. هۆی لایەنگری جیهانی لە دیمۆکراسی ئەوەیە کە لیبرال دیمۆکراسی باشترین سیستەمێکی رامیارییە کە مرۆڤ دەتوانێ بە دەستی بێنێ. ئەمە بۆچوونی زۆربەی نەتەوەکانی جیهانە. فاشیزم لە مێژە شکستی هێناوە، کۆمۆنیزم لە هەلدێرگای نەبووندا تووشی فەوتان هات و دەسەلاتداری سەربازی ناتوانێ حکوومەتێکی لێهاتوو و شیاو بێ. لیبرال دیمۆکراسی هاوڕێ لە گەل سەرمایەداری لە پانتای ئابووریدا، تەنیا سیستەمێکە کە بەردەوام ماوەتەوە و درێژە بە ژیانی دەدات.

هەندێ کەس لەم هەل‌ومەرجەی کە هاتۆتە ئاراوە شاگەشکە بوون و هەندێ وەکوو فۆکۆیاما لە رووی ناچارییەوە سەریان بۆی نەوی کردووە.

گیدێنز ئەو وەلامەکەی‌تر سەبارەت بە برەوسەندنی دیمۆکراسی بە ئال‌و گۆرەکانی دونیا نوێ دەزانێ. بۆ وێنە ولاتانی رۆژهەلاتی ئەورووپا لە سیستەمی یەک پارتییەوە دەرباز بوون و روویان لە سیستەمێکی فرەحیزبی نا. دیارە یەکێک لە دیاردەکانی لیبرال دیمۆکراسی سیستەمێکی گشتگیرە کە بەشی هەرە زۆری چینەکانی کۆمەلگای تێدا بەشدار بن. لەم سیستەمەدا دەولەت خاوەنی دەسەلاتێکی بێ‌سنوور نییە؛ بەلکوو بە هۆی نوێنەرانی خەلکەوە چاودێری لێ‌دەکرێ. ئەم چاودێرییە بەو مانایە نییە کە دەولەت لە سیستەمی لیبرال دیمۆکراتدا لاواز و کەم دەسەلاتە، بە پێچەوانە چونکە دەسەلاتی دەولەت لە لایەن خەلکەوە چاودێری و پشتگیری لێ دەکرێ، لە باری یاساییەوە رەواتر و بە دەسەلاتترە (گیدنز؛ ١٣٨١).

دیمۆکراسی لە ئێراندا لە کاتی دامەزراندنی یەکەمین پەرلەمان کە لە سەرەتاکانی ١٩٠٠دا دامەزرا دەستی پێکرا. لە سەردەمی قاجارەکاندا بەهۆی لاواز بوونی دەسەلاتی قاجارەکان، هەروەها سەرهەلدانی بزووتنەوەیەکی رووناکبیرانە کە سەرەتای مۆدێرنیزاسیۆنی ئێران بوو، رەوت و پرۆسەی دیمۆکراسی توانی لەنێو زەخت و گوشاری قاجارە دیکتاتۆرەکاندا سەر هەلبێنێ و بە دامەزراندنی پەرلەمان بەشێکی زۆر لە دەسەلاتی پادشاکانی قاجار بۆ پەرلەمان گوازرایەوە. هەرچەند محەمەد عەلی‌میرزای قاجار بوونی دەسەلاتێکی‌تری بۆ قووت نەدەچوو، بەلام تەنانەت بە بەتۆپ بەستنی پەرلەمانیش هیچی پێ‌نەکرا و نەیتوانی بەر بە رەوتی دیمۆکراسی بگرێ.

سەردەمی ئەحمەدشا دەیتوانی خولێکی زێرین بێ لە مێژووی ئێراندا.

## دیمۆکراسی

ئەحمەد شا خۆی رازی بوو بەوەی کە حکوومەتی ئێرانیش وەکوو بریتانیا پادشایەتییەکی سیمبۆلیکی بێ و کارەکان بە هۆی پەرلەمانەوە بەڕێوە ببرێن. بەڵام رووخانی قاجار و سەرهەڵدانی پەهلەوی ئەم خەونەی پووچەڵ کردەوە. سەردەمی رازا شای پەهلەوی، هەرچەند لەباری بۆرۆکراسیەوە دەسکەوتی زۆری بۆ ئێران بوو، بەڵام لە راستیدا رەوتی دیمۆکراسی تووشی هەرەس هێنان کرد. تەنیا پاش ئەو بوو کە لە سەردەمی حەمەڕەزای شای پەهلەویدا دیسانەوە ئەم پرۆسەیە دەستی پێکرا و توانی دەسکەوتی زۆری بێ. لەئێراندا هاوکات چەن پارتی دژ بەیەک خەریکی چالاکی بوون و دەوڵەتیش بەهۆی ئەو زەختەوە کە ئەمریکییەکان بە تایبەت کێنێدی خستبوویانە سەری، ناچار بوو کە زۆرتر بەرەو دیمۆکراسی هەنگاو بنێ و ئازادییە شارستانییەکان زۆرتر و دەسەڵاتی شا و دەرەبەگەکان کەمتر کاتەوە.

شۆڕشی ئیسلامی، ئێرانی بەرەو قۆناغێکی نوێ برد. بەپێچەوانەی ئەو شتەی کە چاوەڕوانی دەکرا، لەم سیستەمە نوێیەدا نە تەنیا دیمۆکراسی گەشەی پێنەدرا، بەڵکوو هەموو ئەو رەنجەی کە بەدرێژایی ئەو شەست ساڵە کێشرابوو، بەخەسار چوو و دیمۆکراسی بە سەرکوت کردنی پارت و گرووپە ناکۆکەکان لە گەڵ حکوومەت، دوایی پێدرا و سیستەمێکی یەک حیزبی هاتە کایەوە. هەرچەند بێجگە لە حیزبی جومهووری ئیسلامی چەن حیزبی‌تریش خەریکی چالاکی بوون، بەڵام لە راستیدا هەموویان لە سەر یەک هێڵ کە ئەویش داسەپاندنی دەسەڵاتێکی شیعی لە ئێران و دونیا بوو، رێگایان دەبڕی. پاش مردنی رێبەری شۆڕش، وەلایەتی موتڵەقی فەقیهـ دوایین وزەکانی دیمۆکراسی بڕی. لە سەردەمی دەسەڵاتداری رێفۆرمخوازەکاندا هیوای حکوومەتێکی دیمۆکراتیک دیسان لە دڵی خەڵک بە گشتی و رووناکبیراندا بەتایبەت چرۆی کردەوە. بەڵام ئەم

سیستەمە لە گەڵ حکوومەتی دیسپۆتیزمی دینیدا نەدەگونجا، بۆیە دەنگدانی ساڵی ١٣٨٣ لە ئێراندا داهاتووی دیمۆکراسی بەرەو قۆناغێکی لێڵ و تاریک بردووە و وادیارە ئێران لە باری نۆرم و یەکگرتوویییەوە تووشی ئانۆمی هاتووە (بشيريه؛ ١٣٨٧).

### cultural shock /راتەکانی کولتووری

ئێسنۆگرافەکان ئەم زاراوەیە بۆ ئاماژە بە هەست بە شلەژان و سەرلێشێوان و زەختە دەروونیەکانی ئەو کەسانەی بەکار دەبەن کە تووشیاری کولتوورێکی نامۆ دەبن. راتەکانی کولتووری کاتێک تووش دێ کە مرۆ بۆ ولاتێکی بیانی سەفەر کا و لە گەڵ شوێن و خەڵکێکی جیاواز لە گەڵ خۆی رووبەڕوو بێ. رەنگە تاک لە ولاتی خۆیشیدا تووشی راتەکانی کولتووری بێ. بۆ وێنە کابرایەکی گوندی کە لە کۆمەڵگایەکی بچووکەوە دەڕوا بۆ شارێکی گەورە. لە ئاوەها هەلومەرجێکدا هەندێ دیاردە لە راتەکانی کولتووری خۆیان پیشان دەدەن؛ وەکوو بێمتمانەیی بەخۆ، هەست بە تەنیایی، ترس لەوەی کە نەکوا لە گەڕەکێکی گونجاودا نەبێ، خانوویەکی شیاو نەبینێتەوە، بکەوێتە بەر قەشمەری خەڵکی و هتد. لە ئاوەها بارودۆخێکدا هەڵس‌وکەوتی ئاسایی تاک لەپرونەکاو دەگۆڕێ و میتۆدی نوێی رەفتار جێگای میتۆدە پێشووەکانی دەگرنەوە. لەم هەلومەرجەدا ژیانی رۆژانە، پێش‌بینی ناکرێ. بەواتایەکی‌تر، راتەکانی کولتووری جۆرێک نارێسایی یا ئانۆمی دێتە ئەژمار.

### secondary analysis / راڤەی دووەمین

لە هەموو توێژینەوەیەکدا پێویست ناکا خودی توێژەر زانیارییەکانی کۆ بکاتەوە. زۆرجار کۆمەڵناسان دەپەرژێنە سەر ئەو شتەی کە پێی دەڵێن راڤەی دووەمین. کەواتە راڤەی دووەمین شێوازێکی تایبەت نییە، بەڵکوو راڤەیەکی نوێیە لەو داتایانەی کە بە مەبەستێکی‌تر کۆوە کراون. هاکیم، راڤەی دوەمین بەم چەشنە پێناسە دەکات: «بریتیە لە هەر راڤەیەکی‌تر لە کۆمەڵە زانیارییەک کە پێشتر هاتۆتە دەست و لەم سۆنگەوە لێکدانەوە و ئاکام و تێگەیشتنێکی نوێ دەداتە دەست. زۆرتر راڤەی دووەمین لە سەر ئەو

زانیاریانەوە دەکرێ کە بە مەبەستێکی تر و بۆ بابەتێکی تر لە لایەن توێژەرێکی ترەوە کۆ کراونەتەوە» (بیکر؛ ١٣٨٧).

لە توێژینەوەدا کاتێ توێژەر بۆ خۆی نەتوانێ داتاکانی کۆ بکاتەوە، دەتوانێ لە داتای توێژەرێکی تر بەهرەوەربگرێ و لە راڤەی دووەمین کەڵک وەربگرێ. لە رواڵەتدا وادیارە کە چۆنییەتی ئەو زانیاریانەی کە لە لایەن حکوومەتەوە کۆوە کراون، باشتر لەو زانیاریانەیە کە تەنانەت لە لایەن پسپۆڕترین توێژەرانەوە کۆ کراونەتەوە. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە راڤەی دووەمین بۆ خۆی هەندێ گیرو گرفتی تایبەتی هەیە. بۆ وێنە: رەنگە داتاکان بەو شێوازەی کە توێژەر دەیەوێ کۆوە نەکرابێتن. هەروەها، هەموو کات شک و دڕدۆنگییەک لەو زانیاریانەی کە بە هۆی کەسانی ترەوە کۆ کراونەتەوە، هەیە. بۆ وێنە دوورکایم لە پرۆسەی توێژینەوەی کلاسیکی خۆی لە سەر خۆکوژی، تێگەیشت کە ناتوانێ بە تەواوی لە داتا ئامادەکان دڵنیا بێ. هەروەها ناکرێ لە راپۆرتی بەرپرسە رەسمییەکانی حکوومەت سەبارەت بە مردنێک دڵنیا بێ کە ئەو مردنە بە هۆی کارەساتەوە بووە یان خۆکوژی بووە. هەروەها دوورکایم تێگەیشت کە کارمەندانی حکوومەت لە رێی جۆراوجۆرە داتاکانیان کۆ دەکەنەوە، بەم بۆنەوە هەڵسەنگاندنیان کارێکی زۆر ئەستەمە (دورکهایم؛ ١٣٧٨).

## راڤەی ناوەرۆک / content analysis

راڤەی ناوەرۆک وەکوو ئامرازێک بۆ توێژینەوە، لە لایەن یەکەمین کۆمەڵناسانی راگەیاندنە گشتییەکانەوە و بە مەبەستی بەراورد، هاتە دی. وادیارە یەکەم جار کە ئەم زاراوە بەکار برا، بۆ توێژینەوە ئەمریکییەکانی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی و سەبارەت بە چۆنییەتی راگەیاندنی رۆژنامەکان بوو. ئەم راڤە، دوو بۆچوونی لە سەرە: یەکەم ئەوەیە کە دیاردەکانی وتنی

نووسراوەیەک(یاخۆ دیاردەگەلی‌تر) بە سانایی لە «بواری» خوێندنەوەی ئەو نووسراوە جیا دەکرێنەوە؛ دووەم، دەکرێ ئاوەها ناوەرۆکێک بە چەشنی دیار و ئاشکرا بەراورد بکرێ و لە پێوانە بدرێ، تاکوو خوێنەرانی ئەو نووسراوە، تەنیا یەک ناوەرۆک بخەنە بەر راڤە و لێکدانەوە. ناوەرۆکی راگەیندراوەکان دەتوانن شێوازی جۆراوجۆریان بێ، بۆ وێنە: لە توێژینەوەکانی رێبازی فرانکفۆرت سەبارەت بە گۆرانی و گۆڤارە خەڵک پەسەندە ئەمریکییەکان، ئەم شێوازە بە چەشنێکی کاریگەر بەکار براوە (پین؛ ١٣٨٦).

## راگەیاندنی گشتگیر / mass communication

ئەم زاراوە باس لە هەواڵ یان پەیغامێکی کولتووری دەکات کە لە لایەن دەزگایەکی راگەیاندنی گشتییەوە دەبێژرێ و بە سەر جەماوەرێکی زۆر گەورەی خەڵکدا کاریگەر دەبێ.

## راگەیاندنی بێ ئاخاوتن / nonverbal communication

راگەیاندنی بێ‌ئاخاوتن بریتیە لە ئاڵو گۆڕی زانیاری و واتاکان لە رێی چۆنییەتی گۆڕانکارییەکانی رواڵەت و شەکاندنەوەی ئەندامان و سەر و دەست. راگەیاندنی بێ‌ئاخاوتن هەندێ جار بە زمانی لەش ( body language) ناو دەبرێ (عضدانلو، ١٣٨۴)، بەلام ئەم زاراوە دەبێتە هۆی جۆرێک سەرلێشێوان، چونکە مەبەست لە کەڵک‌وەرگرتن لە دیاردەکانی راگەیاندنی بێ‌ئاخاوتن، کەم یان زۆر کردن و روون کردنی واتای ئەو وشانەیە کە لە قسە کردندا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ(گیدنز؛ ٢٠٠٤).

جۆرەکانی پێکەنین، گریان، رەنگ گۆڕان، گەڕانی چاو و گەڕاندنی دەست و سەر و ئەندامانی‌تر، هەموویان لە راستیدا هەواڵێک رادەگەینن.

یەکێک لە رەهەندە گرینگەکانی دەربڕینی هەست و بۆچوونەکان، بە

هۆی ئاڵوگۆڕەکانی روومەتە. پۆل ئێکمەن و هاوکارانی بۆ لێکدانەوەی ئاڵ و گۆڕەکانی روومەت، زاراوەی «سیستەمی نیشانەدانانی کردەی روومەت ( Facial Action Coding System)»یان داناوە (*Ekman & Freisen;1978*). دارڤین دەیگوت شێوازگەلی راگەیاندنی بێئاخاوتن لە نێو هەموو کۆمەڵگا مرۆییەکاندا یەکسانە. توێژینەوەکانی ئێکمەن و فریزێن لە نێو هۆز و کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا، ئەم بۆچوونەی دارڤینی دەسەلماند.

بە گوتەی ئێکمەن، ئاکامی تۆژینەوەکان لە سەر کولتوورە جۆراوجۆرەکان، پشتگیری لەم بۆچوونە دەکات. دەربڕینی هەست بەهۆی ئاڵوگۆڕی روومەت و شرۆڤەی ئەم دۆخانە، لە هەموو مرۆڤێکدا بەڕووداوێکی فیتری دەزانرێ. هەروەها ئاشکرا دەکات کە دەسکەوتی توێژینەوەکان ناتوانن ئەم بۆچوونە بە تەواوی بچەسپێنن.

بە گوێرەی توێژینەوەکانی تر، هیچ جووڵانێکی لەش لە هەموو شوێنی دونیادا وەکوو یەک و بە یەک واتا نین. بۆ نموونە، لە هەندێ ولاتاندا خەڵکی بۆ گوتنی «نە»، سەریان بەرەو ژوور رادەشەکێنن؛ کەچی ئەمە بە ئاوەژووی کولتووری ئەورووپی- ئەمریکییە کە سەریان بەرەو لای چەپ و راست رادەشەکێنن (*Bull, 1983*).

ئەو هەواڵانەی کە رواڵەتمان بە کەسانیتری رادەگەینین، لە راستیدا روون دەکەنەوە کە ئەو شتەی بە وشە دەریدەبڕین، سەرلەبەری مەبەستەکەمان نییە. جا یان وشەکانمان کەل و کوتەرن و پڕبەپڕی مەبەستەکەمان ناگەینن، یاخۆ شتێک بێجگە لە راستەقینە دەڵێین، واتە درۆ دەکەین و ئاڵوگۆڕەکانی رواڵەتمان بە درۆمان دەخەنەوە. وەکوو ئەوەی دایکێک لە منداڵەکەی دەپرسێ لە کوێ بووە و ئەویش راستی پێ نالێ، کەچی دایکەکەی بە سوور بوونەوەی کوڕەکەی یاخۆ سەرداخستن یان دەست راشەکاندنی تێدەگا کە راستی نەگوتووە.

## hunting and gathering /راو و کۆومکردنی خۆراک

بەشێکی هەرە زۆر لە ژیانی مرۆ بۆ راو و کـۆوەکـردنی خـۆراک تـەرخـان کراوە. چونکە تەنیا لە ١٠ تا ١٢ هەزار سـاڵ لـەمـەو پێشـەوە دەبیـنین کـە جۆرێکی‌تر لە کۆمەڵـگاکان (واتـە کۆمـەڵـگای شـوانکارەیـی و جووتیـاری) سەریان هەڵداوە. هۆی هـەرەس‌هێنـانی کۆمـەڵـگاکانی راو و کـۆوەکـردنی خۆراک، شکان لە ململانێ لە گەڵ کۆمـەڵـگاکانی‌تـر بـۆ پاراسـتنی زەوی و سەرچاوەکانی ژیانیان دەزانن. لە درێژەی ئەم چەن سـەدەی دواییـەدا ئـەم جڤاکانە تەنیا توانیویانە لە ناوچەگـەلی تـەریـک و دوورەدەسـتدا بـژین. بـە چەشنێ کە ئێستا تەنیا ٠٠١/ % خەڵکی دونیا لـەم رێگـاوە ژیانیـان دابـین دەکەن (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣). ئەم کۆمەڵگایانە گەشەی جەماوەریـان زۆر کەمە، بەم بۆنەوە لە باری جەماوەرەوە زۆر کەمن. ئەمانە لە نێـو گرووپگـەلی ٤٠-٥٠ کەسیدا کە زۆربەیان پێوەندی خزمایەتییان پێکەوە هەیـە، دەژیـن. خزمایەتی بنەمای هەرجـۆرە دامـەزراوەیـەکـی کۆمـەڵایـەتییانـە و پێکـەوە پێوەندی ناوگرووپی سەقامگیریان هەیە، بەڵام پێوەندیەکـی نێـوان گرووپـی (پێوەندی لە گەڵ گرووپەکانی‌تر) زۆر قایم و پایەداریـان پێکـەوە نییـە. لـەم جڤـاکانەدا چـەن ژنی زۆر بـاوە. هـەرکـەس خـاوەنی ژنی زۆرتـر بـێ، بـە دەولەمەندتر دەزانرێ و نیشانەیەکە بۆ پلە و پاگە و رێزی کۆمەڵایـەتی. ئـەم جڤـاکانە خۆبژیـون؛ بـەڵام هـەرچـەنـد لـە دوورەپـەرێزیـان لـە کۆمـەڵـگا دەسەڵاتدارەکانی دەورو پشتیان کەمتر دەبێتەوە، ئاسـتی خۆبژیویـان زۆرتـر دادەبەزێ (بیتس و پلاگ؛ ١٣٨٦).

ئەمانە دامەزراوەی ئابووری زۆر ئاڵۆزیان نییە. گـەڕان بـە دووی خـۆراک، گرینگترین چالاکی ئەندامانی ئەم جڤاکانەیە. کارەکان بە گـوێرەی جـنس و تەمەن دابەش دەکرێن. راو، شـەڕ، چـالاکی رامیـاری و ئـایینی و هونـەری و بەجێهێنانی رەسم و یاساکان لە ئەسـتۆی پیاوانـە. کۆکردنـەوەی خـۆراکی

گیایی و بەخێوکردنی منداڵان لە ئەستۆی ژنانە. پسپۆڕییەکی تەواو کات لـە کاردا نییە. لەباری دامەزراوە رامیارییەکانەوە ئـەم کۆمـەڵـگایانە لـە قۆنـاغی سەرەتاییدان و چونکە جەماوەریان زۆر نییە، زۆرتر بەشـێوازی نافـەرمـی بـۆ خۆیان کێشە رامیارییەکانیان چـارەسـەر دەکـەن. چـاودێری کۆمـەڵایـەتی شێوازێکی نافەرمی هەیـە و تۆڵـەی خـوێن و گوشـاری گرووپـی و زەخـتی بەرگرانە بە گوێرەی رەسم و نەریتەکان جێبـەجـێ دەبـێ. بـێگومـان ئـەم چەشنە چاودێری و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییە لەکۆمـەڵـگاگەلی بچـووک کـە ئەندامانیان وێکچوونی زۆریان هەیە و پێوەندی زۆر و نزیکیان پێکڕا هەیـە و بیری ناتەبا و دژبە یەکیان لـە نێوانـدا نییـە، چـارەسـازە (نـولان و لنسـکی؛ ١٣٨٣).

## رکەبەرێ / competition

رکەربەرێ بریتیە لە شێوازێکی کارلێک بۆ گەیشتن بە مەبەسـتێکی دژوار یاخۆ مەبەستێک کە پێگەیشتنی بە دژوار دەزانـرێ. ئـەم کارلێکـە خـاوەنی نەزمێکی رێساداره و دەتوانێ بە چەشنی راسـتەوخـۆ یـا ناڕاسـتەوخـۆ بـێ، هەروەها دەتوانێ تایبەت یا ناتایبەت بێ و بە گشـتی کـەس ئیـزنی ئـەوەی نییە بۆ رکەبەرێ لە زۆر و توندوتیژی کەڵک وەربگرێ.

لە سەردەمی هۆرتۆن کوولی بەم لاوە، کۆمەڵناسان سەرنجیان دایـە ئـەم راستییە کە پەیدۆزی ئارمانجگەلێکی دژوار کە کەسـانیتریش بـە دوویانـدا دەگەڕێن، رەنگە بەبێ ئاگەداری کەسانیتر بێ، یـاخۆ گـەر کـەسـانیتریش ئاگەدار بن، بەبێ شەڕو کێشەیـە. کـوولی لـە وتـارێکی خۆیـدا لـە ژێرنـاوی «رکـەبـەرێـی تاکـەکـەسـی»، نووسـی کـە: «مـەرج نییـە کـە رکـەبـەرێ چاولێگەرییەکی دوژمنانە بێ و تەنانەت مەرج نییە کە لایەنەکانی رکەبـەرێ ئاگەداری کارەکەیان بن. بەڵکوو لێهاتوو بوون بۆ جێبەجێ کـردنی ئـەرکـی

کۆمەڵایەتییە کە مرۆڤ دەکاتە رکەبەر و پێشبڕکێخواز، ئەمەلە کاتێکدایە کە رەنگە خۆی ئاگەداری ئەم کارەی بێت یا نەبێ. گەریش ئاگەدار بوو، رەنگە ئاگادارانە خەریکی ململانێ لە گەڵ کەسانیتر بێ یا نەبێ» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

لە ژێر کاریگەری بیردۆزەکانی ژینەوەرناسی و ئابووری کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بوو کە رابێرت ئێزرا پارک و و. بورگس رکەبەرییان –کە بە کارێکی ناوشیارانە و ناتایبەت دەزانرا- کردە بەردی بناغەی لقی ئێکۆلۆجی مرۆیی. ئەوان دەیانگوت «رکەبەرێ لە واتایەکی ورددا بریتیە لە کارلێکێک کە بەبێ پێکدادانی کۆمەڵایەتییە». ئەرک و دەوری رکەبەرییان وەکوو بەدیهێنانی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ناتایبەت راڤە دەکرد، کە تێیدا هەر تاکێک لە هەمان کاتدا کە بۆ گەڕان بە دووی قازانجەکانی خۆیدا سەربەستە، تا رادەیەکیش ناچار بەم کارەیە و کەسیتر دەکاتە ئامرازێک بۆ گەیشتنی خۆی بە قازانجەکانی. ئەم کارە بەم وتەوە روون دەکرێتەوە کە «لە کومەڵگای مرۆییدا، رکەبەرێ هەموو کات لە گەڵ پرۆسەکانیتری کارلێک ئاوێتەیە» و «رکەبەرێ لە نێوان مرۆڤەکاندا تا رادەیەکی زۆر بۆتە چاولێکەری و دوژمنایەتی» کە بە کارگەلێکی وشیارانە و تایبەت دەزانرێن (هەمان سەرچاوە).

## رکەبەریی پێگە/ status competition

کریستۆفێر هۆرن، بۆ لێکدانەوەی «شۆڕشی خوێندن» لە زاراوەی رکەبەریی پێگە کەڵکوەردەگرێ. واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لە کۆشش و تەقالا بۆ گەیشتن بە پێگە و بەها کۆمەڵایەتییەکان. واتای شان یا پێگەی کۆمەڵایەتی یەکەم جار ماکس ڤیبێر هێنایە نێو کۆمەڵناسییەوە. ئەو باوەڕی وابوو کە بایەخی پێگەی کۆمەڵایەتی بۆ بەردەوامی و سەقامگرتنی چینە

کۆمەڵایەتییەکان، کەمتر لە بایەخی دەسەڵات و سامان نییە. لە زۆرێک لە وڵاتەکاندا هێشتا خوێندن وەکوو سیمبۆل و ڕەمزێک دەزانرێ بۆ پیشان دان و دیاری کردنی پێگەی کۆمەڵایەتی. بەم بۆنەیە کە دایک و بابانی چینە ناونجی و خوارەکانی کۆمەڵگا خەرجێکی زۆر دە کەن تا منداڵیان بتوانن بخوێنن و بەڵگەنامەی خوێندنی باڵا بە دەست بێنن. هۆرن بەم چەشنەدەگاتە دەرەنجامی باسەکەی خۆی کە شۆڕشی خوێندن هیچ پێوەندییەکی بە نیازەکانی کۆمەڵگای سەرمایەدارییەوە نییە و بەڵگەنامەخوازی تەنیا بەهایەکی تاکەکەسییە (عضدانلو، ١٣٨٤).

## ڕوانگەی جیهانگیر / global perspective

بریتیە لە ڕوانگەیەک کە جیهانێک بەرفراوانتر لە جیهانی گرووپ، هۆز یا نەتەوەیەک دەخاتە بەر وردبوونەوەو تۆژینەوە و هان دەدا کە پێگەی گرووپ، نەتەوە  یا هۆزێک لە چاو گرووپ و نەتەوە و هۆزەکانیتردا ئاشکرا بکات. بۆ وێنە گەر کۆمەڵناسێک بە نیازی تۆژینەوە لە سەر نەتەوە یا هۆزێک بێ، نابێ بە تەنیا لە سەر مێژوو و سەربهورد و شوێنگەی ئەو نەتەوەیە بکۆڵێتەوە. زانیارییەکی جیهانگیر، یەکێک لە رووبەرە لۆجیکییەکانی ڕوانگەو بۆچوونی کۆمەڵناسانەیە. ڕوانگەی بنەڕەتی کۆمەڵناسی ئەمڕۆ ئەوەیە کە جێگای تاک لە کۆمەڵگادا، بە چەشنێکی قووڵ و ورد بە سەر ئەزموونی تاکەکاندا کاریگەری هەیە. بەم بۆنەوە، جێگا و شوێنی هۆز یا نەتەوەیەک، لە سیستەمی جیهانیدا، بە سەر ئەزموونەکانی سەرجەمی تاکەکانی ئەو هۆز یا نەتەوەیەدا کاریگەری هەیە. بەبڕاوی ئالێن ئۆستار «ئێمە دەبێ نەوەکانیتر نە وەکوو بیانی، بەڵکوو وەکوو ئامبازی خۆمان لە گەیشتن بە دۆزەکانماندا بزانین. ئێمە دەبێ ڕوانگەیەک سەرتر لە سنوورە نەتەوەیی و جۆگرافیاییەکان و دەمارگیرییە کولتوورییەکانی

خۆمانمان هەبێ... بۆ گەیشتن بە ئاوەها فامێک، پێویستە کە ڕوانگـەیـەکـی جیهانگیرمان بێ» (*Ostar, A; 1988:461*- وەرگیراو لە: عضدانلو، ١٣٨۴)

## ڕوانگەی ململانێ / conflict perspective

ڕوانگە زۆر و لێکجیاوازەکانی ململانێ، دیاردەکۆمەڵایەتییەکانی ڕابـردوو و ئێستا و داهاتوو، بە بەرهەمی ململانێ و ناتەبایی و دژایەتی تاک و گرووپـە کۆمەڵایەتییەکان دەزانن. لەم ڕوانگـەیـەدا پرۆسـە کۆمـەڵایـەتییـەکـان لـە سۆنگەی دژایەتی و ناتەبایی قازانجەکانی تاک و گرووپە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەرەو پێش دەڕۆن، نەک بە بۆنەی هاوکاری و ئاریکـاری کۆمـەڵایـەتییـەوە. گریمانەی سەرەکی ئەم بۆچوونـە ئـەوەیـە کـە کۆمـەڵگاکان لـە گـرووپ و دەستەگەلی لێک جیاواز پێک هاتوون، کە هەر یەکەیان ویسـتێکی تایبـەت بە خۆی هەیە کە زۆرجار لە گەڵ ویست و قازانجی تاک یان گرووپەکانی‌تـر ناتەبایە. بە بڕوای کۆمەڵناسانی ململانێ ئەو شتەی کە بۆتـە هـۆی مانـەوەو پاراستنی کۆمەڵگا، بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەرکخوازانە کە سیسـتەمێکـی ئۆرگانیکی بۆ کۆمەڵگا ڕەچاو دەکەن، ناتەبایی و ناکۆکییە لە قازانجەکاندا.

سەرچاوەی ئەم بیردۆزە دەگەڕێتەوە بۆ کارێل مـارکس. بـەڕای مـارکس، کۆمەڵگا بەرهەمی هاوسەنگی هێزە ناتـەبـا و دژ بـە یـەکـەکانـە. بـە هـۆی پێکدادان و ململانێی ئەم هێزانەوە، گۆڕانی کۆمەڵایەتی دێتە دی. ڕوانگـەی مارکس لە سەر بۆچوونێکی تەکامولی دامەزرابوو. بە بڕوای ئـەو، دژایـەتی و ململانێـی کۆمـەڵایـەتی مـاتۆڕی پێشـکەوتـە. خـەبـاتی کۆمـەڵایـەتی بەرهەمهێنەری هەموو شـتە و ململانێـی کۆمـەڵایـەتی کاکڵـەو نـاوەرۆکـی پرۆسەی کۆمەڵایەتییە. ئەم بۆچوونە هەرچەند لە گـەڵ ڕێبـازی پێشـوونانی سەدەی هەژدەهەمدا ناتەبا بوو، بەڵام لە گەڵ زۆربەی ئەندێشەکانی سەدەی نۆزدەهەم سازگار بوو (کوزر؛ ١٣٨٧).

بە بڕوای مارکس، ئەو هێزانەی کە لاپەڕەکانی مێژوویان نووسیوە، هەمان شێوازی پێوەندی ململانێی مرۆڤەکان لە درێژایی مێژوودا بۆ بەدەست هێنانی بژیو بوون. «یەکەمین کردەی مێژوویی، بەرهەمهێنانی خودی ژیانە. بە ڕاستی کە ئەمە کارێکی مێژوویی و مەرجی بنەمایی سەرلەبەری مێژووە» (مارکس؛ ١٣٨٧). گەڕان بە دووی خۆراک و پۆشەن و دیتنەوەی پەناگایەک بۆ حەوانەوە، دۆزی سەرەکی مرۆڤ لە بەرەبەیانی ژیانیدا بووە. هەروەها گەر ئەمڕۆکەش چەندوچوونی ژیانی مرۆڤ بە وردی شرۆڤە بکرێ و لێکبدرێتەوە، ئاشکرا دەبێ کە هەنووکەش بەشی زۆری کۆشەوەی مرۆڤ هەر بۆ ئەم مەبەستەیە. تا کاتێک ئەم نیازانەی مرۆڤ پێک نەیەن، ململانێی مرۆڤ و سروشت بەردەوامە. مرۆڤ ئاژەڵێکی نارەزایە. هەرکات نیازە سەرەکییەکانی دابین بکرێن «نیازی نوێ لە ناخیدا سەرهەڵدەدا و هەر ئەم هاتنەدییەی نیازی نوێیە، بۆ خۆی یەکەمین کردەی مێژووییە» (هەمان سەرچاوە). مرۆڤ کە داخوازێکی دابین دەبێ، دوابەدوای ئەوە پاپای نیازێکیتری بۆ دێتە کایەوە.

مارکس بە پێچەوانەی هێگڵ و کۆنت، گەشە و پەرەسەندنی کۆمەڵگای لە گەشەی بیرو هزر و ئەندێشەدا نەدەزانی؛ بەڵکوو هۆکاری ئابووری و شێوازی بەرهەمهێنانی بە هۆی ئەم گەشەیە دەزانی. بە بڕوای مارکس هۆکاری ئابووری دەوری سەرەکی لە پێشکەوتی مرۆڤدا دەگێڕێ و هۆکارەکانیتر بە هۆکاری لاوەکی دەزانێ. هەروەها بە بڕوای مارکس، جیاوازییەک کە لە شێوازی بەرهەمهێنان و قازانجێک کە لایەنەکانی پرۆسەی بەرهەمهێنان دەیبەن، دەبێتە سەرچاوەی ناکۆکی و ململانێ لە نێوان چینی چەوساوەو ڕەنجدەر کە کەمترین قازانجی بەردەکەوێ و چینی سەرمایەدار و خاوەن کەرەسەی بەرهەمهێنان کە بەشی هەرە زۆری قازانجی بەرهەمهێنان دەبات. ململانێی نێوان ئەم دوو چینە دەبێتە هۆی

سەرکەوتنی چینی کرێکار و نەمانی چینی سەرمایەدار. کرێکاران دەبنە خاوەنی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان و ئەو قازانجەی کە مافی خۆیانە، خۆیان دەیبەن. بە هۆی سەرکەوتنی چینی کرێکارەوە، ململانێی کۆمەلایەتی دوایی دێ (کوزر، ١٣٨٧؛ مارکس، ١٣٨٧؛ ریتزر، ١٣٨٥).

هەرچەند بیردۆزی مارکس هەنووکەش خاوەن کاریگەرییەکی بەرچاوە، بەلام پاش مارکس گۆڕانکاری زۆر بە سەر ئەم بیردۆزەدا هاتووە و دەتوانین بلێین کە گەشەیەکی بەرچاوی سەندووە. ئەم گەشەسەندنە سەرەتا لە سۆنگەی ماکس ڤیبێرەوە و پاشان بە هۆی زیملەوە بوو. ڤیبێر و زیمل بێجگە لە تەوەری ئابووری و بەرهەمهێنان، بگۆڕی دەسەلات و پێگەی کۆمەلایەتییان لێ زیاد کرد. بە گوێرەی بۆچوونی ڤیبێر، ململانێ بریتیە لە پێوەندییەکی کۆمەلایەتی کە تاک یان گرووپ دەیەوێ ویست و داخوازەکانی خۆی بە سەر تاک یا گرووپەکانی‌تردا داسەپێنێ. ململانێ قەد دوایی نایە و هەر کارێک بۆ سڕینەوەو لابردنی، دەبێتە هۆی سەرهەلدانی دووبارەی (کرایب، ١٣٨٨).

کۆزێر لە کتێبی «ئەرکەکانی ململانێی کۆمەلایەتی»دا (١٩٥٦) بادەداتە سەر ئەم بابەتەی کە ئەرکخوازی ناتوانێ پەرسڤدەری کێشەکانی ململانێی کۆمەلایەتی بێ و ئاماژە بە گوتاری زیمێل سەبارەت بە ململانێ دەکات کە دەلێ: ململانێ دەبێ جۆرێ لە کۆمەلگای مرۆیی بێ؛ چونکە لانی‌کەم دوو کەس پێکڕا دەبەستێتەوە. ململانێ ئەنجامی هۆکارگەلی جیاکەرەوەی وەکوو رق و قین و ئێرەییە و کۆشەوەیەکە بۆ چارەسەر کردنی ئەو ناکۆکیانەی هاتوونەتە ئاراوە و هەولێکە بۆ پاراستنی یەکیەتی، تەنانەت ئەگەر ئەم یەکیەتییە پێویستی بە نەمانی یەکێک لە دوو لایەن بێ. ململانێ و ئاشتی، هەر دوویان بیچمگەلێک لە کۆمەلگای شارستانی مرۆڤن؛ خالی بەرانبەری هەردووی ئەمانە بریتیە لە گوێ‌پێ نەدان. ململانێ رەهەندە

نیگه‌تیڤ و پازێتیڤه‌کان تێکه‌ڵ ده‌کات و کۆمه‌ڵگاش بۆ خۆی به‌رهه‌می ئه‌و ململانێ و ئاشتیه‌یه. ئه‌گه‌رچی ره‌نگه ململانێ له پانتای تاکه‌که‌سیدا خراپ و رووخێنه‌ر بێ، به‌ڵام مه‌رج نییه له رووبه‌ری کۆمه‌ڵایه‌تیشدا هه‌روابێ (کرایب، ١٣٨٨).

به بڕوای کۆزێر، ململانێ له یه‌کگرتوویی یه‌که‌ی کۆمه‌ڵایه‌تیدا ده‌وری هه‌یه. مه‌رج نییه ململانێ ببێته هۆی فه‌وتاندن و له‌ناو بردنی یه‌کێک له دوو لایه‌ن. به‌ڵکوو ده‌توانێ هانده‌رێک بێت بۆ پێشکه‌وتنی کۆمه‌ڵایه‌تی. ململانێ ده‌بێته هۆی کۆشه‌وه و رکه‌به‌ریی زۆرتر، که ئه‌نجامی ده‌بێته ئارخه‌یانی و خاترجه‌می و پێشکه‌وتن. بۆ وێنه کاتێک وڵاتێک له گه‌ڵ وڵاتێکی‌تردا تووشی شه‌ڕ و پێکدادان دێت، ناکۆکی و ململانێیه‌کان ده‌خرێنه لاوه و بۆ سه‌رکوت‌کردنی دوژمن و گه‌یشتن به دۆزی هاوبه‌ش هاوپه‌یمان ده‌بن. هه‌روه‌ها ئاماژه ده‌کات که ململانێیه چه‌ن لایه‌نه‌کان (له نێوان هۆز، ره‌گه‌ز، ژن و پیاو، پیرو گه‌نج و هتد) پێکرا تێکه‌ڵ ده‌بن و له دابه‌ش بوونی کومه‌ڵگا به دوو ره‌هه‌ندی دژ به یه‌ک به‌رگری ده‌کرێ (کوزر؛ ١٣٨٧). والێرێشتاین، یه‌کێک‌تر له بیرمه‌ندانی ململانێ، له مۆدێلی ململانێی چینایه‌تی مارکس سه‌باره‌ت به سیسته‌می جیهانی که‌ڵک‌وه‌رده‌گرێ و به‌جێی پێداگری له سه‌ر پێوه‌ندی ئابووری نێوان چینه‌کان، ئاماژه به پێوه‌ندی ئابووری نێوان نه‌ته‌وه‌کان ده‌کات (عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## ره‌چه‌ڵه‌ک / descent

واتای ره‌گه‌ز له کۆمه‌ڵناسیدا، بریتیه له هه‌مان واتای ئاسایی و گشتی ئه‌م زاراوه‌یه: فلان که‌س له ره‌چه‌ڵه‌کی Xه، (X ده‌توانێ شوێن، ناوچه، ره‌چه‌ڵه‌ک یاخۆ پێڕه‌وانی ئایینێکی تایبه‌ت بن)، واتای ئه‌مه بریتیه له‌وه‌ی که یه‌ک یان چه‌ن که‌س له پێشوونانی سه‌ر به گرووپی X بوون. واتای ئه‌م

زاراوەیە ئەوەنییە کە ئەو تاکە ئەندامی گرووپی Xە، بەڵکوو ئاماژە بەوە دەکات کە تاک بۆی هەیە هەرجۆرە ماف، ئەرک، تایبەتمەندی کولتووری، رامیاری یان کۆمەلایەتی باب و کالانی بە میراتی پێی بگات. بۆ وێنە کاتێک دەڵێین فلان کەس لە رەچەڵەکی بریتانیە،کەچی لە هەموو بارێکەوە فەرانسیە، بەلام باپیرە گەورەی لە بریتانیاوە هاتووە؛ یان فلان کەس لە رەچەڵەکی چینییە، کەچی لە باری کولتووری و رامیارییەوە ئەمریکییە و تەنیا لە باری رەگەزەوە چینییە.

رەچەڵەک دەتوانێ لە دوو قەوارەدا خۆی بگونجێنێ کە هەرچەن لێک نزیکن، کەچی جیاوازی زۆریان لە ناودا هەیە: ١) یەکەمیان زۆر لەوەی کە رەچەڵەکناسی باوی رۆژاوای پێی دەڵێن، نزیک دەبێتەوە. رەچەڵەک بە مانای پێوەندی خزمایەتی نێوان دوو کەسە، بەچەشنێ کە یان یەکێکیان باپیری یەکێکی تریانە یاخۆ هەردووکیان یەک باپیریان هەیە. رەچەڵەک زۆرتر بۆ دایک و باب دەگەڕێتەوە، کەچی پانتای ئەم زاراوە هەموو سیستەمی خزمایەتی دەگرێتەوە. لە هەندێ کۆمەڵگادا رەچەڵەک لە شێوازی بۆچوونی تاک سەبارەت بە پێوەندی خرمایەتی خۆی لە گەڵ کەسانیتر، وەکوو بازنەیەکە کە بە دەوری تاکدا کێشراوە و پێوەندی تاک لە گەڵ دایک و باب و بنەماڵەی دیاری دەکات. ٢) دووەمین واتای رەچەڵەک بریتیە لەو بەهرەی کە لە پێوەندی نێوخێزاندا-واتە ئەندامەتی لە گرووپێکی دیاریکراودا- هەیەتی. سیستەمە خێزانییە یەک هێلییەکان کۆمەڵگا بە گرووپگەلێکی لێک جیاواز دابەش دەکەن. لە ئاوەها کۆمەڵگایەکدا پشت ئەستوور بوون بە رەچەڵەک دەبێتە هۆی بەهرە بردن لە پێگە، ئەرک و مافێک کە بە هۆی ئەندامەتی لە گرووپی هاوڕەگەزدا دێتە دەست (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

بە گشتی دەتوانین ئاماژە بە سێ جۆرە رەچەڵەک بکەین:

**ره‌چه‌ڵه‌کی دایکی**: که بریتیه له‌و پێوه‌ندیانه‌ی که تاک به هۆی دایکه‌وه له گه‌ڵ باوباپیرانی هه‌یه‌تی. ره‌چه‌ڵه‌کی یه‌ک هێڵی له ڕێگای مێینه‌وه دان به پێوه‌ندییه خزمایه‌تییه‌کانی خۆیدا ده‌نێ، که هێڵی ره‌چه‌ڵه‌که‌کانی بۆ وه‌چه‌ی سه‌ره‌وه، له ڕێگای دایکیه‌وه ده‌ست پێده‌کات؛ به‌ڵام بۆ وه‌چه‌کانی خواره‌وه، به بنه‌ماڵه‌ی خۆی و کچی خوشکی و کچی براکانی ده‌ست پێده‌کات. میراته‌کان به‌م شێوازه له ڕێی دایکه‌وه دابه‌ش ده‌کرێن؛ واته له خاڵه‌وه بۆ کوڕی خوشک. پیاو له‌م سیسته‌مه‌دا پێگه‌ی کۆمه‌ڵایه‌تی و هێز و ده‌سه‌ڵاتی خۆی له گرووپی دایکییه‌وه به ده‌ست ده‌هێنێ؛ واته له که‌س و کاری دایکیه‌وه.

**ره‌چه‌ڵه‌کی باوکی**:واته ئه‌و پێوه‌ندییانه‌ی که تاک به باوباپیرانیه‌وه ده‌به‌ستێته‌وه، له ڕێی باوکیه‌وه‌یه (ره‌چه‌ڵکی یه‌ک هێڵی). تاک ته‌نیا له ڕێی باوکیه‌وه دان به پێوه‌ندیه خزمایه‌تییه‌کانیدا ده‌نێ و له ڕێی باوکیه‌وه هێڵی ره‌چه‌ڵه‌کی خۆی بۆ گه‌یشتن به نه‌وه‌کانی سه‌ره‌وه‌ی ده‌ست پێده‌کا و له ڕێی باوکییه‌وه میراتی پێده‌گات (مه‌عن خه‌لیل؛ ٢٠٠٧).

**ره‌چه‌ڵه‌کی چه‌ن هێڵی**: له‌و کۆمه‌ڵگایانه‌ی که تاک ئایدۆلۆژییه‌کی چه‌ن هێڵی هه‌یه، تاک ده‌توانێ به ویستی خۆی له ڕێی دایک یان باوکیه‌وه خۆی به وه‌چه‌ی سه‌روه ببه‌ستێته‌وه. له هه‌ندێ کۆمه‌ڵگای چه‌ن هێڵیدا تاک ده‌توانێ له‌هێڵێکه‌وه بۆ هێڵێکی‌تر بڕوا و ره‌چه‌ڵه‌کی خۆی بگۆڕێ، به‌و مه‌رجه‌ی که له یه‌ک کاتدا له یه‌ک گرووپدا بێ. له هه‌ندێ کۆمه‌ڵگای‌تریشدا تاک ده‌توانێ بۆ گه‌یشتن به ئامانجی جۆراوجۆر له گه‌ڵ چه‌ن گرووپدا که ده‌توانێ به خزمی خۆی بیانزانێ، پێوه‌ندی هه‌بێ (بیتس و پلاگ؛ ١٣٨٦).

**ره‌چه‌ڵه‌کی باوکی** / patrilineal descent : بڕوانه: **ره‌چه‌ڵه‌ک**

**ره‌چه‌ڵه‌کی دایکی** / matrilineal descent : **بڕوانه: ره‌چه‌ڵه‌ک**

**ره‌سم (سوننه‌ت)/ tradition**

ماکس ڤیبێر به‌جێی ئه‌وه‌ی که کۆمه‌ڵگاکان به گوێره‌ی تیکنۆلۆجی یاخۆ سیسته‌مه‌کانی به‌رهه‌مهێنان چین‌به‌ندی بکات، به گوێره‌ی جیهان‌بینی خه‌لک جڤاکه‌کانی چین‌به‌ندی کردووه. به واتایه‌کی ساکارتر، ڤیبێر ده‌گاته ئه‌م ئه‌نجامه‌ی که ئه‌ندامانی کۆمه‌ڵگاکانی پێش پیشه‌سازی، پشتیان به ره‌سمه‌کان به‌ستووه، له کاتێکدا خه‌ڵکی کۆمه‌ڵگا پیشه‌سازییه‌کان، پشتیان به ئه‌قلانییه‌ت ده‌به‌ستن. مه‌به‌ستی ڤیبێر له ره‌سم، ئه‌و هه‌ست و باوه‌ڕانه‌یه که له وه‌چه‌یه‌که‌وه بۆ وه‌چه‌یه‌کی‌تر ده‌گوازرێنه‌وه. له‌م سۆنگه‌وه رێنومای جڤاکه سوننه‌تییه‌کان، رابردوویانه. ئه‌ندامانی ئه‌م جڤاکانه، دروست و راست بوونی کرده‌وه‌کانیان به گوێره‌ی درێژخایاندنی ئه‌و ماوه‌یه هه‌ڵده‌سه‌نگێنن که ئه‌و کرده‌له لایه‌ن پێشوونانیانه‌وه په‌سند کراوه. له کاتێکدا خه‌ڵکی کۆمه‌ڵگا مۆدێرنه‌کان روانگه‌یه‌کی جیاوازیان بۆ جیهان هه‌یه و کرده‌کانیان نه به گوێره‌ی ره‌سم و سوننه‌ت، به‌ڵکوو به گوێره‌ی ئاوه‌ز و فامیان هه‌ڵده‌سه‌نگێنن. واته: رێنومای خه‌ڵکی کۆمه‌ڵگا مۆدێرنه‌کان، ئاوه‌زیانه نه‌ک رابردوویان.

**ره‌ش بگیر / witch-hunt**

ئه‌م زاراوه‌بۆ واتای تاوانباری بێ‌تاوان به کار ده‌برێ. کاتێ کاره‌ساتێ ده‌قه‌ومێ، خه‌ڵکی به دووی که‌سێکدا ده‌گه‌ڕێن که لۆمه‌ی بکه‌ن و هه‌موو گوناحه‌کان بخه‌نه ئه‌ستۆی ئه‌و. ناسین و دیاری کردنی پێناسه‌ی ئاوه‌ها که‌سێک ده‌بێته هۆی هاتنه دی ئه‌م خه‌یاله خاوه که خه‌ڵکی وابیر که‌نه‌وه

کە هەموو بارودۆخێکیـان لـە ژێـر کۆنترۆڵـدایە. ئـاوەهـا پێناسـەیـەک لـە هەڵومەرج، خۆی لە قەوارە و بیچمـی ڕەش بگـیردا دەنوێنـێ. ڕەش بگـیر، کردەوەیەکە دژ بە هۆکارگەلێکی تێکدەر، بە مەبەستی چاکسازی ڕەفتار یـان هەڵس‌وکەوتگەلێک کە دەبنە هۆی لاواز کردنی گـرووپ یـان وڵاتێـک. لـە ڕاستیدا بۆی هەیە کە کردەوەی ڕەش بگیر نەگات بە ئامانجی خۆی، چونکە ناسین، هۆی سەرەکی کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز و بەدەر لە هەڵس‌وکەوتی تـاک یان گرووپێکە کە ڕەش بگیر کراوە. زۆربەی کاتەکان، خەڵکێک کە بە هـۆی سەرەکی ئاژاوەیەک دەزانرێن، هۆی سەرەکی نین، بەڵام بـە قـەسـتی وا بـە خەڵکی دەناسرێن تا خەڵکی وابیر کەنەوە کە دەسەڵاتداران بارودۆخیان لـە ژێر کۆنترۆڵدایە. بۆ وێنە، کاتێک ڕامیاران و دەسـەڵاتـداران نـاتوانن بـڕیار و بەڵێنەکانیان بە ئەنجام بگەینن، بچووکترین دەنگی ناڕەزایەتی و ڕەخنە، بـە تاوان دەزانرێ و بە تونـدترین جـۆر سـەرکـوت دەکـرێ. بـە واتایـەکـی‌تـر، حکوومەت لە ئاوەها بارودۆخێکدا بە دووی کەسـێکدا دەگـەڕێ تـا هـەڵـە و پەڵەکانی خۆی بخاتە ئەستۆی و واپیشان بدا کە بـە هـەمـوو دەسـەڵاتـەوە بارودۆخی لە ژێر کۆنترۆڵدایە و بە جێی ئەوەی هۆی ناتەواوییەکانی لـە نێـو خۆیدا ببینێتەوە، هان دەدا تا بە سەرکوت‌کردنی ڕەخنەگران و ناڕازییەکـان، ئەوان بە هۆی نالەباری و کەم‌وکووڕییەکانی خۆی پیشان بدات.

## ڕەشکوژی / terrorism

تەنیا دیاردەی دژ بە هێورکردنەوەی ناوخۆی دەوڵەتەکان، دیاردەیەکە کە لە ژێرناوی ڕەشکوژی یان تیرۆریزمدا ناوی لێ دەبەن. تیرۆریـزم بریتیـە لـە هەڕەشە یان کەڵک وەرگرتن لە توند و تیژی بۆ گەیشتن بە دۆز و ئامـانجی سیاسی؛ ڕەشکوژان، بێجگە لە هەڕەشە یان توند و تیـژی چـەکدارانـە، هـیچ دەسەڵاتێکی سیاسی فەرمییان نییە. بە گوێرەی ئەم پێناسە، لە نێو وڵاتـانی

ئەمڕۆدا ڕەشكوژی بایەخێكی ئەوتۆی هەیە؛ چونكە لە دونیای ئەمڕۆدا حكوومەتەكان دەسەڵاتی سەربازی بە قۆرخی خۆیان دەزانن و بێجگە لە خۆیان كە لە هێزی چەكداری بۆ گەیشتن بە دۆز و ئامانجی سەربازی بەهرە دەگرن، ئەم مافە بە كەسی‌تر نادەن. بەم چەشنە، تیرۆریزم لە هەمان سیمبۆلی ڕەوای مەشرووعییەت كەڵك وەردەگرێ كە حكوومەتەكان لە گەڵی دژایەتی دەكەن. تیرۆریستان كارەكانیان بە یاسامەند دەزانن و خۆیان بە سەرباز ناودەبەن؛ بۆ ناونانی بەشەجۆراوجۆرەكانی ڕێكخراوەكەیان لە زاراوەگەلی سەربازی بەهرە دەگرن؛ وەكوو: ئەرتەشی ڕزگاریخواز ئیرلەند، بریگادەسوورەكانی ئیتاڵیا (گیدنز؛ ١٣٨٥).

تیرۆریزمیش وەكوو شۆڕش، كارێكە كە بە پێچەوانەی یاسا سەقامگرتووەكانی كۆمەڵگا ئەنجام دەگرێ. بەڕای ئوونیل، ڕەشكوژی بریتیە لە شێوازێک لە شەڕ كە تێیدا بزاڤێكی كۆمەڵایەتی كە دژ بە دەوڵەتە، هێزی چەكداری بە جێی ئەوەی دژ بە ئەرتەش بەكار ببا، دژ بە هاووڵاتیە ئاساییەكان بەكاری دێنێ *(O' Neill, B. E;1990)*. لەم ڕووەوە تیرۆریزم دەبێتە هۆی نیگەرانی، چونكە لەم شەڕەدا منداڵان و ژنان و پیاوانی بێ‌تاوان دەكوژرێن. لە لای ڕەشكوژان، هۆوە سیاسیەكان پاكانە بۆ كوژرانی بێ‌تاوانان دەكەن، چونكە بەڕای ئەوان گەیشتن بە دۆزە سیاسیەكان گرینگتر لە هەموو شتێكی‌ترە.

كاری ڕەشكوژی بریتیە لە تەقینەوە، مرۆڤ‌كوژی، دزینی خەڵكی، دزینی فڕۆكە و ئەشكەنجە. هەرچەند مەبەست لە ڕەشكوژی گۆڕانی هەڵس‌وكەوت و لایەنگرییەكانی گرووپ یان گرووپگەلێكی دیارە، بەڵام هەندێ جار ڕەشكوژان بە دووی ئامانجێكی خێرادان و خوازیاری ڕاكێشانی سەرنجی گشتی خەڵكن بەرەو لای خۆیان، یان بە نیازی دڵسارد كردنی خەڵكی و زۆرتر كردنی فەرمانبەرداری خەڵكی لە خۆیانن لە ناو و لە دەرەوەی گرووپدا

و تەنانەت سازیان لە گەڵ حکوومەت لە ڕێی وەرگـرتنی پـارەوە ( *O' Neill, B. E;1990*).

بەڕای بیرمەندی سەربازی ئەمریکی، کلایتـۆن نۆئێـل، تیرۆریـزم کاتێـک کاریگەرە کە بتوانێ سەرنجی دەزگاگەلی ڕاگەیاندنی گشتی نێونـەتـەوەیـی بەرەو لای خۆی ڕاکێشێ. پۆل جانسۆن بە چوار ڕوانگەی تیرۆریستی ئامـاژە دەکات:

١) ڕەشکوژان لە توندوتیژی (هـەرچـەن زۆربـەی کۆمـەڵـگاکان نکۆڵـی لێدەکەن) وەکوو تاکتیکێکی ڕەوای ڕامیاری بەهـرە وەردەگـرن. ڕەشـکوژان باری یاسایی و سەقامگرتووی وتووێژی سیاسـی لـە بـەرچـاو نـاگرن. لـەم ڕووەوە تیرۆر ستراتژیەکی لاوازی ڕێکخراوەییە کە مەبەستی زیان گـەیانـدن بە دوژمنێکی بەهێزترە. بۆ وێنە هەرچەن بە بارمتەگرتنی خـەڵـکی لـە نێـو هەموو جیهاندا بە هەڵسوکەوتێکی نەگونجاو پێناسـە دەکـرێ و دەناسـرێ، بەڵام بارمتەگران مەبەستیان لەم کارە ئەوەیە کە بیری گشتی خەڵکی بەرەو لای خۆیان ڕاکێشن.

٢) تیرۆریزم تاکتیکێکە کە نەتەنیا لە لایەن گرووپەکانەوە بەکار دەگیرێ، بەڵکوو دەوڵەتەکانیش کەڵکی لێدەگرن.

٣) هەرچەند کۆمەڵگا دیمۆکراتیکەکان تیرۆریزم بـە کـارێکی نائاکـاری و نەگونجاو دەزانن، بەڵام بە بۆنەی ئازادییـە بـەرفراوانـە شارسـتانییەکانـەوە و کەمتر بوونەوەی تۆڕی پۆلیس، لە بەرانبەر ڕەشکوژیدا زۆر زیان دەبینن. ئەم بابەتە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی حکوومەتـە دیمۆکراتیکـەکـان، کاتـێ هەست بە مەترسی دەکەن، ئازادییە شارستانییەکان وەلا دەنـێن و خـەڵـک لەو ئازادییانە بێبەش دەکەن. هەرچـەنـد کـردەوەی وەکـوو بارمتـەگـری و کوشـتنی ئاشـکرا، تـووڕەیـی گشـتی خـەڵـکی هـەڵـدەخـرێنێ، بـەڵام دژکردەوەیەکی کاریگەر لە بەرانبەر ئاوەها کردەگەلێک کێشـەی زۆر دێنێتـە

دی. چونکە زۆربەی گرووپە ڕەشکوژەکان، نهێنین و بە شێوازێکی بەرپیـوارو تارمایی ئاسا کار دەکەن، تۆڵە ئەستاندنەوە لێیان زۆر دژوارە. بەڵام بێدەنـگ بوون لە بەرانبەر ئاوەها گرووپکەلێک دەبێتە هۆی تەشەنەی ڕەشکوژی. بـەم بۆنەوەدژکردەوەیەکی سەربازی بەهێز دژ بە تیرۆریزم، دەتوانێ پانتای تونـدو تیژییەکان فراوانتر بکا و مەترسی شەڕی چەکدارانە بێنێتە ئاراوە.

٤) تیرۆریزم زاراوەیەکە کە دەتوانـێ واتـای زۆری بـێ. حکوومـەتـەکـان تەنانەت بە زۆر، خوازیاری دامەزرانـدنی ئـارامش و ڕێـکو پـێکین و ڕەنگـە مۆرکی ڕەشکوژ بە سەر ئەو کەسانەدا بنێن کە لە گەڵیان ناتەبان. ناکۆکییـە رامیارییەکان دەتوانن روونکـەرەوەی ئـەوە بـن کـە بـۆچی تاکێـک لـە لای هەندێ کـەس «تیرۆریسـت» و لـە لای هـەنـدێ کـەسـی‌تـر «لایـەنگـری ئازادی»یە.

## ڕەشکوژی دەوڵەتی / state terrorism

مەرج نییە کە ڕەشکوژی هەموو کات لە لایەن گرووپێکی بچووکەوە بـێ. بەڵکوو لەم چەن دەیەدا شێوازێکی‌تـری تـیرۆر کـە بریتیـە لـە تیرۆریزمـی دەوڵەتی باڵی بـە سـەر ڕەشـکوژیەکـانی‌تـردا کێشـاوە؛ واتـە زۆربـەی ئـەو ڕەشکوژییانەش کە ئـەنجـام دەگـرن، لـە لایـەن وڵاتانێکـەوە کـە نایانـەوێ راستەوخۆ نە گەڵ وڵاتێکی‌تر بە شەڕ بێن و بۆ ئەم مـەبـەسـتە ڕەشـکوژانی وڵاتی‌تر بەکرێ دەگـرن، هاتۆتـە دی. زۆرتـر ئـەم شـێوازە هـی ئـەو وڵاتـە لاوازانەیە کە تـوانی شـەڕی سـەربـازی راسـتەوخۆیـان لـە گـەڵ وڵاتێکـی بەهێزتردا نییە و بۆ گوشار خستنە سـەر ئـەو وڵاتـە لـە ڕەشـکوژی بـەهـرە وەردەگرن. جۆرێکی‌تر لە ڕەشـکوژی دەوڵـەتی، بریتیـە لـەو شـێوازەی کـە ئەمرۆکە لە نێو وڵاتـانی جیهـانی سـێیەم یـان ئـەو وڵاتانـەی کـە ئازادییـە شارستانییەکان زۆر لە ناویاندا گەشەی نەسەنـدووە و زۆرتـر لـە ڕۆژهـەڵاتی

ناوەڕاستدان، باوە. ئەو دەوڵەتانە بۆ داسەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان و لەناو بردنی ئەو تاک یان گرووپانەی کە بە شێوازی دیپلۆماسی لە گەڵ سیاسەتەکانیان ناتەبان و دژایەتی دەکەن، دەست دەدەن بە کوشتن و تیرۆری کەسایەتیە سەرەکی و ناسەرەکییەکان.

لە تیرۆریزمی دەوڵەتیدا، دەوڵەتەکان بۆ سەرکوت کردنی ناتەباییەکان، دەست دەدەن بە تیرۆری کەسایەتی ئەو تاک و گرووپانەی لە گەڵ سیاسەتەکانیان دژایەتی دەکەن. دەوڵەتەکان بە چەسپاندنی مۆرکی خراپکار، خاین، شۆفار، لادەر و ... پاکانەبۆ ڕەشکوژییەکانی خۆیان دەکەن. لەم دەوڵەتانەدا پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش دەسەڵاتێکی زۆریان هەیە و ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی گەورەکانی حکوومەتدان. پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش لەم حکوومەتانەدا دەوری دارەدەسی دەوڵەت دەگێڕن و ناکۆکان لە گەڵ حکوومەت، چ لە دەرەوەی وڵات و چ لە ناوخۆی وڵاتدا بە شێوازی جۆراوجۆر لەناو دەبەن (گیدنز؛ ١٣٨٦).

## ڕەفتاری بەکۆمەڵ/ collective behavior

ڕەفتاری بەکۆمەڵ بریتیە لە میتۆدەکانی هەڵسوکەوتێک کە هیچ پێکهاتەیەکی نییە، لە خۆڕا دێتە دی و پێشبینی ناکرێ. ئەو تاکانەی پێڕەوی لە ڕەفتاری بە کۆمەڵ دەکەن، لە بەرانبەر بزوێنەرێکی تایبەتەوە کە ڕەنگە ئەو بزوێنەرە تاک یا ڕووداوێک بێت، لە خۆیان دژکردەوەپیشان دەدەن. کۆمەڵەیەک کە لە یارییەکی فووتبۆڵدا بە هۆی سەرکەوتنی ئەو تیمەی کە لایەنگری لێ دەکات، ڕەنگە بڕژێنە نێو مەیدانی یاری و یاریکەرەکان لە ئامێز بگرن و لە سەر شان هەڵیانگرن؛ ئەمە نموونەیەکە لە ڕەفتاری بەکۆمەڵ.

نیل سمێلسێری کۆمەڵناس شەش مەرج وەکوو هۆکارە سەرەکییەکانی

ڕەفتاری بەکۆمەڵ دیاری دەکات (*Neil J. Smelser, 1962*- وەرگیراو لە: کوئن؛ ١٣٨٧):

بنەمای پێکهاتەیی: واتە دەبێ پێکهاتەی کۆمەڵگا بە چەشنێک بێ کە شێوازێکی تایبەت لە ڕەفتاری بەکۆمەڵی تێدا بقەومێ. بۆ وێنە لەو جڤاکانەی کە دەربڕینی ئەندێشە و بیرو بۆچوون، وتو وێژ، ئازادیخوازی، ڕەخنە و خۆپیشاندان و خەباتی ڕامیاریان تێیاندا قەدەغەیە، بنەما بۆ ڕەفتاری بەکۆمەڵیان تێدا ئامادەیە.

گوشاری پێکهاتەیی: کاتێک لە کۆمەڵگایەکدا گوشار و زەختێک دەخرێتە سەر خەلکی، ئەندامانی کۆمەڵگا بۆ دەرباز بوون لەو زەختە، بەرەو هاوکاری و ڕەفتاری بە کۆمەڵ پاڵ پێوە دەنرێن.

بۆچوونی گشتگیر: بەر لەوەی کە ڕێگا چارەیەکی بەکۆمەڵ بۆ پرسێک بدۆزرێتەوە، پێویستە کە هەموان دان بەوەدا بنێن کە پرس و کێشەیەک هەیە؛ کەواتە دەبێ پرسەکە بناسرێ، بیری گشتی سەرنجی پێبدەن و ڕێگەچارەگەلی شیاوی بۆ ببیننەوە.

هۆکارە خێراییپێدەرەکان: بۆ سەرهەڵدانی ڕەفتارێکی بەکۆمەڵ سەرەتا دەبێ ڕووداوێکی گرینگ خەلکی بەرەو دژکردەوە بهەژێنێ. ئەم ڕووداوە زۆرجار بە چاوڕاو گەورەتر پیشان دەدرێ و لە ئەنجامدا بە چەشنێکی سەرنجڕاکێشتر پیشان دەدرێ.

کۆوە بوون بۆ ڕەفتاری بەکۆمەڵ: کاتێک ڕووداوی خێراییدەر ڕووی دا، تاقمێ بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی کۆوە دەبن. ئەم جۆرە ڕێکخراوە کە ئەندامەکانی بەخێرایی لە دەوری یەک کۆوە دەبن، زۆر سستە و پێکهاتەیەکی خۆگرتووی نییە.

کاری کۆنترۆلی کۆمەڵایەتی: سەرکەوتن یا شکست هێنانی کۆشەوەی بەکۆمەڵی تاکەکان، بەستراوە بە سەرکەوتن یا شکانی مکانیزمی کۆنترۆلی

کۆمەڵایەتی. مکانیزمەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، وەکوو پۆلیس، هێزەسەربازییەکان، دەوڵەت و میدیا گشتییەکان، پێکەوە ئاکامی رەفتاری بە کۆمەڵ دیاری دەکەن (کوئن؛ ١٣٨٧).

## رەفتاری گشتی / mass behavior

شێوازێک لە رەفتاری بەکۆمەڵ کە بنەمای لە سەر پێوەندییە ناتایبەت و ناڕاستەخۆکانی کۆمەڵەیەکە کە ئەندامەکانی لە گرووپ و تاقمە جۆراوجۆرەکان پێک هاتووە. پێوەندییە گشتگیرەکان، بە پێوەندی کردن لە نێوان ئەو تاکانەی کە هیچ پێوەندییەکی تایبەتیان پێکەوە نییە و تەنانەت هیچ شتێکی هاوبەشیان لە نێواندا نییە، لە گەشەی هەڵسوکەوتە گشتییەکاندا دەورێکی کاریگەر دەبینن. رەفتارە گشتییەکان بریتین لە باوەڕو داخواز و ویستە جۆراوجۆرەکانی ئەندامانی کۆمەڵگایەک کە لە بزاڤە رامیارییەکانەوە بگرە تا دەگاتە مۆدی رۆژ، شێوازی جلو بەرگ لە بەر کردن، هەڵپەڕکێ و مۆسیقا دەگرێتە بەر.

## ڕەهەندی فەرمی ڕێکخراوەکان

## formal dimension of organization

کۆمەڵناسان لە نیوان باری فەرمی و نافەرمی ڕێکخراوەکاندا جیاوازی دادەنێن. رەهەندی رەسمی بریتیە لە رێنوێنەکان، یاساکان، دەستوورەکان و داب و دەستووره فەرمی و نووسراوەکانی رێکخراو کە ئامانج، یاسای چۆنییەتی پێوندی ئەندامان پێکەوە و هەروەها شێوازی هەڵسوکەوت و پێوەندی ئەندامان لە گەڵ رێکخراوەکانیتردا (بۆ وێنە پێوەندی لە گەڵ دامەزراوە حکوومیەکان) دیاری دەکات. هەروەها دەتوانین ئاماژە بکەین بەوەی کە ئەم زاراوەیە چەمکی چۆنییەتی دەور گێڕانەکان، پێوەندی زاتی

نێوان دەورەکان و لێکدانەوەی ئەرکی تاکەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجی ڕێکخراو ڕوون دەکاتەوە.

## ڕەهەندی نافەرمی ڕێکخراوەکان
## informal dimension of organization

ڕەهەندی نافەرمی بریتیە لەو نۆرم و پێودانانەی کە کرێکاران بە هۆی ئەوانەوە خۆیان لە کار دەدزنەوە و بە چەشنێکی سیستماتیک یاساکان و سیاسەتەکانی ڕێکخراوە دەخەنە پشت گوێ. بە گشتی ئەم زاراوەیە بریتیە لەو هەڵسوکەوتانەی کە نین لە سەر ڕێبازی ئارمانج و دۆزە سەرەکی و نووسراوەکانی ڕێکخراودا (*Sekulic, D; 1978: 27-43*). ئەم ڕێسا و نۆرمانە بریتین لەو یاسا و دەستوورە نەنووسراوانەی کە پێوەرەکانی پێوەندی ئەندامانی ڕێکخراو، شێوازی ئاخاوتنی شیاو و لەبار لە نێوانی کارمەندەکاندا، خێرایی کاری کارمەندان و کرێکاران ڕوون دەکەنەوە.

## ڕێبەرایەتی / leadership

لە نێوان ئەندامانی گرووپدا ڕەنگە تاکێک شوێنگەیەک بە دەست بێنێ کە بتوانێ بە سەر هەڵسوکەوت و ڕەفتاری کەسانیتردا کاریگەری هەبێ و ئەوان بێنێتە ژێر دەسەلات و ڕێبەرایەتی خۆی. ئەرکی ڕێبەر لە نێو گرووپدا پتر لە هەر شتێکیتر، کۆشەوەیە بۆ گەیشتن بە دۆز و ئارمانجەکانی گرووپ.

کۆمەڵناسان لە تۆژینەوەکانی خۆیاندا ئاماژەیان بە سێ شێوازی ڕێبەرایەتی کردووە کە برتیین لە:

ڕێبەرایەتی ئۆتۆریتانە (authoritarian leadership): ئەم چەشنە ڕێبەرایەتییە زۆرتر پێوەندی خۆی لە گەڵ ژێردەستەکانی بە پێوەندییەکی ئامرازی دەزانێ و پرۆسەی بڕیاردان، بە پرۆسەیەکی تاکەکەسی دەزانێ و

چاوەڕوانە کە ژێردەستەکانی بێچەندوچوون گوێڕایەڵی دەستوورەکانی بن. هەرچەند ئەم چەشنە ڕێبەرایەتیە لە لایەن سەرجەمی ئەندامانی گرووپەوە پەسند ناکرێ، بەڵام ڕێبەرێکی دەسەلاتدار کە توانی بڕیاردانی خێرای هەیە، لە هەلومەرجی قەیراندا، دەتوانێ لایەنگری زۆر لە دەوری خۆی کۆکاتەوە. لەم شێوە ڕێبەرایەتییەدا، ڕێبەرە کە دۆز و یاسا و ڕێساکانی هەڵسوکەوتی ئەندامانی گرووپ یان کۆمەڵگا دیاری دەکات. دەسەلاتێکی تەواو و بێکەم و کووڕی دراوەتە ڕێبەر و ئەویش بۆ بڕیاردان هیچ پێویستی بە ڕاوێژکردن لە گەڵ ئەندامانی گرووپەکەی نییە. ڕیز و ئەرکی پێگەکانی نێوو گرووپ، لە سەرەوە و لە لایەن ڕێبەرەوە دیاری دەکرێ. ئەندامانی گرووپ بۆ پاراستنی ئەندامێتی خۆیان لە نێو گرووپدا، ناچارن لەوەی کە گوێڕایەڵی ڕێبەرایەتی بن. ئەم چەشنە ڕێبەرایەتییە لە نێو ئەرتەش، حکوومەتەملهۆڕەکان، ڕێکخراوە پیشەسازی و بازرگانییەکان، خێزانە باوکسالارەکان و گرووپە لادەرە گانگستەرەکاندا دیارە.

ڕێبەرایەتی دیمۆکراتیک (democratic leadership): لەم ڕێبەرایەتییەدا پرۆسەی بڕیاردان بە چەشنێکە کە هەموو ئەندامان تێیدا بەشداری دەکەن. باوەڕ و کردەی ڕێبەرەکان لە گەڵ باوەڕ و بەها و نۆرمی هەموو ئەندامانـدا سازگار و یەکسانە. ئەوان بۆ مافی بەشداری ئەندامان لە پرۆسەی بڕیاردانـدا بایەخی ئەوتۆ دادەنێن و ئەم مافە لە ئەندامان ناگرنەوە. بناغەی ئەم شێوازە لە سەر باوەڕ بە بەهاکانی مۆرڤایەتی و باوەڕ بە بەهاکانی ئاریکاری و وتوویژ و یەکدەنگی ئەندامان، دانراوە. هەرچەن ئەم ڕێبەرایەتییە لە کاتی قەیرانـدا کەمتر لە ڕێبەرایەتی ئۆتۆریتە توانی چالاکی هەیە، بەڵام دەتوانێ بەردەوامی کومەڵگا و بەهاکانی کۆمەڵگا مسۆگەر بکا.

ڕێبەرایەتی ئابووری ئازاد (laissez faire): ئەم ڕێبەرایەتییە ئەندامانی گرووپ یا کۆمەڵگا بۆ جێبەجێ کردنی هەر کارێک کە خۆیان دەیانەوێ،

سەربەست دیلێتێیەوە. لە چاو جۆرەکانی تری ڕێبەرایەتیدا، ئەم جۆرە ڕێبەرایەتییە کەمتر دەتوانێ ئەندامان بۆ گەیشتن بە دۆزی هاوبەش پاڵ پێوەبنێ (*White, R & Lippitt, 1953*– وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨٤).

### ڕێڕەوی ژیان (پیشە) / career

ئەم زاراوە بە زۆری لە کۆمەڵناسیدا بەکار دەبرێ و بەم بۆنەوە واتا گشتییەکەی بەرانبەرە لە گەڵ کار یان پیشە و ئاماژەیەکە بە ئاستێکی بەرز لە بەردەوام بوونی کار و پیشەیەک کە مسۆگەری سەرجەمی ژیان بێ. واتایەکی گشتی‌تر، ئەم زاراوەیە بەم چەشنە پێناسە دەکات: پیشە بریتیە لە کۆمەڵە ڕێککەوتنێک لە گەڵ ئیدارە و دامەزراوە و ڕێکخراوە ڕەسمییەکان و پێوەندیە ناڕەسمییە کۆمەڵایەتییەکان کە بەو کارەوە بەندیوارن، یاخۆ زنجیرە کار و پیشەیەک کە سەرچاوەی کاری تاک یان گرووپێک پێک دینن.

بە سەرنجدانی زۆرتر بەم خاڵە کە مێژووی کاری تاکەکان تەنیا لە یەک کارو پیشەی تایبەتەوە سەرچاوە ناگرێ، واتای «تیپی کار» بەرفراوانتر دەبێتەوە. بەگوێرەی وتەی میلێر و فرۆم، بریتیە لە «زنجیرەیەک لەو کارانەی کە لە ڕەوتێکی یەکسان و تەکووز بۆ گەشەسەندن پێڕەوی دەکەن»؛ یان بە گوێرەی پێناسەی سووپێر، بریتیە لە «دوابەدوای یەک بوونی کارەکان لە ژیانی تاک یان گرووپێک لە تاکەکاندا. بۆ ڕوون کردنەوە و دیاری کردنی ئەو خولە گرینگانەی کە دەبنە هۆی هاتنە دی کار و پیشەیەک، دەتوانین ئەم دوابەدوای یەک بوونە بخەینە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە» (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

### ڕێسا / folkway

ویلیام گراهام سامنێر بۆ پیشان دانی نەرت و ڕێو ڕەسمەکانی نێوان

ئەندامانی کۆمەڵگا بۆ کارلێکە ئاساییە ڕۆژانەکانیان، بێجگە لە زاراوەی **دامودەستوور**، زاراوەیەکی‌تری داناوە کە پێی دەڵێ ڕێسا (عرف). لە لای سامنێر، گرینگی ڕێسا کەمتر لە دامودەستوورە. ڕێسا بریتییە لە چۆنییەتی جلک لە بەر کردن، ڕێزگرتن لە خەڵک و... . چونکە ڕێسا لە بەرانبەر دامودەستووردا کەمتر گرینگە، جڤاکەکان ئاسانتر دان بە لادان لە ڕێساکاندا دەنێن و کەمتر داکۆکیان لە سەر دەکەن. بۆ وێنە، ئەگەر کەسێک لە میوانییەکی ڕەسمیدا، جلکی ڕەسمی لە بەر نەکات، زۆر سەرنجی پێ‌نادرێ؛ ڕەنگە تەنیا هەندێ کەس پێی بڵێن کە شێوازی هەڵس‌وکەوت لە گەڵ خەڵکی نازانێ. بەڵام ئەگەر هەر ئەم کەسە پانتۆڵی لە پێدا نەبێ و بڕواتە نێو کۆبوونەوەیەکی ڕەسمییەوە، ئەوە لە ڕاستیدا سووکایەتی بە دامودەستووری کۆمەڵگا کردووە و لە گەڵ دژکردەوەی توندوتیژی خەڵکی ڕووبەڕوو دەبێ.

## ڕێکخراوە/ organization

ڕێکخراوە ئامرازێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی خەڵکی پێکڕا و بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەت دەستی ئاریکاری بدەن بە دەستی یەکترەوە. ڕێکخراوەکان دەتوانن فەرمی یا نافەرمی بن؛ هەروەها دەتوانن بۆ گەیشتن بە ئامانج یان ئامانجگەلێک دامەزرابێتن. بە گشتی گەیشتن بە دۆز و ئامانجەکان کاتێک ئاسانتر دەبێتەوە کە کۆشەوەکان لە قەوارەی ڕێکخراوەیەکدا بن. شێوازی ڕێکخراوە لە چەندوچوونی کردەی بە کۆمەڵدا کاریگەرە و هەندێ جاریش دەوری سەرەکی هەیە. ئەو جڤاکانەی کە بنەمایان لە سەر ڕێکخراوە خەڵکییەکان دانراوە، پتەوی و سەقامگرتوویەکی زۆرتریان هەیە، بەڵام بۆ چارەسەر کردنی پرس و کێشە ناوچەیی و بچووکەکان، تووشی کۆسپ و ئاستەنگی زۆر دەبن. ڕێکخراوەڕەسمییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستە گەورە و سەرەکییەکان، پێویستن. بۆ وێنە:

## ڕێکخراوە

هەرچەند دانیشتوانی ناوەندی لۆس ئانجلێس لە ساڵی ١٩٩٢دا بۆ چارەسەر کردنی کێشەی ڕەش پێستەکان دەستیان دا بە ناڕەزایەتی و ئاژاوەگێڕان، بەڵام بۆ ئەوەی کە شۆڕشەکەیان بکەن بە سەرهەڵدانێکی سەرتاسەری و لە ئەنجامدا لە یاسای نەتەوەییدا بیچەسپێنن، پێویستیان بە ڕێکخراوەیەکی ڕەسمی بوو.

بەگشتی، ڕێکخراوەکان لە سێ ڕووبەردا دەخرێنە بەر ڕاڤەو وردبوونەوە: ١) لە ڕووبەری تاکدا، ٢) لە ڕووبەری گرووپە بچووکەکانی شوێنی کاردا، ٣) لە ڕووبەری ڕێکخراوەی فەرمیدا.

١- لە ڕووبەری تاکدا، باس لە سەر چۆنییەتی شوێنی کار و کارلێکی نێوان تاک و ڕێکخراو و هەروەها کاریگەری تاک بە سەر ڕێکخراودایە. هەروەها باس لەو هێز و هۆکارانەی دەکرێ کە هەر چەشنەی کاریگەرییەکی پازیتیف یان نیگەتیڤیان بە سەر تاکدا هەیە. هەندێ لە تۆژەران بۆ پێداگری لە سەر ئەم تەوەرە، زاراوەی دەروونناسی ڕێکخراویان هێناوەتە کایەوە (organizational psychology). لە دەروونناسی ڕێکخراوەدا ئەنگیزەکانی تاک لە گرووپەکانی کاردا دەخرێنە بەر سەرنج و زۆرتر لە سەر تاک و چۆنییەتی سازگاربوون یا گونجانی لە گەڵ شوێنی کاردا دەخرێتە بەر باس.

٢- لە ڕووبەری گرووپە بچووکەکانی شوێنی کاردا ئەم خاڵانە جێگای سەرنجن: یەکگرتوویی گرووپ لە شوێنی کاردا بو کاریگەری بە سەر سەرکەوتن لە بواری گەیشتن بە ئامانجەکانی ڕێکخراوەدا؛ پێوەندی نافەرمی نێوان ئەندامانی گرووپی کار و کاریگەری ئەم پێوەندییە بە سەر تەواوتر کردنی پێوەندییە فەرمییەکانی نێو ڕێکخراوەدا؛ لێهاتوویی و قازانجدەری گرووپی کار. دەبێ بزانین کە لێهاتووییە تاکەکەسییەکان لەنێو ڕێکخرادا دەکەوێتە ژێر کاریگەری لێهاتووییەکانی گرووپەوە. سەرپەرشتەکانی

ڕێکخراوە پیشەسازییەکان زۆرتر پێیان خۆشە بەجێی ئەوەی کە سەرنج بدەنە لێهاتووییەکانی تاک، لە سەر چۆنییەتی شارەزایی و لێهاتوویی و کارزانی گرووپ باس بکەن. لە راستیدا گرووپ وەکوو واقعێکی سەربەخۆ دەزانرێ.

٣- لە رووبەری ڕێکخراوەی فەرمیدا یەکەی ئێمە بۆ باس و لێکدانەوە، سەرجەمی ڕێکخراوەیە. هەموو ڕێکخراوێک لە کەسانێک پێک هاتووە کە بەبێ سەرنجدان بەوەی کە چ کارێک لەنێو ڕێکخراودا دەکەن، پێوەندییەکی ئەرکخوازانەیان پێکەوە هەیە. هەروەها هەموو ڕێکخراوێک لە گرووپگەلی کاری جۆراوجۆر پێکهاتووە (صبوری، ١٣٨٨؛ راسل، ١٣٨۶). بڕوانە: **ڕێکخراوە فەرمییەکان**

### formal organization / ڕێکخراوە فەرمییەکان

ڕێکخراوە فەرمییەکان بە گرووپێک دەڵێن کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەت، بە گوێرەی یاسا و پێوەرەگەلی دیاری کراو، دامەزرابێ و پێک‌هاتبێ. جیاوازی ڕێکخراوە رەسمییەکان لە گەڵ شێوازەکانی‌تری گرووپدا، لە قەوارە و پێکهاتەو پێداگری لە سەر ئامانجەکان و چۆنییەتی ئەنجام دانی کارەکاندایە. لە بەراورد لە گەڵ شێوازەکانی‌تری گرووپدا، ڕێکخراوە رەسمییەکان زۆرتر مەیلیان بە گەورە بوون، ئاڵۆزتر بوون و کۆشەوەی زۆرتر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان هەیە.

ڕێکخراوەکان کاتێک دێنە دی کە بۆ گەیشتن بە ئاماجێکی دیاریکراو، نیاز بێ بە کۆوەکردنی لێهاتوویی و شارەزایی ژمارەیەک لە تاکەکان. هیچ تاکێک بە تەنیا خۆی ناتوانێ هەموو توان و بڕشتی پێویست بۆ ئیدارە کردنی کارخانەیەک (وەکوو پارچە چنین) دابین بکات. هەروەها کۆوە کردنی دیزاینێر (گەلالەدارێژ)، ئەندازیار، میکانیک، مەوادی سەرەکی و کرێکاران لە

شوێنێکی تایبەتدا ناتوانێ چارەسەری کێشەکە بکات. ئەندازیاران دەبێ بزانن کە نیازی گەلالەدارێژان چییە و کاری ئەندازیاران و میکانیکەکان پێکەوە هاودەنگ بێ. بەواتایەکی‌تر، هەموو ئەو کەسانەی کە خەریکی کار لە کارخانەیەکی پارچەچنینن، دەبێ ڕێککەوتوو بن. بۆ گەیشتن بە ئاوەها مەبەستێک دانانی هێڵی پێوەندی و دەسەلاتێک کە بتوانێ ئەرکی هەریەک لە ئەندامان و شێوازی پێوەندی نێوان بەشەکان دیاری بکات، پێویستە. ڕەنگە کرێکاران، کارمەندان، ئەندازیاران و میکانیکەکان نەمێنن، بەلام ڕێکخراوەکە دەتوانێ بۆ دەیان ساڵ درێژە بە ژیانی بدات. بۆ وێنە، ئەنجومەنی وەزیرانی حکوومەتێک هەر ٤-٨ ساڵ ئاڵ و گۆڕی بەسەردا دێ، کەچی حکوومەت، یان هەمان ڕێکخراوەی ڕەسمی، بۆ دەیان ساڵ بەردەوامە و درێژە بە ژیانی دەدا.

بەشەکانی ڕێکخراوە: دەزگا و ڕێکخراوە ڕەسمییەکان بە هەر مەبەستێکەوە کە دامەزرابێتن (بەرهەمهێنانی ترۆمبیل، پارچە، خانووسازی، گۆڕانی حکوومەت و هتد) هەموو لە هەندێ بەشدا یەکسانن. بە بڕوای سکۆت (*Scott, W. R; 1987*) ئەم بەشانە بریتیین لە: پێکهاتەی کۆمەلایەتی، کارمەندەکان، ئامانجەکان، تیکنۆلۆجی و شوێنی سروشتی.

پێکهاتەی کۆمەلایەتی: پێوەندی نێوان ئەندامانی ڕێکخراوەیەکی ڕەسمی، کەم تا زۆر، بە گوێرەی کۆمەلەیەک لە یاسا، پێوەر و میتۆد کە پێش‌بینی دەکرێن، داڕێژراوە. هەندێ ئامراز بۆ پەیدۆزی ئامانجە کورت ماوە و بلیند ماوەکان هەیە و تاکەکان دەبێ لە شوێنگە جۆراوجۆرە کارییەکاندا، ئەو ئەرکەی پێیان سپێردراوە، جێ‌بەجێی بکەن. ئە م ئامرازانە بە هۆی نۆرم و ڕێساگەلێکەوە ڕێنومایی و ڕێبەری دەکرێن. هەرچەند گلە و گازندەی کرێکاران لە بارودۆخ و هەل‌ومەرجی کار شتێکی زۆر باوە، بەلام هەر ڕۆژە میلیۆنەها کرێکار لە شوێنی جۆراوجۆردا خەریکی کارن و هیچ لە کار و

باریان پەکی ناکەوێ و تێکنادرێ.

کارمەندان و ئەندامان: زۆربەی ڕێکخراوەکان تەنیا دەتوانن پاژێک لە کاتی ئەندامانی خۆیان بگرنە بەرکار. بەم بۆنەوە زۆربەی خەڵکی، تەنیا ئەندامی ڕێکخراوەیەک نین و هاوکات ئەندامی چەن ڕێکخراوەی لێک جیاوازن. تاکێک دەتوانێ هاوکات هەم خوێنکاری زانکۆ بێ، هەم ئەندامی گرووپێکی ئایینی بێ، هەم فرۆشندەی دووکانێک بێ و هەمیش ئەندامی گرووپێکی وەرزشی بێ. هەروەها دەتوانێ هاوکات موشتەری چەندین فرۆشگە و ئەندامی ڕێکخراوێکی سیاسی، هاووڵاتی دەوڵەتێک و هتد بێ. ئاستی بەڵێنی ئەو تاکە بۆ هەر یەک لەو ڕێکخراوانە جیاوازە. ئەم بابەتە ئەم واتایەمان تێدەگەینێ کە هەموو ڕێکخراوە ڕەسمییەکان بۆ بە دەسهێنانی کات و ئەمەگداری ئەندامانیان دەبێ لە گەڵ گرووپ و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیتر خەریکی ململانێ بن.

ئامانجەکان: ڕێکخراوە ڕەسمییەکان دادەمەزرێن و بە چەشنێکی فەرمی دەردێن، چونکە ئامانج و دۆزی ڕوون و پێناسە کراویان هەیە و دەیانەوێ پێی بگەن. لە ڕاستیدا، ئامانجدار بوون بەشێک لە پێناسەی باوی ڕێکخراوێکی فەرمییە. بەڵام ڕادەو پێداگری لە سەر گەیشتن بە ئامانجەکان، لە ڕێکخراوەگەلی جۆراوجۆردا جیاوازە. کاتێک ڕێکخراوەیەکی ڕەسمی دێتە دی، ڕەنگە ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە هەموو کات و هێزی خۆیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ڕێکخراوە تەرخان بکەن. بە واتایەکیتر مانەوەو ژیانی ڕێکخراوە بەستراوە بە چۆنییەتی پەیدۆزی ئامانجەکانی ئەو ڕێکخراوەیە. هەروەها دەبێ بزانین کە ڕێکخراوە فەرمییەکان، سیستەمگەلێکی بەستراو نین کە هیچ پێوەندییەکیان لە گەڵ دەورو پشتیان نەبێ. بەڵکوو ڕێکخراوەکان بە کارمەند و سەرچاوەگەلێکەوە بەستراون کە لە دەرەوەی دام و دەزگای خۆیانن. چونکە هەموو ڕێکخراوێک بۆ ڕانانی

بەرهەمی خۆی لە گەڵ بازاڕ و ڕێکخراوەکانیتردا خەریکی ڕکەبەریٚ و ململانێیە، بەردەوام پێکەوە خەریکی چەقەن. کرێکاران و کارمەندانی ڕێکخراوەیەک ڕەنگە دەست بدەن بە مان گرتن و خوازیاری کەم کردنەوەی ماوەی کاریان بن؛ کڕیاران ڕەنگە خوازیاری جۆرێکیتر لە کالا بن؛ ڕەنگە حکوومەت هەندێ سنووری بەرتەسکتر دابنێ و شتی لەم چەشنە. بە هۆی ئەم گوشارە دەرەکییانەوە، دەبێ بەردەوام ئامانجەکانی ڕێکخراوە پێناسە بکرێنەوە.

تیکنۆلۆجی: ئامانج و دۆزی ڕێکخراوەیەک هەرچی کە بێت و هەرچەندیش ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێ، دیسان بوونی بەستراوە بەوەی کە «کارێک بکات». لێرەدا مەبەست لە تیکنۆلۆجی هەموو ئەو ئامراز و کەرەسانەیە کە ڕێکخراو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی بەهرەیان لێ دەگرێ. کاری هەندێ لە ڕێکخراوەکان گۆڕانەوەی مەوادی کاڵە بە کالایەک کە شیاوی بەهرەوەرگرتن بێ. ڕەنگە ئەم کارە (واتە گۆڕانەوەی مەوادی سەرەتایی بۆ کالا) یان بە دەست بکرێ یاخۆ بە ئامراز و مەکینەی میکانیکی و کارەبایی. کاری هەندێ ڕێکخراوەیتر گۆڕانی مندالانە بە هاوولاتیانی شارەزا (قوتابخانە)؛ کاری هەندێتر یارمەتی برینداران و نەخۆشانە بۆ چاکبوونەوەی باری تەندروستی (نەخۆشخانەکان). بەرهەمی ڕێکخراوە هەرچی کە بێ (بە مەکینەچێکراو یان خزمەتگوزاری)، تیکنۆلۆجییەک کە تێیدا بەکار براوە، کاریگەرییەکی زۆری بە سەر ئەندامان، ئامانجەکان و پێکهاتەی ئەو ڕێکخراوەدا هەیە. بۆ وێنە گەر ڕێکخراوێک بیەوێ کە سیستەمی خۆی بە کۆمپیوتەر تەیار کا، یان دەبێ کارمەندانی پێشووی فێری کار بە کۆمپیوتەر بکات، یان دەبێ کارمەندی نوێ دابمەزرێنێ. کە ئەم هەنگاوانە هەڵگیران، ڕەنگە ئەو ڕێکخراوە بە نیاز بێ کە خزمەتگوزارییەکانی لە ڕێی کۆمپیوتەرەوە بە ئەنجام بگەینێ تا موشتەری

زۆرتر بەرەو لای خۆی رابکێشێ (ئامانجی نوێ).

شوێن: هیچ ڕێکخراوێک ناتوانێ بۆ خۆی سەرجەمی پێداویستەکانی دابین بکات؛ هەموو ڕێکخراوەکان، پاژێک لە سیستەمی گەورەترن. بەو جۆرەی کە ئاماژەمان پێی کرد، قەوارەی هەر ڕێکخراوەیەک، دەنگدانەوەی پێوەندی ئەو ڕێکخراوە لە گەڵ ڕێکخراوەکانی‌تر، کڕیاران، بەرهەمهێنەرانی‌تر و خودی کۆمەڵگایە. ڕێکخراوەکان نیازیان بە سەرچاوە سروشتییەکان هەیە. ئەمان پێکهاتە، تیکنۆلۆجی، پسپۆڕ و تەنانەت ئامانجەکانیان لە شوێنی‌ترەوە دێنن. بۆ وێنە کارخانەیەکی پارچەچنی، کرێکاران و کارمەندەکانی لە شوێنگەلی‌ترەوە دابین دەکات؛ ئەندازیاران، گەلالەداڕێژان و بەڕێوەبەران دادەمەزرێنێ (پێکهاتە)؛ بە چەشنێک شوێنی کارخانە و نووسینگەکەی هەڵدەبژێرێ کە بتوانی موشتەری زۆرتر بە دەست بێنێ (ئامانج). ڕێکخراوەکان هاوکات بە سەر شوێن و دەورو پشتیاندا کاریگەریان هەیە. بۆ وێنە ڕەنگە هاتوچۆی زۆری موشتەرییەکانی ئەو ڕێکخراوە، بە سەر چۆنییەتی ترافیکی ئەو شوێنەدا کاریگەرییەکی نیگەتیڤی بێ؛ یان ئەوەی کە دووکەڵی کارخانەی ئەو ڕێکخراوە هەوای ئەو دەڤەرە پیس بکات.

## زاڵبوون (هەژمۆنی) / hegemony

ئەم زاراوە باس لە ڕێبازێ دەکا کە تێیدا چینێکی کۆمەڵایەتی، بە ڕێککەوتن نەک بە زۆر، بە سەر چینەکانی‌تردا زاڵ دەبێ. بە واتایەکی‌تر، باس لە و ئامرازانەی دەکات کە گرووپی دەسەڵاتدار و زاڵی کۆمەڵگا، گرووپەکانی‌تری کۆمەڵگا بە هۆی ڕێککەوتن و بیرو بۆچوونی زاڵی خۆیەوە، دێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی. یەکەم جار ئانتۆنیۆ گرامشی، شۆڕشگێڕ و دامەزرێنەری پارتی کمۆنیستی ئیتالیا لە *بیرەوەرییەکانی زینداندا* ئەم زاراوەیەی بەکار بردووە. لەم ڕووەوە، کولتوورەکان لە هەموو شێوازەکانیاندا، دەتوانن ببنە میکانیزمێک بۆ هان دانی خەڵکی کە سیستەمی باوی نێو کۆمەڵگا قبووڵ بکەن و بەبێ ڕەخنە گرتن و لە بارو دۆخێکی نایەکساندا سەری بۆ نەوی کەن. لە ڕێی بەکار بردنی کولتوورەوە، ڕەنگە بکرێ بۆ پاراستنی زاڵبوون، بەهرە لە زۆر و توندوتیژی وەرنەگیرێ. بیرمەندانی ململانێ ڕایان وایە کە سیستەمە کولتوورییەکان، نیازەجیاواز و نایەکسانەکانی مرۆڤەکان دیاری دەکەن و یەکێک لە ئەرکە گرینگەکانی پاژە کولتوورییەکان، پاراستنی زاڵبوون و سەرتری گرووپێک لە خەڵکە بە سەر گرووپەکانی‌تردا.

ئەم بۆچوونە، ئەو ڕەوتانەی کە مێتۆدە کولتوورییەکان لە سۆنگەیانەوە دەبنە هۆی یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی، لە بەرچاو ناگرێ. بەم بۆنەوە پێویستە کە بۆ باشتر تێگەیشتن لەکولتوور، بیردۆزی ململانێ و ئەرکخوازی، پێکڕا لەبەر چاو بگیرێن (عضدانلو، ١٣٨٤).

## زانست/ science

زانست بریتیە لەو بنەما و شێوازانەی کە تۆژەران بۆ ڕاڤەی پێوەندی نێوان ڕووداوەکان، دانیان پێیاندا ناوە و لە سەریان یەکدەنگن. کۆمەڵناسان

تێدەکۆشن لە شێوازی تۆژینەوەی زانستەکانی تر –بە تایبەت زانستە وردەکان وەکوو ماتماتیک- بۆ گەیشتن بە دەرەنجامێکی ڕێکوپێک و ڕاست و بێهەڵە بەهرە وەربگرن. کۆمەڵناسی –لانی کەم- لە پێنج بابەتدا لە گەڵ زانستەکانی‌تر هاوبەشە. ئەو پێنج بابەتە بریتین لە:

١- کۆمەڵناسی پشت بەو بەڵگە و داکیۆمێنتانە دەبەستێ کە لە ڕێی دیتنی سیستماتیکەوە کۆوە کرابێتن. کۆمەڵناسان دەپەرژێنە سەر ئەو زانیارییانەی کە کە لە ڕێی دیداری ڕاستەوخۆوە ڕاست بوونیان بچەسپێندرێ. بەواتایەکی‌تر، تا ئەو جێگای بۆیان بلوێ، هیچ شتێک بەچاوی بەستراو و بەگوێرەی باوەڕیان ناسەلمێنن. لە تۆژینەوەی کۆمەڵناسانەشدا وەکوو زانستەکانی‌تر، ئەگەر و گریمانە و بۆچوون هەیە. گریمانەکان ڕێگا و چۆنییەتی تۆژینەوەکە پیشان دەدەن، بەڵام بەر لەوەی کە ئاکامی تۆژینەوەکان بسەلمێندرێن، دەبێ تاقی بکرێنەوە.

٢- کۆمەڵناسی وەکوو زانستەکانی‌تر دەیەوێ خۆی لە هەڵە و پەڵەی دەمارگیری بپارێزێ. هەروەها بۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆیان لە تەکنیکی جۆراوجۆری وەکوو گرووپی کۆنتڕۆڵ و نموونەگیری هەڵکەوتانە، بەهرەوەردەگرن تا هەڵەکانیان بە کەمترین ڕادە بگەینن.

٣- کۆمەڵناسانیش وەکوو لێکۆڵەرانی زانستەکانی‌تر ڕەوت و ئەنجامی تۆژینەوەکانی خۆیان دەخەنە بەر دەست کەسانی‌تر تا تۆژەرانی‌تر بتوانن ئەم ئەنجامانە تاقی بکەنەوە و هەڵیانسەنگێنن. زۆرجار تۆژەرانی‌تر هەر لەو داتایانەئەنجامی‌جیاواز بە دەست دێنن.

٤- کۆمەڵناسی وەکوو زانستەکانی‌تر بەنیازی گشتگیر کردنی دەرەنجامی تۆژینەوەکانی خۆیە. بۆ وێنە کاتێ کۆمەڵناسان لە گەڵ ژمارەیەکی کەم لە خێزانەکان سەبارەت بە پێوەندی ناوخۆی ئەندامانیان وتوویژ دەکەن، تەنیا مەبەستیان زانینی پێوەندی نێو ئەو خێزانانە نییە، بەڵکوو مەبەستیان بە

دەس‌هێنانی داتاگەلێکە کە شیاوی گشتگیر کردن بن و بۆ هەموو خێزانێک بەکەڵک بن. بەواتایەکی‌تر، ئەوان بەنیازی گشتگیر کردنی دەرەنجامی تۆژینەوەکانیانن.

٥- کۆمەڵناسی وەکوو زانستەکانی‌تر دەیەوێ لە نێوان رووداو و کارەساتەکۆمەلایەتییەکاندا پێوەندی بدۆزێتەوە تا لە رێی ئەو پێوەندییەوە بتوانێ بگاتە بیردۆزێکی پەسندکراو. کۆمەڵناسان نە تەنیا پیشاندەری پرسە کۆمەلایەتییەکانن، بەڵکوو ئەو پرس و تەوەرانەش دەخەنەبەر راڤە و وردبوونەوە. ئەوان دەیانەوێ هۆی رووداوە کۆمەلایەتییەکان، ئەرکی دامەزراوە کۆمەلایەتییەکان، یاخۆ کردە کۆمەلایەتییەکان بزانن. بیردۆز یارمەتیان دەدات تا رووداو و کارەساتە کۆمەلایەتییەکان بناسن و راڤەیان بکەن. لەم سۆنگەوە دەست دەدەن بە پێش‌بینی رووداوەکۆمەلایەتییەکان.

## زانیاری / information

پاش ئەوەی کە داتاکان بە شێوەی چاپی، دەنگ یاخۆ فیلم خرانە بەردەست تۆژەران، دەبنە زانیاری. چونکە ئەم زانیارییانە بەرهەمی دیتن و بیستن و خوێندنی کەسانی‌ترن، دروست بوونیان زۆر جێی متمانە نییە. ژمارەی داتاکان کێشەیەکی سەرەکین لە سەر رێی توێژینەوەدا. بەم بۆنەوە تۆژەران دەبێ بە شارەزایی لە شێوازەکانی تۆژینەوە، زۆرتر بە چۆنییەتی ئەم داتایانە سەرنج بدەن، نەک ژمارەیان (*Michael, D; 1984: 347-54*).

## زمان/ language

زەقترین تایبەتمەندی بەرەی مرۆڤ، زمانە. زمان بریتیە لە سیستەمێک لە هێماکان (احمدی؛ ١٣٨٢). بەبێ زمان، کولتووریش قەد نەدەهاتە دی. زمان ئەو هەلەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا بتوانین لە توانایيە هەستی و هزری و

جەستەییەکانمان کەڵک وەربگرین. توانی پێوەندی کردن بە هۆی زمانـەوە، هەموو ڕەهەندەکانی کولتوور، لە پێوەندی خزمایەتییەوە بگرە تـا رامیـاری و ئایین و ژیانی خێزان و زانست و تیکنۆلۆجی، هێناوەتەژێر رکێفی خۆی.

دەتوانین بڵێین کە زمان، سیستەمێکی پێوەندی تایبەت بە مرۆڤە کە لـە سەر سیمبۆلە زارەکییەکان دارێژراوە. زمان کە تایبـەتمـەنـدی کۆمـەڵـگای گوتارییە و بە شێوازی جۆربەجۆر پێناسە دەکرێ، سیستەمێکـی پێـوەندییـە کـە بـە هـۆی سـیمبۆلە زارەکییـەکانـەوە –واتـە دەنـگ، نـەک نووسـین– دادەڕێژرێ و لە لایەن تاقمێکی مرۆییەوە بە مەبـەسـتی ڕاڤـە و لێکدانـەوە و پۆلێن و ریزبەندی ئەزموون و واتا و شتمەکەکانـەوە بـەکـار دەبـرێ (گولـدو کولب؛ ١٣٨٤).

کۆڵـینەوە لـە سـەر زمـان، هـەرچـەنـد لـە هـەمـوو لقـەکـانی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکاندا بووە، بەڵام زۆرتر لە لایەن مرۆڤناسـانەوە خـراوەتـە بـەر باس و لێکۆڵینەوە. ئێدوارد ساپیر یەکەم کۆمەڵناسێک بوو کە سەرنجی دایە بابەتی زمان وەکوو پێشکەوتێکی تایبەت بە مرۆڤ. هەرچەنـد دەبـێ بلـێین کە پێشتر ئەم بابەتە لە لایەن کـەسـانێک وەکـوو ڤـۆن هۆمبۆلـت، ئێـدوارد بارێنت تایلۆر و فرانتس بۆئاسەوە ئاماژەی پێ کراوە. ساپیر زمانی بە «شێوازێکی ناغەریزی و تایبەت بە مرۆڤ بۆ پێوەندی کردن و گواستنەوەی بیر و ئەندێشـە و هەست و نست و هەروەها سیستەمێک لە ڕەمـزە بـەرهـەمهـاتووەکـان» دەزانی (هەمان سەرچاوە).

وادیارە هەموو گیانداران بۆ گواستنەوەی هـەواڵ بـۆ یـەکتـری، هـەنـدێ ئامرازی تایبەت بە خۆیان هەیە. مێشهەنگوین بۆ ئەوەی پیشان بـدات کـە لە کوێدا خۆراک هەیە، دەست دەدا بە فڕینێکی تایبـەت کـە وەکـوو سـەمـا دەمێنێ. سەگ بۆ پیشاندانی ئامادەبوون بۆ جووتگیری، بۆنێکی تایبەت لە خۆی دەردەکا. هەرچەند زمانی مرۆڤ لە گەڵ دەنگ هاوڕێیە، بـەڵام دەنـگ

بۆ ئاخافتن مەرج نییە. زۆر دەبینین کەسانێک توانی ئاخافتنیان نییە، کەچی بە هێما و ئاماژە مەبەستی خۆیان دەردەبڕن. لە بەرانبەر ئەوانەش گیانداری وەکوو تووتی هەیە کە هەرچەند دەتوانێ دەنگەکانی ئاخاوتنی مرۆڤ بەکار ببات، کەچی توانی قسە کردن بە شێوازی مرۆڤی نییە (بیتس و پلاگ؛ ١٣٨٦).

بەڵام زمانی مرۆڤ، زمانێکی کراوەیە و ژمارەی ئەو هەواڵانەی کە بەم زمانە رادەگوازرێنەوە، لە رادەبەدەرن. لە راستیدا مروڤەکان دەتوانن رستە و هەواڵی نوێ کە پێشتر قەد نەبێژراون، بڵێن. کەچی زۆربەی سیستەمە هەواڵییەکان (مەبەست گیاندارانیتره کە لە دەنگ تەنیا بۆ گەیاندنی هەواڵ کەڵک وەردەگرن، وەکوو ئەوەی لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا) تەنیا هەندێ واتای ساکار و سنووردار وەکوو مەترسی، دوژمنی، مەیلی جنسی، برسیەتی و شتی وا رادەگوێزنەوە. بە گوتەی بێرتراند راسێل «سەگێک هەرچەند کە بتوانێ بە جوانی بگەفێ، بەڵام قەد ناتوانێ بە ئێوە بڵێ کە دایک و بابم هەژارن، بەڵام خاوەن شەرافەتن» (هەمان سەرچاوە).

ئەو کەسانەی لە سەفەر بۆ وڵاتانی بیانی ویستوویانە بە کەڵکگرتن لە فەرهەنگی وشە پێوەندی بە خەڵکەوە بکەن، بە راشکاوی تێگەیشتوون کە زمان تا چ رادەیەک ئاڵۆزە. زانینی واتای وشەکان بە تەنیا بۆ ئاوەها پێوەندییەک بەس نییە. دەبێ شارەزای رێزمان و پێکهاتەی ئەو زمانەش بن. بێجگە لەمەش، هەر زمانێک دەنگی تایبەت بە خۆی هەیە و زۆرێک لەم دەنگانە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکیتر جیاوازن. بۆ وێنە زۆر دەنگی ناوچەیی لە زمانی کوردیدا هەیە، کە خەڵکی ناوچەکانیتر بە ئەستەم بتوانن بیڵێنەوە؛ وەکوو دەنگی «د» لە بنزاراوەی ئەردەڵانیدا، یاخۆ «رد» لە زاراوەی هەورامیدا.

هەموو زمانێک خاوەنی وشە و زاراوەگەلێکە کە دیتنەوەی واتای

هاوچەشن بۆ ئەو وشانە لە زمانەکانیتردا زۆر دژوارە. ئەم وشە و زاراوانە کە وەرناگێڕدرێنە سەر زمانێکیتر، ئەم پرسیارانەیان بۆ زمانناس و مرۆڤناسان هێناوەتە ئاراوە کە: ئایا جیاوازی زمانەکان دەتوانێ یەکێک لە هۆکانی جیاوازی جیهانبینی تاکەکان بێ؟ ئایا جیاوازی زمان بۆتە هۆی جیاوازی فام و تێگەیشتنی تاکەکان لە ناوچە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان؟ ئایا ئێمە لە نێو زیندانی زمانی خۆماندا قەتیس ماوین؟ هەندێ مرۆناسی وەکوو ساپیر و ڤۆرف رایان وایە کە ئێمە لە نێو زیندانی زمانی خۆماندا دیلین. بە گوێرەی گریمانەی بەناوبانگی ڤۆرف، زمان دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی سەرنج بە هەندێ لە شتەکان بدەن و بە هەندێکیتر سەرنج نەدەن. بۆ وێنە لە زمانی ئینگلیزیدا بەو شتەسپییە نەرمەی کە لە ئاسمان دادەبارێ دەڵێن بەفر (snow) کەچی سکیمووەکان بۆ ئەم واتایە پتر لە بیست وشەیان هەیە کە هەر وشە باس لە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی بەفر دەکات؛ وەکوو قورسایی، ئەستووری و شتیتر. هیچ یەک لەم زاراوانە ناتوانن بە تەنیایی هەموو ئەو دانستانە پێناسە بکەن (بیتس و پلاگ؛ ١٣٨٦).

## زمانناسی کۆمەڵایەتی/ sociolinguistics

زمانناسی کۆمەڵایەتی یەکێکتر لە لقەکانی کۆمەڵناسییە کە لە سەر پێوەندی زمان و ژیانی کۆمەڵایەتی تاک دەکۆڵێتەوە. دەبینین کە جڤاکە جۆراوجۆرەکان، بە گوێرەی نیازەکانیان زمانیان لە گەڵ هەل و مەرجی نوێدا دەگونجێنن. لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە، واتە پێوەندی دوو لایەنە لە نێوان بگۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و زمان، پێی دەڵێن زمانناسی کۆمەڵایەتی؛ وەکوو ئەوەی کە زمانناسانی کۆمەڵایەتی زانیویانە، تەنیا جیاواز جۆگرافیایی نییە کە بۆتە هۆی ئەوەی زمانێک بە شێوازی جۆراوجۆر بەکار ببرێ. فەرمی بوونی پێوەندی بێژەرانی زمانێک، شوێنگەیان، دەورە جنسییەکان و تەنانەت

تەمەنیان، لە رەفتاری زمانی جیاوازیاندا خۆی دەنوێنێ. خەڵکی کاتێ گوێ لە زمان و ئاخافتنی یەکتر دەگرن، هاوکات لە گەڵ گوێدان بە قسەکانیان، هان دەدەن تا لە سۆنگەی ئەو وشە و زاراوانەوە کە بەکاریان دەبەن، پێگە و شوێنگەی کۆمەلایەتی یەک بناسن. هەروەها لە کاتی قسە کردندا هەندێ زانیاری سەبارەت بە خۆیان بۆ گوێگر ئاشکرا دەکەن. لە هەر کۆمەڵگایەکدا، هەڵبژاردنی زاراوەو وشەکان، شێوازی ئاخافتن و سەرجەمی زمان، پێگەی کۆمەلایەتی، پەروەردە و ئاستی خوێندن، تەنانەت شوێنگەی جوگرافیایی بێژەر، پیشانی گوێگر دەدرێ.

## زۆرینە / majority

زاراوەی زۆرینە زۆرتر بۆ دەنگدان بەکار دەبرێ؛ واتە زۆرترین رادە و ژمارەی دەنگدەران یاخۆ بە واتای زۆرتر لە نیوەی دەنگدەران. لە پەرلەمان یان ئەو شوێنانەی کە کاریان تۆماری یاسایە، هەندێ جار زۆرینە ناوێکە بۆ کەسێکی تایبەت، وەکوو رێبەرانی پارت یان هەڤبەندی ئەو پارتانە کە بەرنامە و دەستوور و یاساکانی پەرلەمانیان لە ژێر چەتری دەسەلاتدایە.

گەر تاقمێک وەکوو دەنگدەران، کۆڕی یاسادانەران یان دەستەی بەڕێوەبەران بە نیاز بن بڕیارێکی گرینگ بدەن، رێک کەوتن بۆ ئەم بڕیارە پێویستی بە یاسا و دەستوورێک هەیە. چونکە پێناسەیەکی تایبەت لە یاسادا بۆ زۆرینە نەکراوە، دادگاکانی بریتانیا و ئەمریکا لە کاتی پێویستدا هەموویان لە سەر ئەوەی کە پێوەر، دەنگ و رای زۆربەی بەشدارانی پەرلەمان یاخۆ دەستەی بەڕێوەبەر بێ هاودەنگن. زۆرینە گەلێک گرینگە لە کاتێکدا کە بۆ بڕیارێک پێویست بێ پتر لە زۆربەی ئەو کەسانەی کە دەتوانن دەنگ بدەن —بۆ وێنە دوو سێیەم یا سێ چوارەمی کەسانێک کە دەتوانن دەنگ بدەن– لە دەنگداندا بەشداری بکەن؛ مەبەست لەئاوەها زۆرینەیەک ئەوەیە کە مافی

ڤیتۆ لە لایەن یاساوە پێشکەش بەو کەمینەیە بکرێ کە لە بەرانبەر بیرو ڕای زۆرینەدا ڕاوەستاوە. دەبێ سەرنج بدرێتە ئەم خاڵە کە لە کاتێکدا کە یەکەی دەنکدان دیاری نەکرابێ یاخۆ بەر لە دەنگدان پێوەرێکیان بۆ ڕەچاو نەکردبێ، بۆ کەڵک وەرگرتن لە وشەی «زۆرینە» تووشی کێشە و لێڵییەکی گرینگ دەبن (گولد، ١٣٨٤).

## ژنانەکردنی هەژاری/ feminization of poverty

ئەم واتایە باس لە ڕەوتێک دەکات کە ژنان پێشاندەری ڕێژەی هەژارین؛ بەم چەشنەی کە لە پێوانە لە گەڵ پیاواندا ژنان هەژارترن و ئەمە پرۆسەیەکی ڕوو لە زۆربوونە. پیتێر تاونسێند (*peter townsend*)، لە تۆژینەوەکانی خۆیدا ئاماژە بە چوار تاقمی ژنان دەکات کە پیشاندەری «هەژاری ژنانە»ن:

١- ژنانی زگورت (هەروەها ئەو ژنانەی کە تەلاق دراون) لە گەڵ منداڵیان؛

٢- ژنانی بە ساڵاچووی وەنیشتە (تەقاعودی)؛

٣- ژنانی نەخۆش کە بە دووی منداڵ یا خزمانیتردا دەگەڕێن؛

٤- ژنانێک کە داهاتیان زۆر کەمە.

ژنانەکردنی هەژاری بەشێک لە گۆڕانێکی زۆر گەورەترە؛ واتە: پەرە سەندنی ئەو خێزانانەی (لە هەموو چینەکاندا) کە بە هۆی ژنێکی زگوردەوە بەڕێوە دەبرێن. ئەم ڕەوتە، هاوڕێ لە گەڵ ئەم ڕاستییە کە ئەندامانی ئەم خێزانانە لە مەترسی تووش هاتن بە هەژاریدان، ئەم پرسە دێنێتە کایەوە کە بۆچی ژنان لە زۆربەی وڵاتە ئەورووپییەکاندا (هەروەها منداڵەکانیان) پیشاندەری بەشی سەرەکی هەژاری کۆمەڵگان. ژنانی ڕەشپێست لە نێو هەموو ئەم چینانەدا هەن و هەژارییەکەیان سەرنجڕاکێشە ( *Glendinning,*

*C. & J. Millar; 1987*- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨٤).

## ژینگەناسی / ecology

ئێکۆلۆجی کۆڵینەوەیە لە سەر پێوەندی نێوان ئۆرگانیسمەزیندووەکان و ژینگەیەک کە ئەم ئۆرگانیسمانە تێیدا دەژین. ئێکۆلۆجی هان دەدا بۆ توێژینەوە لە سەر تۆڕی پێوەندی نێوان ئۆرگانیسمە زیندووەکان (روەک و گیانداران)، پێوەندی ناوخۆی ئەم گیاندارانە، پێوەندی نێوان جۆرەکانی بوونەوەران، پێوەندی ئەم گیاندارانە لە گەڵ سروشتی ژینگەیاندا (زەوی، ئاو و هەوا و ...). ژینگەناسی روەک و گیانداران لە سەر چۆنییەتی سازگار بوونی گیانداران لە گەڵ ژینگە و لە گەڵ خۆیان دەتۆژێتەوە؛ ژینگەناسی مرۆڤیش لە سەر پێوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت دەکۆڵێتەوە. هەرچەند ژینگەناسان دانیان بە سەر ئەم پێناسە گشتییەدا ناوە، بەڵام هاوکات لە گەڵ گەشەسەندنی ئەم لقەی زانستە، پێناسەی‌تریش هاتوونەتە ئاراوە:

١) توێژینەوە لە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە رێی لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو شوێنانەی بە هۆی مرۆڤەوە داگیر کراون، یان دابەش کردنی کاتی تاکەکان، گرووپ و خزمەتگوزارییەکان لە هەل و مەرجی دیار و تایبەتدا، هەروەها ئەو هۆکارانەی کە لە دابەش بوونی مرۆڤ بە سەر ژینگەدا کاریگەرییان هەیە. لە ئاستی پێناسەکانی‌تردا، ئەم پێناسە لە لایەن زۆربەی کۆمەڵناسانەوە پەسند کراوە.

٢) توێژینەوە لە سەر ئەو رێگاچارانەی کە جەماوەرێک بۆ ژیان و مانەوە لە شوێنێکدا خۆیانی لە گەڵدا رێک دەخەن. ئەم پێناسە لە لایەن ئا. هاولییەوە پێشنیار کراوە (*Hawley, A. H; 1948*).

٣) توێژینەوە لە سەر شێوازی ژیانی رێکخراوە مرۆڤییەکان؛ واتە ئاستی ئەو رێکخراوانە کە بەرهەمی کۆشەوەی مرۆڤەکان‌بۆ ژیان و مانەوەن و

بناغەی لە سەر ململانێی نامرۆڤانە و گەلالە نەکراو دارێژراوە. ئەم پێناسە لە لایەن رابێرت پارک و ژینگەناسانی کلاسیکەوە باس کراوە. لە دەیەکانی ۱۹۲۰ و ۱۹۳۰دا ئەمانە یەکەم کۆمەڵناسانێک بوون کە هانیان دا تا دیزاینی هەزری ژینگەناسی روەک و گیانداران، بە چەشنێکی سیستماتیک بۆ توێژینەوەلە سەر جڤاکە مرۆڤییەکانیش بەکار بهێنن. بەگوێرەی ئەم پێناسەیە، ئاستی کولتووری کۆمەڵگا کە بنەمای لە سەر پێوەندی و سازگاری کۆمەلایەتی دارێژراوە، لە کۆڵینەوەی ژینگەناسی مرۆپیدا نەخراوەتە بەرچاو. بەم بۆنەوە ئەم پێناسە لە کۆتایی دەیەکانی ۱۹۳۰ و سەرەتای دەیەی ۱۹٤۰دا بە توندی رەخنەی لێ گیراو لەلایەن زۆربەی کۆمەڵناسانەوە حاشای لێ کرا. بەشی هەرەزۆری ژینگەناسانی هاوچەرخ، بگۆڕی کولتوور لە شیکردنەوەو لێکدانەوەی ژینگەناسی مرۆڤی خۆیاندا بەکار دەبەن و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لە نێوان چینی سەرووی رێکخراوە کۆمەلایەتییەکان و چینی خوارووی ئەم رێکخراوانە جیاوازی دادەنێن.

٤) خوێندنەوەی جوگرافیای مرۆڤی: ئەم پێناسە لە لایەن زۆربەی کۆمەڵناسان و جۆگرافیزانەکانەوە پەسند کراوە. بە گوێرەی ئەم پێناسەیە، ژینگەناسی مرۆڤی بریتیە لە توێژینەوە لە سەر پێوەندی دوو لایەنەی نێوان کولتووری مرۆڤ و ژینگەی فیزیایی مرۆڤ. زانا سەرەتاییەکانی جوگرافیای مرۆڤی، وەکوو فرێدریک راتزێل و ئالێن سەمپێل رایان وابوو کە هەل و مەرجی جوگرافیایی، شێوازی ژیان و کولتووری مرۆڤ دیاری دەکات. بەلام ئەمڕۆکە ئەم بۆچوونە بە ئەستەم پەسەند دەکرێ. جوگرافیزانانی هاوچەرخ زۆرتر پێداگرێ لە سەر کاریگەری دوولایەنەی مرۆڤ و سروشت دەکەن. واتای ئەمە ئەوەیە کە بە هەمان چەشن کە ژینگە و سروشت بە سەر جڤاکی مرۆییدا کاریگەری هەیە، دەستێوەردان و کۆنترۆڵی مرۆڤ بە سەر سروشتدا دەبێتە هۆی گۆڕانی سروشت و جوگرافیای مرۆڤ. بەم بۆنەوە ئەمڕۆکە

زانایانی جۆگرافیای مرۆیی و ئیسنۆگرافان، جوگرافیای مرۆیی بە ژینگەناسی مرۆڤی دەزانن.

## ژینەوەرناسی کۆمەڵایەتی/ sociobiology

ئـەم زاراوە بـاس لـە راسـتییەکـی کـۆن دەکـات، بـەڵام وەک لقێکـی تۆمارکراوی زانستی، دەگەڕێتـەوە بـۆ چـاپی کتـێبی ئـیَ.ئـۆ. ویلسـۆن، لـە ژێرناوی *ژینەوەرناسی کۆمەلایەتی: سەنتەزێکـی نـویَ* (١٩٧٥). پـاش بـڵاو کردنەوەی ئـەم کتێبـەبـوو کـە ئـەم لقـە زانسـتییەلـە بنـەماڵـەی زانسـتە کۆمەلایەتییەکاندا سەری هەڵدا و لە لایەن ئەم زانستەوە بـە تونـدی خرایـە بەر رەخنە و لیَپرسینەوە.

بەبڕوای لایەنگرانی ژینەوەرناسی کۆمەلایەتی، بابەتی ئەم زانسـتە بریتیـە لە روون کردنەوەی بەدیهاتنی ژمارەیەک دامەزراوەی کۆمەلایـەتی لـە سـەر بنەمای داتاکانی بیردۆزی نـوێی گـۆڕان (تحـول)، بـەو چـەشـنەی کـە لـە بەرهـەمـەکـانی دارڤـیندا راڤـە کـراوە و بـە دارڤـینیزمی نـویَ و بـیردۆزی «تێکەلاوی» گۆڕان دوایی هاتووە. ئەم لقە لە رەوتی بەدیهاتنیـدا پشـتی بـە دەسکەوتە ژنێتیکییە نوێکان بەستووە، لقێـک کـە تۆژینـەوەکـانی مـەنـدێل بەردی بناغەیانی پێک دەهێنا و لـە خـولی نوێـدا لـە ژێـر سـای گـەشـەی ژینەوەرناسی مولکوولیدا ژیاوەتەوە.

پانتای تۆژینەوەی ژینەوەرناسی کۆمەلایەتی، بە گشتی لە دونیای ئاژەلان پێک دێت. ویلسۆن بۆ خۆی پسپۆڕ و شارەزای حەشەرە کۆمەلایەتییـەکـان بوو. هەندیَ لە ژینەوەرناسانی کۆمەلایەتی، وەکوو ویلسۆن، رایـان وایـە کـە ژینەوەرناسی کۆمەلایەتی دەتوانیَ بۆ ناسینی هەندیَ لە دیاردەکانی کۆمەڵگا مرۆییەکان یارمەتیـدەر بێـت. هـەرئـەم بۆچوونـە، بۆتـە هـۆی ئـەوەی کـە ژینەوەرناسی ببێتە هۆکارێک بۆ شەڕەقسـەیـەکـی ئایـدۆلۆجیکی (بـودون و

بوریکو؛ ١٣٨٥).

بەگشتی ئێمە باش دەزانین کە کولتوور، بەرهەمی مرۆڤە. بەڵام هەنووکە ئەم پرسە بەردەوامە کە ئایا بایۆلۆجی و ژێنی مرۆڤ بە سەر گەشە و پەرەسەندنی کولتووردا کاریگەریان هەیە یا نە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە ئەستۆی ژینەوەرناسی کۆمەڵایەتیدایە کە هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکان و هەلومەرجە بایۆلۆجییەکان پێکەوە دەخاتە بەر راڤە و وردبوونەوە. لەم رووەوە ژینەوەرناسی کۆمەڵایەتی پارادایمێکی هزرییە کە هان دەدات بزانێ بایۆلۆجی مرۆڤ چ کاریگەرییەکی بە سەر بەدیهاتنی کولتووردا هەیە. دارڤین لە نامیلکەبەناوبانگەکەی خۆیدا کە لە ژێرناوی *سەبارەت بە سەرچاوەی بوونەوەران* کۆڵاوەتەوە، جەخت لە سەر ئەم بۆچوونە دەکات کە ئۆرگانیزمی گیانداران، لە درێژایی مێژوو و بە هۆی هەڵبژاردنی سروشتییەوە، گۆڕانی بە سەردا دێ. لۆجیکی ئاڵوگۆڕی داروین لە سەر چوار بنەما دارێژراوە:

١- هەموو گیانداران لە درێژایی ژیانیاندا هان دەدەن کە خۆیان نوێ بکەنەوە.

٢- نەخشەی گشتی ئەم بەرهەمهێنانەوە بە هۆی ژێنی (jen) گیاندارانەوە کێشراوە. ژێن یەکەی سەرەکی ژیانی گیاندارانە کە تایبەتمەندییەکانی بەرەیەک بۆ بەرەیەکیتر رادەگوێزێتەوە. ژێنی گیاندارانی جۆراوجۆر لە گەڵ یەک جیاوازییان هەیە. ئەم جیاوازییە یارمەتی گیانداران دەدات تا لە شوێنی جۆراوجۆردا درێژە بە ژیانیان بدەن.

٣- بە گوێرەی جیاوازی ژێنی گیانداران، هەندێ لە ئۆرگانیزمەکان، لە چاو ئۆرگانیزمەکانیتردا بۆ درێژەدان بە ژیان و گواستنەوەی ژێنە بە کەڵکەکانی خۆیان بۆ بەرەکانیتر توانایی و لێهاتوویەکی زۆرتریان هەیە.

٤- پاش هەزاران ساڵ ژیانی بەرەکان، ژێنە تایبەتەکان کە لە

بەرهەمهێنانەوەی خۆیاندا سەرکەوتووترن، دەمێننەوە و بە سەر ژینەکانی‌تردا زاڵ دەبن. ئەمە هەمان شتێکە کە بایۆلۆجیستەکان پێی دەڵێن سازیانی گیاندار لە گەڵ ژینگە. لەم دۆخەدا تایبەتمەندی زاڵ و داسەپاوی گیاندار وەکوو زات و سروشتی ئۆرگانیزم خۆی دەنوێنێ (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## سازگاری ئەکتیڤ / active adaptation

ئە م واتایە سەبارەت بە مەیلی بیۆلۆجیکی بۆ رووبەڕوو بوون و سازگار بوون لە گەڵ کۆسپەکانی ژینگەدا بەکار دەبرێ. پیاژە یەکەم جار ئەم زاراوەیە داهێنا. لە بەرهەمگەلی جۆراوجۆریدا پەرژاوەتە سەر باسی شێوازی بیرکردنەوە، بەڵگە هێنانەوە و فێربوونی منداڵان. هەندێ لەو بەرهەمانەی کە پیاژە لەم بابەتەدا نووسیویە بریتین لە *زمان و بیری منداڵ*، *تێگەیشتنی منداڵ لە جیهان*، *دادوەری ئاکاری منداڵ*، *چۆنیەتی تێگەیشتنی منداڵ لە کات*، سەبارەت بە گەشەی بیر و کەسایەتی. نووسراوەکانی پیاژە کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر بیۆلۆجی، پەروەردە، **کۆمەڵناسی**، دەروونناسی و فەلسەفەدا داناوە. پیاژە پاش توێژینەوەیەکی زۆر لە سەر منداڵان، دەگاتە واتای سازگاری ئەکتیڤ، بە پێناسەیەکەوە کە پێشتر بێژرا. ئەم واتا لە زۆربەی هەرە زۆری نووسراوەکانی پیاژەدا هاتووە. بەڕای پیاژە، بناغەی بیرکردنەوە و بەڵگەهێنانەوە، لە سەر سازگاری ئەکتیڤ دانراوە. پیاژە ڕای‌وایە کە بیرکردنەوەی لۆجیکی وەکوو کەرەسەیەکی گرینگ بۆ رووبەڕوو بوون و چارەسەری پرسەکانی ژینگە، یەکێکتر لە تایبەتمەندییەبیۆلۆجیکییەکانی مرۆڤە کە بەرەبەرە و هاوڕێ لە گەڵ ئەزموونە راستەوخۆ و ئاشکراکانی تاک خۆی پیشان دەدات. گەر وانەبێ، هیچ منداڵێک قەد ناتوانێ رادەی تواناییەکانی خۆی بناسێ. منداڵ بەگوێرەی ئەو ئەزموونانەی کۆی کردوونەتەوە، تێگەیشتنی خۆی لە کەش‌وهەوای دەورو بە ری و هەروەها لە خۆی نوێ دەکاتەوە و ئەم نوێ کردنەوەیە بەردەوام دووپاتە دەبێتەوە.

بە بڕوای پیاژە گەشەی بیرو ئەندێشەی تاک لە چوار قۆناغی سەرەکی تێدەپەڕێ و هەر قۆناغ بۆ خۆی خاوەنی شێوازی بەڵگەهێنانەوەیەکی تایبەت بە خۆیە و بە پەڕینەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی‌تر، ئاستی بەڵگەهێنەری

(استدلال) تاک گەشە دەکات و ئاڵۆزتر دەبێ. منداڵ ناتوانێ بەبێ ئەوەی لە کۆسپەکانی بەڵگەهێنانەوەی قۆناغی یەکەم تێپەڕێ، بڕواتە قۆناغەکانی‌تر. بە بڕوای پیاژە بۆ گەشەی توانایی بەڵگەهێنانەوەی منداڵ نابێ پەلەی لە گەڵ بکرێ، چونکە تا کاتێک مێشک بە تەواوی تەیار نەبێ، ئاستی ئاڵۆزتری تێگەیشتن خۆی پیشان نادا. ئەم قۆناغانە بریتین لە: *قۆناغی جوولەی هەستی، قۆناغی بەرلە کردەوە، قۆناغی کردەوەی دیار یان بەرچاو، قۆناغی کردەی فەرمی.*

## سازگاری پێگە/ status consistency

ئەم واتایە ئاماژە دەکات بە رادەی سازگاری پێگەی کۆمەڵایەتی تاک لە رەهەندەجۆراوجۆرەکانی نایەکسانی کۆمەڵایەتیدا. لە سیستەمی کاستدا، بەربەستێک کە لە بەرانبەر **بزاوتی کۆمەڵایەتیدا** هەیە، بۆتە هۆی رادەیەکی زۆر لە سازگاری پێگە. واتای ئەمە ئەوەیە کە هەر تاکێکی ئاسایی لە هەموو رەهەندەکاندا (سامان، دەسەڵات و رێزی کۆمەڵایەتی) لە یەک پێگەی کۆمەڵایەتیدایە. بەپێچەوانە، هەرچەند بزاوتی کۆمەڵایەتی زۆرتر بێ، رادەی سازگاری پێگە نزمترە. بۆ وێنە، لەکۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا مامۆستایەکی زانکۆ کە خاوەن رێزێکی کۆمەڵایەتی زۆر بەرزە، رەنگە داهاتی زۆر باش نەبێ یا ناونجی بێ. بە واتایەکی‌تر، پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم کەسە لە هەموو بارێکەوە (سامان، دەسەڵات و رێزی کۆمەڵایەتی) یەکسان نییە. رەنگە هەر بەم بۆنەوە بێ کە بۆ کۆمەڵناسان پێناسە کردنی **کاست**، زۆر ساناترە لە پێناسە کردنی **چین**.

## سامان / wealth

مەبەست لە سامان لە وتو وێژی رۆژانەدا، دەوڵەمەندییە. لێرەوە دوو

واتای‌تر دێته دەست: ١) خودی خاوەنێتی سامان، چ کەم بێ یان زۆر، ٢) فراوان بوونی هەرشت، چ ماڵ و سامان بێ یان شتی‌تر، یاخۆ خاوەنی بێ یان نەیبێ.

هەروەها لە واتایەکی‌تردا باس لە بەهای سەرجەمی پارە و ماڵ و سامانی تاک دەکات کە قەرزەکانی لێ دابشکێ. ئەم بۆچوونە سەبارەت بە گرووپ یان ولاتێکیش بەکار دەبرێ. بۆ وێنە: سامانی ولاتێک بریتیە لە سەرجەمی داراییەکانی ئەو ولاتە کە قەرزی ولاتان و دامەزراوە نێونەتەوەییەکانی لێ‌دابشکێ. دەبێ ئاگادار بین کە زۆر بە دەگمەن بکرێ سامانی ولاتێک لەپێوانە بدرێ؛ چونکە رەنگە بکرێ بە گوێرەی پێوەرە باوەکان، رادەو بایەخی کانە سروشتی و سەرچاوە تیکنۆلۆجیاییەکان بپێورێ، بەلام ناتوانین بە ئاسانی بایەخی هێزە مرۆییەکان بە هەمان پێوەر بپێوین. ئەو داراییانەی کە لە ریزی سامانی تاکەکاندان بریتین لە: خاوەنێتی خانوو، زەوی، زێڕو خشڵ، ترۆمبیل، گەمیە، پارەیەک کە تاک لە بانکدا هەڵیدەگرێ.

ئەم زاواوە لە روانگەی کۆمەڵناسانێک وەکوو مارکس و ڤیبێردا، تا رادەیەک لەگەڵ ئەو شتەی بێژرا جیاوازە. ماکس ڤیبێر، سامان بێجگە لە خاوەنێتی کەل و پەل و پارە، بەو مافانەش دەزانێ کە تاکەکان بە گوێرەی ئەو سامانەوەهەیانە. بۆ وێنە: کۆمپانیا مەزنە نەوتییەکان، مافی هەڵێنجانی نەوت لە نێو ئۆقیانووسەکاندا دەکرن، بەلام ناتوانن خودی ئۆقیانووسیش بکرن و ببنە خاوەنی. لە یوونان و ئەمریکادا، کۆیلە وەکوو سامانی کۆیلەدار بوو، چونکە خاوەن کۆیلە بە رێژەی ئەو کۆیلەیە خاوەن ماف بوو. بە پێچەوانەی ڤیبێر، جەختی مارکس لە سەر کەرەسەکانی بەرهەمهێنانە. راڤە و لێکدانەوەی چینایەتی مارکس بەم پرسیارەوە دەست پێدەکات کە «تاک خەریکی چ کارێکە؟» (ئایا سەرمایەدارە؛ واتە خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنانە یان کرێکارێکە کە خاوەنی هیچ ئامرازێکی بەرهەمهێنان نییە؟) کەچی

جەختی ماکس ڤیبێر لە سەر بازاڕی کار و دامەزراوە بازرگانییەکانە. بۆ ڤیبێر ئەم پرسیارە دێتە کایەوە کە «داهاتی تاک چەندە؟» (دەوڵەمەندە یان هەژار؟)

لانی کەم لە باری هزرییەوە، سامانی نەتەوەیەک هی ئەندامانی ئەو نەتەوەیە. بەڵام هەل و مەرجی کۆمەلایەتی، ئابووری و رامیاری هەموو کۆمەڵگاکان بە چەشنێکە کە ئەم سامانە بە یەکسانی لە نێو ئەندامانیدا دابەش ناکرێ. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩١١دا، یەک لە سەتی خەڵکی بریتانیا، خاوەنی ٦٩% سامانی ئەم وڵاتەبوون. ئاماری بانکی جیهانی پیشان دەدا کە لە ١٩٩٥دا، ١% لە خەڵکی بریتانیا ٢٠% لە سامانی ئەم وڵاتەیان لە دەستدا بووە. هەرچەند ئەم ئامارە پیشان دەدا کە لەم ماوەیەدا رادەی کەسانێک کە لە سامانی نەتەوەیی بەشیان بردووە، زۆرتر بوون، بەڵام هێشتا سامانی ١% دەوڵەمەندانی بریتانیا بەرانبەرە لە گەڵ سامانی ٥٠% لە خەڵکی هەژاری ئەم وڵاتە. هەر ئەم ئامارە پیشان دەدات کە لە ئەمریکادا ٤٠% لەو بنەماڵانەی کە خاوەنی خانوون، پاش داشکاندنی قەرزی بانک، خاوەنی هیچ سامانێک نین و ٢٠% لە هەژارترینیان نە تەنیا خاوەنی هیچ سامانێک نین، بەڵکوو قەرزداریشن.

### سانسۆر/ censorship

مەبەست لە سانسۆر، بەرگری دەسەلاتی دینی، رامیاری و ... لە دەربڕینی ئاشکرای هەر جۆرە بیرو بۆچوونێکە کە بۆ دەسەلات، یا بۆ سیستەمی رامیاری یا ئاکارییەک کە دەسەلات پشتگیری لێ دەکات، مەترسی تێدا بێ. هەروەها ئەوەش کە بە بۆنەی زەخت و گوشارەکانی بیرە گشتییەکانی نێو کۆمەڵگاوە، کەسێک بازنەی دەربڕینی بۆچوونەکانی بەرتەسک بکاتەوە، ئەوەش هەر سانسۆرە.

## سانسۆر

سانسۆر هەر لە کۆنترین جڤاکە رامیاری و دینیەکانەوە دەستی پێکراوە. سانسۆر بۆ یوونان و رۆمی کەونارا و سەدەکانی ناوەڕاست، رووداوێکی ئاشکرا بووە. بەڵام پاش داهاتنی مەکینەی چاپ، جەختی زۆرتری لە سەر کرا. بۆ وێنە، لە سەدەی شازدەهەمدا یەکەمین سیایی ئەو کتێبانەی کە بڵاوکردنەوەیان قەدەغە بوو، لە لایەن کلیساوە دەرچوو. پرۆتستانەکانیش لە خولی چاکسازی (رێفۆرماسیۆن) دینیدا، سانسۆریان دامەزراند.

سانسۆر لە رۆژگاری ئێمەشدا بە رێژەی ئەوەی کە بەر لە بڵاوکردنەوەی بابەت ئەنجام بدرێ یا پاش بڵاوکردنەوەی، لە دوو تەوەری لێک جیاوازدا پۆلێن دەکرێ: بەرگریکەر و سزادەر. لە ئەمریکادا، سەبارەت بە «بەرگرتن» (واتە: سانسۆری بەرگریکەر) کە لە گەڵ دەستەبەرە یاساییەکان سەبارەت بە ئازادی نووسین و بڵاوکردنەوە ناتەبایە، بابەتی زۆر نووسراوە.

جیاوازییەگرینگەکانی‌تر دەکرێ لە نێوان سانسۆری فەرمی و نافەرمی و هەروەها لە نێوان سانسۆرێک کە راستەوخۆ لە لایەن خاوەن دەسەڵاتەوە ئەنجام دەدرێ و سانسۆرێک کە بە هۆی بڕیارە نافەرمییەکانەوە «بۆ بڵاونەکردنەوەی بابەتەکان» سەرچاوە دەگرێ، پەیدۆزی بکرێن. سانسۆر کردن لەم ئاستانەدا رەنگە بۆ وێنە لە گەڵ قەدەغە کردنی ئەو بابەتانەکە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی زیانیان هەیە، هاورێ بێ (لە کاتی شەڕ یا ئاشتیدا) یاخۆ بەرگری لە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە رەنگە بە گوێرەی پێوەرگەلی جۆراوجۆر، بە بێ‌شەرمانە بزانرێن. ئاشکرایە کە شێوازەکانی نەتەوەیی بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئەم کارە، تا رادەیەکی زۆر لێک جیاوازن.

ئەمڕۆکە سانسۆر وەکوو دامەزراوەیەکە کە لە زۆرتر لە وڵاتە دیکتاتۆری و یەک پارتییەکاندا باوە. بەڵام سانسۆر هەم بە شێوەی خۆسانسۆری و هەمیش بە شێوازی فەرمی، لەو وڵاتانەی کە شێوازی حکوومەتیان دیمۆکراتیکە، زۆر نامۆ و لاپرە نییە؛ واتە لەو وڵاتانەشدا هەر دوو جۆری

سانسۆری هەیە (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## delegation of power / سپاردنی دەسەلات

سپاردنی دەسەلات بریتیە لە کارێک کە بە گوێرەی ئەوە تاک یان کۆمەڵێک کە خاوەنی دەسەلاتێکی یاسایی و رامیارین، بەشێک یان هەمووی دەسەلاتیان بە ژێرە دەستێکی خۆیان دەسپێرن.

زۆرتر لە نێوان سپاردنی دەسەلات لە لایەن نوێنەرێکی بلند پایە و سپاردنی دەسەلات لە لایەن بەرپرسێکی نزم پایەوە جیاوازی دادەنرێ. بەپێی ئەم پەیڤە کە دەڵێن «بریکار ناتوانێ بریکار بگرێ»، یان نوێنەر ناتوانێ دەسەلاتی خۆی بە کەسێکیتر بسپێرێ، بەرپرسی نزمپایە تا ئەو رادە دەتوانێ دەسەلاتی خۆی بە کەسێکیتر بسپێرێ کە ئەو کۆمەڵ یان لێژنەیە کە دەسەلاتێکیان پێداوە، بە راشکاوی ئیزنی سپاردنیان پێ دابێ، لەوە زۆرتر بۆی نییە دەسەلات و بەرپرسایەتییەکانی بە کەسێکیتر بسپێرێ. کەچی کەسایەتیەکی بلیندپایە کە خاوەنی دەسەلاتێکی زۆر بێ، دەتوانێ بەشێک یان هەمووی دەسەلاتی بە کەسێکیتر بسپێرێ و تەنانەت دەتوانێ هیچ دەسەلاتێک بۆ خۆی نەهێڵێتەوە و هەمووی بسپێرێ بە کەس یان کەسانیتر. لەم سۆنگەی پەرلەمانی یاسادانانی بریتانیا دەتوانێ ئەو ئەرکانەی کە باری گشتی و یاسادانەرانەیان هەیە، بە بەرپرسانی ئیداری بسپێرێ (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## nature / سروشت

باس لە سەر **بەکۆمەلایەتی کردن** ناتوانێ گرینگی و بایەخی سروشت و پەروەردە لە گەشەی فیزیایی، هزری، کومەلایەتی و کەسایەتی تاکەکان بهکەم بزانێ و ئاوڕی لێنەداتەوە. کۆمەڵناسان سەبارەت بە دەوری هەر

یەک لەم هۆکارانە (ژین و شوێنی کۆمەڵایەتی و سروشتی) بە سەر ڕەفتار و هەڵس و کەوتی تاکدا بیردۆزی زۆریان هەیە. بەڵام تۆژینەوەکان ئەم ڕاستییەیان پیشان داوە کە بە هیچ جۆر ناتوانین بۆ پیشان دانی گەشەی مێشکی مرۆڤ، چۆنییەتەکانی ئەم دوو هۆکارە بە جیاواز بخەینە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە. بە واتایەکی ساکارتر، دەوری ئەم دوو هۆکارە لە دیاری کردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤدا جیابوونەوەیان بۆ نییە. مێشکی مرۆڤ، لە باری ژێنێتیکیەوە، توانی ڕێکوپێک کردن، لەبەرکردن، پێوەندی کردن، تێگەیشتن و داهێنانی هەیە. توێژی دەرەوەی مێشکی مرۆڤ لانی کەم لە ۱۰۰ بیلیۆن خان پێکهاتووە (*Montgomery, G; 1989*– وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ۱۳۸۴). چنی ئەم خانانە پێکهێنەری هەزاران سیناپس (*synaps*) یا ڕشتەی گواستنەوەی دەمارەکانە کە دەبێتە هۆی پێوەندی خانەکان پێکەوە. ڕادەی پێوەندییەکان نزیک بە هەتاهەتایە. گەر لە هەر چرکەدا پێوەندییەک بناسین و بیژمێرین، سیو دوو میلیۆن ساڵ ماوە دەخایەنێ تا ڕادەی پێوەندییەکان بژمێرین (*Ibid*).

یەکێک لە زەقترین ڕەهەندەکانی مێشکی مرۆڤ، توانی مێشکە بۆ سازیان لە گەڵ هەر بارودۆخێک. زانایان ڕایان وایە کە مێشک توانی فێربوونی پانسەد زمانی هەیە. لە یەکەمین مانگەکانی ژیاندا، منداڵ دەتوانێ دەنگی پێویست بۆ ئەم زمانانە لاسایی کاتەوە، بەڵام ئەم توانە مەزنە، بە هۆی ئەو زمان یا زمانانەی کە دەگەڵ مندا قسە دەکەن، بە ڕادەیەک کەم دەبێتەوە کە منداڵ تەنیا دەتوانێ بەو زمانە قسە بکات کە دەیانبیسێ. بەڵگەکان و توێژینەوەکان وامان پیشان دەدەن کە هێزی زمانی منداڵ، کاتێک تەمەنی دەگاتە یەک ساڵ زۆر کەم دەبێتەوە (*R.F.Thompson; 1984*). ئەم کارە هەرچەند ئاماژە بەوە دەکات کە پێکهاتەژێنێتیکیەکان (کە ماکە خامەکانی مێشکی مرۆڤ دابین دەکات) بنەماین، بەڵام ئەم بابەتە بە گوێرەی

بارودۆخی سروشت، ئاڵوگۆڕی بە سەردا دێ.

سازگار بوونی پێکهاتەی مێشکی مرۆڤ بە رادەیەکە کە دەتوانێ بەها، باوەڕ، نۆرم، هەڵس‌وکەوت و زمانی هەر کولتوورێک فێر بێ. فرە بوونی ئەزموونە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ، هاورێ لە گەڵ تواناییە ژێنێتیکییەکان، پێکهێنەری بیرو بۆچوون و باوەڕ و رەفتارەکانی مروڤن. بە واتایەکی ساکارتر، گەر مرۆڤ پێوەندی لە گەڵ کەسانیتر نەبێ، ناتوانێ ببێتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی (واتە: مرۆڤ).

## سوشیالیزم/ socialism

دوورکایم دەڵێ کە سوشیالزم بریتیە لە ئایدۆلۆجییەک لە خزمەت بزووتنەوەی کرێکاریدا کە دەیەوێ نایەکسانییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری کەمتر کاتەوە؛ یاخۆ دەیەوێ ئەو نایەکسانییانە بە شۆڕشێکی مەزنی کرێکاری و ئاڵوگۆڕ لە بواری چاودێری بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و گواستنەوەی دەسەڵات لە لایەن سەرمایەدارانەوە بۆ لای کرێکاران دوایی پێبێنێ (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

سەرەتای مێژووی بزاڤی سوشیالیزم دەگەڕێتەوە بۆ راگەیندراوی پارتی کۆمۆنیست لە ١٨٤٨ کە لە لایەن مارکس و ئەنگلسەوە بلاو کرایەوە. بناوانی ئەم بزاڤە لانی کەم دەگەڕێتەوە بۆ دووسەت ساڵ پێش ئەو راگەیندراوە، واتە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شەڕی ناوخۆی بریتانیا لە ١٦٤٢-٥٢. ئەم شەڕە بوو بە هۆی بەدیهاتنی بزاڤی رادیکاڵ. بیروڕاکانی ئەم رادیکالیسمە بە سەرنج دان بە گوتەکانی جێرارد ڤینستلی وێکچوونێکی زۆری لە گەڵ بنەما سەرەکییەکانی سوشیالیزم هەیە. پێشڕەوەکانیتری ئەم رێبازە بریتین لە بابۆڤی فەرانسی، یۆتۆپیاخوازاه بریتانی و فەرانسییەکان ( ئوون، فوریە و سان سیمۆن) لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم و چارتیستە بریتانییەکانی

دەیەکانی ١٩٣٠ و ١٩٤٠ کە بۆ یەکەم جار بیری سوشیال دیمۆکراسی، بەرانبەری و کۆلێکتیڤیزمیان (collectivism) لە نێو بزاڤی بەربلاوی چینی کرێکاردا جێ‌کردەوە.

مارکس و ئەنگلس بە ئاوەژووی زۆربەی پێشوونانیان، سوشیالیزمیان بە ئامانجێک نەدەزانی کە دەکرێ گەلالەیەکی گشتی بۆ دابڕێژرێ، بەڵکوو سوشیالیزمیان بە بەرهەمی یاسا تەکامولیەکانی سەرمایەداری دەزانی کە ئابووریزانە سەرەتاییەکان دەست‌نیشانیان کردبوو و تێکۆشابوون کە شرۆڤەی بکەن. کەواتە، بیچم و قەوارەیەک کە سوشیالیزم دەتوانێ بیبێ، تەنیا بە هۆی پرۆسەیەکی مێژووییەوە ئاشکرا دەبێ کە هەنووکە روون نەبۆتەوە. مارکس و ئەنگلس بە لە بەرچاو گرتنی ئەم بۆچوونە، بە چەشنێکی لۆجیکی خۆیان لە راڤە و شیکردنەوەو تەنانەت پێناسە کردنی ئەم زاراوەیە پاراستووە. بەڕای ئەوان بەر لە هەموو شتێک حاشاکردنی سەرمایەدارییە کە پێناسەی پازیتیڤی خۆی لە ریگای پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕانەی درێژخایەنەوە رادێنێ و لە سەر وێرانەکانی ئەم سیستەمەیە کە پرۆلتاریا دیسان کۆمەڵگا ئاوەدان دەکاتەوە و بەم کارەی، خۆی دەبووژێنێتەوە.

گرینگترین بەرهەمی مارکس لەم بوارەدا، *رەخنە لە بەرنامەی گۆتەیە* (١٨٧٥). ئەم بەرهەمەی مارکس، دژایەتییەکەلە گەڵ بەرنامەیەک کە لە کۆنگرەیەکدا پەسندکرابوو. بە هۆی ئەم بەرنامەوە دوو لقی بزووتنەوەی کرێکارانی ئاڵمانیا (لاسالییەکان و ئایزناخرییەکان) هاوپەیمان بوون تا «پارتی کرێکارانی ئاڵمانیا» بنیات بنێن کە دواتر بوو بە «پارتی سوشیال دیمۆکراتی ئاڵمانیا». مارکس لە رەخنەکەی خۆیدا لە نێوان دوو قۆناغی کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا جیاوازی داناوە. «قۆناغی یەکەم» بریتیە لە کۆمەڵگایەک کە بەبێ یەک و دوو دەبێتە جێگری کۆمەڵگای سەرمایەداری. ئەم قۆناغە خاوەن نیشانەکانی قۆناغی تایبەتی خۆیە: کرێکاران لە شوێنی

چینی دەسەڵاتداردا ڕۆدەنیشن و لەم پێگە نوێیەدا پێویستیان بە دەوڵەت هەیە (دیکتاتۆری پرۆلتاریا) تا ئەم جڤاکە نوێیەیان لە بەرانبەر دوژمنانەوە پارێزگاری بکەن. ئاسۆوە هزری و دەروونییەکانی خەڵک وان لە ژێر کاریگەری ئەندێشە و بەها بورژوازیەکاندا. داهات، هەرچەند لە خاوەنێتی سەرمایەوە سەرچاوە ناگرێ، بەڵام هێشتا بەجێی ئەوەی کە بە گوێرەی نیاز و پێداویستی بێ، بە گوێرەی رادەی کار دەدرێتە خەڵک. بەڵام لە سەرینی ئەمانەش، هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگا لەم سیستەمە نوێیەدا بە خێرایی گەشە دەکەن و پەرە دەستێنن و ئەو سنوورانەی کە ئاسەواری سەرمایەدارین، بەرەبەرە لە ناودا نامێنن و تێک دەچن. پاش ئەمە کۆمەڵگا دەڕواتە نێو قۆناغێکی سەرتر و نوێترەوە کە مارکس پێی دەڵێ «قۆناغی سەرتر لە جڤاکی کۆمۆنیستی». لەم قۆناغەدا دەوڵەت دەمرێ و کۆمەڵگا ئەم دروشمە راست دەکاتەوە کە «لە هەرکەس بە قەدەر توانی و بۆ هەرکەس بە قەدەر نیازی».

لنین لە کتێبی دەوڵەت و شۆڕشدا دەڵێ: «ئەوەی کە پێی دەڵێن سوشیالیزم، مارکس پێی دەڵێ قۆناغی یەکەم یا خوارتر لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستی». بەم بۆنەیە یەکیەتی سۆڤییەت وەکوو کۆمەڵگایەک کە لە نێو شۆڕشی رووسیاوە سەری هەڵداوە، بە ناوی دەوڵەتێکی سوشیالیستی دەناسرێ. هەروەها زۆربەی هەرەزۆری ئەو وڵاتانەی پاش ١٩١٧شۆڕشیان کرد، مۆرکی سوشیالیستیان هەڵبژاردووە. بەڵام بە بۆچوونی مارکسیەکان، سوشیالیزم دوایین قۆناغ نییە، بەڵکوو قۆناغی بگارێکە بۆ گەیشتن بە کۆمۆنیزم. پرسیارێک کە لێرەدا دێتە ئاراوە ئەوەیە کە ئایا ئەم وڵاتانە کە نزیک بە ٣٠% وڵاتانی سەرزەوی و ٣٥% دانیشتووانی گۆی زەوی دەگرنەوە، بەرەو گەیشتن بە دوایین قۆناغ، واتە کۆمۆنیزمی راستەقینە، هەنگاویان هەڵگرتووە؟ گەر ئەم وڵاتانە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەک بەبێ

سیستەمی چینایەتی و ناتەبایی کۆمەڵایەتی-ئابووری هەنگاوی بنەڕەتیان هەڵنەگرتووە، ناتوانین بەو جۆرەی کە رای مارکس بوو، بە حکوومەتی سوشیالیستییان بزانین (سویزی؛ ١٩٩١).

بێگومان کتێب و وتاری ئێجگار زۆر سەبارەت بە سوشیالیزم نووسراوە، کەچی بەو جۆرەی کە لە سەرەوە باسمان لێکرد، واتای ئەم زاراوەیە زۆر لێڵ و ئاڵۆزە. رەنگە هۆی ئەم ئاڵۆزییە بگەڕێتەوە بۆ ئەو پێناسەی کە خودی وڵاتە سوشیالیستییەکان لە سەر خۆیان و سیستەمی مارکسی خۆیان هەیانە. هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی وەڵامدانەوە بەو پرسیارەی کە سویزی هێناویەتە ئاراوە. راستییەک کە دێتە کایەوە ئەوەیە کە لە هیچ یەک لەو وڵاتانەدا کە خۆیان بە سوشیالیست دەزانن، کۆشەوەکان بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگای بێچینایەتی یا نەکراوە یاخۆ شکستیان هێناوە. پرۆسەی مارکسیزم لە هیچ وڵاتێکدا نەیتوانیوە لە قۆناغی یەکەمین، واتە سوشیالیزم، بپەڕێتەوە و خۆی بەرەو کۆمۆنیزم هەڵبکشێ.

پاش تێکشکانی یەکیەتی سۆڤییەت، هەندێ لە بیرمەندە مارکسیەکان روویان لە سوشیالیزمی دەوڵەتی وەرگەڕاند و رایان هاتە سەر لیبرالیزمی دەوڵەتی کامەرانی. یەک لەم بیرمەندانە هابرماسە کە لە وتارێکی بەناوبانگیدا کە لە ژێرناوی «ئەمڕۆکە سوشیالیزم چ واتایەکی هەیە؟» بڵاوی کردەوە. هابرماس هاوکات لە گەڵ ئەمەگداربوونی بە سوشیالیزم، ئەو سوشیالیزمەی بڕوای پێیە جیاوازییەکی پێکهاتەیی و ئەرکخوازنەی لە گەڵ سوشیالیزمی مارکسی و سوشیالیزمی دەوڵەتی و باو هەیە.

هابرماس لەم وتارەیدا دەستی داوە بە گەڵاڵە کردنی باس و بابەتێک کە بۆتە هۆی دژکردەوە و رەخنەیەکی زۆر لە وتارەکەی. ئەو رای وایە کە سوشیالیزمی دەوڵەتی تێکشکاوە و رووخاوە و دەبێ پێداچوونەوەیەکی ورد و قووڵمان لە سەر مارکسیزم و بە تایبەت سوشیالیزم هەبێ. هابرماس

لیبرالیزمی دەوڵەتی ئاسوودەیی بە تەنیا ڕێگە چارەی کۆمەڵگا سەرمایەداری و پیشەسازییەکان بۆ دەربازبوون لە قەیران و تەنگ و چەڵـەمـە رامیـاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریانەی دەزانێ کە تووشی هاتوون. هابرمـاس لە بەشێک لە وتارەکەیدا بە ئاماژە بە دەسکەوت و خاڵە پازێتیڤەکـانی بـیر و تیۆری لیبرالیزم و کاریگەری شرۆڤەلیبراڵـیەکـان بـە سـەر رەوتی گـۆڕان و تەکامولی زۆربەی بیردۆزە کۆمەڵایەتییەهاوچەرخەکان، بە تایبەت بـە سـەر بیرە سوشیالیستییەکانی ئەم دووسەدەدواییەدا دەڵێ: «ئـەو شرۆڤـانەی کـە لیبرالیزم کردوونی، هەڵە نین؛ بەڵـکوو تـەنیـا ئـەو دڕکـەی کـە لـە چـاوی خۆیدایە نایبینێ». مەبەستی ئەو کەموکووڕی و ناتەواویانەیە کە لـە خـودی لیبرالیزمدا هەیە. بە بڕوای هابرماس، لیبرالیزم هـەرچـەنـد سـەرنـج ناداتـە کەمایەسییەکانی خۆی، بەڵام بـە وردی لـە ڕێبـازەهزرییـەکـانیتـر رەخنـە دەگرێ و کەمایـەسـیەکانیـان زۆر گـەورە دەنوێنـێ. بـە بـڕوای هابرمـاس، ئەزموونە دیارەکانی لیبرالیسم لە بواری رامیـاری، کۆمـەڵایـەتی، ئـابووری و کولتووریدا لە درێژایی ئەم سێ دەیە دواییەدا لە زۆربەی جڤاکە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا، ئەمیـان وەکـوو ئاڵتێرناتیڤـێکی گشـتگیر دەرهێنـاوە؛ بـە تایبەت پاش رووخانی کۆمۆنیزمی سۆڤییەت و سوشیالیزمی دەوڵەتی، زۆرتر هاتۆتە کایەوە (نوذری؛ ١٣٨٥).

هانت لە فەرهەنگی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەڵێ: واتاگەلی نـوێ و تـا رادەیەک جیاواز، لە سوشیالیزم هاتوونەتە ئاراوە، بە تایبەت لە بریتانیـا؛ ئـەم واتایانە لە لایەن زۆربەی ئـەو سوشیالیسـتانەوە کـە بـڕوایان بـە یـەکسـانی کۆمەڵایەتی هەیە پەسند کراوە. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سێ ویستی سـەرەکـی کۆمەلانی خەڵک: ١) دامەزرانی کۆمەڵگایەک کە تێیدا کرێکاران نە تەنیا لە بواری یاسای رامیارییەوە سەرنجیان پێدرابێ، بەڵکوو لـە بـاری ئابوورییـەوە (بە تایبەت بابەتی کار لەم دواییانـەدا) ئاسـوودەگییـان مسـۆگەر کرابـێ. ٢)

دەوڵەتێکی کامەرانیبەخش کە لە سۆنگەی گەشەو پەرەسەندنێکی بەرفراوانەوە هاتبێتە دی. ٣) دابەش‌کردنەوەی دووبارەی داهات کە بۆ لەناو بردنی نایەکسانییە چینایەتییەکان و هەروەها بەرز کردنەوەی ئاستی ژیانی خەڵکی پێویستن (هانت؛ ١٩٦٤).

بە گشتی وادیارە کەمتر بیر لەوە دەکرێتەوە کە حکوومەتێکی دیکتاتۆری پرۆلتاریا یا هەمان سوشیالیزم -کە بە گوتەی مارکس قۆناغی یەکەمە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگای بێ‌چینایەتی و بێ‌حکوومەت- دابمەزرێ. سوشیالیستانی ئەمڕۆ بیر لەوەدەکەنەوە کە لە نێو هەمان حکوومەتی سەرمایەداری و مۆدێرندا بتوانن مافی چینە خوارووەکانی کۆمەڵگا بستێنن و ئاستی ژیانی خەڵک، بە تایبەت کرێکاران بەرز بکەنەوە. هەرچەن ئاڵوگۆڕی زۆر بە سەر سوشیالیزمدا هاتووە، کەچی ئێستاش هەر دروشمی سوشیالیزم بریتیە لە بەدیهاتنی ژیانێکی یەکسان و ئاسوودە، کە مەودای چینەکان کەمتر بکرێتەوە.

## سوشیالیزمی دیمۆکراتیک/ democratic socialism

جۆرێک سوشیالیزمی سنووردارە کە نابێتە هۆی سەرکوت کردنی سەربەستی یان سەربەستییە دیمۆکراتیکەکان. بۆ وێنە هەندێ لە وڵاتە ئەورووپییەکان وەکوو سوید و نۆرویج، بەرنامەی ئابووری سوشیالیستیان لە گەڵ سیستەمی رامیاری دیمۆکراتیکدا تێکەڵاو کردووە. توێژەران بەم رێگا سێیەمەی حکوومەتە دەڵێن سوشیالیزمی دیمۆکراتیک: سیستەمێکی ئابووری-کۆمەڵایەتی کە ئاوێتەیەکە لە دەنگدانی ئازاد و چاودێرییەکی بەرچاو بە سەر بەشی ئابووریدا.

لەم سیستەمەدا حکوومەت خاوەنی بەشێکی زۆر لە پیشەسازییەکان و بەشە خزمەتگوزارییەکانە (وەکوو: هاتوچۆ، راگەیاندنە گشتییەکان،

تەندروستی و...). بۆ وێنە لە وڵاتی سوید زۆرتر لە دوازدە لە سەتی بەرهەمە ئابوورییەکان وان لە ژێر چاودێری حکوومەتدا. هەرچەند بەشی هەرە زۆرتر وا لە ژێر کۆنترۆڵی کەرتی تایبەتدا، بەڵام کەرتی تایبەتیش بە گوێرەی یاسا و پێودانەکانی حکوومەتەوە دەبزوێتەوە و وەکوو کەرتی تایبەتی وڵاتە سەرمایەدارییەکان، بە تەواوی سەربەست نین. لەم سیستەمەدا پیتاکێکی زۆر لە دەوڵەمەندان وەردەگیرێ تا بۆ بەرنامەکانی کامەرانی گشتی خەرج بکرێ. بە واتایەکی‌تر، بەشێک لە داهاتی دەوڵەمەندان بۆ بەشە کەم داهاتەکانی کۆمەڵگا رادەگوێزرێتەوە.

## سەرشانۆ / front stage

ژیانی رۆژانەی ئێمە وەکوو دراما، سەرشانۆ و پشت شانۆی هەیە. سەرشانۆ بریتیە لەشوێن یان ناوچەیەک کە بینەران دەتوانن سەیری نمایشی ژیانمان بکەن و ببینن. کاتێ ئەکتەر لەسەرشانۆیە، هان دەدا تا هەڵس‌وکەوتی بە چەشنێک بێ کە لە گەڵ ویستی بینەراندا سازگار بێ و بینەر لێی رازی بێ. ئێمەش لە ژیانی رۆژانەمان و لە هەڵس‌وکەوت لە گەڵ خەڵکدا هان دەدەین تا نەبینە هۆی نیگەرانی و ئازاری خەڵکی. بەڕای ئەرڤین گافمەن هەڵس‌وکەوتی ئێمە لە دوو مەڵبەندی سەرەکیدایە: مەڵبەندی گشتی (سەرشانۆ)، مەڵبەندی تایبەت (پشتی شانۆ). بۆ وێنە هەر ژیانێکی هاوبەش دوو مەڵبەندی گشتی و تایبەتی هەیە. لە مەڵبەندی گشتیدا ژن و مێرد هان دەدەن بە خەڵکی بسەلمێنن کە ژیانیان، ژیانێکی سەرکەوتووە و هیچ کێشە و گرفتێک لە ژیانیاندا نییە. ئەوان لەوەی کە لە بەرچاوی خەڵکی و بە راشکاوی ناکۆکییەکانیان پیشان بدەن، خۆیان دەپارێزن و هان دەدەن رەخنە لە یەکتر نەگرن. هەروەها ئاگادارن کە یەکتری لە کارێک کە ببێتە هۆی نارەزایەتی کەسانی‌تر بپارێزن و ئاگادار کەنەوە. بۆ وێنە گەر یەکێکیان

قسەیەک بکات کە ببێتە هۆی دڵ ئێشانی کەسێکیتر، ئەویتر خێرا دەڵێ کە «هیچ مەبەستێکی نەبوو، ویستی گاڵتەت لە گەڵ بکات» (*Goffman, E; 1959*).

## سەرمایەداری/ capitalism

وشەی سەرمایەداری لە ڕەگی capot سەرچاوە دەگرێ و بە مانای سەرە. کاپیتاڵ لە زمانی لاتینیدا بریتیە لە بڕی پارەیەک کە بە قەرز دراوە و وەکوو ئاوەڵناوە دەور دەگێڕێ (گولدو کولب؛ ١٣٨٤). لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٩٢دا ئارسێر یانگ، لە وشەی کاپیتاڵ، کاپیتالیستی چێکرد و لە کاپیتالیست، وشەی کاپیتالیزمی دەرهێنا کە بە مانای سیستەمێکە کە خاوەنانی سەرمایە تێیدا کار دەکەن و دەسەڵاتی ئەو سیستەمەیان لە دەستدایە و کەسانێکیتر بە ناوی کرێکار، ناچار هێزی کاری خۆیان بەم کەسانە دەفرۆشن.

مارکس شاکاری ١٨٦٧ خۆی ناو لێنا: سەرمایە (capital)، هەرچەند لەم کتێبەیدا زۆرتر باس لە بورژواکان دەکات تا سەرمایەدارەکان، هەروەها زۆرتر باسی بەرهەمهێنانی بورژوازی دەکات تا سەرمایەداری.

مارکس سەرمایەداری وەکوو شێوەیەک لە بەرهەمهێنان -کە خاوەنی دوو تایبەتمەندی سەرەکییە- خستە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە. تایبەتمەندی یەکەم بریتیە لەو شتمەک و خزمەتگوزارییانەی کە وەکوو کاڵا دێنە بەرهەم. واتە کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بەم بۆچوونەوە دێنە بەرهەم کە قازانجێکی پارەیی بە بەرهەمهێنەرەکان بگەینن و هیچ سەرنجێک نادرێتە ئەوەی کە ئەم بەرهەمانە چ کەڵکێکی هەنووکەییان هەیە. تایبەتمەندی دووەم ئەوەیە کە هێزی کاری تاک، بیچمی کاڵایەک دەگرێتەخۆی کە لە بازاڕدا دەیکڕن و دەیفرۆشن. مارکس بە کاڵابوونی هێزی کار، لە تایبەتمەندییەکانی

سەرمایەداری دەزانێ. بێگومان، کۆیلەکانیش دەکڕان و دەفرۆشران، بەڵام کۆیلەداران بۆ کاری زۆرتر کێشان لە کۆیلەکان، بە ناچار لە زۆر و توند و تیژی کەڵکیان دەگرت و بەبێ سەرنجدان بە کەڵک و بەهرەی کۆیلەکان، ناچار بوون کە چاودێرییان لێ بکەن. کرێکارانی مزبەر، سەربەستی تاکەکەسی خۆیان دەپارێزن و ئازادن کە خۆیان خاوەن کاری خۆیان هەڵبژێرن؛ بەم بۆنەوە لە ڕواڵەتدا وادیارە کە سەرمایەداری پێویستی بە بازرگانی و مامەڵەی ئازادە نەک زۆر. کەچی کرێکاران بە هۆی نەبوونی سەرمایە و کارێکیتر، بێجگە لە هێزی جەستەیان، ناچارن کە هێزی کاری خۆیان بفرۆشن بە سەرمایەدار. بەم چەشنە مارکس دەڵێ کە کرێکارانیش «کۆیلەی مزبگیر»ن (استونز؛ ١٣٧٩).

لە بۆچوونی مارکسدا سەرمایەداری بریتیە لە شێوازێکی بەرهەمهێنان کە بەرەو بەرهەمهێنانی نرخی زۆرتری سەرمایە و کۆوەکردنی سەرمایەی زۆرتر دەڕوا. تایبەتمەندی سەرەکی ئەم سیستەمە بریتیە لە خاوەنێتی کەرەسەگەلی بەرهەمهێنان و دابەش کردنی کۆمەڵگا بە چینگەلی جۆراوجۆر. هەرچەند مارکس دان بەوەدا دەنێ کە کۆمەڵگا بێجگە لە دوو چینی سەرمایەدار و کرێکار، چینیتریشی هەیە، بەڵام زۆر بایەخ بەوان نادات و دەڵێ کە ئەو چینانە لە پرۆسەی تەکامولی کۆمەڵگادا بە ناچار لە نێو ئەم دوو چینە سەرەکییەدا دەتوێنەوە و لە خەباتی چینایەتیدا دەبێ یا بەرەو کرێکاران بێن یا سەرمایەدارەکان (آرون؛ ١٣٨٦). ئەم دوو چینە سەرەکی و دژبەیەکە، یەکێکیان خاوەنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە و ئەویتریان کرێکارگەلێکن کە بێجگە هێزی کاری خۆیان شتێکیان بۆ فرۆتن نییە. مارکس لە ژێرناوی سەرمایەداریدا قۆناغە جۆربەجۆرە مێژووییەکانی ڕوون کردۆتەوە. ئەو لە وێناکردنێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی باسی کردووە و قۆناغەکانی گۆڕانی دیاری کردووە: سەرمایەداری بازرگانی، سەرمایەداری

مانۆفاكتۆری، سەرمایەداری پیشەسازی. ئەنگلس پاش ژیانی ماركس، سەرمایەداری دەوڵەتی لەم قۆناغانە زیاد كردووە. كە بریتیە لە قۆناغێك كە سەرمایە قۆرخ دەكرێ و پاش سەرمایەداری پیشەسازی سەرهەڵدەدا و ئەو قۆرخە بەهێز و روو لە گەشەیە بە ناوی «ئەمپریالیزم» ناو لێ دەبا (احمدی؛ ١٣٨٢).

باوەڕ بەوەی كە سەرمایەداری بریتیە لە خاوەنێتی تایبەت بە سەر ئامرازەكانی بەرهەمهێناندا و كەڵكوەرگرتن لەم كەرەسانە بۆ گەیشتن بە قازانجێكی زۆرتر، لە هەموو پێناسەكانی سەرمایەداریدا یەكسانە. بەڵام باوەڕ بە چەوساندنەوەی چینی كرێكار لە لایەن سەرمایەدارەكانەوە، تەنیا تایبەتە بە سووشیالیستەكان. ئابووریزانە ناسووشیالیستەكان كە سەرمایەداری وەكوو سیستەمێكی ئابووری لە خاوەنێتی و سەرمایەداناندا دەزانن، رایان وایە كە ئەگەر دەوڵەت لە كارو باری ئەو سیستەمەدا كەمتر دەستوەر بدات، بەرهەمهێنان دەگاتە بەرزترین ئاستی خۆی و قازانجی ئەم بەرهەمهێنانە هەم بۆ كرێكاران دەبێ و هەمیش بۆ سەرمایەدارەكان. سووشیالیستەكان بە توندی هەم لە رەوا بوونی بەهرەمەندی سەرمایەدارەكان لە قازانجەكانی بەرهەمهێنان حاشا دەكەن و هەمیش حاشا لەوە دەكەن كە بە نەبوونی گەڵاڵەیەك بۆ بەرهەمهێنان و دابەش كردنی دادوەرانەی داهاتەكان، قەد ناتوانن بگەن بە دابەشكردنی ئەقڵانی دەسڕەنجەكانی بەرهەمهێنان (گولدو كولب؛ ١٣٨٤).

## head of state /سەرۆكی وڵات

سەرۆكی وڵات لە نێو وڵاتانی ئەرووپیدا بە گوێرەی نەریتی ئەو وڵاتانە، هەمان پادشا بوو كە باڵوێز و نوێنەرانی وڵاتانیتر دەهاتنە لای و پادشایانیتر نامەكانیان بۆ ئەو دەنووسی. سەرۆكی وڵات لە هەمان كاتدا سەرۆك

حکوومەتیش بوو، بەم بۆنەوە ئەرکی بڕیاردان و لابردن و دانانی بەرپرسانی حکوومەتی لە ئەستۆدا بوو. لە دیکتاتۆرییەکانی سەردەمدا، هەر ئەم ریزە لە چینبەندی حکوومەتدا دیارە.

لە حکوومەتە پادشایەتی و پەڕلەمانییەکاندا هێزی بەڕێوەبەری حکوومەت دابەش کراوە بە: ۱) سەرۆکی وڵات کە هەمان پادشایە و باڵوێزەبیانییەکان دێنە لای ئەو و هەروەها پادشا یا سەرۆکی وڵات لە رێ و رەسمەکانی دەوڵەتدا بەشداری دەکات. ۲) حکوومەت کە هێزی وڵاتی لە دەستدایە، مەگەر ئەوەی کە سەرۆک وەزیر دانرابێ. بەڵام لەم حاڵەتەشدا لە لایەن سەرۆکی حکوومەتەوە و بە ناوی تاج و تەخت، لە نێو دەسەڵاتدا دەستوەر دەدات.

لە حکوومەتە کۆمارییە پەڕلەمانییەکاندا، هێزی بەڕێوەبەر دابەش دەکرێت بە: ۱) سەرۆکی وڵات، کە بریتیە لە سەرۆک کۆمارێک کە زۆرتر لە لایەن پەڕلەمانەوە هەڵدەبژێردرێ. ۲) حکوومەت، کە سەرۆک وەزیران (یا لە شوێنێک وەکوو کۆماری فێدراڵی ئاڵمانیا، بریتیە لە سەرۆک (chancellor)) لە سەرووی هەمووانەوە رادەوەستێ.

لە سیستەمە سەرۆککۆمارییەکاندا —وەکوو ئەمریکا- سەرۆک کۆمار بە هۆی دەنگدانی خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێ و هەم سەرۆکی وڵاتە و هەمیش سەرۆکی حکوومەتە. لە هەندێ وڵاتیشدا هیچ شوێن و پاگەیەک بۆ سەرۆکی وڵات نییە (گولدو کولب؛ ۱۳۸٤).

## rebellion /سەرهەڵدان

هەر سەرهەڵدانێک رەهەندی بەرفراوانی هەیە کە بە هۆی تاقمێک لە هاووڵاتیانی کۆمەڵگایەکەوە دژ بە دەوڵەت و بەرنامەکانی ئەو دەوڵەتەوە بەڕێوە دەبرێ. ئامانجی سەرهەڵدان گۆڕانی کۆمەڵگا نییە، بەڵکوو گۆڕانی

حکوومەت یان بەشێک لە بەرنامەکانی حکوومەتە. بەواتایەکی تر، سەرهەڵدانەکان بۆ دژایەتی و بەربەرەکانێ لە گەڵ هەموو یان پاژێک لە ئامراز یان ئامانجەکانی حکوومەتن و خوازیاری گۆڕانەوەی ئەو دۆز یا ئامرازانەن لە گەڵ ئامانج یا ئامرازی نوێ. گەر سەرهەڵدانێک تایبەت بێ بە بەشێکی بچووک لە کۆمەڵگا، دەتوانێ لە گرووپە لادەرەکانی نێو شەقامەکان پێک بێت کە ناتوانن خۆیان لە گەڵ نۆرم و ڕێساکانی کۆمەڵگا بگونجێنن. بەلام گەر سەرهەڵدانێک بەربەرەکانێی بەشێکی گەورەی کۆمەڵگا بێ لە گەڵ هەموو یان پاژێک لە بەرنامە و ئامانجەکانی حکوومەت، ڕەنگە ئەو سەرهەڵدانە ببێتە شۆڕش. سەرهەڵدانەکان زۆرتر لەو ولاتانەدا دێنە کایەوە کە بە توندی بەندیوارن بە ئابووری جیهانییەوە، ئامراز و کەرەسەی سەرکوت کردنی ئەم حکوومەتانە زۆر لاوازن و نایەکسانی کۆمەلایەتی و رامیاری زۆر زەق و بەرچاوە و نیشانەگەلێک لە گەشەی ئابووریان تێدا بەدی دەکرێ (بوسول و دیکسون؛ ۱۹۹۰). لەو ولاتانەی کە سیستەمی ئابووریان بەستراوە بە ئاڵوگۆڕی ئابووری ولاتانیترەوە (دەولەتە بەهێزەکان لە ناوەندی ئابووری جیهانیدا) چینە کۆمەلایەتیەکان بەرەو دووجەمسەری بوونی نێوان چینە دارا و چینە نەدارەکان رادەکێشرێن. بەگشتی، لەم ولاتانەدا چینێکی ناونجی بچووک هەیە و دەسەلاتە رامیاری و ئابوورییەکان لەژێر رکێفی بەشێکی زۆر بچووکتر لە چینی سەرووی کۆمەڵگادایە. ئەم چینە دواییە، بەشی ئابووری و حکوومەتی لەژێر کۆنترۆڵدایە و بەشەکانیتری کۆمەڵگا لە هەل‌ومەرجێکی نالەبارو نەگونجاودا بەجێ دێلێ. لەم گەلالە ئابوورییەدا، واتای هەژاری ڕێژەیی، دەورێکی سەرەکی هەیە. واتای ئەمە ئەوەیە کە گرووپە هەژارو نەدارەکان بە ڕێژەی ئەو کەسانەی کە دەستیان بە سەر بەشی ئابووریدا راکێشاوە، هەست بە رق و قین و بێزاری دەکەن.

کۆمەڵناسانی ئەمریکی، تێری باسڤێل و ڤیلیام دیکسۆن، رایان وایە کە

هەرچەند سەرکوتە توندو تیژەکان دەتوانن بەرگری لە سەرهەڵدانەکان بکەن، بەلام سەرکوتە هێور و نەرمەکان دەتوانن ببنە دنەدەرێک بۆ سەرهەڵدانی‌تر (هەمان سەرچاوە). واتە: هەرچەند سەرکوتە نەرم و هێورەکان خەلک تووڕە دەکەن، بەلام هەندێ سەرچاوەی‌تریان بۆ ڕێکخستن و بەرەنگاری پێدەدەن. بۆ وێنە ئەم جۆرە سەرکوتانە هۆی سەرهەڵدانەکانی‌تر لە ئیرلەندی باکووردا روون دەکەنەوە.

دەبێ ئاماژە بەوەبکەین کە سەرهەڵدانەکان کاتێک دێنە کایەوە، کە بارودۆخی ئابوروی بەرەو باشتر بوون دەڕوا. گوندنشینەکان زۆرتر کاتێک رادەپەڕن کە بارودۆخی ئابوورییان باشتر لە کاتی ئاسایی بووبێ؛ چونکە نایانەوێ ئەو شتەی کە بە دەسیان هێناوە لە دەستی بدەن (جنکیتر؛ ١٩٨٣). هەست بە هەژاری رێژەییش لەم بارودۆخانەدا دەورێکی بالای هەیە. خەلکی زۆرتر کاتێ بۆ سەرهەڵدان تەیار دەبن کە شتێکیان بۆ پاراستن هەبێ.

## سیستەمی بەسراو/ closed system

لە سیستەمە بەسراوەکۆمەلایەتییەکاندا شوێنگەی تاک لە نێو زنجیرەی پلەوپاگە کۆمەلایەتییەکاندا، شوێنگەیەکی *پێبەخشراوە*، واتە شوێنگەیەک کە تاک لە بەدەستهێنانیدا هیچ دەورێکی نییە (وەکوو رەنگی پێست، پێوەندی خوێنی، جنسیەت، تەمەن). لە زۆربەی ئەم سیستەمانەدا شوێنگەی تاک، بە هۆی میراتەوە پێی دەگا و تاک لە دیاری کردنی شوێنگەو پلەوپاگەیدا هیچ دەورێکی نییە. وێنەی ئەمە سیستەمی کاستە لە هیندوستاندا؛ هەروەها پێوەندی نێوان یارسانەکانیش لەم چەشنەیە. ئەندامێکی یارسان کە دێتە دونیا، بەبێ سەرنجدان بە توان و لێهاتووییەکانی لە هەمان سەردەمی بە دونیا هاتنیەوە پلەوپاگە و شوێنگەی دیاری کراوە.

سیستەمی کاست لە هیندستاندا سیستەمێکی تەواو بەسراوە؛ بە چەشنێک کە تاک بە هیچ جۆر ناتوانێ لە شوێنگەی کۆمەڵایەتی خۆی ببزوێتەوە.

## سیستەمی کاست/ cast system

سیستەمی کاست بە هەر جۆرە چینبەندییەکی کۆمەڵایەتی دەبێژرێ کە پێگەی کۆمەڵایەتی خەڵک بە گوێرەی ئەو تایبەتمەندییانەوە پۆلێنکرابێتن کە خودی تاک هیچ دەورێکی لە تۆمار یان کۆنترۆڵ و چاودێری بە سەر ئەو تایبەتمەندیانەدا نەبێ و زۆرجاریش ناتوانێ هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا بەدی بێنێ (وەکوو تایبەتمەندییە جەستەیی و کولتوورییەکان). شوێنگەی کۆمەڵایەتی هەر کاستێک لە لایەن کۆمەڵگایەکەوە دیاری دەکرێ کە ئەو کاستەی تێدایە. لە راستیدا کۆمەڵگا هەلومەرج و پێگەیەک کە هەر کاست دەتوانێ پێی بگات، دابین دەکات.

## سیستەمی کراوە/ open system

چینبەندیە کۆمەڵایەتییەکان بە دوو دەستەی کراوە و بەستراو دابەش دەکەن. لە سیستەمی چینبەندی کراوەدا، ئەندامانی کۆمەڵگا خۆیان بە هۆی کۆشەوە و هەل و مەرجی کۆمەڵگاوە پلە و پاگە و شوێنگەی کۆمەڵایەتیان بە دەست دێنن. واتە شوێنگەی تاک لە زنجیرەی پلە و پاگە کۆمەڵایەتییەکاندا بە گوێرەی لێهاتوویی، شارەزایی، توانایی و کۆشەوەکانییەوە دیاری دەکرێ و هۆکارگەلی وەکوو تۆرەمە و رەنگی پێست و رەگەز و تەمەن هیچ دەورێکیان لە دیاری کردنی پێگەی کۆمەڵایەتی تاکدا نییە. وادیارە یەکێک لە ئیدیالترین سیستەمە کراوەکانی ئێستای دونیا، سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەمریکایە. باوەڕی زۆربەی ئەمریکییەکان ئەوەیە کە هەموو مرۆڤەکان لە ژێر سای پەروەردگاردا یەکسانن. نەریتی

ئەوان جەخت لە سەر تاک‌خوازی، داکۆکی، ململانێ و سەربەستی دەکات. لانیکەم لەباری هزرییەوە، خەڵکی ئەمریکا سەربەستن بۆ گەیشتن بە هەر شتێک ئاواتیانە. باوەڕی ئەوان وایە کە سیستەمی کۆمەڵایەتییان بە چەشنێکە کە هەل‌ومەرجێکی یەکسانی بۆ هەموو خەڵکی دابین کردووە تا بتوانن بگەن بەو شتەی کە ئامانجیانە. هەموو خەڵکی لە بەرانبەر یاسادا بۆ گەیشتن بە پلەو پاگەی رامیاری، کۆمەڵایەتی و ئابووری یەکسانن؛ تەنیا مەرج بۆ ئەم گەیشتنە، کۆشەوەو لێهاتوویی خودی تاکە. لەباری هزرییەوە، هەمووی خەڵکی لەیەک شوێنەوە دەست پێدەکەن، بەڵام گەیشتن بە پلەی یەکەم پێویستی بە تێکۆشان و لێهاتوویەکی تایبەت هەیە.

بەشی هەرە زۆری کۆمەڵناسان حاشا لە ئاوەها کۆمەڵگایەکی ئارمانی دەکەن. کێشە لەوەدا نییە کە ئایا کۆمەڵگایەکی کراوە هەیە یان نە، بەڵکوو کێشە لەوەدایە کە ئایا هەموو خەڵکی لە یەک خاڵی یەکسانەوە رکەبەرێیەکەیان دەست پێدەکەن؟ بێ‌گومان لە کراوەترین کۆمەڵگاکانیشدا هەلی یەکسان بۆ هەمووان دەست نادا. تەنانەت ئەگەر وابیرکەینەوە کە وەچەیەکی تایبەت لە سەر یەک خاڵەوە کێ‌بەرکێیەکان دەست پێکردووە، دیسان تاقمێکی تایبەت دەبنە پاڵەوانی ئەم یارییە. ئاشکرایە کە وەچەی دووەم ناتوانن لە یەک خاڵی یەکسانەوە کێبەرکێیەکەیان دەست پێ بکەن. لەم رووەوە، نایەکسانییەکۆمەڵایەتییەکان پاشکۆی دەسکەوتەکان، بە تایبەت دەسکەوتە ئابوورییەکانن.

خەڵکی هەندێ لە وڵاتان پێیان وایە کە سیستەمی کۆمەڵایەتییان کراوەیە، بەڵام لە راستیدا بەو چەشنەی کە خەڵک وادەزانن کراوەنییە؛ واتە هیچ وڵاتێک بە تەواوی کراوە نییە، بەڵام دیارە هەندێ لە وڵاتان بۆ گەیشتن بە وڵاتێکی کراوەی ئارمانی هەنگاو هەڵدەنێن. بۆ وێنە سەردەمێک زۆربەی خەڵکی پێیان وابوو کە بەختی بوون بە سەرۆک کۆمار لە ئەمریکادا بۆ

هەموو کەس یەکسان نییە. واتە، دەیانگوت کە سپی پێست و پرۆتستانەکان بەختی زۆرتریان بۆ سەرۆک کۆماری هەیە؛ کەچی بە هاتنەسەرکاری جۆرج بووشی کاتۆلیک و ئۆبامای رەش پێست، ئاشکرا بوو کە ئەم وڵاتە بەردەوام بەرەو کراوەتر بوون دەڕوا.

## شارنشینی/ urbanization

کۆوەبوونی مرۆڤەکان لەنێو شارەکاندا، ساکارترین پێناسەیە بۆ ئەم زاراوەیە. شارنشینی بریتیە لە زۆربوونی ژمارەی شارەکان و کۆوە بوون و کۆمای خەڵک تێیاندا. هەروەها ئەم زاراوە ئاماژە دەکات بە کۆچی خەڵکی گوندەکان بەرەو شار و زۆربوونی ڕێژەیی ژمارەی شارەکان. واتایەکی تر بۆ شارنشینی بریتیە لە داسەپانی دەسەڵاتی کولتووری و ڕەسم و نەریتەکانی شار بە سەر گوندەکاندا. پێناسەیەکی تر کە ڕەنگە سەرەکیترین پێناسە بێ، بریتیە لە سەرهەڵدانی «تایبەتمەندییەکانی شار لە نێو جەماوەرێکدا» (آلبرت؛ ۱۹۶۴). ئەم واتایە زۆرتر لە ئەدەبی کۆمەڵناسی لادێدا دیارە. سەرهەدانی خووخدەی کولتووری تایبەت لە مەڵبەندێکی لادێییدا بەڵگەیە بۆ بە شاری بوونی جەماوەری گوندنشین یاخۆ لەسەر پرۆسەی بەشاری بووندا ڕاوەستان. ئەم پێناسەکێشەیەکی تایبەت دێنێتە ئاراوە، ئەوەش بریتیە لەوەی کە سەرەتا دەبێ تایبەتمەندی و خووخدەکانی شار بە ڕاشکاوی ڕیزبەندی و جیا بکرێنەوە، کە واتای ئەم کارەش بریتیە لەوەی کە ئێمە هاتووین هەندێ پرۆسەمان کردۆتە پێش‌گریمانە بۆ بەشاری بوون (هەمان سەرچاوە).

مارکس‌و ئەنگڵس بەزۆری لەسەر بایەخ و گرینگی شارنشینی لە مێژوو و گۆڕانی شێوازە جۆراوجۆرەکانی بەرهەمهێنان باسیان کردووە. لە ئایدیۆلۆجی ئاڵمانیدا دەنووسن: «سەرەتای ناکۆکی نێوان شارو گوند لە دڕندایەتییەوە بۆ شارستانی دەست پێدەکا و سەرلەبەری مێژووی شارستانی هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا دەگرێتەوە». ئەم ناکۆکییە بناغەی دابەش کردنی کار و جیاوازیە چینایەتییەکانە، لە هەمان کاتدا «بوونی شار باس لە نیاز بە بوونی سیستەمی ئیداری، پۆلیس، باج و پیتاک و بە گشتی بەرنامەی بەڕێوەبردنی سەرلەبەری کۆمەڵگا دەکات». هەروەها توێژینەوەی ئەنگڵس لە سەر شاری

مەنچستەر و شارەکانی دەور و بەری لە کتێبی *بارودۆخی چینی کرێکار*دا بۆ بەشێکی زۆر لە لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان سەبارەت بە میتۆدۆلۆجی سەرمایەداری و کاریگەری بە سەر چینی چەوساوەدا، بەردی بناغە بوو. *راگەیندراوی پارتی کۆمۆنیست* بەوردی سەبارەت بە دەرئەنجامە ئابووری و رامیارییەکانی کۆوەبوونی هێزەکانی بەرهەمهێنان و پرۆلتاریا لە ناوەندی شارە گەورەکاندا باسی کردووە (هاروی؛ ١٩٩١).

هەرچەند لێکدانەوەی شارنشینی لەباری هزری، رامیاری و مێژووییەوە بایەخ و گرینگی زۆری هەیە، کەچی ئەم بەشە لە توێژینەوەکان نەخراونەتە ریزی کۆڵینەوەسەرەکییەکانی مارکسیزم. ئەم سەرنج نەدانە جێگای سەرسوورمانی هەیە، چونکە «هۆکاریشاری» بۆ زۆربەی بزاڤە شۆڕشگێرانەکان حاشاهەڵگر نین. بێجگە لەمەش، گرینگی یەکیەتییەچینایەتییەکان لە دژایەتی شار-گونددا بە تایبەت لە جیهانی سێیەمدا دەبێ وەکوو بنەمایەک بۆ ستراتژی شۆڕش بناسرێتەوە (وێنەی ئەمانەی لە نووسراوەکانی گرامشی و مائۆدا بەزۆری هەیە). هەروەها چۆنیەتی زاڵ بوون بەسەر ناکۆکی شار-گونددا لە بگاری سوشیالزمدا لە یەکیەتی سۆڤییەت و چین و کووبا و تانزانیا و... وەکوو بابەتێکی گرینگ و پێویستی لێ هاتووە (هەمان).

بەگشتی شارنشینی دەبێتە هۆی دابەش بوونەوەی دووبارەی جەماوەر و بەشێکی زۆر لە میتۆدەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی تووشی گۆڕان دەکات. ژیان لەنێو شاردا دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاک شێوە ژیانێک جیاواز لە ژیانی گوند هەڵبژێرێ. لە شاردا، دابەش‌کردنی کار و ئەو کارانەی کە هەن، پسپۆڕانەترن لە کارەکانی گوند؛ جەماوەری شار لەچاو جەماوەری لادێ، ناجۆرترن (واتە: یەک دەست نین)؛ رەچەڵەک و چین و ئاستی جۆراوجۆری خوێندنی جیاوازن؛ بەگشتی، پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زۆرتر باری فەرمییان هەیە.

### شانۆی یاری/ game stage

له لای هێربێرت مید، شانۆی یاری درێژەی هەمان سەرشانۆیە. لە شانۆی یاریدا منداڵان تەنیا بە لاسایی کردەنەوەی دەوری کەسانیتر قنیات ناکەن، بەڵکوو هان دەدەن تا بتوانن لە گەڵ یاریکەرانیتر پێوەندییەکی دوو لایەنە سازبکەن. بەڕای مید لە کتێبی *زەین، خود و کۆمەڵگادا* یارییە منداڵانەکان کە منداڵ تەنیا دەورێکی سادە دەگێڕێ، یەکەمین قۆناغی گۆڕانی کەسایەتی منداڵە کە پاش ئەوەمنداڵ دەست دەدا بە گێڕانی دەوری گەورەساڵانیتر. منداڵ لە یارییە ساکارەکاندا -وەکوو چاوشارکێ- تەنیا یەک دەور دەگێڕێ بەبێ سەرنجدان بە پێوەندی نێوان ئەندامانی ئەو یارییە. لە یاری چاوشارکێدا منداڵەکان خۆیان دەشارنەوە و منداڵێکیتر بە شوێنیاندا دەگەڕێ بەبێ ئەوەی کە پێویست بێ ئەو منداڵە هەریەک لە منداڵانیتر لە پێوەندی لە گەڵ یەکدا هەڵسەنگێنێ. کەچی لە یارییەک وەکوو بەیسبۆڵدا منداڵ لە هەمان کاتدا کە دەوری خۆی دەگێڕێ، دەبێ ئامادە بێ بۆ ئەوەی کە دەوری یاریکەرانیتریش بگێڕێ و هەروەها دەبێ پێوەندی هەر یەک لەو یاریکەرانە لە گەڵ یاریکەرانیتر لێکبداتەوە. بەبڕوای مید ئەمە دوایین قۆناغی یاری منداڵە (کوزر؛ ١٣٨٧).

مید دەڵێ: لە نێوان یاری ئاڵۆز و یاری ساکاردا ئەم جیاوازییە سەرەکییە هەیە کە لە یاری ئاڵۆزدا منداڵ دەبێ شێوازی هەڵسوکەوتی یارکەرانیتریشی لەبەرچاو بێ. شێوازی رەفتاری یاریکەرانیتر لە زەینی یەک یاریکەردا، وەکوو یەکەیکی دامەزراوەیی دێتەدی و هەر ئەم دامەزراوەیە کە کردەی تاکێکی یاریکەر دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی... کردەی هەریەک لە یاریکەران بە گوێەی بۆچوونێک کە تاک سەبارەت بە یاریکەرانیتر هەیەتی، دیاری دەکرێ (مید؛ ١٩٤٣).

منداڵ لە یاریە ئاڵۆزەکاندا لە گەڵ پێکهاتەیەکی نوێ لە ژیانی نێو

کۆمەڵگا ئاشنا دەبێ. ئاشنایەتی لە گەڵ ئەم پێکهاتەدەرەکییە، پێکهاتەی ژیانی دەروونی تاک تەکووز دەکات. لەم پرۆسەیەدا منداڵ لە گەڵ شێوازێکی‌تر بەناوی هیتری گشتی‌کراو ئاشنا دەبێ.

## شوانکارەیی/ pastoralism

کۆمەڵگا شوانکارەییەکان لە نێوان ١٠ تا ١٢ هەزار ساڵ لەمەو پێشەوە سەریان هەڵداوە. بناغەی ئەم سیستەمی ژیانە، لە سەر کەوی‌کردن و ڕاگرتنی ئاژەڵی وەکوو بزن، مەڕ، گا، ئەسپ و... دانراوە. شێوازی شوانکارەیی، بەرێژەی شێوازی ڕاو، شێوازێکی‌کارامەتر بوو بۆ دابین کردنی خۆراک. ئەم شێوازە سەرچاوەیەکی خۆراکی مسۆگەر دەکرد و هەروەها بە کەڵک وەرگرتن لە شێوازی نوێی بەخێو کردنی ئاژەڵان، ڕەنگ بوو ژمارەی گەلەکان زۆرتر بن. ئاکامی ئەم ڕەوتە زۆرتر بوونی جڤاکەکان بوو (رابرتسون؛ ١٣٧٢). لە کۆمەڵگای شوانکارەدا زۆربوونی خۆراک، هاواکات لە گەڵ ئەوەی کە دەبووە هۆی زۆربوونی جەماوەر، دەبووە هۆی پێوەندی و مامەڵەی کومەڵایەتی. ژیانی شوانکارەیی هاوڕێ لە گەڵ ژیانی کۆچەرییە. ژیانی کۆچەری لە دوو شێوازی کۆچی ئاسۆیی لە دەشتەکان و کۆچی ئەستوونی لە ناوچە کوێستانییەکان (واتە: گەرمیان و گوێستان کردن) پێڕەوی دەکرد. ئەم پرۆسەدەبووە هۆی پێوەندی نێوان هۆز و خێڵەکان و هەروەها زۆر جاریش لە سەر خاوەنێتی لەوەڕگاکان دەبووە هۆی شەڕو کێشە لە نێوان خێڵەکاندا. رابێرتسۆن دەڵێ: «کۆیلەداری کە لە سەردەمی ڕاو و کۆوەکردنی خۆراکدا بابەتێکی نامۆ بوو، هاوکات لە گەڵ ئەم شەڕانە و بەدیل گرتنی نەیارەکان و گرتنەبەرکاریان، سەری هەڵداوە» (رابرتسون؛ ١٣٧٥). بە بڕوای گیدنز، جڤاکە شوانکارەکان زۆرتر بە نایەکسانیگەلی ئاشکرا دیاری دەکرێن، بە سەر ئەم جڤاکانەدا سەرۆک یان پادشاکان دەسەڵاتدارییان دەکرد

(گیدنز؛ ١٣٨٥). لەم کۆمەڵگایانەدا چوارپێیەکان سەرەکی‌ترین سەرچاوەی ژیان بوون و رادەو ژمارەی گەلە، پێوانەی هەڵسەنگاندنی پیاوان بووە. گەلە گەورەکان تەنیا بە مانای سامان و مال نەبوون، بەڵکوو نیشانەی دەسەلاتیش بوون.

## شۆپ (شوێنەوار) / traces

کۆمەڵناسان ئەم زاراوەیە بۆ شتمەک و هەڵومەرجێک بە کار دەبەن (وەکوو ئەو شتانەی خەڵکی فڕێی دەدەن، ژمارەی گڵۆپەکانی خانوویەک، یاخۆ گۆڕانی گوشاری ئاوی نێو لوولەکان) کە پێکهێنەری زانیارییە سەبارەت بە چەند و چوونی هەڵس‌وکەوت مرۆڤەکان. بە واتایەکی‌تر لە سۆنگەی ئەم شتمەک و ئاسەوارانەوە دەتوانین شێوازە جۆراوجۆرەکانی ژیانی خەڵکی بناسین. تۆژینەوەیەک کە زانکۆی ئاریزۆنا ئەنجامی داوە، یەکێک لە نموونەکانی ئەم چەشنە تۆژینەوەیە. لە دەیەی ١٩٧٠ەوە گرووپێکی تۆژینەوە بە سەرپەرشتی دوو کەس لە مامۆستایانی زانکۆی ئاریزۆنا، دەستیان دا بە کۆوەکردنی زبڵ لە گۆڕستانی زبڵەکان و هەروەها لە نێو سەتڵی زبڵی نێو گەڕەکە جۆراوجۆرەکان. ئەم توێژینەوەئەو راستییەی پیشان دەدا کە ئەو زبلانەی خێزانەکان فڕێیان دەدەن، بە قەدەر زبڵی کارگە پیشەسازییەکان بۆ ژینگە زیانیان هەیە ( *Rathje, W & C. Murphy, 1992*– وەرگیراو لە: عضدانلو، ١٣٨٤).

## شۆڕش / revolution

بۆ باس لە شۆڕش، پێناسەی بەشە پێکهێنەرەکانی شۆڕش، یەکەمین و رەنگە گرینگترین و دژوارترین پرسێکن کە رووبەڕوویان دەبینەوە. لەم بوارەدا تەنانەت بارستی زۆری ئەو نووسراوانەی کە لە سەر شۆڕش نووسراون،

هیچ یارمەتییەکمان پێ نادەن. تەنانەت هەریەک لەم نووسراوانە پێناسەیەکیان لەم بەشانە داوەتە دەست کە زۆرجار بە پێچەوانە و دژ بە یەکن و زۆرتر سەرمان لێ دەشێوێنن. ئامان رای وایە کە نابێ زۆر خۆمان بە پێناسەکانەوە خەریک بکەین. «لە راستیدا بۆ واتایەکی ئینتزاعی، هیچ پێناسەیەکی راستەقینە نییە: پێناسە، تەنیا کەرەسەیەکە بۆ واتای وشەکان و رەنگە قازانجێکی بێ یا نەیبێ» (کوهن؛ ١٣٨٧).

بێشک ئامان راست دەکا، بەڵام ئەمە نابێتە هۆی هێور کردنی خەیاڵی تۆژەرێک کە لە گەڵ پانتایەکی بەربلاو لە پێناسەکان رووبەڕوویە. بۆیە بە نیازین هەندێ لە و پێناسانە کە سەبارەت بە شۆڕش کراون لێرەدا بخەینە روو.

پێناسەی شۆڕش زۆر بەربلاوە و تەنیا بە گۆڕانکاری بنەمایی رامیاری نابێژرێ. وەکوو ئەوەی کە گواستنەوەی سەردەمی کشتوکاڵ بۆ پیشەسازی بە شۆڕشی پیشەسازی ناو لێدەبرێ. یان لەم دواییانەدا بە داهاتن و گەشەی کەرەسەکانی راگەیاندن، شۆڕشی ئەنفۆرماتیک هاتۆتە دی. هەروەها گەشەی خۆراک بۆتە هۆی هاتنە دی دیاردەیەک کە بە ناوی «شۆڕشی شین» ناوی لێ دەبەن. بە گشتی لە شۆڕشدا واتایەک هەیە کە گۆڕانی بنەڕەتی و تێک دانی شتە کەونەکان و داهێنان و بنیاتنانی بینایەکی نوێمان دەخاتەوە بیر. بۆیە کاتێک بیر لە تێکنۆلۆژییەکی نوێ کە تا ئەو دەم تاقی نەکراوەتەوە، وەکوو تەکنێکی نوێی پەیوەندانی جەرگ لە پزیشکیدا، زاراوەی شۆڕش، زاراوەیەکی شیاو و لەبار دێتە بەرچاو.

شرۆڤەی هۆکار و هەلومەرجەکانی شۆڕش دەبێ لە کۆمەڵناسی مارکسیەوە دەست پێ بکرێ. لە روانگەی کۆمەڵناسی مارکسیستیەوە، هۆی مێژینەی ئەو شۆڕشانەی کە کاریگەرییان بە سەر مێژووی مرۆڤدا بووە، خاوەنێتی تایبەتی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان بووە. لە راستیدا خاوەنێتی تایبەت، دەبێتە هۆی

کۆوەبوونی کەرەسەگەلی بەرهەمهێنان لە دەست کەمینەیەکدا کە ئەو بەرهەمهێنەرانەی خاوەنی هیچ شتێک بێجگە لە ڕەنجەکەیان نین، دەچەوسێننەوە. بەم بۆنەوە پێوەندی بەرهەمهێنان دەبێتە هۆی هاتنە دی پێوەندی چینایەتی. مەبەست لە پێوەندی چینایەتی، پێوەندی نێوان چینی خاوەن بەرهەم، کان و کەرەسەی بەرهەمهێنان لە لایەکەوە و چینی کرێکاری چەوساوەی لەخۆ بیانیکەوتوو لە لایەکیترەوە. چینی کرێکار پاش گەیشتن بە خۆناسی، لە گەڵ چینی چەوسێنەر یان هەمان چینی خاوەن کەرەسەی بەرهەمهێنان دەکەونە ململانێ و ئەنجامی ئەم خەباتە چینایەتییە، تێکچوونی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و داهاتنی سیستەمێکی نوێی کۆمەڵایەتیە کە چینایەتی و دەوڵەت هیچ دەوریان تێدا نییە (روشە؛ ١٣٨٧).

دوورکایم لە بیردۆزی ئانۆمی خۆیدا ئاماژە بە هۆکارگەلێک دەکات کە دەبنە هۆی شۆڕش و هەندێ لە کۆمەڵناسانی دوایی، بناغەی کاری خۆیان لە سەر ئەو بۆچوونە داناوە. دوورکایم دەڵێ کە لە کاتێ نەجوولان یان گەشەی خێرای ئابووریدا کۆمەڵگا تووشی ئاژاوە دێ (ئانۆمی). لە هەل و مەرجێکی کۆمەڵایەتی قایم و پایەداردا، داخواز و ئارەزووی خەڵکی بە هۆی نۆرم و ڕێساکانی کۆمەڵگاوە ڕێکوپێک و کۆنترۆڵ دەکرێن. بە تێکدانی نۆرمەکان و لێکهەڵوەشانی ڕێکوپێکی و زۆربوونی داخوازەکان، کۆمەڵگا ناتوانێ پەرسڤدەری ئەو داخوازانە بێ؛ بۆیە جۆرێک نارەزایەتی گشتی لە نێو ئەندامانی کۆمەڵگادا دێتەدی کە بۆ روون کردنەوەی ئەم تەوەرە وەکوو واقیعەکانیتری کۆمەڵگا، دەبێ لە واقعیەتەکانیتری کۆمەڵگا کەڵک وەربگیرێ (غفاری؛ ١٣٨٨).

بە بڕوای تێدا ئێسکاکپۆل شۆڕش و گۆڕانی کۆمەڵایەتی تەنیا کاتێک واتای هەیە کە حکوومەت وەکوو پێکهاتەیەکی کلان سەیر بکەین. شۆڕشە

کۆمەڵایەتییەکان ناتوانن بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاڵوگۆڕی مێژوویی و پێکهاتەی نێو نەتەوەیی شرۆڤە بکرێن. ئێسکاکپۆل دەڵێ: «بە سەرنج دان بە بیردۆزە کۆمەڵایەتییەکان کە لە سەر شۆڕش دانراون، لێکدانەوەی شۆڕشێک بە تەنیا، دەبێ لە ڕێی لێکدانەوەو شرۆڤەی مێژوویی و بەراوردەوە ئەنجام ببێ»، بەڕای ئەو، شێوازی شرۆڤەی بەراوردی بۆ لێکدانەوەی شۆڕشگەلی تایبەت و دانسقە، لە درێژایی مێژوودا، شێوازێکی شیاو و لەبار بووە. ئەم شێوازە لە هەلومەرجێکدا کە ئاڵوگۆڕەکان جۆراوجۆر بن، کەلکێکی زۆرتری هەیە (اسکاکپول؛ ١٣٧٦).

بە گشتی ئەو پێناسانەی کە لە شۆڕش دراونەتە دەست لە دوو چیندا پۆلێن دەکرێن. هەرچەن هەندێ پێناسەش لە نێو ئەم دوو چینەدا جێ ناکرێنەوە. چینی یەکەم ئەو شۆڕشانەن کە دەتوانین بە «شۆڕشی مەزن» ناویان بەرین. کارێن برینتۆن، جۆرج پێتی، زیگمۆند نویمان و هەندێ لە تیۆریسیەنە مارکسیەکان وەکوو لنین و مائۆ، لەم چینەدا دادەنرێن. ئەم جۆرە شۆڕشانە بریتین لە شۆڕشی فەرانسە و ئەمریکا لە سەدەی هەژدەهەمدا، دوو شۆڕشی مەزنی سەدەی بیستەم لە رووسیا و چیندا. شۆڕشەکانی ئەلجەزایر، کووبا و مکزیکیش هەرچەن کێشەیان لە سەرە، دەکرێ بخرێنە ئەم ریزەوە. بەڵام لە لایەکی ترەوە داگیرکردنی دەسەلات لە لایەن ئەرتەشی بەرزیلەوە لە ساڵی ١٩٦٤دا بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، ناخرێتە ریزی شۆڕشەوە. هەرچەند وانییە کە ئەم بۆچوونە هەموو کوودتا سەربازییەکان لە دەرەوەی شۆڕش بزانێ، چونکە کوودتای ئەرتەشی میسر لە ١٩٥٢دا دەخرێتە ئەم ریزەوە.

چینی دووەم زۆر بەربلاوترن و زۆربەی گۆڕانکارییەکانی چینی یەکەمیش دەگرنەوە. هەروەها ئەم چینە هەموو تەوەرە سەروو یاساییەکان یان گواستنەوەی دەسەلات بە زەبر و تووڕەیی دەگرێتەوە. چالمێرز جانسۆن،

ڕۆدفۆلف ڕۆمێل، ڕەیمۆند تانتێر، پیتێر کالڤێرت و جەیمز دەیویس لە بیرمەندانی ئەم بیردۆزەن. بەگوێرەی ئەم بیردۆزە کوودتای ساڵی ١٩٦٧ی ئەرتەشی یوونان بە شۆڕش دێتە ئەژمار؛ کەچی دانیشتنی نازییەکان لە سەر جێی کۆماری وایمار لە ١٩٣٣دا بە شۆڕش نازانرێ. ئەگەر گواستنەوەی دەسەلات بە شێوازی یاسایی جێبەجێ بکرێ، بە شۆڕش نایەتە ئەژمار(کوهن؛ ١٣٨٧).

جیاوازی سەرەکی نێوان ئەم دوو بۆچوونە ئەوەیە کە بیردۆزانی ڕێبازی «شۆڕشی مەزن» ڕوانگەیەکی پاوانخوازانەیان سەبارەت بە بەشە پێکهێنەرەکانی شۆڕش هەیە. بە بڕوای ئەوان تەنیا ژمارەیەکی کەم لەو هەلومەرجانەی کە گۆڕانکارییان تێدا دێتە ئەنجام، بە شۆڕش دەزانرێن.

هەندێ لەرەهەندەکانی شۆڕش بریتین لە:

گۆڕانی بەهاکان: بە ڕای زۆربەی کۆمەڵناسان گۆڕانی بەهاکان بە گرینگترین دیاردەی شۆڕش دەزانرێ. ئەم تەوەرە زۆرتر لە نێو ئەو کۆمەڵناسانەی کە بۆچوونی مارکسیان نییە، پێداگری لە سەر دەکرێ. هانتیگتۆن دەڵێ: «شۆڕش گۆڕانێکی ناوخۆی خێرا، بنەڕەتی و پڕلە توندو تیژییە کە بە سەر بەهاکانی کۆمەڵگایەکدا دێ» (هانتینگتون؛ ١٣٧٠).

نویمان شۆڕش بە وردی و بەربلاوی دەخاتە بەر توێژینەوەو دەڵێ «شۆڕش گۆڕانێکی گشتگیر و بنەڕەتییە لە سیستەمی بەهاکانی کۆمەڵگادا» (کوهن؛ ١٣٨٧).

هانا ئارێنت بڕوای وایە کە : «واتای نوێی شۆڕش لەم بۆچوونە جیاواز نییە کە ڕەوتی مێژوو لەپڕونەکاو لە نوێوە دەست پێدەکا و داستانێکی نوێ کە قەد نەبێژراوە و نەبیسراوە ئاشکرا دەبێ» (آرنت؛ ١٣٧٠).

گۆڕانی پیکهاتەیی (structural alteration): گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵگا دووەمین ڕەهەندێکە کە بۆ پێناسەی شۆڕش بەکار براوە. نەریتی مارکسی

زۆر له گەڵ ئەم بۆچوونە ئاوێتەیە. بە بڕوای مارکس، واتای شۆڕش، گـۆڕانی پێکهاتەی کۆمەڵایـەتییـە؛ شـۆڕش، گواسـتنەوە لـە خـولێکی مێژوویـی بـۆ خولێکی‌تره. بە گوێرەی ئـەم بۆچوونـە، شـۆڕش، یـان بـە تـەواوی گـۆڕانی بیچمـی سیسـتەمێـک، کاتێـک روودەدا کـە چینێـک لـە مرۆڤـەکـان بـۆ رزگاربوونیان لە بارودۆخ و هەلومەرجی نالەباریان، هیچ رێگایەک بێجگە لـە شـۆڕش شـک نابـەن. بـە پێـی رێبـازی مـارکس، شـۆڕش بـە سـڕینەوەی دوژمنایەتی چینایەتی و نەمانی بنەو بارگـەی دەوڵـەت دوایـی دێ، چونکـە دەوڵەت بێجگە لە چاودێری بە سەر قازانجی چینی سەرمایەدار کارێک ناکـا (کوهن؛ ۱۳۸۷).

گۆڕانی رێکخراوەکان: رەنگە پێناسەی شۆڕش بە هەندێ بۆچوون لە سەر گۆڕانی رێکخراوەکانەوە بەسترابێ. بۆ وێنە، مۆر زنجـیرەیـەکـی لـە گـۆڕانی کۆمەڵایەتی راناوە کە شۆڕش لە سەریکی ئەم زنجیرەدایە. مۆر، شـۆڕش بـە گۆڕانێک دەزانێ کە پڕ لە توندوتیژی بێ و پاژێکی زۆر لە خەڵکی بە خۆیەوە خەریک کا و ببێتە هۆی گۆڕان لە پێکهاتەی کۆمەڵـگادا. جیـاوازی گـۆڕانی دامەزراوەکان لـە گـۆڕانی گشـتی‌تـری پێکهاتـەکـان ئـەوەیـە کـە گـۆڕانی رێکخراوەیی ئاماژە بە هەندێ گـۆڕان لـە رێکخـراوە سیاسـیەکانـدا دەکـات، کەچی مەبەست لە گۆڕانی پێکهاتەیی دەتوانێ گـۆڕانی شـێوازی پێـوەنـدی چینایەتی کۆمەڵگا بێ. گۆڕانی رێکخراوەکان دەتوانێ بریتی بێ لـە هـەمـوو جۆری گۆڕان، وەکوو گۆڕان یان نەمانی پادشایەتی، بنیات‌نران یان داخـرانی پەڕلەمان، یاخۆ گۆڕانێکی سەرەکی لە ئەرکێکی تایبەتی پەڕلەماندا. شۆڕشی رووسیا نموونەی ئاوەها گۆڕانێکە. حکوومەتی پادشایەتی رووسیا (بنەماڵـەی رۆمانۆف) پاش سێسەد ساڵ دەسەڵاتداری لـە رووسـیا، زۆر بـە ئاسـانی لـە ساڵی ۱۹۱۷دا هەڵچنرا(کوهن؛ ۱۳۸۷).

گۆڕانی بژاردەکان (alteration of the elite): یەکێکی‌تر لە رەهەندەکانی

شۆڕش، گۆرانی بژاردەکانە. پێناسەی ئەم تەوەرە باس لە چۆنییەتی چنرانی ڕێبەرانی کۆمەڵگا و ڕادەی گۆڕانی ئەم ڕێبەرایەتییە لە درێژەی ماوەی شۆڕشدا دەکا. لاسوێڵ، شۆڕش بە گۆڕانی شێوازی چینایەتی بژاردەکان دەزانێ (*lasswel. H. 1936*). لاسوێڵ بڕوای وایە کە بۆ دیاری کردنی ڕادەی گۆڕانێک، پرسی سەرەکی، لێکدانەوەی ڕابردووی چینایەتی ئەو تاقمەنییە. گرینگترین بابەت ئەوەیە کە بزانرێ ئەو گۆڕانە نوێنەری چ گۆڕانێکە لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، دەبێ هاتنە سەر کاری نازییەکان لە ١٩٣٣دا بە شۆڕش بزانرێ.

## شۆڕشی پیشەسازی / industrial revolution

پاش دوایی هاتنی سەدەی نۆزدەهەم، مێژوونووسانی ئابووری بەرەبەرە خوویان بە زاراوەی پیشەسازییەوە دەگرت و لە ڕاستیدا مەبەستیان سەرجەمی ئەو داهێنانانە بوو کە لە ماوەی ١٧٦٠-١٨٣٠ لە بریتانیادا هاتبووە دی. بە بڕوای ئەوان، ماشینی بوونی پیشەسازی ڕستن و چنین، سەرکەوتنی تەکنیکی و گەشەی پیشەی پۆلاسازی، بەکار هێنانی مەکینەی هەڵم، دامەزراندنی سیستەمگەلی کارگەیی و پێشکەوتنەکانی تری ئەو سەردەمەبە تەواوی ڕواڵەتی بریتانیای گۆڕابوو. کۆمەڵگایەک کە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا هەنووکە وڵاتێکی جووتیاری بوو، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا ببووە کۆمەڵگایەکی تەواو پیشەسازی (موحسێنی؛ ٢٠٠٦).

دیاری کردنی کاتێکی تایبەت بۆ دەس پێکردن یان دوایی هاتنی پیشەسازی بەرە بەرە کەوتۆتە بەر ڕەخنە. زۆربەی توێژەرانی ئێستا ڕایان وایە کە دیاری کردنی کاتێ (١٨٣٠) بۆ دوایی هاتنی پیشەسازییەک کە هێشتا بەردەوامە، بەجێ نییە. هەندێ‌تر بەڵگە دێننەوە کە دەستنیشان کردنی ساڵی ١٧٦٠ بۆ سەرەتای شۆڕشی پیشەسازی زۆر دێرە. چونکە

خێراتر بوونی چالاکییە پیشەسازییەکان لە نێوان سەدەی هەژدەوە نەبووە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی شازدەهەم (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

نۆلان و لێنێسکی بۆ شۆڕشی پیشەسازی چوار قۆناغ ڕەچاو دەکەن، هەرچەن ئەم خاڵەش لە بەر چاو دەگرن کە مەرج نییە هەموو کۆمەڵگایەک بۆ بوون بە پیشەسازی لەم قۆناغانە تێپەڕێ:

١- قۆناغی یەکەم لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە دەست پێدەکا و نزیک بە یەک سەدساڵ درێژە دەخایەنێ. لە باری جوگرافیاییەوە ئەم قۆناغە دەکەوێتە مەڵبەندی ئەنگلتەرەوە. داهێنانی ئەم قۆناغە، زۆرتر لە بواری پیشەسازی ڕستن و چنین و بەکار گرتنی مەکینەی هەڵمە. هەروەها لە داهێنانەکانی ئەم قۆناغە ئاماژە دەکەن بە سەقامگیر بوونی سیستەمی کارخانەیی. بەر لە شۆڕشی پیشەسازی، کاری چنین و ڕستن، کارێک بوو کە لە نێو بنەماڵەکاندا جێ بەجێ دەکرا. بنەماڵەکان بە دووک و مەکینە سەرەتاییەکان ئەم کارەیان دەکرد و دەیانفرۆشتە بازرگانان. بەڵام پاش داهاتنی تیکنۆلۆجیای نوێ (مەکینەی هەڵمی)، بنەماڵەکان کە زۆربەیان کەم دەس و هەژار بوون، ئەو مەکینە گران و مەزنانەیان پێ دابین نەدەکرا. بۆیە بازرگانەکان دەستیان دا بە کڕینی ئەم مەکینانە و بنیاتنانی کارخانەگەلی مەزن و دامەزراندنی کرێکاران بۆ کاری چنین و ڕستن. ئەمە لە ڕاستیدا بنیاتنرانی سیستەمی کارخانەیی بوو کە دواتر بوو بە زەقترین تایبەتمەندی جڤاکە پیشەسازییەکان. هەروەها پەرەسەندنی پیشەسازی بەرهەمهێنانی کانزا بە تایبەت ئاسن لە تایبەتمەندییەکانی ئەم بەشەیە.

٢- قۆناغی دووەم لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی پێکرد. پیشەسازییەکانی ڕستن و چنین، تواندنەوەی ئاسن و خەڵووزی بەرد، لە

گەشەدا بوون. لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا هەموو بوارەکانی ئابووری بریتانیا خەریکی پەرەسەندن بوون. ئەم شۆڕشە لەم قۆناغەدا گەیشتە ولاتانی رۆژاوای ئەورووپا و ئەمریکا.

لە دەسکەوتە گرینگەکانی ئەم قۆناغە، بەکار گرتنی هەلم بۆ گواستنەوە بوو. لە دەیەی ١٨٥٠دا زۆربەی شوێنەکانی بریتانیا بە هۆی هێڵی ئاسنەوە پێکەوە بەسترابوون. بەرهەمی ئەم داهێنانە، هەرزانتر بوونی گوژمەی گواستنەوەی کالا و دابەزینی نرخی بەرهەمەکان و زۆرتر بوونی داخوازی خەلکی بوو. هەروەها هێڵی ئاسن بووە هۆی تێکدانی قۆرخکردنە ناوچەییەکان و بەرفراوان کردنی پانتای ململانێیە ئابوورییەکان و دیسان کەمتر کردنی نرخی بەرهەمەکان.

هەروەها لەم قۆناغەدا پیشەسازی لاستیک هاتە دی. هەر لەم قۆناغەدا سامۆئێلموورس و چەن کەسیتر برووسکەیان داهێنا. لە دەیەی ١٨٦٠دا دینام چێ کرا و داهێنانی دینام دەسپێکێک بوو بۆ داهاتنی پیشەسازی کارەبا. هەروەها لە باری کشتوکالیشدا ئاڵوگۆڕی مەزن هاتەدی. داهێنانی مەکینەی دروونەوە و جووت کردن و خەرمانکوت و هەروەها کوودە دەسکردەکان، شۆڕشێکی مەزنیان لە کشتوکاڵدا هێنایەدی.

لە بەشی ڕێکخراوەکاندا داهاتنی *دەزگا چەن بەشییەکان بە بەڕێوەبەرانی مووچەبگیرەوە*، بە ڕووداوێکی گرینگ لە بەشی ئیداریدا دێتە ئەژمار. ئەم گۆڕانە، سەرەتا لە پیشەسازییە نوێکانی هێڵیئاسن و گەمیەوانی و تیلگرافدا هاتەدی کە گەشەیان پێویستی بە دابەش کردنی کرێکاران لە ناوچەگەلی جیاواز و دوور لە یەک بوو. لە ئاوەها بارودۆخێکدا، بنەماڵەکان نەیاندەتوانی هەموو یان بەشی مەزنی کارە بەڕێوەبەرایەتیەکان بگرنە ئەستۆ و ناچار بوون، بەڕێوەبەری پسپۆڕ و شارەزا دامەزرێنن؛ ئەمەش بوو بە سەرەتایەک بۆ گەشە و پەرەسەندنی بنکەگەلی

پیشەسازی و بازرگانی.

٣-قۆناغی سێیەم: ئەم قۆناغە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا شەڕی دووەمی جیهانی بەردەوام بوو. تایبەتمەندی ئەم قۆناغە، گەشەسەندنی تیکنۆلۆجی لە بواری وزەدا بوو. بناغەی زەقترین و مەزنترین داهێنانەکانی سەدەی بیستەم، لە سەدەی نۆزدەهەمدا دانرابوو؛ بە تایبەت بە هاتنەدی ماتۆڕی ئیحتراقی ناوخۆیی.

یەکێکی‌تر لە زەقترین بەرهەمەکانی ئەم قۆناغە، داهاتنی پیشەسازی ترۆمبیل بوو. پەرەسەندنی پیشەسازی نەوت، لەم قۆناغەدا زۆر بەرچاو نییە. پیشەسازی تەلەفوون و رادیۆ بە خێرایی خەریکی گەشەسەندن بوو. لەم قۆناغەدا شۆڕشی پیشەسازی گەیشتە ناوچەگەلی‌تر، بۆیە گۆڕانێک لە پۆلێن‌کردنی وڵاتەکاندا هاتە دی. ئەمریکا هەروا پێشڕەو بوو، بەڵام بریتانیا و ئاڵمانیا و فەرانسە، هەرچەن پیشەسازی لە ناویاندا گەشەیەکی ڕێژەیی هەبوو، بەڵام خەریک بوون لە ئەمریکا دەکەوتنە دواوە.

لە قۆناغی سێیەمی شۆڕشی پیشەسازیدا، تیکنۆلۆجیای نوێ لە شەڕەکاندا دەورێکی گرینگی دەگێڕا. تانک(دەبابە) و کەرەسەی‌ماتۆڕی‌تر لە شەڕدا جێی ئەسپیان گرتەوە. لە هەمان کاتدا چەکی کیمیاوی (وەکوو گازە خنکێنەرەکان، چەکە کۆمەڵکوژ و ناوکیەکان) هاتنە دی.

٤-قۆناغی چوارم: نوێترین قۆناغ لە پیشەسازیدا بە ناوی «خولی زانیارییەکان» بەناوبانگە، چونکە دەسڕاگەیشتن بە زانیارییە جۆراوجۆرەکان بە چەشنێکی سەرنجڕاکێش گۆڕانی بە سەردا هات. ئەم قۆناغە لە دەیەی ١٩٥٠وە بە داهاتنی تەلەفزیۆن دەستی پێکرد. لە ساڵی ١٩٦٠دا نزیک بە ٨٧ لە سەتی بنەماڵەئەمریکییەکان خاوەنی

یەک یان چەن تەلەفزیۆن بوون. ئەمڕۆکە تەلەفزیۆن لە هەموو جڤاکەکاندا –تەنانەت کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم– وەکوو یەکێک لە کەرەسەپێویست و گرینگەکانی نێو خانووی لێ هاتووە.

تەلەفزیۆن ئەزموونەکانی مرۆڤی بە چەشنێ گۆڕاوە کە وێنەی لە کەمترین داهێنانێکدا دیارە. ئەم کەرەسە وایکردووە کە تەنانەت خەڵکی ئاسایی لە نێو خانووی خۆیاندا دادەنیشن و هەموو رۆژێ لە دوورترین رووداوەکان و شێوە ژیانەکانی دونیا ئاگەدار دەبنەوە. ئەمڕۆکە خەڵکی بە هۆی تەلەفزیۆنەوە دەتوانن لە نێو خانووی خۆیاندا دانیشن و بە خاترجەمی سەیری هەموو چەشنێکی ژیان، رووداو کارەساتی کونج و قوژبنی دونیا بکەن، دەتوانن بەبێ مەترسی لە ژیانی گیاندارانی دڕندە ئاگەدار بن، لە بنی زەریاکان رۆبچن، لە بەرزاییەکان سەرکەون، تەنانەت سەیری وردترین شتمەکی سەر گۆی مانگ کەن.

بەڵام تەلەفزیۆنیش وەکوو سینەما، بە پێچەوانەپیشان دانی رووداوەکان، یان بە راکێشانی سەرنجی خەڵکی بەرەو شێوازێکی تایبەتی ژیان، یان هەڵسوکەوتی نالەبار و نەشیاو، روانگەیەکی ناحەز لە کۆمەڵگا مرۆییەکان دەخاتە روو. توندوتیژی بە هەموو شێوازێکی خۆی، لە نێو تەلەفزیۆندا خۆی پیشان دەدا. تەلەفزیۆن و سینەما، دەسەڵاتێکی زۆر لە ژێر رکێفی کەمینەیەکی تایبەتدا دادەنێن و ئەم هەلەیان بۆ دەرەخسێنن کە بەها و باوەڕەکانی خۆیان بە سەر خەڵکی دونیادا داسەپێنن و تەنانەت دەست لە نێو هەڵسوکەوتی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەربدەن و گۆڕانیان بە سەردا بێنن.

کۆمپیۆتەر دووەمین داهێنانی خولی زانیارییەکانە. داهاتنی ئینترنێت، ئاسۆکانی خولی زانیارییەکانی بە چەشنێکی سەرنجڕاکێش پەرە پێداوە (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

## شۆڕشی شین / green revolution

یەکێک لە هۆکانی زۆرتر بوونی بەهەمهێنانی خۆراک، لە چەند دەیەی رابردوودا، هەمان شتێکە کە شۆڕشی شینی پێ دەڵێن. شۆڕشی شین، بەرهەمی داهێنان لە چاکسازی رەچەڵەکی تووی گەنم، برێنج و دانەوێڵە و هەروەها شێوازی نوێی کشتوکاڵە. لە سۆنگەی ئەم داهێنانەوە جووتیاران توانییان بەرهەمێکی زۆرتر لە زەوی هەڵبگرن. لە خولی سەرەتاییدا، واتە دەیەی ۱۹۵۰ —کە بە خولی «مۆعجیزەی کشتوکاڵ» بەناوبانگە- ئەم شۆڕشە بە رێگایەک دەزانرا بۆ چارەسەر کردنی کێشەی برسیەتی لە جیهاندا. پاش دە تا پانزدە پاش ئەم شۆڕشە، گەنم لە ئەندۆنزی دوو بەرانبەر، لە هیندوستان سێ بەرانبەر و لە مکزیکدا بوو بە چوار بەرانبەر (*Brown, L; 1988*). بەلام شۆڕشی شین ، زیان و خەساریشی لە گەڵدا بوو. ئەم شێوازە پێویستی بە ئاودێرانی بەردەوام، دەرمانی کیمیایی گران بۆ لە ناو بردنی ئافەتەکان بوو. یەکێک لە شێوازە گرینگەکانی هەڵگرتنی بەرهەم، کەڵک وەرگرتن لە مەکینەی کشتوکاڵە. ئەم مەکینانە هەم زۆر گرانن و هەم دەبنە هۆی بێکار کەوتنی کرێکارانی بەشی کشتوکاڵ. لە رووبەری نەتەوەییدا حکوومەتەکان دەبێ بۆ هاتنە ریزی شۆڕشی شین، گوژمەی زۆر دابنێن؛ لە رووبەری ناوچەییشدا بە هۆی ئەم شۆڕشەوە مەزرا بچووک و سەربەخۆوەکان لەناوچوون و جێگای خۆیان دا بە شەریکەگەلی گەورەی بازرگانی. زۆرتر زەویدارانی گەورە دەیانتوانی لە تیکنۆلۆجیای نوێ بەهرەمەند بن؛ لە راستیشدا ئەم شێوازە نوێیە تەنیا بۆ زەویوزارگەلی گەورەبەکەڵکن. لە ئەیالەتی پەنجابی هێندوستاندا شۆڕشی شین بوو بە هۆی زۆرتر کردنی بەرهەمی کشتوکاڵ؛ بەلام لە هەمان کاتدا بوو بە هۆی لەناوچوون و نەمانی سەتی پەنجای کارەکان و هەزاران کەسی لە کار بێکار کرد و لە زەوی و زارەکانیان دەرکران. کێشەیەکی‌تر کە لە سۆنگەی شۆڕشی

شینەوە هاتە دی، دابەزینی نرخی گەنم و زۆرتر قـەرزدار کـەوتـنی وڵاتـانی جیهانی سێیەم بوو. هەروەها شۆڕشی شین زیانی زۆری بە ژینگـە گـەیانـد. پاش ماوەیەک، ئاودێرانی بەردەوامی زەویەکان بوو بە هۆی کەم بوونی ماکـە خۆراکییەکان لە نێو بەرهەمەکاندا و دەرمان و سەمە کیمیاوییـەکـان بوونـە هۆی ئاڵوودە بوونی ئاو و بەهێزتر کردنی ئافەتەکان لە بەرانبەر دەرمانەکاندا. بە زۆر بوونی خەڵکی ئەو وڵاتانەی خەریکی گەشەسەنـدن بـوون، کێشـەی بەرهەمهێنان و جێبەجێ کردن گەیشتە قۆناغێکی زۆر ئاستەنگ. زۆربـوونی لە رادەبەدەری خەڵک، بوو بە هۆی کۆچ کردنی ژمارەیەکی زۆر لە خـەڵـکی بۆ شوێنە بایێرەکان یاخۆ بۆ نێو جەنگڵ و لێڕەوارەکان، بەم بۆنەوە ناچار بە لە ناوبردن و بـڕینی دارسـتانەکـان بـوون (*Hendry, P. 1988*). زەویـنی ئـەم ناوچانە کەمپیـت و مایـەیـە و بـە خێرایـی دەفـەوتـن. زۆربـوونی ژمـارەی دانیشتوانی ئەو شوێنانەی کە بۆ سووتەمەنی و رووناکی پێویسـتیان بـە دارو چێو هەیە، خێراتر لێڕەوارەکانی فەوتاند. لەم شوێنانەدا جووتیاران بـە جێـی ئەوەی کە لە سەنێر و ریخی ئاژەڵەکانیان بـۆ کـوودی نێـو زەوی و زارەکـان بەهرە بگرن، بۆ سووتەمەنی کەڵکیان لێ دەگرن؛ بۆیـە خـاکی ئـەو ناوچانـە سفتتر دەبێ و ناتوانێ ئاو لەنێو خۆیدا رابگرێ. لـە ئـەنجامـدا خـاک و ئـاو تەنانەت بۆ خۆراکی خودی جووتیارانیش نامێنێ و ناچار دەبنە «پـەنابـەرانی پەراوێز» و بەرەو نزیکترین شارەکان کۆچ دەکەن (*Brown, L; 1988*). لـەم سۆنگەوە زەویگەلی کشتوکاڵ کەمتر دەبن و ژمارەی جووتیـارانی بـێزەوی زۆرتر دەبن. ئەم شێوازە بە تایبەت لە وڵاتە ئەفریقیەکاندا بە راشکاوی دیارە. گەشە و پەرەسەندنی شارەکان لەم وڵاتانەدا، هەم هۆی لەنـاوچوونی زەوی و زارەکانە و هەم لەناوچوونی زەوی و زارەکانیش هۆی پەرەسەندنی شارەکانە.

لە شەڕی جیهانی دووەم بە دواوە، زەوی و زاریکی زۆر (نزیک بـە پانتـای وڵاتانی هیندوستان و چین) هێزی بەرهەمهێنـانی خۆیـان لـە دەسـت دا و

ئیتر قەد بەرهەمێکی وایان نەهێنا (*World Resources,1992-3*). بەپیشەسازی بوونی وڵاتانی ژاپۆن ، تایوان و کووریای باکوور بوو بە هۆی ئەوەی کە کەمتر شتمەکی خۆراکی بێننە بەرهەم و ناچار لە وڵاتانیترەوە ئەم پێداویستییانە دابین بکەن. کەچی وڵاتانی ئەفریقی و ئەمریکای لاتین وانین. لەم وڵاتانەدا هەم پیشەسازی گەشەی نەسەندووە و هەم بە هۆی کەم بوونی هێزی زەوی و زارەکان و باهێر بوونیان، برسیەتی و هەژاری ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر بەربینگی دانیشتوانی دەگرێ.

## شۆڕشی کۆمەڵایەتی / social revolution

کۆمەڵناسان شۆڕش بە دیاردەیەک سەرتر لە بزاڤگەلی کۆمەڵایەتی ئاشکرا و دیار دەزانن. تێدا ئێسکاکپۆل شۆڕشی کۆمەڵایەتی بە گۆڕانی خێراو بنەمایی سیستەمی سیاسی، پیکهاتەی چینەکانی کۆمەڵگا و ئایدیۆلۆژی داسەپاو بە سەر کۆمەڵگادا پێناسە دەکات. بە پێچەوانەی چاڕلز تیلی کە دەیگوت شۆڕشەکان دەتوانن زانایانە و بە قەستی بن، ئێسکاکپۆل بڕوای وایە کە شۆڕشەکان بە دەگمەن بەرنامەیان بۆ دادەڕێژرێ و چاوەڕوان دەکرێن. بە واتایەکیتر بەرنامەی شۆڕشەکان لە چاوپێکەوتنەنهێنییەکاندا گەڵاڵە ناکرێن و لە لایەن ئەندامانی ناوەندی شۆڕشەوە ڕەچاو ناکرێن. بە پێچەوانە، کاتێ قەیرانە نێونەتەوەییەکان دەبنە هۆی زۆرتر کردنی ناکۆکی ناوخۆی نەتەوەیەک، شۆڕشەکان بۆ خۆیان دێنە دی. ئەم ڕوانگەی سکاکپۆلە، ڕوانگەیەکی پێکهاتەخوازانەیە (اسکاکپول؛١٣٧٦).

شرۆڤەکەی سکاکپۆل، زۆرتر پێداگری لە سەر دەوری پێکهاتەگەلی ئاشکرای جووتیاری و بژاردەیی، وەکوو هۆکاری خێراییدەر و ئاسانکەری شۆڕش دەکا. بەڵام سکاکپۆل دەیەوێ بگاتە بیردۆزێکی گشتگیرتر. شرۆڤەکەی خۆی بە ئاماژە بەم خاڵە دەس پێدەکا کە شۆڕشە

کۆمەڵایەتییەکان تەنیا لە نێو کۆمەڵگاگەلی «جووتیاری- بۆرۆکراتیک»دا دێنە دی. ئەم جڤاکانە، بۆرۆکراسییەکی نیوە ناوەندییان هەیە. داهاتیان لە لایەن زەویدارە بەدەسەڵاتە ناوچەییەکانەوە دابین دەکرێ. ئەم جڤاکانە سێ خاڵی لاوازیان هەیە: یەکەم، بۆی هەیە حکوومەتی بۆرۆکراتیکی ناوەندی و زەویدارەکان بە بۆنەی دابەش کردنی داهاتی زیادەوە، ناکۆکی لە ناویاندا بێتە دی؛ دووەم، جەماوەری زۆری جووتیار و سەپان دەتوانن ببنە سەرچاوەی نارەزایەتی و دژایەتی؛ سێیەم، چونکە زیادەی داهاتێک کە پشتگیری لە بۆرۆکراسی و زەویدارەکان دەکات، بەرهەمی کشتوکاڵی سونەتییە، گەر گوشارێکی دەرەوەیی (وەکوو شەڕ یان هێرشی ئابووری بازاڕەکانی دەرەوە بۆ نێو بازاڕەکانی ناوخۆ) مەترسی هەڵلووشین یان کەم کردنەوەی داهاتەکان بێنێتە دی، بە ئاسانی قەرەوی ناکرێتەوە (اسکاکپول؛ ١٣٧٦).

هەر بەو جۆرەی کە سکاکپۆل ئاماژە دەکا، ئەم خاڵە لاوازانە لە هەموو کۆمەڵگا جووتیارییەکاندا دیارن؛ بەڵام هەموو ئەم جڤاکانەتووشی شۆڕش نابن. بەم بۆنەوە سکاکپۆل لە نیوەی یەکەمی کتێبەکەیدا بە وردی و شارەزایانە ئەم بابەتە دەخاتە بەر وردبوونەوە و لێکدانەوە کە بۆچی لە فەرانسە و رووسیا و چیندا شۆڕشی کۆمەڵایەتی هاتە دی، کەچی لە پرووس و ژاپۆن و بریتانیادا لە خولی هاوچەشندا، هیچ شۆڕشێک نابینین.

وەڵامی سکاکپۆل ئەوەیە کە هۆکارگەلێکی پێکهاتەیی دیار و ئاشکرا – واتە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی جووتیاری و پێکهاتەی بژاردەکان- دەبێتە هۆی ناتەبایی زۆرتری نێوان بۆرۆکراسی و چینی زەویدار و خێرایی دەبەخشێتە شۆڕشەکان. بەم پێیە، جیاوازی نێوان پێکهاتەی وڵاتانی فەرانسە، رووسیا و چین لە لایەکەوە و رووس و ژاپۆن و بریتانیا لە لایەکیترەوە –هەروەها جیاوازی نێوان گوشارە نێو نەتەوەییەکان- بۆمانی روون دەکەنەوە کە بۆچی

لە وڵاتانی دەستەی یەکەمدا شۆڕشگەلێکی سەرکەوتوو هاتنە دی، بەڵام لە وڵاتانی دەستەی دووەمدا نە.

بەڕای سکاکپۆل توندی شۆڕشە جووتیارییەکان بە رادەی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی ڕێکخراوەیی جڤاکە جووتیارییەکان بەستراوە. بۆ نموونە، جووتیارانی فەرانسە و رووسیا لە گوندگەلێکدا بوون کە تا رادەیەک سەربەخۆ بوون و پێکهاتەی رامیاری سەرنجڕاکێشیان بوو. ئەم هەل و مەرجە پایەگایەکی بۆ شۆڕشی ڕێکخراو و هاودەنگی جووتیاران دژ بە ئاغەواتەکان، هێنایە دی. بەپێچەوانەی ئەوان، جوتیارانی پرووس و بریتانیا لە سەدەی حەڤدەهەمدا، لێک دابڕاو و لە ژێر چاودێری زۆر توندوتیژی زەویدارەکاندا بوون و هیچ جۆرە سەربەخۆییەکی سیاسیان نەبوو. ئەم هەلومەرجە تا رادەیەکی بەرچاو، ئاکامی یەکەمین قۆناغی بواری ئەم کۆمەڵگایانە بوو بۆ کشتو کاڵی سەرمایەداری، کە بە تێکشکانی کۆمەڵگاگەلی سوننەتی جووتیاری و ئاغا و رەعیەتی، بوو بە هۆی هاتنە دی هێزی کاری کشتو کاڵ کە زۆر لە ژێر چاودێریدا بوو. بۆیە لە شۆڕشی ١٨٤٨ی پرووس و شەڕی ناوخۆی بریتانیادا، لە چاو شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرانسە و ١٩١٧ی رووسیادا کاریگەرییان بە سەر دەوڵەتدا نەبوو.

دووەم، رادەی ناکۆکی نێوان حکوومەتی پادشایەتی و چینی زەویدار، بەوەبەستراوە کە ئەم چینە (چینی زەویدار) تا چ رادەیەک لە نێو سیستەمی بۆرۆکراتیکدا خاوەن را و دەسەڵاتە و تا چ رادەیەک کۆسپ و تەگەرەکانی سیستەمی بۆرۆکراتیکی لە کۆنترۆڵدایە. بۆ نموونە سیستەمی پادشایەتی چین، زۆربەی کارمەندانی ئیداری خۆی لە نێو زەویدارەکاندا هەڵدەبژارد. سیستەمی ئیداری فەرانسە هەرچەن لە چین و توێژگەلی جۆراوجۆر پێک هاتبوو، بەڵام ئەو پەرلەمانانەی لە ژێر دەسەڵاتی خانەدانانـدا بوون و بۆ بەرەنگاری لە گەڵ فەرمانەکانی پادشا دامەزرابوون، وەک خۆیان مانەوە. لە

هەر دووی ئەم حکوومەتانەدا هاوکاری چینی زەویدار بۆ کـاری حکوومـەتی ناوەندی، بایەخێکی ئەوتۆی هەبوو. لەم سۆنگەوە کاتێ نێوان پادشا و چـینی زەویـدار تێکچـوو و نـاکۆکی هاتـە کایـەوە، چینـە زەویـدارەکـان توانییـان حکوومەت لە کاربخەن و ڕێگا بۆ شۆڕشێکی تەواو عەیـاری گشـتگیر خـۆش بکەن. لە لایەکـیتـرەوە حکوومـەتـە نـاوەندییـەکـانی چـین و ژاپـۆن، زۆر سەربەخۆتر لەوە بوون کە ناڕەزایەتی و ناتەبایی زەویدارە ناوچەییەکان بتوانن بیانڕووخێنن. بەم بۆنـەوە ناتـەبـایی نێـوان حکوومـەتی نـاوەنـدی و چـینی زەویدار-هەرچەن بوو بـە هـۆی چاکسـازی پێـوەندییـەکانیـان- نـەیتـوانی دەسەڵاتی بۆرۆکراتیکی ناوەندی تێک بدات.

سێیەم، ڕەنگە گوشارە نێو نەتەوەییەکـان بـە گـوێرەی جیاوازییـەک کـە وڵاتانی دژ بە یەک لە باری پێشکەوتوویی ئابووری و دەسەڵاتی سەربازییەوە هەیانە، جیاواز بێ. لەم بارەوە رووسیا نموونەیەکی تەواوە. رووسـیا هـەم لـە باری ئابووری و هەم سەربازیوە زۆر دواکەوتووتر لە ئیمپراتۆری ئاڵـمانیا بـوو، بۆیە حکوومەتی تێزار نەیتوانی بۆ بەرەنگاری لە گەڵ هێرشی ئاڵـمانیەکانـدا، سەرچاوەگەلی پێویستی سەربازی و ئابووری دابین بکات. تێکشـکانی یـەک بە دوای یەکی تێزار، ڕێکخراوی و لێهاتوویی سـوپای رووسـیای بـە تـەواوی تێکدا. کاتێ جووتیاران لە بەرانبەر زوڵم و ئەستەمی تێـزار و ئابووریيـەکـی شەڕلێـدراوەوە کـە لـە کـاتی ئاشـتی و هێمنیشـدا بـە ئـەسـتەم دەیتوانـێ گوژمەکانی خۆی دابین بکات، زەوییەکانیـان داگـیر کـرد، تێـزار نـەیتـوانی بەرەنگاریـان بـێ. بـە پێچـەوانـەی رووسـیا، پـرووس لـە شۆڕشـی ١٨٤٨دا گوشارێکی دەرەکی کەمتری لە سەردا بوو، ئەرتەشیش لە سەر جێـی خـۆی نەجوولابوو؛ بۆیە پادشا توانی بۆ سەرکوت کردنی ئاژاوەی نێو شار کەڵکی لێ بگرێ و ئاژاوەکە بخەوێنێ (اسکاکپول؛ ١٣٧٦).

سکاکپۆل لە بەشەکانیتردا لە شرۆڤەو بـەراوردی شۆڕشـەکـانی رووسـیا،

چین و فەرانسە، دەستی دا بـە روون کردنـەوەی ئـەو هۆکارانـەی بـە سـەر ئاکامی شۆڕشەکۆمەڵایەتییەکاندا کاریگەر بوون. هۆکارە سەرەکییەکانی ئـەم بەشە بریتین لە هۆکارە رامیاری، ئابووری و گوشارە نێو نەتەوەییەکان.

## شەڕ (جەنگ) / war

لە کۆمەڵناسیدا شەڕ لە سێ رەهەندا پێناسە دەکرێ:

١) رەنگە جەنگ بریتی بێ لە بارودۆخێک کە لە باری کۆمەڵایەتییەوە بـە رەسمی زانراوە و لەم بارو دۆخەدا شەڕی چەکدارانە لە پانتایەکی بەرفراوان و بەردەوام لە نێوان دوو یان چەند وڵات، دەوڵەت و حکوومەتدا لە گەڕایە.

٢) رەنگە یاسای وڵاتێک دەستنیشانی کردبێ کە جەنگ بریتیە لـە بـارو دۆخی کێشەی چەکدارانە لە نێوان ئەو دەوڵەتە و دەوڵـەتێکـی‌تـر یـاخۆ لـە نێوان دوو دەوڵەت یان بەرەسیاسییەکانـدا. ئـەم هـەل‌ومـەرجـە لـە لایـەن دەزگایەکەوە کە بە هۆی یاسای وڵاتێکەوە ئەم ئیزنەی پـێ دراوە، بـە نـاوی جەنگ رادەگەیندرێ.

٣) لە یاسای نێونەتەوەیی هاوچـەرخـدا شـەڕ بریتیـە لـە ململانێیـەکـی چەکدارانە لە نێوان دوو یان چەن وڵات کە هەر یەکەیان خـۆی بـە حـاکمی رەوای نەتەوەیی دەزانێ. ئەم وڵاتانـە لـە چوارچێـوەی ئـەم ململانێیـەدا لـە ئاست وڵاتانی‌تر لە باری یاساییەوە یەکسانن.

جەنگ، زۆرتر بریتیە لە ململانێی چەکدارانەی نێوان وڵاتەکان؛ هەرچەنـد لەم بابەتانەی خوارەوەش بەکار دەبرێ: ١) بە چەشنی مەجـازی بریتیـە لـە هەر کێشە و ناکۆکییەک کە لە ناودا بێ؛ وەکوو: شەڕە قسە، جەنگـی نێـوان زانسـت و دیـن، جـەنگـی پیشـەسـازی، شـەڕی ژن و پیـاو، شـەڕی دژ بـە نەخۆشی. ٢) کێشە و ناکۆکی نێوان بەرە سیاسیەکانی نێو وڵاتێـک (شـەڕی ناوخۆ). ٣) دژایەتی کوشندە لە نێوان هەر جۆرە سیستەمێکی پراکتیسی کـە

زۆر لێک بچن؛ وەکوو هۆزە سەرەتاییەکان، تاکەکان یا تەنانەت ئاژەڵانیش.
٤) دژایەتییە نێو نەتەنەوەییەکان کە نەگاتە جەنگی چەکدارانە و پای هێزە چەکداراەکانی تێدا نەکرێتەوە، وەکوو جەنگی ئابووری، جەنگی دەروونی، جەنگی ئایدیۆلۆجیک و شەڕی سارد.

بەڵام هەروەک ئامازەی پێکرا، زاراوەی شەڕ لە زەقترین واتای خۆیدا بریتیە لە دژایەتییەک بە پانتایەکی بەربلاو کە بە هۆی هێزە چەکدارەکانی دەوڵەتێکەوە لە مەودایەکی دیاردا لە گەڕدابێ. وەکوو شەڕی رووسیا و ژاپۆن، ئێران و عەراق. بەم واتایە جەنگ زنجیرە پێکدادان و کێشەی بەردەوامە لە نێوان لایەنە ناتەباکاندا. هەرچەند هەندێ جار بۆ ماوەیەکی زۆر لە نێوان دوو لایەنی شەڕدا ئاگربەس دەکرێ، هەروەک ئەو شتەی سەبارەت بە «شەڕگەلی سەدساڵە» و «شەڕگەلی سی ساڵە» هاتە ئاراوە (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## شەریکەی بەشکۆ/ corporation

شەریکەیبەشکۆ جۆرێک دامەزراوەی فەرمی ئابوورییە؛ بنەمایەکی یاسایی ناسراوە کە خاوەنی مافی خاوەنێتییە و دەتوانێ گرێبەستی ئابووری ببەستێ و لەژێر ناوی دامەزراوە-نەک تاک- خەریکی مامەڵەی ئابووری بێ. بەگوێرەی یاسا، بوون و بەرپرسایەتی شەریکەی بەشکو، جیاوازە لە بەڕێوەبەران و خاوەنانی شەریکە. هەر تاقمێک لەو تاکانەی کە بتوانن فۆرمی پێویست بۆ دامەزراندنی شەریکە ئیمزا بکەن و لە لایەن ناوەندە بەرپرسەکانەوە تۆماری بکەن، دەتوانن شەریکەیەکی بەشکۆ دابمەزرێنن. رێکخراوێکی ئاینی، دەزگایەکی چاکەکاری، یا قوتابخانەیەک، دەتوانێ شەریکەی بەشکۆ بێ؛ بەڵام زۆرتر ئەم واتایە بۆ بنکەیەکی بازرگانی و ئابووری تایبەت بەکار دەبەن.

شەریکەی بەشکۆ لە هەندێ ڕەهەند و لایەنەوە لە گەڵ جۆرەکانی تری شەریکە بازرگانییەکان جیاوازی هەیە. بە گوێرەی یاسا، شەریکەی بەشکۆ وەکوو کەسایەتییەکی دەسکرد و چێ کراوە (*Dan-Cohen, M; 1986*). شەریکەی بەشکۆ وەکوو تاکێکی ئاسایی دەتوانێ خاوەنی سامان بێ، گرێبەست ئیمزا بکات، لە تاک یا شەریکەکانی‌تر شکایەت بکات یا بخرێتە بەر لێپرسینەوە. چونکە بەپێی یاسا، شەریکەی بەشکۆ کەسایەتییەکی یاساییە، ئەو تاکانەی کە تێیدا کار دەکەن، ناکرێ لە باری یاساییەوە بۆ هەڵەکانی شەریکە بخرێنەبەر لێپرسینەوە. بۆ وێنە گەر تورمۆزی ترۆمبیلەکەتان خراپ کار بکات و ببێتە هۆی زیان و خەسار گەیاندن بە ئێوە، ئێوە دەتوانن لەو شەریکەیە کە ئەو ترۆمبیلەی بەرهەم هێناوە شکایەت بکەن، بەڵام ناتوانن لە بەڕێوەبەر، یاخۆ ئەو کرێکار یا ئەندازیارەی کە بەرپرسی چێ کردنی تورمۆزەکەتان بووە شکایەت بکەن. هەروەها گەر پێش ئەوەی ئێوە تووشی زیان بن، ئەو شەریکەیە ئاش‌بەتاڵ کا، ئێوە ناتوانن لە کەس شکایەت بکەن، چونکە ئەو شەریکە کە بەرپرسی چێ کردنی ترۆمبیلەکەتان بووە، نەماوە تا شکایەتی لێ بکەن.

جیاوازی‌تری شەریکەی بەشکۆ لە گەڵ شەریکەبازرگانییەکانی‌تر لەمەدایە کە شەریکەی بەشکۆ دەتوانێ بەشێک لە سامانەکەی وەکوو «بەش» لە بازاڕی بوورسدا بفرۆشێ. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە شەریکە بەشکۆکان لە چاو شەریکەکانی‌تر ببنە خاوەنی سەرمایەیەکی زۆرتر؛ واتە لەم بارەوە لەگەڵ یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی سیستەمی سەرمایەداری کە کۆوەکردنی سەرمایەی پارەیییە سازگارە (مندل؛ ١٩٩١).

جیاوازییەکی‌تر بریتییە لە جیاکردنەوەی خاوەنێتی (مالکیت) لە بەڕێوەبەرایەتی (مدیریت) (مندل؛ ١٩٩١). ڕەنگە تاک یا بنەماڵەیەک کۆنترۆڵی هەموو بەشەکانی شەریکەیەکی بەشکۆی لەژێر ڕکێفدا بێ، بەڵام

خاوەنانی شەریکە بەشکۆوە گەورەکان سەدان و رەنگە هەزاران بەشـدار بـن. خاوەنێتی ئەم شەریکانە لە مامەڵەکانی بازاڕی بوورسدا دەگۆڕێن و هـەر رۆژ کەسێک دەبێتە خاوەنیان. هەندێ لەم خاوەنانـە، تاکـەکـان نـین، بـەڵـکوو ئەوانیش شەریکـەن. بـە پێچـەوانـەی شـەریکـە تایبـەتـەکـان، خـاوەنـانی شەریکەکانی بەشکۆ هیچ کۆنترۆڵێکیان بە سـەر کـارو کـردەی شـەریکـەدا نییە.

## شەریکە فرەنەتەوەییەکان/ multinational corporation

ئەم زاراوە بەو بنکە بازرگانیانە ئاماژە دەکات کە ئەمڕۆکە لە پتر لـە یـەک وڵاتدا خەریکی کارن. هەرچەن ئەم واتا بەربلاوە دەتوانـێ بازرگانـانی خـولی مێرکانتالیستیش بگرێتەوە کە لە قۆناغی سەرەتای کۆلۆنیالیزمی ئـەورووپـادا خەریکی چالاکی بوون. ئەم زاراوە تا پاش شەڕی دووەمی جیهانی کـەڵـکی لێوەرنەدەگیرا. هەروەهـا ئـەم زاراوە ئامـاژە دەکـات بـە دیـاردەی قـۆرخی سەرمایەداری نـوێ کـە دەبێتـە هـۆی نێونـەتـەوەیـی بـوونی سـەرمایـەی پیشەسازی (ویکس؛ ١٩٩١).

لە روانگەی هزری مارکسیەوە، هۆی نێونـەتـەوەیـی بـوونی سـەرمایـەی پیشەسازی لە گەشە و تـەکامولـی خـودی سـەرمایـەداریدایـە. بـە گشـتی ئەمڕۆکە شەریکە فرەنەتەوەییەکان ئەکتەری سەرەکی سیسـتەمـی ئـابووری جیهانین. ئەمانە بریتین لەو شەریکانە کە مەکۆی ئابووریـان (نـاوەندگـەلی بڕیاردان، دارایی و سامانەکان) لە یەک وڵاتدا نییە، بەڵـکوو لـە چـەن وڵاتی جۆراوجۆردا بڵاوبوونەتەوە (بارنت و میلر؛ ١٩٧٥). ئەم شەریکانـە سـەرچـاوە سروشتییەکان، دەسکەوتە تیکنۆلۆجیەکان و هێزە مرۆییـەکـان لـە کـونج و قوژبنی دونیاوە دەبیننەوە و کۆیان دەکەنەوە و لە یەکەیەکی بەرهەمهێنانـدا رێکیان دەخەن. بۆ وێنە شەریکەی فرەنەتـەوەیـی هارڤێسـتێر (harvester)

خاوەنی کارخانەیەکی ترۆمبیل‌سازیە لە تورکیادا کە کەرتەکانی لە ئەمریکا و ماتۆرەکەی لە ئالمانیا چێ‌دەکرێ. شەریکەی‌ترۆمبیل‌سازەکانی تۆیۆتا و هیۆندای کارخانەکانی لە ئەمریکادایە کە بەرهەمەکانیان بۆ فرۆتن بۆ ژاپۆن دەنێرن. نزیک بە ٧٠٪ تەلەفزیۆنەکانی ژاپۆن لە ولاتانی‌تردا چێ‌دەکرێن (نیویورک تایمز، ٢٩ آگوست ١٩٩٣). یەکەمین شەریکەگەلی فرەنەتەوەیی مۆدێرن، لە ئەمریکادا سەریان هەلدا. ئەم شەریکانە بۆ ئەوەی کە بتوانن بە برێکی کەمتر بەرهەمەکانیان چێ بکەن و بیانێرنە نێو بازاڕەوە، بەشێک لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی خۆیان بۆ ولاتانی‌تر بە تایبەت ولاتانی ئاسیا و ئەفریقا نارد؛ ولاتانی‌تریش لەم شێوازە پێڕەوییان کرد.

ئەم شەریکانە بە کۆنترۆلی بازاڕ، هان دەدەن تا خۆیان لە بازاڕی رکەبەرێ لە سەر نرخی کالاکان بپارێزن. ئەوان ماکە سەرەکییەکان لەو سەرچاوانەی کە لەژێر رکێفیاندان دەکڕن و بەرهەمەکانیان لەو بازارانەی کە لەژێر دەسەلاتیاندان، دەفرۆشن. بە سەرنج دان بەوەی کە ئەم شەریکانە لەولاتانی جۆراوجۆردا پێگەی زۆریان هەیە، بۆ دەرباز بوون لە پیتاک و رەسم و یاسا دەستوپێ‌گیرەکان و هەروەها کێشەی یەکیەتی کرێکاران، دەتوانن سەرمایە و چالاکییەکانی خۆیان لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی‌تر بگوازنەوە. گەورەیی و نزیکی بە سەرچاوە جیهانیەکان، ئەم هەلەی بۆ ئەم شەریکانە رەخساندووە کە بە ویستی خۆیان لە گەل بازاڕی نرخی پارە و بەرهەمەکانیان یاری بکەن. هەروەها ئەم شەریکانە کاریگەریەکی زۆریان بە سەر سیاسەتە ناوچەییەکان -بە تایبەت لە ولاتانی جیهانی سێیەم یا ئەو ولاتانەی کە پێویستی زۆریان بە سەرمایەدانانی دەرەکی هەیە- هەیە.

بەگشتی، شەریکە فرەنەتەوەییە گەورەکان گوێڕایەلی هیچ ولاتێک نین و بۆ خۆیان وەکوو دەولەتێکی سەربەخۆ دەبزوێنەوە. ئەوان بۆ خۆیان لە ولاتانی جۆراوجۆردا نوێنەر و بالوێزیان هەیە و وەکوو حکوومەتێکی

سەربەخۆ، بۆ خۆیان دامودەزگای شۆڤاری و کۆوەکردنی زانیارییان هەیە.

گیدنز دەڵێ هەرچەند باج و پیتاکی شەریکە فرەنەتەوەییەکان کانێکی پڕبایەخی ئەرزی دەرەکی دێتە ئەژمار و ئەم شەریکانە هەلی کار بە مووچەی زۆرتر لەو شتەی کە لە نێو ولاتانی جیهانی سێیەمدا باوە بۆ خەڵکەکە دەڕەخسێنن، بەلام بە گشتی ئاکامی چالاکی ئەم شەریکانە بۆ ولاتانی جیهانی سێیەم نیگەتیڤە. هەرچەند زۆربەی کرێکاران بۆ کار روو لەم شەریکانە دەنێن، شێوازە سونەتییەکانی بەرهەمهێنان دەخرێنە پشت و گوێ و ئاوڕیان لێ نادرێتەوە. بەم جۆرە گەر ئەم شەریکانە بیانەوێ لە شوێنێکی تردا سەرمایەدابنێن و کارەکەییان درێژە پێبدەن، خەڵکەکە تووشی زیان و قەیران دێن. لە راستیدا ئەم شەریکانە خەڵکی ئەو ولاتانە بە دیل دەگرن. هەروەها بژاردەکانی ئەو ولاتانە بە هۆی پێوەندی لە گەڵ شەریکە فرەنەتەوەییەکان، سامانێکی زۆر کۆوە دەکەن و بەم جۆرە مەودای نێوان ئەمان و خەڵکی کرێکار و جووتیار زۆرتر دەبێتەوە (گیدنز؛ ١٣٨٦).

پێرلمۆتێر، شەریکە فرەنەتەوەییەکان بە سێ دەستە دابەش دەکات کە بریتین لە:

١- فرەنەتەوەییە هۆزناوەندییەکان (*ethnocentric*): بەرنامەی کاری ئەم شەریکانە بە هۆی ئیدارەیەکی ناوەندییەوە کە لە ولاتی سەرەکیدایە دابین دەکرێ و تا ئەو جێگای کە بۆیان دەلوێ جێبەجێی دەکەن. ئەو شەریکە و کارخانانە کە شەریکەی سەرەکی یان شەریکەی دایک خاوەنیانە، لە راستیدا درێژەی کولتووری شەریکە سەرەکییەکانن. رەوتی کاری ئەم شەریکانە لە هەموو جیهاندا یەکسانە.

٢- فرەنەتەوەییە چەن ناوەندییەکان(*polycentric*): ئەم شەریکانە، لقەکانی خۆیان (شەریکە و کارخانەکانیان) راستەوخۆ لە ولاتی سەرەکییەوە ئیدارە ناکەن. شەریکە و رێکخراوەکانیان لە ولاتانیتردا بە هۆی شەریکە

ناوچەییەکانەوە ئیدارە دەبن. ئیدارە ناوەندییەکان لە وڵات یا وڵاتە سەرەکیەکانی شەریکەدا تەنیا ڕێنومایی گشتی ئاراستە دەکەن و شەریکە ناوچەییەکان لە نێو چوارچێوەی ئەو دەستوورانەدا کاروباری خۆیان بەڕێوە دەبەن.

٣- فرەنەتەوەییە جیهانناوەندییەکان (*geocentric*): پێکهاتەی بەڕێوەبەرایەتی ئەم شەریکانە نێونەتەوەییە. سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی ئەم شەریکانە بە گوێرەی سیستەمی جیهانی تێکەڵ بووە و بەڕێوەبەرە باڵادەستەکان توانی هاتوچۆی زۆرتریان هەیە و بە گوێرەی نیازەکان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر دەگوازرێنەوە (پرلموتر؛ ١٩٧٢).

بە گوتەی پێرلمۆتێر زۆربەی شەریکە فرەنەتەوەییەکانی ئێستا چەندناوەندین، بەڵام بزاڤێکی بە هێز بەرەو جیهانناوەندیان ڕادەکێشێ.

ئانتۆنی گیدنز هۆی گەشەی ئەم شەریکانە بەم جۆرە باس دەکات: ئەنگێزە و هۆی بەدیهاتنی ئەم شەریکانە مامەڵە و بەدەست هێنانی قازانجی زۆرترە، کەواتە زۆر ئاشکرایە کە بۆ بەدەست هێنانی قازانجی زۆرتر و سەرمایەدانانی پڕبەهرەتر، بتۆژنەوە. هەروەها هان دەدەن لە هێزی کاری هەرزان کە لەژێر چاودێری یەکیەتی کرێکاراندا نەبن، کەڵکی زۆرتر وەربگرن. لقی ئەم شەریکانە لە وڵاتانیتردا ئەو هەلەیان بۆ دەڕەخسێنێ کە لە کان و سەرچاوەکانی وڵاتانیتریش کەڵک وەربگرن. ئەم شەریکانە چونکە خاوەنی لقی جۆراوجۆر لە نێو بازاڕەکانیتردان، هەندێ جار دەتوانن بە دابەش کردنی قازانجەکانیان لە نێوان لقەکانیاندا خۆیان لە دانی باج و پیتاک بپارێزن. ئەم شەریکانە دەتوانن مامەڵەی زۆر و جۆربەجۆر لە نێو لقەکانیاندا ئەنجام بدەن. ئەم شەریکانە بە یەکپارچە کردنی کارخانە و شەریکەکانیان لە چەن وڵاتی جۆراوجۆردا، دەتوانن خۆیان لە بەندیواربوون بە شەریکەکانیتر بۆ دابین کردنی ماکە سەرەکییەکان، بپارێزن و شەریکەی

ناوەندی یا دایک، دەتوانێ بۆ خۆی نرخی کالا و خزمەتگوزارییەکان دیاری بکات (گیدنز؛ ١٣٨٦)

گۆڤاری fortune بەهێزترین شەریکەگەلی فرەنەتەوەیی لە ساڵی ١٩٩٣دا بەم چەشنە ناو لێدەبا:

١- شەریکەی جێنێراڵ ماتۆرز: لە ساڵی ١٩٩٢دا فرۆتنی کالاکانی ئەم شەریکەیە پتر لە ١٣٢ بیلیۆن دۆلار بوو. بایەخی داراییەکانی ئەم شەریکەیە ١٩١ بیلیۆن دۆلارە و ژمارەی کرێکاران و کارمەندەکانی لە سەرانسەری جیهاندا زۆرتر لە ٧٥٠.٠٠٠ کەس بووە.

٢- شەریکەی نەوتی شێل: لە ساڵی ١٩٩٢دا فرۆشی ئەم شەریکە بریتانی-ئەمریکییە پتر لە ٩٩ بیلیۆن دۆلار بووە. بایەخی داراییەکانی دەگاتە ١٠٠ بیلیۆن دۆلار و ژمارەی کرێکاران و کارمەندەکانی لە هەموو جیهاندا زۆرتر لە ١٠٨.١٦٧ کەس بووە.

٣- شەریکەی ترۆمبیلسازی بێنز: ساڵی ١٩٩٢ فرۆشی ئەم شەریکە زۆرتر لە ٦٣ بیلیۆن دۆلار بووە. بایەخی داراییەکانی دەگاتە ٥٣ بیلیۆن دۆلار و ژمارەی کرێکاران و کارمەندەکانی لە هەموو جیهاندا دەگاتە ٣٧٦٠٠٠ کەس (*fortune, july 26, 1993: 191*).

**شەیدایی/ craze** : بڕوانە: **ڕەفتاری بەکۆمەڵ**

**شێوازەکانی کۆڵینەوە/ research methods**

شێوازەکانی کۆڵینەوە بریتیە لە هەندێ تەکنیکی جۆراوجۆر کە کۆمەڵناسان و توژەرانیتر بۆ گەیشتن بە وەلامەکانی خۆیان لە رێی کۆوە کردنی داتا و لێکدانەوەو شرۆڤەی ئەو زانیاریانەونە، بەکاریان دەبەن. ئەنجامی ئەم توژینەوانە ئەم هەلە بۆ لێکۆڵەرانیتر دەڕەخسێنێ کە

جارێکی‌تر ئەم بابەتە تاقی بکەنەوە.

ئێمە ئەگەریش بە نیاز نەبین سەبارەت بە بابەتێک بکۆڵینەوە، دیسان پێویستمان بە لانی‌کەمی زانستی شێوازەکانی تۆژینەوە هەیە. چونکە لە سەردەمی تەقینەوەی زانیارییەکاندا دەژین. واتای تەقینەوەی زانیاری باس لە گەشەی رۆژ بە رۆژی ئەو زانیارییانە دەکات کە بە هۆی کۆمپیۆتەر و پەرەسەندنی تیکنۆلۆجیای زانیارییەکان و میدیا گشتییەکانەوە لە بەر دەستمان دایە. تۆژەران دەبێ بۆ کەڵکوەرگرتن و لێکدانەوەی داتاکان، سەرنجی زۆر بدەن و بە وردی ئەم کارە جێبەجێ بکەن. هەرچەند داتاکان لە باری چەندایەتییەوە ئێجگار زۆرن، بەڵام تۆژەر دەبێ سەرنجی زۆرتر بداتە چۆنییەتی داتاکان. داتاکان بە هۆی بیستن، خوێندن و دیتنی کەسانی‌ترەوە کۆوە دەکرێن. بەم بۆنەوە ئێمە قەد ناتوانین لە راست و دروست بوونیان دڵنیا بین. تێرزاڵ بیکێر، لە شێوازەکانی کۆڵینەوەی هزری لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، ئاماژە دەکات کە مەرج نییە بۆ گەیشتن بە ئەنجامێکی گونجاوتر، کۆمەڵەیەکی ئاماری بەربلاومان بێ. بە پێچەوانە، بەرفراوان بوونی کۆمەڵەی ئاماری و داتاکان، زۆر جار دەبنە هۆی ئاڵۆزی و سەرلێ شێوانی تۆژەر (بیکر؛ ١٣٨٧). گەر تۆژەر بە جێی بایەخ دان بە چەندایەتی و ژمارەی داتاکان، زۆرتر خێ بداتە چۆنییەتی داتاکان، دەتوانێ ئەنجام و ئاکامی تۆژینەوەکەی بە باشترین و وردبینانەترین جۆر بە دەست بێنێ.

## فاشیزم/ fascism

ئەم زاراوە لە وشەی ئیتالی fascimo وەرگیراوە کە باس لە بنـەماکـانی فاشیزم دەکات (بزاڤێک کە لە مارسی ۱۹۱۹ سەری هەڵدا و بە ڕێبـەرایـەتی موسولینی لە ئۆکتۆبری ۱۹۲۲دا کۆنترۆڵی حکوومەتی بـەدەسـتەوە گـرت). بناوانی ئەم زاراوەیە، وشەی fascis (فاشیس)ی یوونانییە کە بریتی بوو لـە دەستەچیلەیەک لە داری نارەوەن کە بە پەتی سوور دەبەستران و لـە ڕۆمـی کەوناردا نوێنەرانی دادوەرانی ڕۆم، بە نیشانەی مافی دادوەر لە ناچار کـردنی خەڵک بۆ گوێڕایەڵی لە بەرانبەر یاسا لە گەڵ خۆیان هەڵیاندەگرت.

فاشیزم هەم بە مانای بزاڤێکی ڕامیارییە و هەمیش بیردۆزێکە بۆ پاکانـەی ئاوەها بزاڤێک. ئامانجی ئەم بزاڤە بریتیـە لـە دامـەزرانـدنی حکوومـەتێکـی دیکتاتۆی دژ بە پەڕلەمان و بە گوێرەی ڕێزگرتن لە دەوڵەت کە بە ڕاشکاوی دژایەتی دەکات لە گـەڵ دیمۆکراسـی و ئـازادی و سوشـیالزم. هـەرچـەنـد ئاخێزگەی بزاڤی فاشیزم، ئیتالیایە، بەڵام لە زۆرێک لە وڵاتاندا بیردۆزی ئـەم ڕێبازە، لایەنگری زۆری هەیە. بەم بۆنەوە ناکرێ فاشیزم بـە ئایدۆلۆجییـەک کە تایبەتمەندییەکی ئیتالی هەیە پێناسە بکەین.

هـەنـدێ جـار زاراوەی «فاشیسـت» بـۆ پێناسـەی بـزاف، بـیردۆز و ڕژیمەکانیتریش بەکار دەبرێ، بەڵام بەکەڵک بـوونی ئـاوەهـا پێناسـەیـەک جێگای دڕدۆنگی و گومانە. هەروەها ئەم زاراوە لە لایەن هەنـدێ نووسـەر و ڕامیارەوە بۆ پیشاندانی نارەزایەتی و ناپەسەندی بیردۆز و ڕژیمەکانیتر بەکار دەبرێ (وەکوو ڕەخنەی کۆمۆنیستەکان لە پارتی سوشیال دیمۆکراتەکان کە پێیان دەڵێن «دارەدەسی فاشیزمی کۆمەڵایەتی»).

فاشیزمی ئیتالیا زۆر پێشتر لەوەی کە موسولینی و هاوڕێیانی وەکوو بیرو بۆچوونی ڕامیاری بەهرەی لێ بگرن، بزاڤێکی ڕامیاری زۆر چالاک بوو. هـەر بەو چەشنەی ماک سمیت دەڵێ: «هەر بەو جۆرەی کە موسولینی دەیگوت،

کردە زۆرترین بایەخی هەیە، تەنانەت ئەگەر هەڵەش بێ؛ بیردۆز و مەبەستێک کە لە پشت کردەدایە تا رادەیەکی زۆر و بەرچاو، بێ‌نرخە». بەم بۆنەوە باس لەو بنەمایانەکە پێوەندییان بەم بیرەوە هەیە لە رێی وەرگرتنی بیرو دروشمە زۆروزەوەندە فاشیستییەکانەوە، کارێکی ئێجگار دژوار و بێ‌ئاکامە؛ چونکە ئەم دروشم و بیرانە بۆ خۆیان لە جۆرەکانی‌تری ئایدۆلۆجی ملهۆڕانەو دژە دیمۆکراتیکی کەون و نوێوە وەرگیراون.

تێرو تەسەلترین راڤەی بنەماکانی فاشیزم دەتوانین لە وتاری موسولینی لە چواردەهەمین چاپی *ئێنسۆکلۆپیدیای ئیتالی(١٩٣٢)دا* بخوێنینەوە. لەم وتارەدا باسەکەی موسولینی دەبێتە دوو پاژ: بەشی یەکەم کە باس لەو بیرانەی دەکات کە فاشیزم لە گەڵیان ناتەبایە و بەشی دووەم ئەو بیرانە باس دەکات کە فاشیزم لە گەڵیان سازگار و تەبایە.

١) باوەڕی فاشیزم ئەوەیە کە ئاشتی بەردەوام نە پێک دێت و نە کەڵکی هەیە؛ ئاشتی گریمانەیەکی زیانبارە.

٢) فاشیزم لە گەڵ مارکسیزم و بیرە سوشیالیستییەکانی‌تر دژایەتی هەیە. موسولینی دەڵێ ئەوەی لە سوشیالیزم ماوەتەوە بریتیە لە «مەیلێکی هەستمەندانە بۆ گەیشتن بە پەیمانێک کە دەردو کەسەری چارەڕەشترینی خەڵکی کەم کاتەوە». هەروەها فاشیزم لە گەڵ ئایدولۆجی دیمۆکراتیک چ لە کردە و چ لە بیردا دژایەتی هەیە. هەروەها لە گەڵ لیبرالیزمیش هەم لە رامیاری و هەمیش لە ئابووریدا دژایەتی هەیە.

فاشییزم بریتیە لە سیستەمێکی رامیاری توتالیتر کە هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سیستەمانەی لەخۆدا کۆ کردۆتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا خاوەنی هەندێ تایبەتمەندی جیاوازە کە لە سیستەمە توتالیترەکانی‌تر جیای دەکاتەوە. لە تایبەتمەندییەکانی فاشیزم کە لە نێو سیستەمە توتالیترەکانی‌تردا هەیە، دەتوانین ئەمانە ناوببەین: ژیانی هەموو

گرووپەکانی‌تر بە دەوڵەتەوە بەستراوە، ترساندنی خەڵکی؛ دامەزراندنی سیستەمێکی یەک پارتی؛ هەموو ئامرازەکانی راگەیاندن و هەروەها کەرەسەکانی توندوتیژی نواندن وا لە ژێر رکێفی دەوڵەتدا. هەروەها هەموو رژیمە توتالیترەکان لەخۆیاندا کۆمەڵگایەکی «ئایدۆلۆجیکن». هەرچەند ئەم ئایۆلۆجییانەجیاوازی زۆریان پێکەوە هەیە و هیوا بە یەکیەتییان نییە و هەر یەکەو ئەرکێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

لە زۆر روانگەی لێک جیاوازەوە لە سەر ئاخێزگە و چۆنییەتی سەرهەڵدانی فاشیزم باس کراوە. بەگوێرەی بۆچوونی ئەلیووت، فاشیزم و نازیسم «بناغەیان لە سەر هێرش بە بیردۆزە ئاوەزخوازانەکانی دەوڵەت دانراوە». هەردوو ئایدۆلۆجی وەکوو شۆڕشی چینی ناونجی دژ بە دامەزراوە دیمۆکراتیکە لێنەهاتووەکان هاوڕێ لە گەڵ ئەرکی هەڵەی سیستەمی ئابووری سەرمایەداری شرۆڤە کراوە (کاتر؛ ١٩٦٤).

## فرە واتایی / polysemic

دەیڤید مورلی کۆمەڵناس لە بواری راگەیاندنە گشتییەکاندا، دەستی دا بە توێژینەوەیەکی بەربلاو سەبارەت بە کاریگەری بەرنامەیەکی بەناوبانگی تەلەفریۆنی بریتانیا بە سەر گرووپە جیاوازەکاندا. توێژینەوەکەی خۆی بەم گریمانەوە دەست پێدەکا کە ئەم بەرنامە دەتوانێ لە روانگەی جۆراوجۆر و بە شێوەگەلی جۆراوجۆر راڤە بکرێ. بە واتایەکی‌تر تێکستی بەرنامەکە چەن واتاییە و ئامادەیە بۆ شرۆڤەی جۆراوجۆر. مۆرلی پێی خۆش بوو کە ئەو بەرنامەیە پیشانی گرووپی جۆراوجۆر (وەکوو خوێندکارانی بەشی هونەر، یەکیەتی کرێکاران، شاگردی دووکانەکان) بدات و را و بۆچوونیان بزانێ. مەبەستی مورلی ئەوەبوو کە بەم چەشنە دەست بدا بە لێکدانەوە و راڤەی ئەو رەمز و گرێ و گۆڵانەی کە بە هۆی ئەم گرووپانەوە دەکرێنەوە.

بە گشتی توێژینەوەی مورلی سێ هەڵو مەرجی «رەمزکردنەوە»ی تێکستی بەرنامەی تەلەفزیۆنی پیشان دەدا. بۆ هەندێ لە بینەران، ئەوەی کە لەو بەرنامەیە تێگەیشتبوون، هەمان مەبەستی دەرهێنەری بەرنامە بوو. مورلی بەم هەڵومەرجە دەیگوت «رەمزی زاڵ». بۆ تاقمێکی‌تر هەرچەند «رەمزکردنەوە» بە هەمان شێوەی جۆری یەکەم بوو، بەلاّم کاتێک تێکستی بەرنامەکەیان بە جێگای خۆیەوە پێوەندی دەدا، واتاکەی دەگۆڕدرا. مۆرلی بەم بارودۆخەی دەگوت «رەمزی وتو وێژ کراو». گرووپی سێیەم هەرچەند لە پەیغام و هەواڵی تێکستەکەدەگەیشتن، بەلاّم دانیان پێدا نەدەنا و واتایەکی تەواو جیاوازیان بۆی دەدیەوە. مورلی بەم هەڵو مەرجەی دەگوت «بۆچوونی ململانێ» (*Morley, D. 1992*).

ئەوەی کە سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە بینەران بەبێ لێکدانەوە و بەخۆڕایی سەیری بەرنامەکە ناکەن. بەڵکوو ئاگادارانە سەیری ئەم بەرنامانە دەکەن و واتایەک کە خۆیان دەیانەوێ، بەو بەرنامانەی دەدەن.

## فرە هاوسەری / polygamy

فرە هاوسەری بە شێوەیەک لە هاوسەری دەبێژرێ کە ژن یا پیاو دەتوانێ لە یەک کاتدا خاوەنی چەن هاوسەر بێ. بەلاّم زۆرتر باس لە هاوسەرگیری پیاوێک لە گەڵ زیاتر لە هاوسەرێک لە یەک کاتدا دەکات. ئەم جۆرە هاوسەر گیرییە لەم کۆمەڵگایانەدا بلاوە:

١- ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئەندامەکانی خێزان، لە چالاکییە ئابووری و کارە پیشەییەکاندا پشت بە یەکتر دەبەستن.

٢- لەو کۆمەڵگا گوندیانەدا کە کشتوکاڵ سەرچاوەی ئابووری و گوزەرانیانە (مەعن خەلیل؛ ٢٠٠٧).

## social formation /فۆرمبەندی کۆمەڵایەتی

زۆربەی کۆمەڵناسان ئەم زاراوەیە بۆ باس لە جۆرێکی تایبەت لە کۆمەڵگا، وەکوو دەرەبەگایەتی یا بورژوازی، بەکار دەبەن. ئەم زاراوەلە لای بیرمەندانی مارکسیستی وەکوو لـویس گودلیـە، ئاڵتۆسـەر، هینـدز و پـۆل هـەرێسـت، بایەخێکی تایبەتی هەیە. مارکسیستە پێکهاتـەخـوازەکـان (وەکـوو لووکـاچ، گرامشی و کەسانیتر) ئەم باسەیـان داهێنـا کـە دۆزی سـەرەکـی مـارکس، دانـانی راڤـەیـەکـی پێکهاتـەیـی زانسـتی سـەبـارەت بـە فـۆرمبـەندییـە کۆمەڵایەتییەکان بوو (حبیب؛ ١٩٩١).

## feminism /فێمینیزم

ئەم زاراوەیە بە واتای لایەنگری لە مافی ژنان لە بەرانبەر بـاوکسـالاری و رەگەزخوازییەوە بەکار دەبرێ. بناوانی ئەم بزاڤە دەگەڕێتە بۆ شۆشی مـەزنی فەرانسا لە ١٧٨٩دا. هەوەڵین ئافرەتی بەناوبانگی داکۆکیکار لە مـافی ژنـان، ئافرەتێکی فەرانسی بوو بـە نـاوی «مـاری گـۆز». لـەم سـەردەمـەدا ژنـانی فەرانسی بە کاریگەری لە دروشمەکانی شۆڕشی فـەرانسـە (واتـە: ئـازادی و بەرانبەری) هەستابوون بە دامەزراندنی بنکە و یانەگەلی بەرگریکار لە مافی ژنان و خوازیاری دابین کـردنی هـەلی یـەکسـان بـۆ کـار و بـەشـداری لـە حکوومەت و پەروەردە و... بۆ ژن و پیاو بوون. ماری گۆز راگەیاندنێکی بـڵاو کردەوە لەژێر ناوی «بڵاڤۆکی مافی ژنان» کە بە گوێرەی راگەیندراوی مـافی مرۆڤ و هاوشارێتی -واتە گرینگترین بەڵگەنامەی شۆڕش- ئامـادە کرابـوو. ئەو دەیگوت مافی هاوشارێتی سەربەست و بەرانبەر نابێ تەنیا بۆ پیاوان بێ و ژنان بێبەش بن. هەروەها دەیگوت چلۆن دەتوانین بگەین بە سـەربـەسـتی راستەقینە، لە کاتێکدا نیوەی ئەندامانی کۆمەڵگا لە مافی یەکسان بێبەشن. بەڵام رێبەرانی پیاوی ئەم شۆڕشە بە لە سێدارەدانی مـاری گـۆز لـە ١٧٩٣دا

پەرسڤی ئەم داخوازەیان وەرگەڕاندەوە و دەستیان دابە داخستن و بەستنی بنکە داکۆکی‌کارەکان لە مافی ژنان (گیدنز؛ ١٣٨٥: ٢١٥-١٦).

بەڵام یەکەم پەرتووکێک کە لەم بوارەدا هاتە وەشاندن، کتێبێک بوو بە ناوی *بەرگری لە مافی ژنان* (١٧٩٢) کە ڤۆلستۆن کرافت نووسیبووی. ئەم بزاڤە بە هۆی چەن لیبراڵی کلاسیکی وەکوو جۆن ستوارت میل و هەریت تایلێر میلەوە لە کتێبێکدا بەناوی *فەرمانبەرداری ژنان* درێژەی پێدرا. ئەوان ئەو بیرەیان کە دەیگوت ژنان لە باری بایۆلۆجیکییەوە دواتر لە پیاوانن، خستە بەر رەخنە و خوازیاری چاکسازی باری پەروەردە و یەکسانی ژن و پیاو لە بەرانبەر یاسادا بوون. زۆربەی خەباتە سەرەتاییەکانی ئەم بزاڤە لە سەر ئەخلاق و مەیلە جنسییەکان جەختیان دەکرد و خوازیاری دوایی هێنان بە سیستەمی کۆیلەداری بوون. بەڵگەکان وامان پێ پیشان دەدەن کە یەکەمین خەباتەکانی بزاڤی فیمینیستی بۆ بەدەست هێنانی مافی دەنگدان بۆ ئافرەتان بووە. ئەم مافە یەکەم جار لە بریتانیادا درایە ئافرەتان و ژنانی بریتانی لە دەنگدانی گشتی ١٩١٨دا بەشداریان کردو دەنگیان دا (بانکز؛ ١٩٨١). بەڵام ژنان سەبارەت بە نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکانی تریش پێداگرییان کرد و لە دەیەی ١٩٦٠دا شەپۆلی دووەمی بزاڤی فیمینیستی ژنان دەستی پێکرد و لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠دا دوایی هات. پاش ئەوە شەپۆلی سێیەمی ئەم بزاڤە لە کۆتایی ١٩٨٠وە دەستی پێکرا و تا ئەمڕۆکەش درێژەی هەیە. بەگشتی ئەم بزاڤە لە درێژەی پەرەسەندنی شۆڕشی پیشەسازی، رووخانی نۆرمە سوننەتییەکان و سەربەخۆیی رێژەیی ژنان لە باری ئابوورییەوە، گەشەی سەند. ئامانجی ئەمڕۆکەی ئەم بزاڤە گەیشتن بە مافی یەکسانی کومەڵایەتی، رامیاری و ئابووری ژنان لە بەرانبەر پیاوانە.

یەکێک لە دۆزە سەرەکییەکانی ئەم بزاڤە، گەیشتنی ژنانە بە ماف و هەلی

کۆمەڵایەتی یەکسان لە گەڵ پیاوان.

ئەم بزاڤە مێژوویەکی کەونی لە ئەمریکادا هەیە. یەکەمین کۆمەڵەی مافی ژنان پتر لە یەک سەدەلەمەو پێش بنیات نرا. لە نامەیەکی هەستیارانەدا نوێنەرانی بەشدار لەم کۆمەڵەدا دەستیان دا بە راڤە و لێکدانەوەی ئەو زیان و خەسارەی کە بە هۆی نادادوەرییەوە لە ئافرەتان دراوە، تا ئەمە ببێتە وانەیەک بۆ ئافرەتان کە بتوانن خۆیان ژیانی خۆیان بەڕێوە ببەن (چف؛ ١٩٧٢).خاڵی گرینگ لە خەباتی لایەنگری لە مافی ژنان لە ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم، واتە ئەو کاتەی کە ژنان بۆ بەدەستهێنانی مافی دەنگدان، خەریکی تەیار کردنی خۆیان بوون. پاش دەسخستنی مافی دەنگدان، ئەم خەباتانە بۆ ماوەی چەن دەیە روویان لە کزی نا. بەڵام بزاڤی خەباتی ژنان لەم سەردەمەدا لە دەیەی ١٩٦٠دا لە بیچمێکی نوێدا سەری هەڵداوە.

بە ڕای هەندێ لە کۆمەڵناسان، چەن هۆکار بوونە هۆی دووبارە سەرهەڵدانی ئەم بزاڤە لە دەیەکانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا (چف؛ ١٩٧٢). یەکەمین هۆکار بریتی بوو لە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان کە بە بزاڤی مافی شارستانییەوە دەستی پێکرا و بە بزاڤی دژبە جەنگەوە بە بەرزترین ئاستی خۆی گەیشت. ئەم بزاڤانە بوونە هۆی ئەوەی کە ئاستی چاوەڕوانی خەڵکی بۆ گەیشتن بە یەکسانی کۆمەڵایەتی بەرزتر بێتەوە. ئەو ئافرەتە لاوانەی کە لەم بزاڤانەدا بەشدارییان دەکرد، لە لایەکەوە ئەزموونی بەرەنگاری رامیارییان بەدەستهێنا و لە لایەکی‌ترەوە تێگەیشتن کە رێبەرانی ئەم بزاڤانە زۆرتر داخوازەکانی ژنان وەکوو داخوازێکی سووک و بێ‌نرخ سەیر دەکەن و ئەو کارانەیان پێ دەسپێرن کە لە کۆمەڵگایەکی نابەرانبەری جنسیدا پێیان دەسپێردرا (وەکوو تایپ کردن، وەڵام دانەوەی تەلەفوون، میوانداری و ...).

هۆکاری دووەم بریتی بوو لە بەدیهاتنی «نادادوەری گشتی». خەڵکی تا

ئەو کاتەی کە کێشە و گرفتەکانیان بە کارێکی تایبەت و تاکەکەسی خۆیان بزانن، دەست لە هیچ کارێک بۆ بەرەنگار بوونی نادەن. خەڵکی تەنیا کاتێک دەست لە کارێکی بەکۆمەڵ دەدەن کە لە لایەکەوە تێبگەن کە خەڵکیتریش لە خەم و پەژارەیاندا بەشدارن و لە لایەکیترەوە بگەن بە پێناسەیەکی هاوبەش لە بارودۆخی خۆیان. نامیلکەی بێتی فریدەن کە ساڵی ۱۹٦۳ لە ئەمریکادا و لەژێرناوی دڵڕفێنی ژنانەدا بڵاو کرایەوە، دامەزرێنەری ئەم بزاڤە بوو لە ئەمریکادا (فریدن؛ ۱۹٦۳). فریدەن بە لێکدانەوە و وردبوونەوە لە تەنیایی و نائۆمێدی ئافرەتان لە کاری تەواو کاتی ماڵداری یاخۆ تووش بوون بەو کارانەی کە هیچ داهاتوویەکیان نییە، کێشەیەک دەدۆزێتەوە کە بە گوتەی خۆی «ناوێکی نییە». بەڵام نارەزایەتی بە تەنیا خۆی ناتوانێ ببێتە هۆی بەدیهاتنی بزاڤێکی کۆمەلایەتی.

سێیەم، هۆکاری «رێکخستن» بوو. بزاڤی فیمینیستی بوو بە هۆی بەدیهاتنی تۆڕێکی پێوەندی نێوان ژنانی لاو کە لە باری رامیارییەوە وشیارییەکی زۆریان بەدەست هێنابوو. هاوکات لە گەڵ ئەمان، ئەو ژنانەی کە لە پانتای ئەیالەتی و فیدراڵدا شوێنگەیەکی بەنرخیان پێ‌سپێردرابوو، لە گەڵ ئەو ژنانەی خەریکی چالاکی رامیاری بوون دەستیان دا بە دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوەیی ژنان ( National Organization for Women NOW). ئەم رێکخراوە بوو بە یەکێک لە گرینگترین و کاراترین ئامرازەکانی خەباتی سیاسی ژنان.

هۆکاری چوارەم، بریتی بوو لە گۆڕانە پێکهاتەییەکان. لە دەیەی ۱۹٦۰دا ژمارەی منداڵانی خێزانەکان بە چەشنێکی بەرچاو کەم بوونەوە. بەم بۆنەوە لەوە بە دوا ماڵداری و منالداری کارێکی تەواو کات نەبوو. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ئەو ژنانەی کە تەمەنیان لە نێوان سی‌و پێنج تا چل

ساڵدا بوو هەل و کاتێکی زۆریان بێ و بەم بۆنەوە بێنە نێو بازاڕی کـارەوە. ژمارەیەکی زۆر لە کچانیش تەمەنی هاوسەرگیری خۆیان وەدرەنگ خست تا بتوانن بڕۆنە نێو زانکۆ و کارێکی شیاو بۆ خۆیان ببیننەوە.

بەکورتی دەتوانین بڵێین کە بزووتنەوەکانی ژنان، تەنیا بۆ دەربـاز بـوون لە کاری ماڵداری نەبوو. بەپێچەوانە، ئەم بزووتنەوانـە کاردانـەوەی گۆڕانـە گشتییەکانی کۆمەڵـگا، بـەرزتربوونـەوەی ئاسـتی داخـوازی ژنـان و ئـەم راستییە بـوون کـە زۆرێـک لـە ژنـان رۆیشـتبوونە نێـو بـازاڕی کـارەوە و خوێندنی باڵای زۆرتریان بەدەست هێنابوو.

بزاڤی ژنان هەر لە سەرەتاوە، بە دوو لقی سـەرەکـی لیـبراڵ و رادیکـاڵ دابەش بوو. لیبراڵەکان بۆ گەیشتن بە مافی یەکسانی لە گەڵ پیـاوان، لـە تاکتیکی خۆپیشاندان، پاوانکاری و دادخوازی (بەیارمەتی یاساوە) کەڵکیان وەردەگرت. بەڵام توندڕەوەکـان (رادیکاڵیسـتەکـان) رایـان وابـوو کـە لـە کۆمەڵگایەکی باوکسالاردا تەنیا رێگای گەیشـتن بـە مـافی رەوای ژنـان، گۆڕانی بنەڕەتی کۆمەڵگایە. لایەنگرانی تونـدڕەوی فیمینیسـتی، هـەمـوو توانی خۆیان بۆ بنیات نانی نەخۆشخانەی ژنان، باخچەی ساوایان، پەناگا بۆ ئافرەتانی تـووش هـاتوو بـە ئـازاری جنسـی و تونـدوتیژی، دامـەزرانـدنی کتێبخانە و هۆڵی شانۆ و... تەرخان کردبوو.

بزاڤی یەکسانی ژنان هەرچەند لێکچوونی زۆریان لەناودا هەیـە، بـەڵام جیاوازی زۆریشیان هەیە. بەر لە هەمـوو شـتێ جیـاوازی ئـەم بزاڤـانە لـە وڵاتانی جۆراوجۆردا سەرنجڕاکێشـە. ئـەم بزاڤـە لـە ئـەمریکـای بـاکووردا یەکێک لە رێکخراوترین، گشتیترین و پڕدەنگوباسترین بزاڤگەلی خەبات بۆ یەکسانی ژنانـە لـە جیهانـدا. هـەنـدێ لـە ژنـانی ئـەم بزاڤـە لـە رێـی نویسکارییەوە ناوبانگێکی زۆریان بەدەست هێناوە.

## قۆرخكردن / monopoly

مەبەست لە قۆرخكردن، كۆنترۆڵ كـردنی بـازاڕە. بـە هـۆی ئـەوەوە كـە فرۆشندەیەک دەستی بە سەر كڕین و فرۆتنی كالایەكـدا كێشـابێ و بێجگـە لەو كەسی دی مافی كڕین و فرۆتنی ئەو كالایە نەبێ.

لە فەرهەنگی بچووكی ئۆكسفۆردا قۆرخكردن بەم چەشنە پێناسە كراوە: «دەسكێشان بە سەر كڕین و فـرۆتنی كالایـەكـی تایبـەت». هـەروەهـا ت. شیتۆڤزكی بە هەل و مەرجێک پێناسەی دەكا كە تێیدا بنكە یان تاكێک لـە چالاكیـەكـانی نێـو بازاڕیـدا بـەتـەواوی تـەنیایـە یـان گـەر تـەنیـا نییـە، هەڵس‌وكەوتی ڕەقیبەكانی كۆنترۆڵ دەكا(گولد؛ ١٣٨٤).

واتای قۆرخكردن زۆرتر سەبارەت بە شـەریكـەگـەلی گـەورەی بازرگـانی بەكار دەبرێ كـە سـەرجـەمـی بـەرهـەمـی كۆمپانیایـەک لـە گـەڵ مـافی دابەشكردنی ئەو بەرهەمە داگیر دەكەن و ڕەقیبەكانی‌تر لـە بازنـەدەهاوێژنـە دەرەوە. ئەم كارە بە پێچەوانەی یاسای دژ بە تراستە كە لە ساڵی ١٨٩٠دا لە لایەن كۆنگرەی ئەمریكاوە چەسپێندرا. بە گوێرەی ئەم یاسـایە كۆشـەوە بـۆ قۆرخكردنی بەرهەم یان دابەشكردنی بەرهەمێک بە تاوان دێتە ئەژمار. بەلام ئەم یاسایەش نـەیتوانیـوە ببێتـە هـۆی ئـەوەی كـە شـەریكـە گـەورەكـان شەریكەگەلی بچووک لە بازنەی ململانێ نەهاوێژنە دەرەوە. بۆ وێنـە، سالـی ١٩٠٤ سی و چوار كۆمپانی چێ كردنی ترۆمبیل لـە ئـەمریكـادا خـەریكـی چالاكی بوون؛ ئەم ژمارەیە لە ساڵی ١٩٢١دا گەیشتە ٨٨ كۆمپـانی. كـەچـی ئەمڕۆ تەنیـا سـێ كۆمپانیـای گـەورەی جێنێـڕاڵ مـاتۆڕ، فـۆرد و كرایسـلێر سەرجەمی بازاڕی بەرهەمهێنان و دابەشـكردنی ترۆمبیلـی ئـەمریكایـان لـە ئەستۆیە(عضدانلو، ١٣٨۴).

بە گشتی دەتوانین قۆرخكردن بە سێ جۆر دابەش بكەین:

١- قۆرخكردنی دووچاوەكـی (discriminating monopoly): دەبێتـە

هۆی ئەوەی کە ئەو بەرهەمانەی وەکوو یەکن، بە نرخێک بفرۆشرێن کە لە گەڵ گوژمەی دوایی ئەو کاڵایە هاوسان نەبێ. کاتێک ئەم جۆرە قۆرخکردنە دێتە دێ کە بەرهەمێک لە دوو یان چەن بازاڕی جیاواز و سەربەخۆدا بفرۆشرێ.

۲- قۆرخکردنی دوولایەنە (bilateral monopoly): هەلومەرجێک کە یەک بەرهەمهێنەر تەنیا لە گەڵ یەک فرۆشندە رووبەڕوویە، یان یەک فرۆشندە تەنیا لە گەڵ یەک بەرهەمهێنەر رووبەڕوو دەبێ و هیچ یەک لەم دوانە جێگرێکی شیاویان بۆ ئەویتر نییە.

۳- سەرمایەداری قۆرخگەر (monopoly capitalism): لە زاراوە مارکسییەکاندا بە قۆناغێک لە سەرمایەداری دەڵێن کە کۆنترۆڵ بە سەر ئامرازی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی بەرهەمەکان بە تەواوی لە ژێر رکێفی تاقمێکی زۆر کەم لە سەرمایەدارەکاندایە (گولد؛ ١٣٨٤).

## oligopoly / قۆرخی چەن لایەنە

زاراوەی oligopoly زاراوەیەکی یوونانییە و بە مانای «فرۆشندە بچووکەکانە» و بریتیە لە کۆنترۆڵ و چاودێری بە سەر بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی کاڵایەک لە لایەن چەن کۆمپانیای بچووکی دەسەڵاتدارەوە.

## mortality crises / قەیرانی مردن

دێمۆگرافان هۆی کەمبوونی رادەی زۆربوونی خەڵکیان تا ساڵی ١٨٠٠، بە قەیرانی مردن ناوبردووە. مەبەست لەم زاراوەیە بریتیە لەهۆکارگەلێک وەکوو شەڕ، برسیەتی و نەخۆشیە گشتگیرەکان کە نرخی مردنیان لە سەرەوە رادەگرت (*Watkins, S. C & J. Menken, 1985: 647-75*). دێمۆگرافان رایان وایە کە لە خولە سەرەتاییەکاندا تا دەگاتە ساڵانی ١٨٠٠،

رادەی خەڵکی زۆر کەم گەشەیان دەسەند، بەڵام لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا گۆی زەوی لە گەڵ جۆرێک لە تەقینەی جەماوەردا رووبەڕوو بوو. بە جۆرێک کە بەر لەسەدەی نۆزدەهەم سەرجەمی دانیشتووانی گۆی زەوی کەمتر لە یەک بیلیۆن کەس بوون، کەچی پاش سەد ساڵ، واتە لە ۱۹۳۰دا گەیشتە دوو بیلیۆن کەس. پاش پەنجا ساڵ، واتە لە ۱۹۸۰دا دوو و نیو بیلیۆنی‌تر لەم ژمارەیە زیاد بوو و لە ۲۰۰۰دا ئەم ژمارەی لە شەش بیلیۆنی تێپەڕاند. ئەم زۆربوونی دانیشتوانی گۆی زەوییە وامان پێ پیشان دەدەن کە هۆکارەکانی قەیرانی مردن یا لەناودا نەماون یاخۆ هێزی رابردووی خۆیان لە دەست داوە (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

### قەیرانی نیوەتەمەن / midlife crises

یەکەم جار ئەم زاراوەلە لایەن گیل شیهیەوە لە کتێبی **ریگا**دا پێشنیار کرا (*sheehy, 1976*). بەڵام دانیال لێڤین‌سۆن، دەروون‌ناسی زانکۆی ییل لە ئەمریکا لە گەڵ هاوکارانی‌تریدا، بواری زانستی ئەم واتایانە دابین کرد (*Levinson, D; 1978*). لڤین‌سۆن لە گەڵ چل پیاو لە تەمەنی نێوان ٤٠-٥٠ ساڵدا بە چین و کاری جۆراوجۆرەوە (مودیری شەریکەکان، زانایان، رۆمان‌نووسان و کرێکاران) وتو ویژێکی دوورو درێژی کرد و بەم ئاکامە گەیشت کە پیاوان لەم تەمەنەدا لە هەل‌ومەرجێکی ئارام و نەگۆڕ و لەباردا ناژین. ئەم کەسانە هەرچەن کە بە هۆی بواردنی کێشەو قەیرانی زۆر لە ژیندا بوونەتە خاوەن ئەزموون و تێگەیشتنێکی تایبەت لە ژیندا، بەڵام لە گەڵ قەیرانی زۆر رووبەڕوون. توێژینەوەی لڤین‌سۆن واپیشان دەدا کە ئەم قەیرانە لە نێوان تەمەنی ٤٠-٥٠ ساڵدا خۆی دەنوێنێ، چونکە تاکەکان ئەم تەمەنە بە خاڵێکی گرینگ و بە دوایین بەختی ژینیان بۆ گەیشتن بە هیواکانی تەمەنی بیست ساڵی و بڕیارەکانی تەمەنی سی ساڵییان دەزانن.

ئەم کەسانە کاتێ ئاوڕ لە ژینی رابردوویان دەدەنەوە، بەم ئاکامە دەگەن کە ئەگەر دەیانتوانی بگەڕێنەوە بۆ دواوە، ڕێبازێکی‌تریان لە ژیندا هەڵدەبژارد: ژنیان نەدەهێنا، خەریکی کارێکی‌تر دەبوون، منداڵی کەمتر یان زۆرتریان دەبوو و ... .

تۆژینەوەکانی‌تریش لەم بابەتەدا ئەنجام دراوە، کە جەخت لە سەر توێژینەوەکەی لڤین‌سۆن دەکەن ( *Ciernia, J; 1985: 1003-1007 ; Farrel, M; and S.Rosenberg, 1981; Weiss, R. S, 1990; Villiant, G, 1977*). ئەم توێژینەوانە وا پیشان دەدەن کە ژمارەیەکی کەم لە پیاوان تووشی قەیرانی نێوان‌تەمەن دەبن، بەڵام زۆربەیان بە جۆرێک نارەزایەتی بەردەوام لە ژیانی خۆیان، ئەم ماوەیە تێدەپەڕێنن. رابێرت وایز بە وت و وێژ لە گەڵ هەشتا پیاوی سەرکەوتوو لە چینی ناونجی و ناونجی بەرەو سەر، تێگەیشت کە زۆربەیان لەوەی کە خاوەن دۆستێکی نزیک بن، بێ‌بەشن، نزیک بە نیوەیان خەونی خۆشیان نییە و زۆرتر لە نیوەیان بێجگە ژنی خۆیان لە گەڵ ژنانی‌تردا سێکسیان هەیە. چونکە نموونەی ئاماری وایز زۆر کەم و سنووردارە و تەنیا چینی ناونجی و ناونجی سەرووی کۆمەڵگا دەگرێتەوە، ناتوانین دەرنجامەکانی بۆ هەموو پیاوانی کۆمەڵگا بە دروست بزانین. بەڵام هەموو ئەم توێژینەوانە وا پیشان دەدەن کە نیوەی تەمەن دەتوانێ لە خولە دژوارەکانی ژیانی پیاو بێ.

## قەزاگێڕ (بەلاگەردان) / scapegoat

بناوانی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ خاخامە جووەکانی کەونارا کە گوناحەکانی خەڵکیان لە گوێی بزنێکدا دەخوێند و ئەو بزنەیان بەرەڵا دەکرد تا هەڵبێ. لە راستیدا ئەو بزنەیان دەکردە قوربانی بۆ سڕینی گوناحەکانی خۆیان.

ئەگەر دووچاوەکی کردن لە گەڵ کەسانی‌تر هەڵسەنگاندنێکی ئەقڵانی

راستەقینە نییە، ئەم پرسە دێتە ئاراوە کە سەرچاوەکەی چییە؟ تۆژەرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە زەق کردنی واتاگەلی وەکوو هیوابڕاوی، ناکامی، کەسایەتی، کولتوور و ململانێی کۆمەڵایەتی، هانیان داوە کە وەڵامی جۆراوجۆر بۆ ئەم پرسە ببیننەوە. یەکێک لە وەڵامەکانی ئەم پرسیارە، بیردۆزێکە بە ناوی قەزاگێر یا بەڵاگەردێن. بە گوێرەی ئەم بیردۆزە، سەرچاوەی دووچاوەکی دەگەڕێتەوە بۆ ناکامی و ناهومێد بوون. ئەم مەیلە زۆرتر لە نێو خەڵکی هەژاری رەش و رووتدا دیارە (*Dollard, J; 1939*– وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨۴). ژنێکی سپیپێست لە بەرچاو بگرن کە لە کارخانەیەکی پارچەچنیدا خەریکی کارە و بە هۆی کەم بوونی داهاتیەوە تووشی ناکامی و نائۆمێدی هاتووە. بێگومان ناوێرێ لە گەڵ خاوەنانی دەسەڵاتداری کارخانەدا دژایەتی بکا، چونکە تووشی دەردی سەر دێ؛ بەم بۆنەوە رەنگە هۆی کەم بوونی داهاتی خۆی بە بوونی ئەو کەمینانە بزانێ کە لەلای ئەو خەریکی کارن. هەرچەن ئەم هەست و دووچاوەکییە هیچ لە دەردەکانی کەم ناکاتەوە و داهاتی زۆر ناکا و شوێنگەی ناگۆڕێ، بەڵام دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی تووڕەیی و ناکامییەکانی، چونکە ئەم هەستەی لە دڵدا بەدی دێنێ کە لانی کەم هەندێ لە هاوکارەکانی داهاتیان لەو کەمترە.

بەم پێیە، بەڵاگەردێن بە کەس یا کەسانێک دەبێژرێ کە دەسەڵاتێکی کەمیان هەیە و خەڵکی زۆر نادادوەرانە ئەوان بە هۆی کێشە و گرفتەکانی خۆیان دەزانن و لۆمەیان دەکەن. دوورکایم دەڵێ:

«کاتێک کۆمەڵگا تووشی رەنج و ئازار دێ، ئەو نیازە هەست پێ دەکات کە دەبێ کەسێک بە هۆی دەردو ژانەکانی خۆی بزانێ و سزای بدات و تۆڵەی ئازارەکانی لەو بسێنێتەوە. دیارە ئەو کەسانەش کە بە هۆی بیری گشتی خەڵکەوە خراونەتە بەر دووچاوەکی (تبعیض)، بۆ ئەم کارە دەست نیشان دەکرێن. ئەمانە کەسانێکن کە کۆمەڵگا دانی پێدا نەناون و وەکوو قۆچی قوربانی دەکەونە بەر شیری تۆڵە سەندنەوە.» (ریتزر؛ ٢٠٠٧: ٤٨)

## کارلێکی سیمبۆلیک/ symbolic interaction

کارلێکی سیمبۆلیک یەکێک لە روانگەهزرییەکانی کۆمەڵناسی هاوچەرخە کە لەم چەن دەیەی دواییەدا باسی زۆری لە سەر کراوە. ئەم بۆچوونە کە دیاردە کومەلایەتییەکان لە روانگەیەکی تایبەتەوە دەخاتەبەر راڤە و وردبوونەوە، بۆ خۆی بەشێکە لە بۆچوونێکی بەرفراونتر کە پێی دەڵێن کۆمەڵناسی دیاردەناسانە (phenomenological). هەرچەند وادەزانرێ کە کارلێکی سیمبۆلیک روانگەیەکی نوێی لە کۆمەڵناسی هاوچەرخدا پێشنیار کردووە، کەچی ئەم بیردۆزە لە بیرو بەرهەمی کۆمەڵناسانی سەدەی نۆزدەهەمەوە وەکوو زیمڵ و فیلسووف و دەروونناسانی ئەمریکی وەکوو واتسۆن، ڤیلیام جەیمز و بە تایبەت جۆرج هێربێرت میدەوە سەرچاوە دەگرێ.

سەرچاوەی سەرەکی ئەم بیردۆزە دەگەرێتەوە بۆجۆرج هێربێرت مید. مید لە کاتی ژیانیدا لە زانکۆی شیکاگۆ وانەی فەلسەفەی دەگوتەوە. زۆربەی خوێندکارانی بەشی کۆمەڵناسی، وانەکانی میدیان هەڵگرت. ئەم خوێندکارانە دواتر لە نووسین و تۆمار کردنی وانەکانی میددا دەوری سەرەکیان بوو و لە نێو کتێبێکدا لە ژێرناوی: زەین، *خود و کۆمەڵگا: لە روانگەی رەفتارناسێکی کۆمەلایەتییەوە*، بیرو بۆچوونەکانی میدیان بلاو کردەوە (ریتزر؛ ١٣٨٥).

لە روانگەی کارلێکدا، پێوەندییە سیمبۆلیکەکان بنەمای هەموو کردەیەکی کۆمەلایەتی و بناغەی میتۆدۆلۆجین بۆ فام کردنی ئەو پێوەندییانە. تاکەکان لە هەر شوێنگەیەکدا بە گوێرەی کردەکانی خۆیان، واتایەکی سیمبۆلیک لەو پێوەندییانە هەڵدەگرن. لە راستیدا کارلێکی کۆمەلایەتی بەم گریمانەوە دەست پێدەکات کە دیاریکەری زۆربەی هەڵسوکەوتەکانی تاکەکان، واقعییەتەکان و هەلومەرجە ئاشکراکان نین، بەڵکوو ئەو واتایانەن کە

مرۆڤەکان بۆ هەلومەرجەکانی خۆیان دایدەنێن. بە واتایەکی تر، ئەو شرۆڤەی کە ئێمە لە جیهانی دەورو پشتی خۆمانی دەکەین، تا رادەیەکی زۆر، رەفتارەکانمان ئاشکرا دەکەن و پیشانیان دەدەن؛ واتە، ئەو شتەی کە ئێمە بە راستەقینەی دەزانین، چێکراوێکی کۆمەلایەتییە (بلومر؛ ١٩٦٩). واتای ئەم پەیڤە ئەوەیە کە ئێمە، بە گشتی، دانمان بەوەدا ناوە کە سەرنج و بایەخێکی زۆرتر دەدەینە هەندێ لە دیاردە کۆمەلایەتییەکان و بە راستەقینەیان دەزانین و لە هەمان کاتدا بەرێژەی هەندێ دیاردەی‌تر، کەمترخەمین.

کارلێکی کۆمەلایەتی باس لەوەدەکات کە لە پێوەندییە کۆمەلایەتییەکاندا شرۆڤەی ئەو سیمبۆلانەی کە لە پێوەندیدا کەلکیان لێ‌وەردەگیرێ، دەتوانێ گرینگتر بێ لەو شتەی کە بە راشکاوی دەبێژرێ. بۆ وێنە، رەنگە کەسێک بۆ قەشمەری یا زمانلووسی، پەسنی کەسێکی‌تر بکات. هەرچەند وتنی ئەو پەسنە بە راشکاوی دیارە، بەلام بە سەرنج دان بەو جوولە سیمبۆلیکانەی کە ئەو تاکە هەیەتی و بە شرۆڤەی ئەو جوولانە، بۆ بیسەر دەردەکەوێ کە ئەو کەسە یا ویستوویە قەشمەری پێبکا، یاخۆ ویستوویە بە زمانلووسی سەرنجی بەرەو لای خۆی راکێشێ. لێرەدا جۆری شرۆڤەیەک کە لە ئاخاوتنی ئەو تاکە دەکرێ، گرینگتر لە خودی ئاخاوتنەکەیە. ئەمە هەمان شتێکە کە کۆمەلناسانی کارلێکی سیمبۆلیک جەختی لە سەر دەکەن. بەواتایەکی‌تر، لێرەدا خودی زەینی مرۆڤ و شێوازی شرۆڤەکردنی، بابەت و تەوەری بەرباسە، نەک ئەو شتەی کە بە واقعی کۆمەلایەتی دەزانرێ.

بەگشتی، کارلێکی سیمبۆلیک درێژەی کارلێکی کۆمەلایەتییە کە بە هۆی فیلسووفانێک وەکوو کوولی و میدەوە گەشەی پێدراو لە قوتابخانەی شیکاگۆدا کۆمەلناسانێک وەکوو گافمەن و هێربێرت بلۆمێر پەرەیان پێدا و کردیانە بیردۆزێکی ئەکتیڤ و کارا لە کۆمەلناسیدا.

## کارلێکی کۆمەڵایەتی/ social interaction

کارلێکی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکە کە تێیدا لە گەڵ ئەو کەسانەی کە لەدەورو بەرماندان کار و کاردانەوەمان هەیە (گیدنز؛ ١٣٨٨). کارلێکی کۆمەڵایەتی هۆی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانن. کارلێکی کۆمەڵایەتی بە هەموو ئەو ڕووداوانە دەبێژرێ کە لانی کەم دوو کەس لە بەرانبەر یەکدا هەیانە و هەر یەکەیان بە زمان و ئاماژە و جووڵە سیمبۆلیکەکان هان دەدەن تا بە سەر هەڵسوکەوت و ئەندێشەی یەکتردا کاریگەر بن. لەم پرۆسەدا هەموو ئەو کەسانەی کە بەشداریان هەیە بە ڕاڤە و شرۆڤەی شوێنگەی خۆیان، واتای پێ دەبەخشن. هەروەها کۆمەڵناسان ڕایان وایە کە کارلێکە کۆمەڵایەتیەکان ڕەنگدانەوەی ئەو هێزانەن کە سەرتر لە هێزە ئاشکرا و دیارەکانن. بەم بۆنەوە هان دەدەن تا کارلێکە کۆمەڵایەتییەکان بە گوێرەی کات (مێژوو) و شوێن (کولتوور) بناسن.

سەرچاوەی ئەم باسە، واتە کارلێکی کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە بۆ ماکس ڤیبێر و دوورکایم. بەڵام ئەمە تالکۆت پارسۆنز بوو کە دەستی دا بە تۆمار کردنی بیرو بۆچوونەکانی ڤیبێر و دوورکایم و پارێتۆ و بەم چەشنە بیردۆزێکی بنیات نا بە ناوی کارلێکی کۆمەڵایەتی. پارسۆنز دەیەویست بیردۆزی کارلێک لە ڕەفتارخوازی جیا بکاتەوە. لە ڕاستیدا بۆ ئەوە زاراوەی کارلێکی هەڵبژارد، چونکە ناوەڕۆکێکی جیاواز لە گەڵ ڕەفتاری هەیە. ڕەفتار یا هەڵسوکەوت بریتیە لە کردەوەیەکی مکانیکی لە بەرانبەر بزوێنەرەکانەوە، کەچی کارلێک بریتیە لە پرۆسەیەکی چالاکانە، ئافرێنەرانە و «زەینی». بەم بۆنەوە پارسۆنز تێدەکۆشا تا ڕەفتارخوازی لە کارلێک جیابکاتەوە (ریتزر؛ ١٣٨٥).

لە ڕوانگەی پارسۆنزەوە، سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بەر لە هەر شتێک و لە یەکەمین وردبوونەوەدا بریتیە لە تۆڕێک لە کارلێکەکانی نێوان تاک و

گرووپەکان و هۆکارگەلێکی زۆر پێکەوە دەبەستێتەوە. بە واتایەکی تر هەر هۆکارێک لە نێو سیستەمێکی کۆمەڵایەتیدا بە تایبەت لە روانگەی کارلێکەوە بە هەڵسەنگاندن لە گەڵ هۆکارەکانی‌تر لە بەرچاو دەگیرێ. لەم روانگەیەدا دیاردەمادی، سیمبۆلیک و کولتوورییەکان لە واتایەکی تایبەتدا سەربە سیستەمی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکوو وەکوو هۆکارگەلێکی دەرەکی کە کارلێکی نێوان ئەکتەرەکان دیاری دەکات یاخۆ مەرجیان بۆ دادەنێ (توسلی؛ ١٣٨٧).

دەبێ ئەو خاڵەمان لە بەرچاو بێ کە مەرج نییە لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا مەبەست لە ئەکتەر، تاکە جیاوازەکان بن، بەڵکوو گرووپ و جڤاکگەلێک وەکوو گوند، ناوچە، چین یاخۆ نەتەوەیەکیش بە ئەکتەر یا هۆکار دەزانرێن. کەواتە لە روانگەی پارسۆنزەوە، کارلێکی کۆمەڵایەتی تەنیا بۆ پێوەندی نێوان تاکەکان نییە، بەڵکوو دەتوانێ بۆ هەموو بوارەکانی واقعییەتی کۆمەڵایەتی بەکار ببرێ.

کارلێکی کۆمەڵایەتی سێ بەش دەگرێتەبەر: یەکەم، چاوەڕوانی نێوان ئەکتەرەکان؛ ئەکتەرێک وەکوو «خود»، لە ئەکتەرێکی‌تر کە لێرەدا «هیتری» پێدەڵێن چاوەڕوانی هەیە کە لە فلان شوێنگەی هاوبەشدا فلان یا فیسار کاری لێ بوەشێتەوە. لە هەمان کاتدا «خود» دەزانێ کە «هیتری»ش لە فلان شوێنگەی هاوبەشدا چ چاوەڕوانییەکی لەم هەیە.

دووەم، هەندێ بەها و نۆرم هەیە کە بە سەر هەڵس‌وکەوتی ئەکتەرەکاندا زاڵە، یاخۆ وادەزانرێ کە بە سەریدا زاڵە. لە راستیدا ئەو شتەی کە لایەنەکانی کارلێک لە یەکتری چاوەڕوانی دەکەن، بە گوێرەی هەمان نۆرم و بەها دیاری دەکرێ. گرینگ ئەوە نییە کە دوو لایەنی کارلێک (واتە: خود و هیتر) خاوەنی بەها و نۆرمی هاوجۆر نەبن، گرینگ ئەوەیە کە هەر یەک لە دوو لایەن دەزانن کە بە چ بەها و نۆرم و ڕێسایەک هەڵس‌وکەوتی لایەنی‌تر

ڕێنومایی دەکەن و بەرەو چ ڕێگایەکی دەبەن؛ بەم بۆنەوە دەتوانن پێش‌بینی بکەن کە لایەنی‌تر لە فلان شوێنگەدا چلۆن هەڵس‌وکەوت دەکات.

سێیەم، دەستەبەری بەڕێوەبردن یا ئەو پاداش و سزادانەی کە هەم «خود» و هەم «هیتر» لە کاتی لادان لەو نۆرم و بەها کە چاوەڕوانی لێ دەکرێ، تووشیاری دەبن. بەبڕوای پارسۆنز، ئەم سێ هۆکارە، واتە چاوەڕوانییەکان، نۆرمەکان و دەستەبەرەکان (پاداش و سزا) پێکهێنەری دەور و ڕۆڵەکانن لە کارلێکی کۆمەڵایەتیدا.

بەم چەشنە سیستەمی کۆمەڵایەتی، واتایەکی هزرییە کە لە کارلێکی نێوان ئەندامانی گرووپ یا جڤاکەوە سەرچاوە دەگرێ (توسلی؛ ١٣٨٧).

لە کۆتاییدا، سیستەمی کۆمەڵایەتی بە ئاریکاری سیستەمی کولتووری ئەو بەها و نۆرمانەی کە لە پێکهێنانی یەکگرتوویی و ئەمەگداری بە سیستەم و چاودێری بە سەر ئەو سیستەمەدا بەشدارن، دەگرێتە خۆ، بە چەشنێ کە سیستەمی کۆمەڵایەتی لە درێژایی مێژوودا سەقامگرتوویەکی ڕێژەیی هەیە. ئەم بۆچۆنەی پارسۆنز پیشان دەدات کە سیستەمی کارلێکی کۆمەڵایەتی وەکوو کۆمەڵەیەکی خاوەنی یەکیەتییە.

کارلێکی کۆمەڵایەتی بە سێ چەشن بەکاردەبرێ کە دەکرێ بە ئاسانی ئەم سێ لقە لێک جیا کەینەوە: ١) ساکارترین واتای کارلێکی کۆمەڵایەتی، کاتێ لە مەڕ مرۆڤەوە بە کار دەبرێ، باس لە کاریگەری دوو لایەنەی نێوان تاکەکان یاخۆ هێزە کۆمەڵایەتییەکان بە سەر یەکدا دەکا؛ «کاریگەری دوو لایەنەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان -کە لە سروشتی مرۆڤ و کولتوورەوە سەرچاوە دەگرێ- کارلێکی کۆمەڵایەتی پێ دەبێژرێ»؛ هەروەها «کارلێکی کۆمەڵایەتی دەبێ دوو لایەنە بێ».

٢) دووەمین پێناسەی ئەم زاراوەیە کە زۆر کەوتۆتە بەر سەرنجی کۆمەڵناسان، دەڵێ کە کارلێکی مرۆڤی جۆرێک کاریگەری دوو لایەنەیە کە

تایبەت بە مرۆڤە بە کۆمەڵایەتی بووەکانە. بە بڕوای ئەم کەسانە، گەر مەبەست لە کارلێک، مرۆڤ بێ، باشتر وایە بڵێین «کارلێکی سەمبولیک». ئەنجامی ئەم چالاکییە، پرۆسەی بەربڵاو و گشتگری کارلێکی کۆمەڵایەتییە. هەرچەن هەندێ لە نووسەران، پێوەندی و کارلێکیان بە یەکسان زانیوە، نووسەرانیتر دەڵێن کارلێک پێویستی بە تایبەتمەندیگەلیتر هەیە.

٣) پێناسەی سێیەم لە لایەن هەندێ لە زانایانی کۆمەڵناسیوە خراوەتە بەر باس کە دەیانەوێ **خود** بە شتێک بزانن کە لە ڕەهەندی کۆمەڵایەتییەوە بە سەر خۆیدا کارلێکی هەیە. تاکێک بە تەنیا لە نێو ژوورەکەیدا خەریکە لە سەر بابەتێک بیر دەکاتەوەو لە گەڵ خۆی قسە دەکات، یان بیرەکانی بە دەنگی بەرز دەڵێتەوە، ئەو تاکە لە باری تەکنیکییەوە خەریکی کارلێکە. چونکە خود بە شتێکی کۆمەڵایەتی دەزاندرێ، ئەو کەسە خەریکی کارلێکی کۆمەڵایەتییە (*Howard Becker* وەرگیراو لە: گولد؛ ١٣٨٤).

## کشتوکاڵ/ agriculture

هەزارەی بەر لە ساڵی ٣٠٠٠ی پێش زایین، ڕەنگە پتر لە هەر خول و سەردەمێک لە مێژووی مرۆڤدا، بەر لە سەدەی شانزدەهەمی زایین، لە بواری داهێنان و دیتنەوەی کان و سەرچاوەکانی زانستدا پڕبەر بووبێ. لانی کەم ئەمەی کە بێژرا بیردۆزێک بوو کە گاردێن چایڵد، بەناوبانگترین مێژینەناسی سەدەی بیستەم گوتوویە. داهێنانە تەکنیکییەکانی ئەم سەردەمە بریتی بوون لە داهێنانی چەرخ و بەکارهێنانی بۆ چێ کردنی عەرەبانە و گاری و گۆزەگەری، چێکردنی ئاموور یان هێش، هەوسار کردنە ملی ئاژەلان بۆ ڕاکێشانی گاری و گاوئاسن، هەروەها داهێنان و چێ کردنی خەت و واتا ڕەقەمییەکان، کۆنترۆڵ کردنی هێزی با بۆ ڕاکێشانی گەمیە و هتد (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

داهێنان و چێ‌کردنی ئەم ئامرازانە، بووبە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێ خۆراکی زۆرتر بێنێتە بەرهەم و هەر بەم بۆنەوە توانی بەخێرا رادە و ژمارەی خۆی زۆرتر کاتەوە و دەسکەوتی زۆر لە هەموو بوارەکاندا بە دەست بێنێ. بنیات‌نانی حکوومەت و ئیمپراتۆرییەکانیش هەر لەم سۆنگەوە بوو. دامەزراندنی لەشکر و سوپا و رێکخراوە نوێیە کۆمەڵایەتییەکان، وەکوو رێکخراوی ئایینی و چاودێری فەرمی و دانانی یاسای رەسمی و ... پاش ئەم سەردەمە هاتنە دی. هەروەها لە دەرەنجامە گرینگەکانی ئەم سەردەمە دەبێ لە داهێنانی خەت و نووسین کە بۆ تۆماری بەرهەمەکان کەڵکیان لێ وەردەگیرا، ناو بەەین. لە راستیدا ئەمە هەمان سەردەمێکە کە مێژوونووسان بە ناوی «کازیوەی شارستانییەت» ناوی لێ‌دەبەن (نولان و لنسکی؛ ۱۳۸۳) و ئاخێزگەی ئەم کازیوەیە مەڵبەندی میزۆپوتامیا یا هەمان نێوان دیجلە و فورات بوو.

جووتیاران بە بەهرە وەرگرتن لە ئاژەڵان توانیان زەوی و زارێکی بەرفراوانتر لە چاو سەردەمی بێسانکاری بکێڵن. شێو بڕینی زەوی ئەم هەلەی بۆ دەرەخساندن کە هەر لەو زەوینە چەن ساڵی بەردەوام کەڵک وەربگرن. ئەم دەسکەوتە بووبە هۆی ئەوەی کە مرۆڤەکان بەجێی کۆچ کردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر، لە یەک جێگادا نیشتەجێ بن. زۆرتر لە نیاز بوونی بەرهەم لەم شوێنانەدا بووبە هۆی نیشتەجێ بوونی ژمارەیەک زۆر لە خەڵکی لە شوێنێکی‌بچووکدا. بۆ وێنە لە ئیمپراتۆری رۆمدا و لە سەد ساڵ بەر لە زایینیدا، نزیک بە حەفتا میلیۆن کەس لە مەڵبەندێک بە پانتای دوو میلیۆن میلدا دەژیان (نولان و لنسکی؛ ۱۳۸۳). بەڕای زۆربەی کۆمەڵناسان، گەشەسەندنی کشت‌وکاڵ بە یەکێک لە هۆکارەکانی پەرەسەندنی نابەرانبەرییە کۆمەڵایەتییەکان دەژمێردرێ، چونکە بەرە بەرە خاوەنێتی زەوی وەکوو ئامرازی بەرهەمهێنان، پەرەی‌سەند و کەسانێک کە

خاوەنی زەوی و زار نەبوون ناچار دەبوایە وەکوو وەرزێر لە سەر زەویوزاری کەسانیتردا کار بکەن.

## کۆچی دەرەکی / out-migration

کۆچی دەرەکی یان پرۆسەی کۆچ لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکیتر بە مەبەستی گەیشتن بە ژیانێکی ئاسوودەتر و هێمنتر و هەڵاتن لە دەست تەنگ و چەڵەمەکانی ژیان، بۆتە یەکێک لە پرسە سەرەکییەکانی ئەم چەرخە.

لێکۆڵەران چوار مۆدێلیان بۆ کۆچ -دەرەکی و ناوەکی- پێناسە کردووە کە بریتین لە: ١) مۆدێلی کلاسیک: ئەم شێوازە زۆرتر تایبەتە بە وڵاتانی وەکوو کانادا، ئوسترالیا و ئەمریکا. ٢) مۆدێلی کۆلۆنیالیستی: ئەم شێوازەش زۆرتر تایبەتی وڵاتانی وەکوو بریتانیا و فەرانسەیە کە کۆچەرانی کۆلۆنییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان وەردەگرن. ٣) مۆدێلی کرێکارانی میوان: لەم شێوازەدا کرێکاران بە چەشنێ کاتی بۆ بە دەستهێنانی داهاتی زۆرتر روو لە وڵاتانی پیشەسازی دەنێن. وڵاتانی وەرگری ئەم کۆچەرانە، بە بۆنەی نیاز بە هێزی کار، ئەم کۆچەرانە بە گوێرەی هەلومەرجێکی تایبەتەوە وەردەگرن، بەڵام ئەگەر کرێکارێک ماوەیەکی زۆریش لەو وڵاتەدا بمێنێتەوە، مافی هاووڵاتی بوونی پێ نادرێ؛ وەکوو کۆچەرانی ترک لە ئاڵمانیادا. ٤) دوایین مۆدێل بریتیە لە کۆچەرانی نایاسایی: ئەم شێوازە بە هۆی توندتر بوونەوەی هەلومەرجی وەرگرتنی کۆچەر لە لایەن وڵاتە پیشەسازییەکانەوە، رۆژ بە رۆژ خەریکی زۆربوونەوە و پەرەسەندنە (گیدنز؛ ٢٠٠٣).

بارودۆخی نالەباری وڵاتانی دواکەوتوو و جیهانی سێیەم، بۆتە هۆی کۆچ کردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەم وڵاتانە، بە چەشنێ کە زۆربەی وڵاتانی پیشەسازی تووشی قەیرانی پێناسەی نەتەوایەتی هاتوون. شەڕ،

بارودۆخی نالەباری ئابووری، هەژاری، بێکاری، برسیەتی، لێڵ و نادیار بـوونی داهاتوو، نەبوونی ئازادی رامیاری و نەتەوایەتی، قـۆرخ بـوونی دەسـەلات لـە لایەن چینێکی دەسەلاتدارەوە لە هۆوە سـەرکییـەکـانی کـۆچ کـردن دێنـە ئەژمار.

## کولتوور (چاند) / culture

وشەی کولتوور (چاند) لە هەموو زمانە ئـەورووپییـەکانـدا هـەر بـەم نـاوە بەناوبانگە. لە وشەی colereی لاتینیەوە سـەرچـاوەی گرتـووە. لـە واتـادا پانتایەکی بەرفراوانی هەیە: نیشتەجێ بوون، کشتوکـاڵ کـردن، پاسـەوانی کردن، پەرستن. بۆ وێنە واتای نیشتەجێ بوون لە colonus گیراوە کـە لـە گەڵ هەمان وشەی colony پێوەندی هەیە؛ یان واتای پەرستن لە cultus گیراوە کە لە گەڵ زاراوەی culyt هاوواتایی هەیە. ئەوەی کە دواتر لە زمانە ئەورووپیەکاندا پەرەی سەند، هەمان واتایەک بوو کە لە زاراوەی کشتوکاڵدا بوو، واتە: cultura، هەرچەند ئەم زاراوەلە سەدەکانی ناوەڕاسـتدا بـە واتـای پەرستن و عیبادەتیش بەکار براوە. لە زۆربەی زمانە ئـەورووپییـەکانـدا ئـەم زاراوە هێشتا هەمان واتا سەرەتاییەکەی خۆی پاراستووە؛ بۆ وێنـە لـە زمـانی رووسیدا بە واتای پەروەردە کردنی روەک و گیا بەکار دەبرێ. واتای کولتـوور تا سەدەکانی شازدە و حەڤدە، واتایەکی پراکتیسی بـووە، بـەلام پـاش ئـەوە دەبینین کە واتایەکی ئینتزاعی دەگرێتـە خـۆ و لـە نێـو نووسـراوە هـزری و فەلسەفییەکاندا جێی خۆی دەکاتەوە (پهلوان؛ ١٣٨٧).

پێناسەیەکی گشتگیر کە پەسندی هەمـوو کـەس بـێ، بـۆ ئـەم زاراوەیـە رەنگە کارێکی ئەستەم و دژوار بێ. بەلام ئـەو پێناسـانەی کـە کـراون، هـەر یەکەو لە بارێکەوە رەنگە بتوانن بە کەڵک بن.

لە فەرهەنگی زاراوەکانی زانستە کۆمەلایەتیەکانی گولد و کرایبدا لە زمان

کرۆبێر و کلۆکهۆنەوە دەگێڕێتەوە کە: «کولتوور بریتیە لە هەندێ میتۆدی ئاشکرا و پیوار لە هەڵسوکەوت و بۆ هەڵسوکەوت کە بە هۆی سیمبۆلەکانەوە دێتە دی و رادەگوێزرێ، ئەو سیمبۆلانە باس لە دەسکەوت و دەسکردە جیاوازەکانی مرۆڤ دەکەن. کاکڵەی سەرەکی کولتوور بریتیە لە بیرو باوەڕە سوننەتییەکان (واتە سەرچاوەی وەرگیراو و هەڵبژێردراو لە مێژوو) و بەتایبەت ئەو بەهایانەی پێوەندییان پێیەوە هەیە. سیستەمە کولتوورییەکان دەکرێ لە لایەکەوە بەرهەمی کردە و لە لایەکیترەوە بە مەرجدار کردنی کردەی دوایی بزانرێن» (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

هەموو کۆمەڵناسان لەم راستییە ئاگادارن کە ئەندامانی هەر کۆمەڵگایەک خاوەنی بیرو بۆچوونی بنەمایی و هاوبەشن کە لە رێی ئەو بۆچوونەوە جیهانی دەورو پشتی خۆیان پێناسە دەکەن و «چاک» و «خراپ» لەیەک جیا دەکەنەوە و بۆ دەسکرد و کردەکانی خۆیان واتا دەبیننەوە. بۆ زۆربەی ئەم کۆمەڵناسانە لە شوێنێکدا کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئاماژە بە ئامرازەکانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، کولتوور باس لە بۆچوونە سیمبۆلیکەکانی پێوەندی کۆمەڵایەتی دەکات (*Wuthnow,R; 1987*- وەرگیراو لە: عضدانلو: ١٣٨۴). کولتوور پلان و نەخشەی ژیانە و تەنیا پێوەندی بە مرۆڤەوە هەیە.

هەموو گیاندارێک بۆ مانەوە و ژیانی خۆی نەخشە و پلانێکی هەیە، بۆ بە دەست هێنانی خۆراک و پاراستنی گیانی خۆی لە دوژمنانی لە هەندێ شێوازی تایبەتی خۆی کە بە شێوەی خۆڕسک و غەریزی فێریان بووە، پێڕەوی دەکات. بەڵام مرۆڤ رەنگە تەنیا گیاندارێک بێ کە بۆ مانەوە و ژیانی خۆی لە شێوازی چاندی بەهرە وەردەگرێ. ئەوەی چاند لە میتودەکانیتری ژیان جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە چاند لە رێی فێرکارییەوە پەرە دەستێنێ. مرۆڤ فێر دەبێ و لە بیرو هۆشی بەهرە وەدەگرێ. رەنگە مرۆڤ تەنیا

ئاژەڵێک بێ کە پاش بە دونیا هاتن، زۆر لاواز و بێهێزە و بەبێ یارمەتی کەسانی‌تر ناتوانێ درێژە بە ژیانی بدا. هەروەها دیسان لە پێوانە لە گەڵ ئاژەلانی‌تر، مرۆڤ هەم توانی بۆ فێربوون زۆرترە و هەمیش زۆرتر پێویستی بە فێربوونە. بۆ وێنە، جوانوویەک کە دێتە دونیا، پاش یەک دوو کاتژمێر دەتوانێ لە سەر پێی ڕاوەستێ و غار بکا و بۆ پاراستنی خۆی جووتە باوێژێ؛ ئەم هەڵس‌وکەوتانە، نە لە سۆنگەی فێرکارییەوە بەڵکوو بە هۆی غەریزە و ژنتیکەوە فێر بووە و بەو چەشنەی کە بۆی ڕەچاو کراوە دەبزوێتەوە. بە پێچەوانەی جوانوو، منداڵی مرۆ بێهێز و وزەیە و پێویستی بە یارمەتییە. منداڵی مرۆڤ بێجگە لەوەی کە توانی زۆر کەمە، لە باری ئەو میتۆدانەوە کە بۆ ژیان و مانەوە پێویستین زۆر ناتوان و هەژارە. بۆ ژیان دەبێ شتی زۆر فێر بێ. دەبێ فێر بێ کە چ شتێک مەترسیدارە و چلۆن دەتوانێ خۆی لە مەترسی بپارێزێ. دەبێ لێهاتوو و شارەزایی و زانستەپەسندکراوەکانی ئەو کۆمەڵگای کە بڕیارە تێیدا بژی فێر ببێ. دەبێ ڕێگای ژیان فێر بێ. لە باری کۆمەڵناسیوە مرۆڤ دەبێ کولتووری کۆمەڵگای خۆی فێر بێ. مرۆڤ ناتوانێ تەنیا بە هۆی وزەبیۆلۆجیکییەکانیەوە بگەشێتەوە و بەرەو تەواوتر بوون بڕوا. گەشەی مرۆڤ بەستراوە بە **بەکۆمەلایەتی بوونیەوە**. کەواتە، یەکێک لە ساکارترین پێناسەکانی فێربوونی کولتوور، ئەوەیە کە کولتوور بریتییە لە فێربوونی شێوازی ژیان: کۆمەڵە خوو و خدە و ڕەوشتێک کە مرۆڤەکان فێری دەبن، لە گەڵ کەسانی‌تر ئاریکاری دەکەن، لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی‌تری رادەگوێزنەوە. کولتوور ڕێنومای ژیانە. بەم پێیە کولتوور خاوەن دوو تایبەتمەندی سەرەکییە: ١) بە هۆی فێرکارییەوە دەگوازرێتەوە، ٢) هەمان کارێکە کە ئەندامانی‌تری کۆمەڵگاش جێبەجێی دەکەن. بەبێ ئەم دوو تایبەتمەندییە کۆمەڵگای مرۆیی نایەتە دی.

## کولتووری ئارمانجی/ ideal cultural

بە گشتی، جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئەو شتەی کە مرۆڤەکان بیری لێ دەکەنەوە و ئەو شتەی لە واقیعدا ئەنجامی دەدەن. واتە، ئامانجێک کە خەڵک باوەڕیان پێیە، جیاوازی زۆری هەیە لە گەڵ ئەو شتەی یا ئەو کارەی کە دەیکەن. کولتووری ئامانجی بریتیە لەو بەها و نۆرمانەی کە خەڵک بە راشکاوی باوەڕیان پێیە و ئەمەگداری خۆیانی پێ دەردەبڕن. ئاکامی پێکدادنی کولتووری ئامانجی و کولتووری واقیعی دەتوانێ ببێتە دژایەتیگەلی روون و ئاشکرا. بۆ وێنە، زۆربەی خەڵکی ولاتانی پیشەسازی بایەخێکی زۆر دەدەنە تەندروستی و لە راستیدا لەش‌ساغی بە بەهایەک دەزانن و سالانە میلیاردها دۆلار پارە بۆ بەشی تەندروستی کۆمەڵگا تەرخان دەکەن (کولتووری ئامانجی). بەلام هاوکات لە گەڵ ئەوەزۆربەی خەڵکی لەو ولاتانەدا دەست دەدەن لە هەندێ کار کە تەندروستیان تووشی مەترسی دەکات؛ وەکوو خوارادنەوەی ئەلکۆل، کێشانی جگەرە و مادە سڕکەرەکان (کولتووری واقعی). خەڵکی لە زۆربەی قسەکانیاندا دان بەم راستییەدا دەنێن کە «راستی باشترین سیاسەتە» (کولتووری ئارمانجی)؛ کەچی کاتێ لە گەڵ یەکتر مامەڵە دەکەن دەڵێن «کار و دۆستایەتی دوو تەوەری جیا لە یەکن» (کولتووری واقیعی). لە ولاتانی خۆماندا زۆربەی خەڵکی کە بڕوایان بە ئیسلام هەیە، دەڵێن «خوارادنەوەی ئەلکۆل حەرامە» (کولتووری ئارمانجی)؛ کەچی زۆربەیان لە تەنیاییدا و بەدوور لە چاوی خەڵکی دەخۆنەوە و لە لای خەڵکدا دان بەم کارەیان نانن (کولتووری واقیعی).

## کولتووری هەژاری/ culture of poverty

سەرەتا ئۆسکار لیویس ئەم زاراوەیەی داهێناوە. لیویس هاوکات لە گەڵ

لێکدانەوە و وردبوونەوەلە ژیانی خەڵکی زۆر هەژاری ئەمریکای لاتین، بەم دەرەنجامە دەگات کە: لەو دەمەوە کە خەڵکی ئەم وڵاتانەلە باری ئابوورییەوە خرانە پەراوێز، راهاتن کە خۆیان لە گەڵ ئەو بارودۆخەدا بگونجێنن و ئەم خۆگونجانەیان لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکیتر راگواستەوە. بەڕای ئەو، کولتووری هەژاری کارلێکی هەژارانە لەبەرانبەر شوێنگەیەک کە لە پەراوێزی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا هەیانە. «ئەم کولتووە لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکیتر رادەگوێزرێتەوە. ئەم کولتوورە هاوکات لە گەڵ ئەوەی کە یارمەتی مندالان دەدات تا فێر بن کە چلۆن دەتوانن کێشەکانی هەژاری خۆیان چارەسەر بکەن، کاریگەرییەکی نیگەتیڤی بە سەریاندا هەیە کە بریتیە لە بەربەست بوون لە بەرانبەر چالاکی و کۆشەوە بۆ بەشداری لە کێبەرکێ و چاولێگەرییەک کە دەبێتە هۆی دەرباز بوون لە دەست هەژاری لەنێو وڵاتانی سەرمایەداریدا» (مور؛ ١٣٧٦).

## کۆلۆنیالیسم / colonialism

ئەم زاراوەیە ئاماژەیە بە ژێردەست بوون و کۆیلەیی کۆمەڵگا، وڵات یان نەتەوەیەک کە لە باری رامیاری، ئابووری و کولتوورییەوە لە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵگا یاخۆ نەتەوەیەکیتردایە. کاتێ ئەم زاراوەیە بە کار دەبرێ کە وڵاتی داگیرکەر یەک لە وڵاتانی ئەورووپا یان ئەمریکای باکوور بێ (عضدانلو، ١٣٨۴).

ئەم پێناسە لەم سێ خاڵەدا شرۆڤە دەکرێ:

١) مێژووی سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیە دەگرێتەوە بۆ سەرەتای ١٩٥٠. ترۆمن لە نووسینی «بەرنامەی بنەمای چوارم»دا زاراوەی کۆلۆنیالیسمی بە کار هێناوە. بەلام لە ١٩٤٩دا کاتێ ئەم بەرنامەیەی رادەگەیاند، ئاماژەیەکی بەم زاراوەیە نەکردووە، بەڵکوو بە جێی ئەوە ناوی ئەمپریالیسمی هێناوە.

له ۱۹۵۲دا لۆرد هیلی نووسی: «وادیاره کۆلۆنیالیسم زاراوەیەکە کە هەنووکە لە لایەن یەکە نەتەوەییە بێهێزەکانەوە بەکار دەبرێ تا هەرچەشنە هەڵسوکەوتێ کە لە لایەن یەکە بەهێزە نەتەوەییەکانەوە دژ بە قازانجەکانیان دەکرێ، روون بکەنەوە.»

۲) لە کۆنفراتنسی باندۆنگدا کە لە ئاڤریلی ۱۹۵۵دا بەڕێوە برا، سەرۆک کۆماری ئەندوونزی، سووکارنۆ، بە کۆلۆنیالیسم ئاماژەی کرد و گوتی: «کۆلۆنیالیسم لە بەرگی نوێیدا بە شێوەی کۆنترۆڵی ئابووری، کۆنترۆڵی هزری و کۆنترۆڵی جەستەیی، لە لایەن نەتەوەیەکی بچووک و بیانییەوە بە سەر نەتەوەیەکیتردا خۆی پیشان دەدا». لە قامووسی یاسای رووسیادا، دەڵێ کە یەکەم جار ئەم زاراوەیە لە کۆنفرانسی باندۆنگدا بەکار براوە.

۳) بازنەی پێناسەی ئەم زاراوەیە زۆر بەرفراوانتر لەوەیە کە پێشتر باسی لێ دەکرا و مەبەست لەم زاراوەیە ولاتانی ئەورووپا و ئەمریکای باکوور بوون. لەم دواییانەدا کارلێکی دەسەلاتە ئاسیاییەکانیش هاتوونەتە نێو ئەم بازنەوە. بەم بۆنەوە گۆڤاری تایمز لە زمان سەرۆک وەزیرانی پاکستانەوە ئاماژە دەکات بە «کۆلۆنیالیسمی قاوەیی رەنگی هیند» (سەبارەت بە کەشمیر) (گولد؛ ۱۳۸٤).

## کۆلۆنیالیسمی نوێ/ neocolonialism

پاش شەڕی عالەمی دووەم، زۆربەی سیستەمە کۆلۆنیالیستەکان بە هۆی شۆڕش و ناڕەزایەتی شارەستانی و وتو وێژەوە لێک هەڵوەشان و کۆلۆنییەکان سەربەخۆیی خۆیان بە دەست هێنا. بەلام هەندێ لەم کۆلۆنییانە پاش بە دەست هێنانی سەربەخۆیی رامیاری، بە توندی بەندیواری ولاتانی بالادەستیان بوون. کۆمەڵناسان ئەم بەندیوارییە نوێیە -کە زۆرتر بەندیواری ئابوورییە- بە کۆلۆنیالیزمی نوێ ناو دەبەن. بە گوێرەی ئەو

پێناسەی کە ئەندرۆ ڤێبستەر لە کۆلۆنیالیسمی نوێی کردووە، کۆلۆنیالیسمی نوێ شێوازێکی نوێیە کە لە دەرەوەدەسەلاتی ئابووری-رامیاری خۆی بە سەر ولاتانی‌تردا دادەسەپێنێ و ناراستەوخۆ چاودێرییان لێ دەکا (*Webster, A; 1990:79*). بۆ نموونە، ولاتی فەرانسە هێشتا دەسەلاتێکی زۆری بە سەر هەندێ لە ولاتە ئەفریقییەکانەوە -وەکوو کامرۆن، چاد، کۆماری ئەفریقای ناوەندی، نیجریە و ...- هەیە. بەر لە شەڕی دووەم، هەمووی ئەم ولاتانە لە ژێر دەسەلاتی فەرانسەدا بوون، کەچی ئێستا زۆربەیان تووشیاری قەیرانی ئابوورین. هەندێک لەم ولاتانە هێشتا پارەی فەرانسی ئاڵوگۆڕ دەکەن و پێوەندی رامیاری، ئابووری، سەربازی و کولتوورییەکی نزیکیان لە گەڵ فەرانسەدا هەیە (*Ungar, S. J; 1989: 342*). هەرچەن ئەم جۆرە پێوەندییە، شێوازی نوێی کۆلۆنیالیسمە و شەڕەقسە و وت‌و وێژی زۆر بۆ چارەسەر کردنی کراوە، بەلام نە فەرانسە و نەهیچ ولاتێکی‌تر کۆشەوەیەکی بۆ گۆڕانی ئەم بارودۆخە نەکردووە. هەندێ لەم ولاتانە زۆر هەژارن و خوازیاری ئەوەن کە فەرانسە یارمەتییان بدات. فەرانسەش ئەم ئەرکەی خستۆتەئەستۆی خۆی تا یارمەتی کۆلۆنییەکانی پێشووی بدات. ئەمە پیشان دەدات کە بناغەی پێوەندی نێوان ولاتە پیشەسازییەکان و ولاتانی «جیهانی سێیەم» لە سەر کۆلۆنیالیسمی نوێ بنیات نراوە.

هەرچەند پێوەندی نێوان فەرانسە و ولاتە ئەفریقییەکان، پێوەندییەکی نوێی کۆلۆنیالیستییە، بەلام چونکە ئەم ولاتانە پێویستیان بە پێوەندی و یارمەتی فەرانسە هەیە، ناتوانین ئەم پێوەندییە بە چەوساندنەوەی ولاتە ئەفریقییەکان بزانین. پێوەندی نوێی کۆلۆنیالیستی دەتوانێ پێوەندییەکی چەوسێنەرانە بێ، ئەوەش لە کاتێکدا کە ولاتان یاخۆ سەرمایەداران بۆ قازانجی زۆرتر و بە بیانووی یارمەتی گەیاندن بە ولاتانی دواکەوتوو، بیانەوێ لە باری رامیاری و ئابوورییەوە دەست بە سەر ولاتە دواکەوتووەکاندا بکێشن.

وەکوو کۆمپانیایەکی ئەمریکی بە ناوی کۆمپانی یەکیەتی میـوە( United Fruit Company) کە لە ولاتانی پاناما، هینـدوراس و کاسـتاریکادا دەسـتی داوە بـە چەوساندنەوەی ئەم ولاتانە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ئـەم کۆمپانیـا تـوانی بـەڵـگەنامـەی رەسمـی لـەم ولاتانـە وەربگـرێ و بـەرهـەمهێنـان و دابەشکردنی مۆزی ئەو ولاتانە بێنێتە ژێر پـاوانی خـۆی. لـە رواڵـەتـدا ئـەم شەریکە زەوینە باهێرەکانی ئەم ولاتانەی بووژاندەوە و بـەنـدەر و بـاژێری بـۆ کردنەوە و هێڵی ئاسنی لە نێوان ئەم شارانەدا بۆ دروست کردن، کەچـی لـە راستیدا مەبەستی سەرەکی ئەم شەریکەیە لەم هەموو پارە خەرج کردنە ئەوە بوو کە بتوانێ بە هۆی هێڵی ئاسن و گەمیەوە، مۆزی ئەم ولاتانـە بنێـرێ بـۆ ئەمریکای باکوور. ئەم کۆمپانیایە نە تەنیا هەنگاوێکی بۆ سـەربـەخـۆیی ئـەم ولاتانە هەڵنەگرت، بەڵکوو بۆ پاراستنی مافی خـۆی، حکوومـەتـەکـانی ئـەم ولاتانەی هێنایە ژێر چاودێری و رکێفـی خـۆی ( *Skidmore, T. E; and P. H. Smith, 1989: 310*). ئەم نموونە پیشان دەدات کە چلۆن کۆمپانیا چەن نەتەوەییەکان دەتـوانن بـۆ پاراسـتنی مافـەکـانی خۆیـان دەسـت بـە سـەر ولاتانیتردا بکێشن.

## mass / کۆمەڵ

کۆمەڵ بریتیە لە تاقمێک بە وێکچوونێکی زۆر و پێوەندی فراوان و زۆرتـر نارەزا و دەم بە جنێو. زۆرتر وایـە کـە هـەمـوو ئـەنـدامانی کۆمـەڵ پێکـەوە پێوەندی نزیکیان نییە، بەلام هەندێ جار بەشێکی گەورە لە کۆمـەلـێک لـە شوێنێکدا کۆوە دەبن. کۆمەلێک کە ئەنـدامانی لـە شـوێنێکدا کـۆوە دەبـن، کۆمەلی کۆما بەستوو و بە پێچەوانەی ئەمەش، واتە کۆمەلێک کە ئەنـدامانی کۆوە نەبووبێتن، کۆمەلـی بلاویـان پـێ دەلـێن. بێکـارانی شـار، هـەژارانی ولاتێک، نموونەیەکن لە کۆمـەڵ. وشـەی کۆمـەلان (masses) بریتیـە لـە

زۆرینەی هەژارانی شار، وڵات یان هەموو دونیا (آگبرن و نیم‌کوف؛ ١٣٥٢).

## society / کۆمەڵگا

تا ئێستا پێناسەیەک لە کۆمەڵگا نەکراوە کە هەمووان دانی بەسەردا بنێن و پەسندی بکەن، چونکە هەریەک لەسێ کارە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا ئاماژە بە رەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکەن:

١) کۆمەڵگا لە بەرفراوانترین واتایدا ئاماژە دەکات بە پێوەندی کۆمەڵایەتی نێوان مرۆڤەکان. ٢) هەر کۆمەڵەیەک لە خەڵکی -لە ژن و مێرد و هەموو تەمەنەکان- کە لە گرووپێکی سەقامگرتوو و خاوەن دامەزراوە و کولتووری تایبەت بە خۆدا کۆوە بن، دەتوانین کۆمەڵگایان پێ بڵێین. کۆمەڵگا لەم واتایەدا بە هۆی سنوورەوە لێکتر جیا دەبنەوە. ٣) لە پێناسەیەکی‌تردا دەڵێن کۆمەڵگا بریتیە لە دامەزراوە (ئەنستیتۆ) و کولتووری تاقمێکی تایبەت و تا رادەیەکی زەق و بەرچاو لە ژن و پیاوی هەرتەمەنێک. لە نێوان پێناسەی دووەم و سێیەمدا وێکچوونێکی ئاشکرا هەیە، چونکە هەردوو پێناسە بە دوو بابەتی سەرەکی و یەکگرتووی کۆمەڵناسی ئاماژە دەکەن: یەکەم ئەوەی کە خەڵکی لە هەموو شوێنێکدا بەکۆمەڵ دەژین، دووەم ئەوەی کە وان لە ژێر کاریگەری نۆرم و بەهای هاوبەشدا.

تا ئەو کاتەی کە کۆنت و سپێنسێر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا ویستیان کۆمەڵناسی وەکوو زانستێکی جیاواز بنیات بنێن، کۆمەڵگا زۆرتر بریتی بوو لە ئاپۆرەی خەڵکی کە دەکرا تایبەتمەندییە بەکۆمەڵەکەیان لە سروشتی سەرەکی مرۆڤەوە بزانرێ. بەڵام هەم کۆنت و هەمیش سپێنسێر رایان وابوو کە کۆمەڵگا بە تەنیا «ناوێکی بەکۆمەڵ بۆ تاقمێک لە خەڵکی» نییە، بەڵکوو «بوونێکی» سەربەخۆ و جیاواز لەو تاکانەیە کە پێکیان هێناوە. هەرچەن کەسانێک بەردەوام رەخنە دەگرن و دەڵێن کە کۆمەڵگا

دیاردەیەکی دەروونییە کە دەبێ بە گوێرەی دەروونناسی تاک راڤە بکرێ، بەڵام بیردۆزی کۆمەڵگا وەکوو راستییەکی تایبەت، بەردەوام وەکوو پرسێکی ئەقڵانی لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسانەدا جێی خۆی کردەوە. کۆمەڵناسان، تەنانەت کاتێک کە دانیان بەسەر ئەم پرسەدا نا، لە پێناسەی واقیعی کۆمەڵگادا هاودەنگ نەبوون (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

مارکس، زاراوەی کۆمەڵگا لە سێ واتای لێکتر جیاوازدا بەکار دەبات: یەکەم: کۆمەڵگای مرۆیی یان «مرۆڤی بە کۆمەڵایەتی بوو»، دووەم: جۆرەکانی کۆمەڵگا (وەکوو کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سوشیالیستی)، سێیەم: هەر کۆمەڵگایەکی تایبەت (وەکوو رۆمی کەونارا یان فەرانسەی مۆدێرن) (باتامور، کیرنن، میلیبند؛ ١٣٨٨).

کۆمەڵگا لە گشتیترین واتایدا ئاماژە دەکات بە مرۆڤایەتی یان بە گشتی هێمایەکە بە جۆری مرۆڤ، یان باس لە راستەقینەی سەرەکی یەکگرتوویی مرۆیی دەکا. گینزبێرگ و مەک ئایڤێر و پارسۆنز لە یەک کاتدا گوتوویانە کە کۆمەڵگا ئاماژە دەکات بە «سەرجەمی چن»یان «سەرجەمی شێوازی ئاڵۆز»ی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

کۆمەڵگا لەم واتا گشتییەیدا لە کۆمەڵگایەک یان ئەنجومەنێک (بە گوێرەی گوتەی مەکئایڤێر) جیا دەکرێتەوە، زاراوەیەک کە دواتر بە شێوەگەلی جۆراوجۆر پێناسە کرا. سپێنسێر زاراوەی کۆمەڵگای، بۆ باس لە کۆمەڵێکی رێکخراو، واتە گرووپێک لە تاکەکان کە بە هۆی پێوەندیگەلی هاریکاریوە کۆمایان بەستووە، بەکار دەبرد. سامنێر و کلێر بە پێڕەوی لە سپێنسێر، کۆمەڵگا بە «گرووپێک لە تاکە مرۆییەکان کە بە مەبەستی دابین کردنی بژیو و سەقامگیر کردنی جۆری پێوەندییەکان پێکرا هاریکاریان هەیە» پێناسە دەکەن. کۆمەڵناسانیتر کە کۆمەڵگا بە کۆمەڵەیەک دەزانن، لە سەر هاریکاری جەخت ناکەن. بۆ وێنە، لینتۆن بەم چەشنە کۆمەڵگای

پێناسە دەکرد: «گرووپێک لە خەڵکی کە ئـەوەنـدە پێکـڕا ژیـاون و کاریـان کردووە کە بوونەتە وەکوو ڕێکخراو و یەکەیەکی کۆمـەڵایـەتی زۆر ئاشـکرا و دیار». لە زۆربەی پێناسەکاندا جیاوازی نێوان کۆمەڵگا و گرووپەکانی‌تر لەبەر چاو نەدەگیران. بەم بۆنەوە گیـنزبێـرگ کۆمـەڵـگا بـە «کۆمـەڵـەیـەک لـە تاکەکان» دەزانێ کە «هۆی یەکیەتیان، بوونی پێوەندی و هەڵس‌وکەوت لـە گەڵ یەکترە. هەروەها ئەم شێوەی هەڵس‌وکەوت و پێوەندیانە دەبنــە هـۆی جیابوونەوەی ئەم تاکانە لەو کەسانەی کە نین لە نێو ئەم بازنەیەدا». زیمێـل کۆمەڵگا بە «ژمارەیەک لە تاکەکان دەزانێ کە بە هـۆی کارلێکـەوە، پێکـەوە پێوەندییان هەیە».

بۆ ئەوەی خوێنەر نەکەوێتە نێو بازنەی ئەم پێناسانەی کـە کۆمـەڵـگا لـە گەڵ هەر گرووپێکی‌تری کۆمەڵایەتی بە یەکێک دەزانن، ئەم پێناسە ئاراستە دەکەین کە: «بەرفراوانترین گرووپێک کە تاک پێوەنـدی لـە گـەڵ هـەیـەو تێیدا بەشدارە»، یان ئەو گرووپەی کە «ئەنـدامانی بـۆ بـەدیهێنـانی بـەشـە سەرەکیەکانی و هەل‌ومەرجی ژیـانی هاوبـەش، تێیـدا بـەشـدارن» دەبێتـە کۆمەڵگا. لەم ڕوانگەوە کۆمەڵگا بریتیە لە تۆڕێکی ئاڵۆز لـەو گرووپانـەی کـە پێکڕا پێوەندییان هەیە و لە نێـو یـەکـدا تێکـەڵاون. ئـەم گرووپانـە پێکـەوە کۆمەڵگایەکی بەرفراوانتر پێک‌دێنن؛ ئەم کۆمەڵە بەرفراوانە لـە کولتـوورێکی هاوبەش و سیستەمێکی کۆمەڵایەتیدا هاوبەش پێک‌هاتوون (گولـدو کولـب؛ ١٣٨٤).

## کۆمەڵگای ئایینی / ecclesia

ئەم واتایە لە ئاتنی کەونارادا بە واتای کۆڕی ڕامیـاری یـان شـوێنی کـۆوە بوون بەکار دەبرا. کۆمەڵگای ئایینی ڕێکخراوێکی دینی شارەزا و ڕاهاتووە کە بە هۆی زنجیرە پلەو پاگەیـەک لـە بـەرپرسـە ئاینییـەکانـەوە ڕێبـەرایـەتی

دەکرێ. ئەم دامەزراوانە پێیان وایە کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا ئەندامی ئەوانن. ئەندامێتی لەم کۆمەڵگایانەدا بە ویستی خودی تاک نییە، بەڵکوو یاسایە و نابێ تاک خۆی لێ ببوێرێ. بەم بۆنەوەی هەڤبەندییەکی (هاوپەیمانی) بەرچاو لە نێوان دامەزراوەی ئایینی و بەرپرسانی ڕەسمی دەوڵەتیدا دێتە دی و ئەم دامەزراوانە دەکاتە، ڕێکخراوێکی ئایینی ڕەسمی دەوڵەتی. ئەم دامەزراوە لە بریتانیادا لە ژێر ناوی کلیسای ئەنگلیکان (Anglican Church)، لە فەرانسەدا بەناوی کلیسای کاتۆلیکی ڕۆم (Roman Cthtolic Church)، لە سویددا بە ناوی کلیسای لۆترییەکان (the Lutheran Church) بەدی هاتوون. ئەمڕۆکەش ئیسلام ئاینیی ڕەسمی ولاتانی مالزی، بەنگلادیش، ئێران و سعوودییە و یاساکانیان لە سەر بنەمای ئیسلامی دادەڕێژرێ.

گەر لە کۆمەڵگایەکدا ئاوەها دامەزراوە و ڕێکخراوێک هەبێ، تاکەکان لە نێو ئەم دامەزراوەدا دێنە دونیاوە و ئەوانەی تازە دێنە نێو ئەم کۆمەڵگا، ئایینی خۆیان دەگۆڕن و دینی ئەو کۆمەڵگا قەبووڵ دەکەن. ڕەنگە لەم کۆمەڵگایانەدا ناتەباکان بکوژرێن، کۆچ بکەن، یان لە نێو کۆمەڵگادا بخرێنە پەراوێزەوە. ئەم دامەزراوە ئاینییانە پێیان وایە کە گەیشتوونەتە باوەڕی ڕاستەقینە، بەم بۆنەوە دان بە ئایینەکانیتردا نانێن. هەروەها لە بیچمی ڕادیکاڵدا، ڕاستەوخۆ هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی تاک دەخەنە ژێر چاودێری. لەم کۆمەڵگایانەدا، کەسانێک وەکوو مەلا و ئاخوند و موفتی، بەرپرس یان چاودێری تۆمارکردنی یاسان؛ دەڵێن کە یاسا بە گوێرەی پێوەرە دینییەکان تۆمار دەکرێ. حوکمە دینییەکان بۆ کار و باری کۆمەڵایەتی بەکار دێنن؛ بۆ وێنە: دەسەڵاتداران بۆ سەرکوت کردنی ئەو کەسانەی خوازیاری دابین کردنی ژیانێکی ئازادن، حوکمی شەڕ لە گەڵ کافر و لاڕێ و مورتەد دەردەکەن. بۆ گەیشتن بە ئامانجە سەربازییەکانیان حوکمی جیهاد

دەردەکەن و... .

## class society / کۆمەڵگای چینایەتی

بریتیە لە کۆمەڵگایەک کە جیاوازییەکی سەرنجڕاکێش لە نێوان چین و توێژەکانیدا هەیە. لە کۆمەڵگای چینایەتیدا، هەر چینێک خاوەنی تایبەتمەندی کولتووری و ئابووری تایبەت بە خۆیە (شێوازی باوەڕ و بەها و هەڵسوکەوتەکان). بەم بۆنەوە لە ناو کولتووری گشتی کۆمەڵگادا وردە کولتوورگەلێک دێنە دی و سەرهەڵدەدەن.

## information society / کۆمەڵگای زانیاری

هەندێ لە بیرمەندانی کۆمەلایەتی رایان وایە کە مرۆڤ لە ئاسانەی شۆڕشێکی تردایە؛ شۆڕشێک کە بایەخی کەمتر لە شۆڕشی جووتیاری و پیشەسازی نییە. بە بڕوای دانییل بێل، تیکنۆلۆجیای نوێ، بنەما و بناغەی دامەزراوە کۆمەلایەتییەکان تێک دەدەات و دەبێتە هۆی گەشە و فراژوو بوونی ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئەو پێیان دەڵێ کۆمەڵگای پاش‌پیشەسازی یان کۆمەڵگای زانیاری. کۆمەگا پیشەسازییەکان بناغەیان لە سەر بەرهەمهێنانی کالا داڕێژراوە. سەرەچاوە و کانە سەرەکییەکانی ئەم کۆمەڵگایانە لە سەرمایەگەلی فیزیایی وەکوو بەرد، کانزا و هێزی کار پێک دێت. زۆرترین هێزی کار بۆ بەرهەمهێنانی کالا تەرخان دەکرێ و خاوەنێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەبێتە هۆی دەسەلاتی ئابووری و رامیاری و کۆمەلایەتی. ئەمڕۆکە ئەم تایبەتمەندییانە، گۆڕانێکی گەورەیان بە سەردا هاتووە و کۆمەڵگا پیشەسازییەکان دەرگاکانیان بۆ کەمەڵگایەکی نوێ ئاوەلا دەکەن کە دەنییل بێل ناوی کۆمەڵگای زانیاری بە سەردا داناوە. کەڵکەڵەی کۆمەڵگای زانیاری، دابین کردنی خزمەتگوزارییە. سەرچاوە و کانی

سەرەکی ئەم کۆمەڵگایانە، سەرمایەی مرۆییە (زانست و زانیاری و ئەزموون). زۆرترین هێزی کار لەم جڤاکانەدا بۆ توێژینەوە و ئامادەکردنی خزمەتگوزاری (وەکوو تەندروستی یان پەروەردە) تەرخان دەکرێ. بە پێچەوانەی جڤاکە پیشەسازییەکان کە خێوەتی کەرەسەگەلی بەرهەمهێنان دەبێتە هۆی دەسەڵاتدار بوون، لە کۆمەڵگا زانیارییەکاندا زانست سەرچاوەی دەسەڵاتە. جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگای پیشەسازی و زانیاری بەم چەشنەیە:

**کۆمەڵگا پیشەسازییەکان**

١- دامەزراوەی ئابووری= بەرهەمهێنانی کاڵا و شتمەکی پێویست

٢- دابەش‌کردنی کار= کرێکاران و بەڕێوەبەران

٣- سەرچاوەی کلیلی= کۆنترۆڵی وزە

٤- سەرچاوەی دەسەڵات= کۆنترۆڵی سەرمایە و هێزی کار

٥- بڕیاردان= دەم و دەس و کاتی (بڕیارەکانی بە گوێرەی ئەزموون و وت‌و ویژە ناڕەسمییەکانەوە دەدرێن).

**کۆمەڵگا زانیارییەکان**

١- دامەزراوەی ئابووری= خزمەتگوزاری و ڕاگەیاندنی زانیاری

٢- دابەش‌کردنی کار= کرێکارانی تەکنیکی و پسپۆڕ

٣- سەرچاوەی کلیلی= زانستی هزری

٤- سەرچاوەی دەسەڵات= کۆنترۆڵی تیکنۆلۆجی و هەڵسەنگاندنی

٥- بڕیاردان= تیکنۆلۆجی هزری یا ڕۆشنبیرانە .

دانییێل بێل پێش‌بینی دەکات کە لە جڤاکە زانیارییەکاندا، تیکنۆلۆجیایەک کە بۆ ئۆتۆماتیکی کردن و چاودێری بە سەر بەرهەمهێناندا تەرخان دەکرا، دێتە خزمەت بەرنامەڕێژی کۆمەڵایەتی. بە پێچەوانەی هەراو هوریای سەرەتای خولی سەرمایەداری، توانایە تەکنیکییەکانی ئەم جڤاکانە لە خزمەت گەشە و بەربڵاو کردنی

کۆمەڵگای ئەقلانی و مرۆییدایە و ئاسانکاری بۆ ژیانی خەڵکی، زۆرتر لە نیازە سەرەتاییەکان دابین دەکرێ. بە بڕوای ئەو: «ئەگەر پێوەری پێوانی ئاستی ژیانی خەڵکی لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا بە هۆی چەندییەتی کاڵا بەرهەمهاتووەکانەوە پێناسە دەکرێ، لە کۆمەڵگای پاش پیشەسازیدا، چۆنییەتی ژیانی خەڵکی لە پێوانە دەدرێ؛ چۆنییەتێک کە بە هۆی خزمەتگوزاری و ئاسانکارییەکانی تەندروستی و پەروەردە و وەرزش و هونەرەوە دەپێورێ» (*Bell, D; 1973*).

## کۆمەڵناسی / sociology

کۆمەڵناسی یەکێک لە لقەکانی زانستەکۆمەڵایەتییەکانە کە گرووپ و کۆمەڵگا مرۆییەکان دەخاتە بەر توێژینەوە و وردبوونەوەی سیستماتیک. هەروەها کۆمەڵناسی کاریگەری پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بە سەر ڕەفتاری مرۆڤەکاندا دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە. ئەم لقەی زانستەکۆمەڵایەتیەکان، لە ژیانی کۆمەڵایەتی، گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان و هۆ و دەرەنجامی کۆمەڵایەتی هەڵس‌وکەوتی مرۆڤەکان دەتۆژێتەوە. مەبەستی کۆمەڵناسان، ناسین و تێگەیشتنی پێکهاتەی گرووپ، دامەزراوە و کۆمەڵگاکانە. هەروەها دەیانەوێ بزانن کە خەڵکی چلۆن لە نێو ئەم پێکهاتانەدا هەڵس‌وکەوت دەکەن و کارلێکیان هەیە. چونکە هەموو هەڵس‌وکەوتەکانی مرۆڤ، کۆمەڵایەتین، بابەتی بەرباسی کۆمەڵناسی، پانتایەکی بەرفراوان دەگرێتەوە: ئەم پانتایە لە خێزانە بچووک و ناوکیەکانەوە بگرە تاکوو دوژمنایەتییە گرووپی و چینایەتی و نەتەوەییەکان، لە ڕێکخراوە مافیاییەکانەوە بگرە تاکوو ڕێ‌و ڕەسمە ئایینییەکان، لە ڕەگەز و وەچە و چینە کۆمەڵایەتییەکانەوە بگرە تاکوو باوەڕە هاوبەشەکانی نێو کولتوورێک، لە کۆمەڵناسی کارەوە بگرە تاکوو کۆمەڵناسی یاری کردن و کۆمەڵناسی خەون، هەمووی دەگرێتەوە. لە ڕاستیدا پانتای

توێژینەوە، بیردۆزدانان و بەکارهێنانی کەمتر زانستێک دەگاتە کۆمەڵناسی. بە واتایەکی‌تر دەتوانین بڵێین کە کۆمەڵناسی، چوارڕێیانی هەموو زانستەکانە.

ناکۆکی لە سەر چییەتی کۆمەڵناسی کە لە سەر بازنەی پرسە زانستییەکان دەسووڕێتەوە، زۆرتر باس دەکات لە سەر: ١) ئەمەی کە کۆمەڵناسی زنجیرە زانستێکی گشتگیرە یان ئەوەی کە زنجیرە زانستێکی مێژووییە؛ ٢) دروست بوونی شێوازگەلی توێژینەوە کە لە گەڵ ئەزموونی دژوار و ورد، یان نموونەگرتنی وردو تەکووزی ئاماری و لێکدانەوەی داتاکان، جیاوازی هەیە (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

## sociology of religion / کۆمەڵناسی ئایین

ئایین یان دین، هەڵس‌و کەوتێکی زۆر تاکەکەسییە. ئەزموونەکانی دین، ئەزموونی تاکەکەسین؛ بە چەشنێک کە ئەزموونی ئایینی هەر تاکێک لە گەڵ تاکێکی‌تر جیاوازی هەیە و لە راستیدا لەو چوارچێوەی کە بکرێ لە سەر خودی ئایین باسی زانستی بکرێ، ناگونجێ. ئایین لە کۆنترین دیاردەکانی کۆمەڵگای مرۆییە و لە خولی جۆراوجۆری مێژووی مرۆڤیشدا کاریگەری زۆری بە سەر کۆمەڵگاکاندا بووە؛ یان کاریگەرییەکەی هان دان و بۆ پێشەوە بردن بووە، یاخۆ بۆتە کۆسپ و تەگەرەیەک لە بەرانبەر پێشکەوتنی کۆمەڵگاوە. ئایین -هەروەک ئاماژەی پێکرا- ئەزموونێکی تاکەکەسییە و هەرکەس هەڵوێستی خۆی هەیە لە بەرانبەر ئایینەوە. بیرمەندان بۆ وردبوونەوە و لێکدانەوەی کاریگەری ئەم چەمکە گرینگەی ژیانی مرۆڤ، ئاماژەیان بە سێ جۆر روانین بە ئایین کردووە کە بریتین لە: روانینی سۆفییانە (ئەزموونی تاکەکەسی)، روانینی مەعریفەناسانە، روانینی کۆمەڵناسانە.

لە روانینی سۆفییانەدا، تاک خۆی دەداتە دەست ئەو هێزە سەروو سروشتییانەوە و بە گوێرەی هەڵوێست و یاساو پێوەرگەلی ئەو ئایینەوە خۆی رادێنێ. ئەم ئەزموونانە کە بۆ تاک دێنە کایەوە، تایبەت بە خودی ئەو تاکەن و ئەزموونی هیچ سۆفییەک لە گەڵ سۆفییەکی تر یەک ناگرنەوە؛ هەروەها رێگابڕین و پەروەردەبوون لەم رەهەندەدا پێویستی بە تەسلیم و گوێڕایەڵ بوونە. سۆفی لە سەرەتای رێگایدا دەبێ بە شمشێری پشت بەستن، سەری ئاوەز و ئەندێشەی ببڕێ و ئاوڕی لێنەداتەوە. بەم بۆنەوە، بە گوێرەی پێوەرە زانستییەکان لە سەر ئەم ئەزموونانە توێژینەوە ناکرێ.

روانینی دووەم، بریتی بوو لە روانینی مەعریفەناسانە یان کەلامی و فەلسەفی. ئەم شێوازە شێوازێکی ئەقڵی تەنیایە. شێوازێک لە ناوەوەی دین بۆ چەسپاندنی راست و دروستی ئایین، یان بە پێچەوانە، بۆ بەدرۆ خستنەوەی ئاینێک و چەسپاندنی ئایینێکی‌تر بەکار دەبرێ. پێوەری ئەم شێوازە، یاسا سەرووسروشتییەکانن، نەک یاسای زانستە ئەزموونییەکان. لەم روانگەدا، بابەتی سەرەکی، شەڕی نێوان خێر و شەڕە و زۆرتر هان دەدرێ بۆ ئەوەی پاکانە بۆ یاسا و پێوەرە ئاینییەکان بکرێ. زانای ئەم رەهەندە ناتوانێ گومان لە سەرچاوە و بنەما و بەها و پێوەرەکان بکات؛ هەروەها ئەرکی سەرەکی زانای ئەم بوارە لێکهەڵاوارنی چاکە و خراپەیە.

روانینی سێیەم، روانگەی کۆمەڵناسانە بوو. کۆمەڵناسی ئایین بۆیە سەرنج دەداتە ئایین، چونکە دین کارێکی گشتگیرە لە هەموو کۆمەڵگا مرۆییەکاندا (لە هەر شوێنێکدا کە کۆمەڵگا هەبێ). هەروەها ئایین جۆرێک لە هەڵس‌و کەوتی گرووپییە. هەر هەڵس‌وکەوتێک کە کەمتر تاکەکەسی بێ و زۆرتر گشتی و بەردوام بێ، کۆمەڵناسان سەرنجی پێ دەدەن و دەیخەنە نێو کوورەی توێژینەوەی کۆمەڵناسانەوە (جلالی‌مقدم؛ ١٣٨٦).

رەنگە هەڵس‌وکەوتی دینی لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا بە گشتگیر بزانرێ.

ئەو ئاسەوارانەی کە لە مرۆڤی نێئاندرتاڵەوە دەسکەوتوون، بەڵگەن بۆ ئەو شتەی کۆمەڵناسان هەڵس‌وکەوتی ئایینی پێ دەڵێن. هیچ ئێتنلۆجێک دەست نەکەوتووە بۆ ڕەت کردنەوەی ئەم بۆچوونە. هەرچەند ڕاڤەی ئەم گشتگیر بوونە دژوارە، بەڵام بەڵگەی مێژوویی و ئێتنۆلۆجی بۆ چەسپاندنی ئەم بۆچوونە لە دەستدایە. کەواتە دین وەکوو دیاردەیەکی گرینگی کۆمەڵگای مرۆیی، دەبێ بخرێتە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە. هەرچەند کۆمەڵناسی، ئایین وەکوو دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی دەزانێ و دەست دەدا بە ڕاڤەی کاریگەری ئایین بە سەر ڕەهەندەجۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا.

گەر دان بەم بۆچوونەدا بنێین کە «کۆمەڵناسی ئایین» هەمان کاری کۆمەڵناسی دینە، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زۆرمان دەست دەکەوێ کە لە سەر ئەم تەوەرانەدا دەکۆڵنەوە: کاریگەری گشتی گرووپەکان بە سەر ئاییندا، ئەرکی ڕێ‌ڕەسمە ئاینییەکان لە نێو کۆمەڵگادا، ناسینی هەموو جۆری ڕێکخراوی ئایینی و هەموو جۆری کاردانەوە ئایینی لە بەرانبەر جیهان یان دیسیپلینی کۆمەڵایەتیدا، کاریگەرییە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆوەکانی سیستەمە ئایینییەکان بە سەر کۆمەڵگا و بەشە پێکهێنەرەکانی (وەکوو چین و گرووپە نەتەوەییەکان)، هەروەها کاریگەری کۆمەڵگا بە سەر سیستەمە هزریە ئایینییەکان، ڕاڤەی بزاڤە جۆراوجۆرە ئایینییەکان وەکوو: زانستی مەسیحی، مورمۆنخوازی، گەڕانەوەی عیسا مەسێح، گەڕانەوەی مەهدی و هتد؛ کارلێکی بەشە گرینگەکانی ئایین لە پانتای ناوچەیی یان کۆمەڵایەتیدا. ئەم سیاییە تەواو نییە و بە وردی و ڕاشکاوی تەواوەوە ئامادە نەکراوە؛ بەڵام تایبەتمەندی گشتی ئەم بۆچوونانە لە کۆمەڵناسی ئاییندا تا ڕادەیەکی بەرچاو بەڕاشکاوی پیشان دراوە (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

خاڵێک کە دەبێ لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە بە گشتی

شارەزایانی کۆمەڵناسی ئایین کە لە گەڵ واتایەکی وەکوو کارلێکی کۆمەڵایەتی کار دەکەن، لە بواری ناسینی تەوەری دین (واتە: بەشە کولتووریەکانی ئایین)، سەرکەتوویەکی بەرچاویان نەبووە و لە باری کۆمەڵناسیوە باسێکی سەرنجڕاکێشیان نەکردووە. بەشی زۆری سەرکەوتن یان نەکەوتنی کۆمەڵناسی ئایین لە داهاتوودا، بەستراوە بە چۆنییەتی رووبەڕوو بوون لە گەڵ پرسی دین (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## کۆمەڵناسی پەروەردە / educational sociology

توێژینەوەی کۆمەڵناسی لە ساڵی ١٩١٨وە لە وڵاتی ئەمریکادا دەسپێکراوە. گریمانەی ئەم توێژینەوانە ئەوە بووە کە پەروەردەپرۆسەیەکە بۆ بە کۆمەڵایەتی کردن بە شێوەیەکی بەربلاو. کۆمەڵناسی پەروەدەش لقێکە لە کۆمەڵناسی کە دەبێ ئامانج و شێوازە ئەقلانییەکانی پەروەردە و بەشی سەرەکی زانست و تەکنیکی پێویست بۆ ماموستایان و توێژەرانی پەروەردە دابین بکات. لەم رووەوە براون لە زمان دادسۆنەوە دەڵێ: «کۆمەڵناسی پەروەردە سەرنجی تایبەت دەداتە سەرجەمی ژینگەی کولتووری؛ چونکە ئەزموون لە ناو و بە هۆی ئەوەوە دێتە دی. ئەم لقە سەرنج دەداتە قوتابخانە و کێشەکانی، بەلام بە بەشێکی بچووک لە گشت(کل) دەزانرێ. کۆمەڵناسی، هۆگری گەیشتن بە وەلامی ئەم پرسەیە کە بۆ گەیشتن بە کەسایەتییەکی سەرتر و پەرەدان بەو کەسایەتییە دەبێ چلۆن پرۆسەی پەروەردە رێکوپێک و ئامادە بکرێ. سەبارەت بە کۆمەڵناسی پەروەردە زۆر بە چاکی تێگەیشتوون کە دەڵێن بریتیە لە هەر چەمکێکی کۆمەڵناسی کە پێوەندی بێ بە پرۆسەی پەروەردە و بەکۆمەڵایەتی کردنەوە. هەروەها هەر بابەتێک لە پەروەردەو بەکۆمەڵایەتی بووندا کە پێوەندی بە کۆمەڵناسییەوە بێ» (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

کۆمەڵناسان لە پێناسەی پەروەردەدا سەرنج دەدەنە هەموو لایەن و رەهەندەرەسمی و نارەسمی و پێکهاتەیی و ناپێکهاتەییەکانی پەروەردە. یان هەر بەو چەشنەی کە بێژرا، پەروەردە هەمان بەکۆمەڵایەتی کردنە. کۆمەڵناسانی پەروەردە بێجگە لەتوێژینەوە لە سەر سیستەمی فەرمی پەروەردە، هۆگری توێژینەوە لە سەر لایەنە نارەسمییەکانی فێرکارین. دەیانەوێ بزانن کە منداڵ بەر لە رۆیشتنە نێو قوتابخانە، چ شتێک فێر دەبێ. چلۆن گرووپی هاوسالان بە سەر سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی منداڵ لە پێکهاتەی رەسمی سیستەمی پەروەردەدا کاریگەر دەبێ. دەتوانین بڵێین کە پەروەردە ناوەندێکی کۆمەڵایەتییە کە لە لایەکەوە لە گەڵ چۆنییەتی مرۆیی و گەشەی کەسایەتی تاکدا پێوەندی هەیە و لە لایەکی ترەوە بەندیوارە بە هەر جۆرە بزاوتن و گۆڕانی کۆمەڵایەتییەوە (گلشن‌فومن؛ ١٣٧٥).

بە سەرنجدان بە بەرفراوان بوونی تەوەرەکانی کۆمەڵناسی پەروەدە، دەکرێ ئەم بەربلاویە بەم چەشنە لێک جیا بکرێنەوە:

١) پێوەندی سیستەمی پەروەردە لە گەڵ دامەزراوەکۆمەڵایەتییەکانی‌تر: ئەم بەشە لە کۆمەڵناسی پەروەردە، خۆی چەن بەشی لاوەکی‌تری لێ دەبێتەوە: ئا: پێوەندی سیستەمی پەروەردە لە گەڵ پرۆسەی گۆڕانە کۆمەڵایەتی و کولتورییەکان، یان پاراستنی بارودۆخی هەنووکەیی؛ ب: کاریگەری سیستەمی پەروەردە لە پرۆسەی چاکسازی کۆمەڵایەتی؛ پ: کاریگەری سیستەمی پەروەردە لە پرۆسەی کۆنترۆلی کۆمەڵایەتی؛ ت: پێوەندی پەروەردە لە گەڵ چینی کۆمەڵایەتی، ج: پێوەندی سیستەمی پەروەردە لە گەڵ بیری گشتی.

٢) کولتووری قوتابخانە و پێوەندیی مرۆیی تێیدا: بەشی دووەمی کۆمەڵناسی پەروەردە کە سەرنجێکی ئەوتۆی پێدراوە، بریتیە لە راڤەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ناو قوتابخانە. میتۆدەکولتوورییەکانی نێو قوتابخانە، جیاوازییەکی

زۆری لە گەڵ دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی‌تر هەیە. توێژینـەوەی زۆر سـەبـارەت بە شێوازی هەڵس‌وکەوتی نێوان تاکەکان لە نێو قوتابخانەدا بـەڕێـوە بـراوە. لـەم بوارەدا دەتوانین ئاماژە بەم بابەتانەبکەین: یەکەم چۆنییەتی کولتووری قوتابخانـە و جیاوازی لە گەڵ کولتـووری دەرەوەی قوتابخانـە، دووەم، چۆنییـەتی شـێوازی پۆلێن کردن لە ناوەوەی قوتابخانە، سێیەم پێـوەنـدی نێـوان مامۆسـتا و قوتـابی، چوارەم راڤەی تۆڕی گرووپی دۆستەکان و پێکهاتەیان لـە نـاوخۆی قوتابخانـەدا، پێنج شێوازی رێبەرایەتی و پێکهاتەی دەسەڵات لە ناو گرووپەکانی قوتابخانە.

٣) پێوەندی نێوان قوتابخانە و کۆمەڵگا: سێیەمین بەش کە کەوتۆتە ناوەنـدی سەرنجی کۆمەڵناسان بریتیە لـە: یـەکـەم، راڤـەی شـێوازی پێـوەنـدی نێـوان قوتابخانە و گرووپەکۆمەڵایەتییەکانی‌تر، لە بواری کاریگەری کۆمـەڵـگا بـە سـەر قوتابخانەدا؛ دووەم، لێکدانەوەی پێکهاتەی دەسەڵاتی کۆمەڵگا و کاریگـەری ئـەو دەسەڵاتە بە سەر قوتابخانەدا؛ سێیەم، لێکدانەوەی پێوەندی نێـوان سیسـتەمـی قوتابخانە و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی‌تری نێو کۆمەڵگا.

٤) کاریگەری قوتابخانـە بـە سـەر تاکـەکـانی نـاو قوتابخانـە: لـەم بـەشـەدا کۆمـەڵناسـان دەسـت دەدەن بـە لێکدانـەوەی دەروون‌ناسـی کۆمـەڵایـەتی سیستەمی پەروەردە. لەم چەمکەدا سەرنج بـە دەور و رۆڵـی مامۆسـتا دەدرێ و کـەسـایەتی مامۆسـتا وەکـوو یـەکێـک لـە باسـە گرینگـەکـان لـەم بوارانـەدا لێک‌دەدرێتەوە: ١- دەوری کۆمەڵایـەتی مامۆسـتا؛ ٢- چۆنییـەتی کـەسـایەتی مامۆستا؛ ٣- کاریگەری کەسایەتی مامۆستا بە سەر هەڵس‌و کەوتی قوتابیـدا؛ ٤- دەوری مامۆستا لە گەشە و سازگاری یان ناساز بوونی قوتابی؛ ٥- تایبەتمـەنـدی و کاریگەری هەڵس‌وکەوتی ملهۆڕانە یان سەربەستانە لە قوتابخانەدا (شـارع‌پـور؛ ١٣٨٦).

## sociology of knowledge / کۆمەڵناسی زانین

گشتی‌ترین واتای ئەم زاراوەیە لەم پێناسانەی خوارەوە دەست دەکەوێ: «مەبەستی سەرەکی توێژینەوەی ئێمە سەیر کردنی ئەم کارەیە کە ژیانی هزری یان واتایی لە کاتێکی مێژوویی تایبەتدا، چلۆن و بە چ شێوازێک لە گەڵ هێزە رامیاری و کۆمەلایەتییە هەنووکەییەکان پێوەندی هەیە». کۆمەڵناسی زانین، بریتیە لە لێکدانەوەی یەکگرتوویی ئەرکی، پێکهاتەو پرۆسەکۆمەلایەتییەکان لە لایەکەوە و شێوازەکانی ژیانی واتایی و تێگەیشتن لە لایەکی‌ترەوە. کۆمەڵناسی زانین ، باس لە مەرجدار بوونی سیستەمە هزرییەکان بە هۆی راستەقینە کۆمەلایەتییەکانەوە دەکات (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

پاش ئەوەی کە پییرۆزالم سالی ١٩٠٩ لە حەوتەنامەی *داهاتوودا* وتارێکی لە ژێر ناوی *کۆمەڵناسی زانین* بلاو کردەوە، دوورکایم لە سالنامەی کۆمەڵناسیەکەی خۆیدا بەشی نوێی کردەوە بەناوی *مەرجەکانی کۆمەڵناسی زانین*. بەلام وادیارە کە ماکس شێلێر کە لە سالی ١٩٢٤دا کتێبێکی لە ژێرناوی *کۆشەوە لە بواری کۆمەڵناسی زانیندا* ئێدیت کرد و پاشان لە ١٩٢٦دا کتێبەکەی خۆی بەناوی *شێوازەکانی زانین و کۆمەڵگا* بلاو کردەوە، گرینگترین کەسێک بێ کە ئەم زاراوەیە هێناوەتە نێو بازنەی کۆمەڵناسیەوە.

پێناسەی زانستی ئەم زاراوەیە دەبێ لە گەڵ ئەم مەرجانەی خوارەوە سازگار بێ: ١) یەکەمین مەرج ئاشکرا بوون و نەکەوتنە ژێر دادوەری بەهاکانە، واتە خالی بوون لە بەهادانان. یەکەمین ئامانجی کۆمەڵناسی زانین وەکوو لقێک لە زانست، بریتیە لە دیتنەوەی ئاخێزگەی بیرو باوەڕەکان، نەک دادوەری سەبارەت بە لایەنگری رامیاری و بایەخی ئەو بیرو باوەڕانە. ٢) دووەمین مەرج، دووری کردنە لە گریمانە و بۆچوونی سەرووسروشتی (متافیزیک) بۆ راڤەی پێوەندی نێوان پێکهاتەی کۆمەلایەتی و پێکهاتەی

هزری، چونکە ئەم گریمانانە نە ڕەت دەکرێنەوە و نە دەسەلمێندرێن. کۆمەڵناسێک کە بیەوێ لە بواری زانیندا بە شێوازی زانستی کار بکات، دەبێ خۆی لەو ڕا و بۆچوونە جەزمییانە سەبارەت بە پرسی جەبرو ئێختیار بپارێزی و شێوازێک بۆ «ڕاڤەی واتا»ی بیرو بڕواکان لە پێناوی شوێنگەی کۆمەڵایەتیدا بەدێ بێنێ.

هەندێ لە ناکۆکی و دژایەتییەکان سەبارەت بە بەکار هێنانی ئەم زاراوەیە لە ڕێی لێکدانەوەی ١) بەکار هێنانی مارکسی و ٢) بەکار براو لە نووسراوەکانی کارێل مانهایم و ٣) لە کۆمەڵناسی زانیندا وەکوو بەشێک لە زانین‌ناسی، دەردەکەوێ.

١) هەرچەند زاراوەی کۆمەڵناسی زانین، ئاخێزگەی مارکسی نییە، بەڵام هەندێ لە نووسەرە مارکسییەکان ئازادانە وەریانگرتووە. ئەم نووسەرانە پێیان وابوو کە کۆمەڵناسی زانین، هەمان یان لانی کەم جۆرێک «بۆچوونی ماتریالیستییە لە مێژوو» کە مارکس باسی لێ‌کردبوو. بۆ چەسپاندنی ئەم بۆچوونە، هەندێ لەم گوتانەی مارکس کە لە نێو کتێبی *ڕەخنە لە ئابووری ڕامیاری* (١٨٥٩)دا بێژراون، وەکوو بەڵگە دێننەوە: لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا کە بە دەستی مرۆڤەکان ئەنجام دەگرێ، دەڕۆنە نێو بازنەیەک لە پێوەندیگەلی تایبەتەوە کە ناتوانن خۆیان لێی بپارێزن و لە ویستی ئەوان بەدەرە؛ ئەم پێوەندیانە لە گەڵ قۆناغێکی تایبەت لە تەکامولی هێزە مادییەکانی بەرهەمهێنان سازگاری هەیە. شێوازی بەرهەمهێنان لە ژیانی مادی، تایبەتمەندی گشتی پرۆسەگەلی کۆمەڵایەتی، ڕامیاری و واتایی ژیان دیاری دەکەن. ئەمە زانستی مرۆڤەکان نییە کە بوونیان دێنێتە دی، بەڵکوو بوونیانە کە زانستیان دێنێتە دی».

٢) بەهەرەیەک کە مانهایم لەم زاراوەیەی دەبرد، لەژێر کاریگەری هەمان واتا مارکسییەدا بوو و بەزۆری تێدەکۆشا کە ئەو واتایانە لە گەڵ بنەمای

پراگماتیکدا تێکەڵ بکات. هەروەک ناوی گرینگترین بەرهەمی (ئایدیۆلۆژی و یۆتۆپیا) پیشان دەدا، کۆمەڵناسی زانینی بە لێکدانەوەو شرۆڤەی سێ جۆر بیرو بۆچوونی جیاواز دەزانی: یەکەم بیری واقیعبینانە؛ واتە: بیرێک کە لە کۆمەڵگایەکی تایبەتدا لە باری پراگماتیسیەوە لە گەڵ راستەقینە یەک بگرنەوە و وەکوو راستەقینە دەور دەگێڕن. بیرێک کە «نە کەمتر و نە زۆرتر لەو واقیعەی کە لە سۆنگەیەوە کار دەکا، ناگرێتەوە». دووەم، بیری ئایدیۆلۆژیکی، واتە بیری تایبەتی گرووپە پاراستنخوازەکان کە دژ بە واقیعبینییە؛ چونکە بە هۆی هۆگرێتی دەسڕاگەیشتن بە راستەقینەی ئاشکراوە نەهاتۆتە دی، بەڵکوو لە سۆنگەی بەرگری لە گۆڕانەوە سەری هەڵداوە. سێیەم، بریتیە لە بیری یۆتۆپیایی؛ واتە بیری تایبەتی گرووپە شۆڕشگێڕەکان، کە ئامانج و بەرنامەکانیان جارێک نایەنە دی و بەم بۆنەوە واقیعبینانە نین؛ چونکە دیسان ئەمیش لە سۆنگەی ئیرادەوە بۆ گەیشتن بە راستەقینەی ئاشکرا نەهاتۆتە دی، بەڵکوو خەیاڵێکە کە لە نێو تارمایی داهاتوویەکی لێڵدا سەری هەڵداوە. تا ئەو جێگای کە بیردۆزی مانهایم سەبارەت بە کۆمەڵناسی زانین بە سەرپەرژانی تایبەت بە «ئایدیۆلۆژی» و «یۆتۆپیا»، لە بەرانبەر بیری زانستی راستەقینە، دیاری دەکرێ، ئەو لە گەڵ مارکسیستەکان، کۆمەڵناسی زانین بە شێوازێک دەزانێ بۆ لادانی دەمامکی بیردۆزە خەیاڵاوییەکان.

٣) هەروەها دەکرێ کۆمەڵناسی زانین بە توێژینەوەیەک لە سەر بایەخی پێکهاتەکانی ئەندێشە، بە سەرنجێکی تایبەت بە روونکردنەوەکانی ئەو ئەندێشانە، بزانرێ؛ روونکردنەوەیەک کە لە سۆنگەی کۆمەڵناسی زانین (نافەلسەفی و بە تەواوی ئەزموونی یان پازیتیڤی) و لە سەر بنەمای هەلو مەرجی (کۆمەڵایەتی) هاتنە دی ئەوانەوە ئامادە کرابێ. کۆمەڵناسی زانین هەرگا بەم چەشنە پێناسە بکرێ، دەبێتە بەشێکی دانەبڕاو لە سیستەمی

فەلسەفی ناسراو بە زانین‌ناسی. هەروەها ئەم سیستەمە فەلسەفییە ناچارە کە بە گوێرەی سەرمەشقەکانی مارکس و مانهایم، لە دادوەرییە رامیارییەکان خۆی ببوێرێ و سەر بۆ بنەما وردبینانە و ئەزموونییەکانی هەرچەشنە روانینێک نەوی بکات (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## کۆمەڵناسی شار / urban sociology

بە گشتی واتای شار بۆ باس لە سەر دیاردە کۆلتووری، کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان بە کار براوە. لە ژێر واتای «شاری»دا کومەڵناس لە گەڵ دیاردەگەلی جۆراوجۆر پێوەندی هەیە: تۆڕگەلی پێوەندی، خانووە تاکەکەسییەکان، جۆرێ مۆسیقا، لێژنە ناوچەییەکان، لادانی کۆمەلایەتی، دەرۆزەیی، هاتوچۆی شاری، شوێنگەلی چاوپێکەوتن و هتد. کۆمەڵناسی شار، بە واتای توێژینەوەی کۆمەڵناسانە لە سەر ئەم بابەتانەیە کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێ کرا و هەروەها هەندێ دیاردەی‌تر کە ناویان لێ‌نەبراوە.

دیاردەی شار، گۆی زەوی داگرتووە. لە کۆتاییەکانی هەشتاکاندا رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، رایگەیاند کە ٥٠% دانیشتوانی زەوی، شارنشینن. لە کاتێکدا لە ١٩٥٠دا ٣٣ لە سەدی دانیشتوانی زەوی شارنشین بوون. هەر لەم کاتەدا ژمارەی ئەو شارانەی کە زۆرتر لە یەک میلیۆن کەس دانیشتوویان بوو، نزیک بە ٢٥٠ شار بوو، کەچی لە ساڵی ١٩٠٠دا تەنیا ١٦ شار لە دونیادا پتر لە یەک میلیۆن کەس دانیشتوویان بوو؛ هەروەها لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا هیچ شارێک لە دونیا یەک میلیۆن کەس دانیشتووی نەبوو.

بۆ پێناسەی شار، پارامێتری جەماوەر، رەنگە شیاو بێ. لە کاتێکدا کە پێوەری جەماوەری شاری لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی‌تر جیاوازە: لە دانمارکدا هەر گوندێک کە ٢٥٠ کەس دانیشتووی بێ، بە شار دەژمێردرێ، لە

فەرانسەدا زۆرتر لە ۲۰۰۰ کەس، لە میسردا زۆرتر لە ۱۱۰۰۰ کەس، لە ژاپۆندا زۆرتر لە ۳۰۰۰۰ کەس. جیاوازی لە پێناسەی شاردا ڕەنگدانەوەیەکە لە ئاستی شارنشینی.

لە پێناسەی ئابووری شاردا یەکەم بیرێک کە دێتە کایەوە، جیاوازی دونیای شارە لە گەڵ دونیای لادێ یان گوند. لە شاردا جەماوەر، کاڵا و بنکەکان کۆمایان بەستووە، بەڵام لە گونددا بڵاون. بە بڕوای مارکس ناتەبایی شار-گوند ڕەنگدانەوەی ئابووری هەیە. پۆل بایرۆخی مێژووناس، دان بەم گوتانەی مارکسدا دەنێ و دەڵێ: بەدیهاتنی شارەکان ئەنجامی دابەش کردنی بەهای زیادەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵە. بەڵام شار وەکوو خوێنمژێکی ئابووری نییە. شار هۆکارێکە بۆ داهێنان، چونکە «بوارێکی شیاو بۆ بڵاو کردنەوە، بە پارەیی کردنی ئابووری و کۆمەڵگا، ڕاگرتنی هاوسەنگی نێوان دانان و داواکردنی هێزی کاری پسپۆڕ و شارەزا و هەروەها گەشەی بازاڕی بەرهەمەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی دەڕەخسێنێ» (فیالکوف، ۱۳۸۸).

## کۆنترۆڵە فەرمیە کۆمەڵایەتیەکان/ formal social controls

لە گرووپە یەکەمینەکان و جڤاکە سونەتییەکاندا، کۆنترۆڵە کۆمەڵایەتییەنافەرمییەکان، کەڵکی زۆریان هەیە و دەتوانن بۆ ڕێکوپێک کردن بەس بن. بەڵام بۆ ڕێکوپێک کردنی گرووپە دووەمینەکان و جڤاکە ئاڵۆزەکان، نیازێکی زۆرتر بە کۆنترۆڵە فەرمییەکۆمەڵایەتییەکان هەیە. کۆنترۆڵە فەرمییە کۆمەڵایەتییەکان، میکانیزمگەلی ڕێکخراو و تۆمار کراون کە بۆ بەرگری یا چاکسازی هەڵسوکەوتی لادەرانە کەڵکی لێدەگیرێ. شارەزایی و پسپۆڕی هەندێ لە ڕێکخراو و دامودەزگاکانی جڤاکە مۆدێرنەکان، لە کاری کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیدایە. ئەرکی پۆلیس، دادگا و

بەندیخانە ئەوەیە کە خەڵکی هان بدەن بۆ ڕێزگرتن لە یاسا و بەرگری لە لادان. دەروونناسان و پسپۆڕان لە بواری نەخۆشییە زەینی و دەروونییەکان بڕیار دەدەن کە ئایا تاکی تاوانبار کە لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان لایداوە، تووشیاری نەخۆشی زەینی و دەروونییە یا نە. ئەگەر دەروونناسێک بڕیار بە نەخۆشی تاکێکی لادەر بدات، بۆ دەرمان کردنی یەکێک لەم کارانە ئەنجام دەدرێ: دەروونمانی، داوو دەرمان، بە دەروونی کردن یاخۆ تێکەڵێک لەمانە. کۆنترۆڵە فەرمییە کۆمەڵایەتییەکانیتر لە نێو پێکهاتەی دامەزراوی کۆمەڵایەتیدا دانراون. بۆ وێنە لە کارخانەیەکدا بۆ ئەو کرێکارانەی کە بە ڕێکوپێکی کارەکانیان جێبەجێ دەکەن و ئاگەداری دیسیپلینی کارخانەن، بە پاداش و بەرز کردنی پلەی کار، ڕێزیان لێ دەگیرێ. بە پێچەوانە، ئەو کەسانەش کە لە نەزمی کارخانە لابدەن، تووشی سزادان دێن.

## کۆنترۆڵە نافەرمیە کۆمەڵایەتیەکان/ informal social controls

چاودێری نافەرمی کۆمەڵایەتی، زۆرتر لە گرووپە یەکەمینەکاندا دیارە و لە ڕاستیدا یەکێک لە ئەرکەکانی گرووپە یەکەمینەکانە. لە زۆربەی کاتەکاندا ئێمە ئەرکی چاودێری بە سەر هەڵسوکەوتی تاکەکان دەگرینە ئەستۆ؛ چونکە سەبارەت بەو تاکە تایبەتە، دەورێکی دیارو ئاشکرا دەگێڕین. ئێمە ژمارەیەکی زۆر لە میکانیزمەنافەرمییەکان بۆ کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیمان لە بەردەست دایە؛ وەکوو: قەشمەری کردن، پێکەنین، تیز و تانە لێ دان، دەنگۆ بلاوە کردن، دووری لێگرتن و هتد. چونکە تاک زۆری پێخۆشە کە لە لایەن گرووپەوە قەبووڵ بکرێ، ترس لەوەی کە گرووپ دووری لێبگرێ، بە یەکێک لە گرینگترین و کاریگەرترین هۆکارەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەزانرێ (کوئن؛ ١٣٨٧).

بەگشتی، کۆنترۆڵی نافەرمی کۆمەڵایەتی، بریتیە لە گوشارێکی نەرم و

زیرەکانە و نافەرمـی بـۆ سـازگاری تـاک لـە گـەڵ نـۆرم و پێـودان و بـەهـا کۆمەڵایەتییەکان. ئەم زەختانە بە رادەیەک لە گەڵ ژیانی رۆژانەمان تێکەڵن کە زۆریان سەرنج پێ نادەین. بزەی کەنین یا راتەکانی سەر بە مـەبـەسـتی پیشان‌دانی رەزامەندی، نوێنەری سەلماندنی کار یا قسەی ئێمەیە لە لایـەن کەس یا کەسانی‌ترەوە. گرژ کردنی ناوچاو، مۆڕ بردنەوە، یا بە ساردی دەست دان لە گەڵ کەسێک، نوێنەری ئەوەیە کە تاک نایەوێ پێوەندییەکـی نزیـک بەو کەسەوە بکات. بەکورتی هەر بـەو جـۆرەی کـە بـرووس کـوئێن گـوتی مکانیزمەنافەرمییەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی ئێجگـار زۆرن و ئێمـە بـەبـێ ئـەوەی کـە خۆمـان بـزانین، رۆژانـە بـۆ رەت کردنـەوە یـا سـەلمانـدنی هەڵس‌وکەوت یا پەیقی کەس یا کەسانێک کەڵکیان لێ‌وەردەگرین.

### کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی/ social control

زاراوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دوو واتای هەیە کە بە راشکاوی دەکرێ لە یەک جیابکرێنەوە:

١- کۆنترۆڵی کۆمـەڵایـەتی بریتیـە لـەوەی کـە تـاک بـەبۆنـەی کـار و کردەکانیەوە لەلایەن گرووپ یان کۆمەڵـگایەکـەوە کـە تێیـدا دەژی، دەبـێ بەگوێرەی هەندێ مەرج و سنوور کە بۆی رەچاو کراوە هەڵس‌وکەوت بکات. ئەم سنووردار و مەرجدار بوونی کارە، دەبێتە هۆی هێنانـە کایـەی هـەنـدێ ئەرکی ئاشکرا و پیوار بۆ گرووپ، کۆمەڵگا و خودی تاک.

٢- ئەم کۆنترۆڵە بریتیە لەوەی کە لە هەموو کارلێکە کۆمەڵایەتییەکانـدا، تا ئەو رادەی کە تاک کاری کەسانی‌تر مەرجدار یا سـنووردار دەکـات، یـاخۆ کارەکانی خۆی بەهۆی کەسانی‌تر، گرووپەکۆمەڵایـەتییـەکـان و ئـەو کـۆڕ و کۆمەڵانەی کە تاک ئەندامیانە یا نییە، مەرجدار و سنووردار دەکرێتەوە، ئـەو میکانیزمانەی کە دەبنە هۆی ئەم مەرجدار و سـنووردار کردنـە، بـەگـوێرەی

تایبەتمەندیگەلی کۆمەڵایەتین. ئەم مکانیزمانە کۆمەڵایەتین، چونکە هەر یەک بە چەشنێک پێویستی بە کردەی کەسانیتره: کەڵکوەرگرتن لە سزادان، پرۆسەی بەکۆمەڵایەتی کردن، بەدەروونی کردن، کەم و زیاد کردنی ئانقەستی سیمبۆلەکان و هتد. ئەم جۆره بەکارهێنانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیە ئەم پرسە کە ئەم کۆنترۆڵانە قازانج و ئامانجی چ کەسانێک دابین دەکەن، هەروا بێوەلام دێڵێتەوه.

لە بۆچوونێکی کۆمەڵناسیدا، زۆرتر پێداگری لە سەر یەکیەتی کۆمەڵایەتی و سیستەمگەلی هاوبەش دەکرێ. راس، کۆمەڵناسی ئەمریکی بەم چەشنە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی پێناسە دەکات: «جۆرێک دەسەڵاتداری کۆمەڵایەتی کە بە نیازی ئەنجامدانی ئەرکێکە بۆ ژیان و دەوامی کۆمەڵگا و ئەم ئەرکەش جێبەجێ دەکات». لە کاتی گەشەی کۆمەڵناسی لە ئەمریکادا، رابێرت پارک و بۆرگێس، پێناسەیەکی هاوچەشنی ئەم بۆچوونەی راسیان پێشکەش کرد: «سەرلەبەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان، لە ئەنجامدا هەمان کێشەیەکن کە بە هۆی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییەوە دێنە دی». ئەم بۆچوونە لەماوەیەکی زۆر کورتدا گەشەی سەند و لە زۆربەی بوارەکانی کۆمەڵناسی و دەروونناسیدا پەرەی سەند. بە چەشنێ کە هێربێرت مید، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بە هۆی بەدیهاتنی خود (self) دەزانێ؛ چونکە «تاک مەیل و هۆگری ئەندامانی گرووپێک کە لە گەڵ ئەو چالاکی دەکەن، دەسەلمێنێ و دانی پێدا دەنێ» (وولف؛ ١٩٦٤).

بەگشتی، هەر تاکێک لە نێوان پرۆسەی بەکۆمەڵایەتی بووندا فێر دەبێ کە لە هەر جێگایەکدا چ هەڵسوکەوتێکی پەسندکراوی لێ بوەشێتەوه. بەم چەشنە فێر دەبێ کە چلۆن دەبێ لە نێوان هەڵسوکەوتی گونجاو و نەگونجاودا جیاوازی دابنێ. لە راستیدا کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، درێژەی هەمان پرۆسەی بە کۆمەڵایەتی بوونە. کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بریتیە لەو

ئامراز و کەرەسانەی کە تاک هان دەدەن بۆ ئەوەی لە گەڵ نۆرم و میتۆدەکانی هەڵس‌وکەوتی کۆمەڵایەتیدا کە لە گەڵ چاوەڕوانییەکانی گرووپ یاخۆ سەرجەمی کۆمەڵگادا هاوسازی بێ، خۆی بگونجێنێ. هەڵس‌وکەوتی تاک لە گەڵ ئەو هەڵس‌وکەوتەی کۆمەڵگا کە لە تاکی چاوەڕوانی دەکات، دەبێ سازگار بێ (کوئن؛ ١٣٨٧).

### کۆمۆنیزم/ communism

کۆمۆنیزم بریتیە لە سیستەمێک بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و شێوازێکی بەرهەمهێنانە کە تێیدا خاوەنێتی تایبەتی تاکەکان بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا پووچەڵ کراوەتەوە و ئەو ئامرازانە هی سەرجەمی کۆمەڵگان.

کۆمۆنیزم لە زاراوەی لاتینی communis وەرگیراوە کە بە مانای «گشتی» و «هاوبەش»ە و لە فەلسەفەی رامیاریدا باس لە شوێنگەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات کە هەموو شت هی هەموو کەسە و هیچ کەس خاوەن شتێکی تایبەت بە خۆی نییە. شێوازێک لەم حکوومەتە لە یۆتۆپیای ئەفلاتووندا باسی لێکراوە، هەروەها ئەرەستوو لە کتێبی دووەمی *سیاسەت*دا رەخنەی لێ گرتووە (ارسطو؛ ١٣٨٦). لە شۆڕشی بریتانیا لە سەدەی حەڤدەهەم و شۆڕشی فەرانسە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا مەیلی رووناکبیران بە کۆمۆنیزم بە راشکاوی دیارە و بەناوبانگترین نموونەی کۆمۆنیزم لە لایەن فرانسۆ بابۆڤەوە باسی لێ‌کراوە. مارکسیش لە *بنەماڵەی پیرۆز*دا بابۆڤیزم بە سەر دەکاتەوە (احمدی؛ ١٣٨٥).

کۆمۆنیزم لە لای مارکس بریتیە لە پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕانە و روونکەرەوەی کۆمەڵگایەکی بێ‌چینایەتی کە تێیدا خاوەنێتی گشتی بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دیمۆکراسی بە واتای هێزی سەرجەمی خەڵکی. ئەمە ئەو هێزەیە کە لەنێو دەوڵەتدا نایەتە دی.

مارکس لە یەکەمین بەرهەمەکانیدا کۆمۆنیزم بە قۆناغی بگار و بە شوێنگەیەک دەزانێ کە دەبێتە هۆی نەمانی خاوەنێتی تایبەت. مارکس بۆ یەکەم جار بەرنامەی کۆمۆنیزم لە سێیەمین بەشی دەستنووسەکانی ١٨٤٤دا لەژێرناوی «خاوەنێتی تایبەت و کۆمۆنیزم» باس لێدەکات (مارکس؛ ١٣٨٧). لەوێدا مارکس پیشان دەدات کە دژایەتی نێوان کار و سەرمایە هەمان خاڵی بەرانبەری کۆمۆنیزم و خاوەنێتی تایبەتە بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا. واتای ئەم خاڵە ئەوە نییە کە لە هەر شوێنێکدا کە خاوەنێتی تایبەتی پێشکەوتوو یان بورژوازی نەبێ، ئەوە کۆمۆنیزم لەوێدا هەیە. بەڵکوو کاری بەرهەمهێنەران، کە مارکس بەناوی کاری کۆمەڵایەتی پێشکەوتوو ناوی لێدەبا، دەبێ بتوانێ هەلومەرجی چاکسازی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەناو ببات و پووچەڵی بکاتەوە. کۆمۆنیزم، بەناچار دەبێ لە خاوەنێتی تایبەتەوە تێپەڕێ. هەروەها کۆمۆنیزم تەنیا پووچەڵ و ڕەت کردنەوەی خاوەنێتی تایبەت نییە، بەڵکوو سەلماندنی خاوەنێتی گشتییە بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا (احمدی؛ ١٣٨٥).

## کۆمۆنیزمی سەرەتایی/ primitive communism

ئەم زاراوە ئاماژە دەکات بە شێوازێک لە ژیانی هاوبەش کە لە سەردەمێک لە مێژووی مرۆڤدا هەبووە؛ واتە ئەو سەردەمەی کە کۆمەڵگا لە هەموو شتێکدا هاوبەش بوو و هەموو شت هی هەموو کەس بوو و مەودای چینایەتی و چەوساندنەوە و توێژبەندی ئابووری سەری هەڵنەدابوو. ئەم زاراوە، کە ماوەیەکی دوور و درێژ لە لایەن ئەو کەسانەوە کە لە کۆمەڵگا نوێ و خاوەن توێژبەندییەکانەوە سەردانی ئەو جڤاکانەیان دەکرد، بایەتی باس و شرۆڤە و شیکردنەوەبوو و سەرەتا لە ساڵی ١٨٧٧دا لە لایەن لویس هێنری مۆرگانەوە بۆ تەوەر و باسی ئیسنۆگرافانە داهاتووە. مۆرگان لە کتێبی

*کۆمەڵگای کەونارا*دا، بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی لە ئیرۆکووی (iroquis) دەستی دا بە راڤە و لێکدانەوەی «ئازادی، بەرانبەری و برایەتی هۆزە کەوناراکان» (لی کاک؛ ١٩٩١). هەروەها لە خانووەکان و ژیانی خانووی خەڵکی رەمەکی ئەمریکا (١٨٨١)؛ ئەم بابەتەی راڤە کرد کە چلۆن «کۆمۆنیزم لە ژیاندا» لە نژیارڤانی گوندەکانی خەڵکی رەمەکی ئەمریکادا رەنگدانەوەی هەیە (هەمان سەرچاوە).

بەکورتی، کۆمۆنیزمی سەرەتایی بریتیە لە شێوازێک لە کۆمۆنیزم کە لە جڤاکە سەرەتاییەکاندا هەیە. لەم جڤاکانەدا هەموو سەرچاوە سەرەکییە ئابوورییەکان نە هی تاکن و نە هی خێزانن و نەهی هۆز و گرووپن، بەڵکوو هی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگان. بەواتایەکی‌تر خاوەنێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، خاوەنێتیەکی هاوبەشە.

## کۆیلەداری / slavery

کۆیلەداری شێوازێکی رادیکالی نابەرانبەریە کە هەندێ لە تاکەکان وەکوو سامانی کەسانی‌تر دەزاندرێن. هەل‌ومەرجی کۆیلەداری لە نێوان کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا جیاواز بووە. لە هەندێ شوێندا کۆیلەکان هیچ مافێکی یاساییان نەبووە -وەکوو ئەو بارودۆخەی لە ناوچە باشوورییەکانی ئەمریکادا بووە- کەچی لە هەندێ شوێندا زۆرتر وەکوو خزمەتکار سەیر کراون.

باتامۆر دەڵێ کۆیلەداری نوێنەری شێوازێکی رادیکاڵ لە نابەرانبەریە کە هەندێ لە تاکەکان بە تەواوی یان تا رادەیەک لە زۆربەی مافەرەواکان بێ‌بەش کراون (باتامور؛ ١٣٧٠). لە مەڕ چەندوچوونی هاتنە دی سیستەمی کۆیلەداریەوە راو بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە. هەندێ لە لێکۆڵەران نیاز بە بەهرە وەرگرتن لە هێزی کاری ئەسیرەکانی شەڕ، بە سەرەتای هاتنە دی کۆیلەداری دەزانن. بە گەشەسەندنی کشت‌وکاڵ و بەدیهاتنی سیستەمی

دەرەبەگایەتی و فیئۆدالیسم، هەروەها بە سەرنج دان بە دژواری کاری کشتوکاڵ، بەجێی کوشتنی بەدیل گیراوەکانی شەڕ، لە کاری کشتوکاڵدا بەهرەیان لە هێز و توانیان وەردەگرت. هەروەها چونکە هەندێ لەم کۆیلانە لەباری جەستەییەوە لێهاتوو و بەهێز بوون، لە کاری شەڕو جەنگیشدا کەڵکیان لێیان وەردەگرت. کۆیلە بە سامانی خێوەکەی دەزاندرا و دەیتوانی بیکرێ یان بیفرۆشێ. هێزی کۆیلە هەم لە کاروباری کشتوکاڵ و هەمیش لە مەیدانی شەڕ و کاروباری نێو ماڵدا وەکوو خزمەتکار بەهرەی لێ دەگیرا. کۆیلە بێجگە لە ئەرک هیچ مافێکی‌تری نەبوو.

بە گشتی دوو جۆرە کۆیلەداری هەبووە: ١) کۆیلەداری باوک سالار، لەم شێوازەدا کۆیلە لە چوارچێوەی کاری ناوماڵدا دەخرایە بەر کار و بەم پێیە، هەندێ جار خاوەن کۆیلە بۆ خۆشی لە گەڵ کۆیلەکەیدا خەریکی کاروبار دەبوو، ٢) کۆیلەداری کلاسیک، ئەم جۆرە دەکرێ بە تەکامولی کۆیلەداری باوک سالار بزانرێ و لەم شێوازەدا کۆیلە بۆ بەرهەمهێنانی کالا بەهرەی لێ دەگیرا(ملک؛ ١٣٨٣).

لە نێو کۆیلەکاندا هەندێکیان خوێندەوار بوون و بۆ کاری ئیداری و راگەیشتن بە حسێبی خێوەکانیان تەرخان دەکران. لە یوونانی کەونارادا کە کاری بازرگانی و تیجارەت بۆ گەورە پیاوان، بە سووکایەتی دەزانرا، کۆیلەکان کاری بازرگانیان بۆ خێوەکانیان ئەنجام دەدا و لەم سۆنگەوە هەندێ لە کۆیلەکان خۆیان زۆر دەوڵەمەند و ناودار بوون و تەنانەت خۆیان خاوەنی کۆیلەبوون (گیدنز؛ ١٣٨٥).

سیستەمی کۆیلەداری لە زۆربەی شوێنەکانی دونیادا بەرەو کزی رۆیشت تا ئەوەی کە بۆ جارێکی‌تر لە رۆژاوادا پاش دیتنەوەی بەڕی ئەمریکا و هێرشی کۆلۆنیالیستانە بۆ ولاتانی رۆژهەلات، سیستەمی کۆیلەداری و نیوەکۆیلەداری بۆ پشتگیری لە سەرمایەداری و زەویداری نوێ بووژایەوە. بە

تایبەت لە ئەمریکادا بە بۆنەی نەبوونی هێزی پێویست بۆ کار و زەوی و زاری زۆر و بێدانیشتوو، داگیرکەرە ئەوروپییەکان پەرەیەکی زۆریان بە سیستەمی کۆیلەداری دا.

پاش شەڕی ناوخۆی ئەمریکا لە ٦٥-١٨٦١، سیستەمی کۆیلەداری بە تەواوی قەدەغە کرا. لە بریتانیاشدا سالی ١٨٠٧ بە پێی یاسا، کۆیلەداری قەدەغە کرا، بەلام تا سالی ١٨٣٣ لە کۆلۆنییەکاندا بەردەوام بوو. لە فەرانسەشدا تا سالی ١٨٤٠ درێژەی هەبوو (ملک؛ ١٣٨٣).

کۆیلەداری —کڕین و فرۆشتنی کۆیلەلە ئەورووپا و ئەمریکادا لە سەد سالی لەمەو پێشەوە تا ئێستا قەدەغە کراوە و زۆر کەس پێیان وابوو کۆیلەداری بە تەواوی بڕاوەتەوە و بنەبڕ بووە، کەچی وانەبوو.

لە ولاتە عارەبییەکانی سوودان و مووریتانیدا هەنووکە ئەم سیستەمە درێژەی هەیە و بەردەوامە. لە مووریتانیدا سالی ١٩٨٠ کۆیلەداری قەدەغە کرا، بەلام هێشتا سزایەک بۆ کەسێک کە ئەم کارە بکات ڕەچاو نەکراوە و هان نەدراوە تا بەو کەسانەی کە خەریکی کۆیلەدارین رابگەینن کە کۆیلەداری دوایی هاتووە. بۆیە بە گوێرەی بۆچوونی *چاودێری ئەفریقا* هەنووکە زۆرتر لە ١٠٠.٠٠٠ کۆیلە لەم ولاتەدا هەیە. لە سووداندا بەرێوەبەری گرووپی ئەمریکایی *دژ بە کۆیلەداری*، دۆکتۆر چارلز جاکۆبز، لە راپۆرتێکدا رادەگەینێ کە «ئێوە دەتوانن لە خارتوومی پێتەختی سووداندا ژنێکی کۆیلە بە بایی ١٥ دۆلار بکڕن».

کۆیلەکان هەندێ جار لە ناوخۆی ولاتدا دەفرۆشرێن و بڕێ جاریش بە ولاتانی چاد، لیبی و ئەماراتی عارەبی دەفرۆشرێن. زۆرجار کۆیلەکان داخ دەکرێن و بە زۆر دەبێ بڕۆنە سەر ئایینی خێوەکانیان، گەر بەرەنگاری بکەن، بە توندی لێیان دەدرێ و گەریش بیانەوێ هەلبێن، دەخرێنە بەر ئازار و سزاوە. ئەم کۆیلانە یان وەکوو خزمەتکاری نێو مال یان لە نێو مەزراکاندا

کاری دژواریان پێ دەکرێ. سەتا سەتی کچەکان ئازاری سێکسی دەدرێن.

هەرچەند ئەم راپۆرتانەش دراون، رێبەرانی مافی مرۆڤ لە ئەمریکادا گوێی خۆیان لێی داخستووە (نولان و لنسکی؛ ١٣٨٣).

## کەرەسەگەل (ئامرازەکان)ی بەرهەمهێنان/ means of production

بە بڕوای مارکس ئامرازەکانی بەرهەمهێنان راستەوخۆ پێکهێنەری دژایەتین. ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بریتین لە سەرچاوەگەلێک وەکوو زەوی، کارخانەکان، ئاڵو وێر و ئەو هێزانەی کە لە بەشی بەرهەمهێنان و بلاوکردنەوە و خزمەتگوزاریدا دەوری سەرەکی دەگێڕن. بە بڕوای مارکس، هەر خولێکی مێژوویی خاوەنی شێوازی بەرهەمهێنانی تایبەت بە خۆیە کە دەبێتە هۆی ناکۆکی نێوان دوو چینی سەرەکی کۆمەڵگا (چەوسێنەر و چەوساوە). هەروەها دەڵێ، ناکۆکی چینایەتی ماتۆڕێکە کە خەڵکی لە خولێکی مێژووییەوە بۆ خولێکیتر رێنوێنی دەکات.

داهاتنی مەکینەگەلی پیشەسازی- وەکوو ئامرازی بەرهەمهێنان- بوو بە هۆی بەدیهاتنی دوو چینی کۆمەلایەتی جیاواز، واتە: بورژوازی (خاوەنانی ئامرازگەلی بەرهەمهێنان) و پرۆلتاریا (کەسانێک کە هێزی کاریان بە چینی بورژوا دەفرۆشن). هۆی ناکۆکی نێوان دوو چینی چەوسێنەر و چەوساوەش لە دوانگەی مارکسییەوە، هەمان خاوەنێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە. کرێکاران کە تەنیا خاوەنی هێزی جەستەیی خۆیانن، لە راستیشدا خاوەنانی راستەقینەی بەرهەمەکانن؛ بەلام چونکە سەرمایەدارەکان خاوەنانی ئامرازەکانن، کرێکاران هیچ کەڵکێک لە بەرهەمەکانیان نابەن و ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانکاری کۆمەڵگا؛ واتە گواستنەوە لە قۆناغی سەرمایەدارییەوە بۆ کۆمۆنیستی. هەروەها دەتوانین ئەوەش بلێین کە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەبنە هۆی گۆڕانکاری

کۆمەڵگاکان.

## کەمینەئیرادییەکان / voluntary minorities

ئەم زاراوە ئاماژە بەو گرووپە نەتەوەیی یان هۆزییانە دەکات کە بە گوێرەی ویستی خۆیان بۆ وڵاتێکی‌تر کۆچیان کردووە و چاوەڕوانـن کـە لـە شـوێنی نوێدا باری ژینیان باشتر و لەبارتر بێ.

## کەمینەکان/ minorities

زاراوەی کەمینەکان زۆرجار بە چەشنێکی هاوواتا لە گەڵ گرووپی هـۆزی، رەگەزی و ئایینی کەڵکی لێ دەگیرێ. وادیارە گـەر رق و قینێـک لـە نـاودا نەبێ لە زاراوەی هۆزەکان کەڵک دەگیرێ و گەریش رق و قین لە نـاودا بـوو دەڵێن کەمینەکان. هەردووکـی ئـەم زاراوانـە تایبـەتمـەندیگـەلی فیزیـایی، ئایینی، رەگەزی و کولتووری دەگرنەوە (گولد؛ ١٣٨٤).

بە هۆی پێناسەگەلی جۆراوجۆر کە لەم زاراوەیە کراوە، لێڵی و ئاڵۆزییەک لە ناساندنی ئەم تاقمەدا هاتۆتەدی. ئـەم پێناسـانە بـریتین لـە بـەرفـراوانی ئاماری و ژمـارەیـی، دابـەش بـوونی دەسـەڵات (کۆمـەڵایـەتی و رامیـاری)، هاوشـێوازی لــە بــاری جــەســتەو کولتــوور و هــەروەهــا رەوت و ئاکــار و هەڵس‌وکەوت. زۆربەی کۆمەڵناسان رایان ئەوەیە کە نابێ بۆ پێناسـەی ئـەم زاراوەیە لە پێوەری ئامار و ژمـارە بـەهـرە بگـیرێ. گیـدێنز دەڵـێ: زاراوەی کەمینەکان بە زۆری لە کۆمەڵناسیدا کەڵکی لـێ دەگـیرێ، کـەچـی واتـای بەفراوانتر تەنیا واتایەکی ئامارییە. لە باری ئامارییەوە کەمینـەی زۆر هـەیـە، وەکوو کەسانێک کە موویان سوورە یان پتر لە سـەد کیلـوو قورسـن، بـەڵام ئەمانە لە کۆمەڵناسیدا کەمینەیان پێ ناڵێن. ئـەنـدامانی گرووپـی کـەمینـە دەبێ خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە بن: ١- ئەندامانی ئەم گرووپانە چونکە لـە

لایەن کۆمەڵگاوە دەکەونە بەر دووچاوەکی (تبعیض)، لە بارودۆخێکی ناڵەباردان؛ ٢- ئەندامانی گرووپی کەمینە جۆرێک یەکگرتوویی گرووپی تایبەتیان لە ناودا هەیە؛ ٣- گرووپی کەمینە تا رادەیەک لە باری فیزیکی و کۆمەڵایەتییەوە لە کۆمەڵگای گەورەتر جیاوازن. کەمینەکان زۆرتر لە نێو گرووپی خۆیاندا ژن و ژنخوازیان هەیە، کەمتر لە گەڵ گرووپی زۆرینەدا ژن و ژنخوازیان هەیە، زۆرتر لە بەشێکی تایبەتی وڵات یان شاردا دەژین (گیدنز، ١٩٨٩).

پێناسەی کلاسیکی کەمینەکان هەمان پێناسەی ل.ڤۆرتە کە دەیگوت: کەمینە گرووپێک لە خەڵکی نێو کۆمەڵگایەکن کە بە بۆنەی تایبەتمەندیگەلی جەستەیی یان کولتوورییەوە لە لایەن ئەندامانیترەوە نابەرانبەرییان لە گەڵ دەکرێ و بەم بۆنەوە لە خەڵکیتر دادەبڕێن. ئەم کەسانە هەست بەوە دەکەن کە بە کۆمەڵ خراونەتە بەر دووچاوەکی و لە بەشداری لە ژیانی کۆمەڵگا کلا دەبن. سی.ب.رۆز بە دان نان بەم راستییەدا کە ژمارە و ئامار لە پێناسەی کەمینەکاندا دەوریان نییە، دەڵێ: رق و قینی تاقمێک لە کۆمەڵگا یان کۆمەڵگا لە تاقم و گرووپێکی تایبەت، بە بۆنەی جۆری ئایین یان رەچەڵەک، یاخۆ هەر تایبەتمەندییەکیتر، شتێکە کە دەتوانێ ببێتە پێناسە بۆ کەمینەکان (گولد، ١٣٨٤).

### کەمینە نائیرادییەکان / involuntary minorities

بە گوێرەی ئەو بەڵگانە کەوتوونەتە دەست، لە نزیک بە پێنج هەزار ساڵی لەمەو پێشەوە، جۆرگەلێک لە کۆمەڵگا، سەرەتا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پاشان لە شوێنەکانیتر هاتنە دی کە لە گەڵ جڤاکە سەرەتاییەکان زۆر جیاواز بوون. ئەم جڤاکە نوێیانە بە ئاوەژووی جڤاکە سەرەتاییەکان، خاوەنی چین و توێژی جۆراوجۆر بوون. لە نێو ئەم چین و توێژانەدا، چینی کۆیلە لە

هەموویـان زەقتـر و بـەرچـاوترە. سیسـتەمـی کۆیلـەداری لـە یـەکـەمـین سیستەمگەلی چینایەتییە کە مرۆڤ دایهێنـاوە و لـە سـەر چـەوسـاندنەوەی تاقمێ لە مرۆڤەکانیتر دارێژراوە. یەکەمین هۆی هاتنە دی ئەم سیستەمە لە رۆژگاری کەونارارادا ئەو یەخسـیرو دیلانـە بـوون کـە لـە شـەڕدا دەگـیران. مرۆڤەکان تێگەیشتن کە بە جێی کوشـتنی ئـەم دیلانـە دەتـوانن کـەڵکی زۆریان لێ بگرن.

سیستەمی کۆیلەداری کەونارا بە هۆی دابەزیـنی لێهـاتوویی ئابووریـەوە و سەرهەڵدانی خەباتی دژ بە کۆیلەداری (وەکوو شۆڕشی کۆیلەکانی سیسیل و هەروەها شۆڕشی سپارتاکووس) رووی لە کزی نا و لە زۆربـەی شـوێنەکـانی دونیادا لێک هەڵوەشـا؛ لـە ئاتینـدا بـە بۆنـەی قـەرزداری زۆرەوە لـە لایـەن سولۆنەوە قەدەغە کرا و لە رۆمیشدا کاریگەری رەواقییـەکـان بـوو بـە هـۆی قەدەغە کردنی کڕین و فرۆتنی کۆیلەکان (باتامۆر؛ ١٣٧٠).

بەڵام پاش دیتنەوەی ئەمریکـا، جـارێکیتـر سیسـتەمـی کۆیلـەداری بـۆ پشتگری لە سیستەمی سەرمایـەداری سـەری هـەڵـدا. رەش پێسـتەکـانی ئەفریقا بە گەمیە دەهێنرانـە ئـەمریکـا و بـۆ کـار لـە کانگـا و بـاخ و زەوی و زارەکان دەفرۆشران. پاش هەڵوەشانی سیستەمی کۆیلەداری لە ١٧٩٠، ئـەو رەش پێسـتانەی کـە بـە زۆر بـۆ ئـەمریکـا کـۆچ درابـوون بوونـە کـەمینـە، کەمینەیەک کە بە پێچەوانەی ویستی خۆیان هاتبوون. هەروەهـا خـەڵکی خۆماڵی ئەمریکا کە بریتی بوون لە سوورپێستەکان و مەکزیکییەکان، بوونـە کەمینەیەکی نائیرادی (ملک؛ ١٣٨٧). ئەم کەمینانە بـە ئـاوەژووی کـەمینـە ئیرادییەکان کە بۆ چاکتر بوونی بارودۆخی ژیانیان کۆچ دەکـەن، چـاوەڕوانی چاکتر بوونی ژیانیان نین.

## گرووپبەندی لێهاتووییەکان / ability grouping

گرووپبەندی قوتابیانی سەرەتایی لە گرووپە فێرکارییەکاندا، بە گوێرەی ئەو وێکچوونە وانەییانەوە کە لە لایەن خۆیانەوە پیشان دراوە، یاخۆ لە رێی ئەو نومرانەیە کە لە ئەزموونەپێوەرەکاندا وەریدەگرن. لە زۆربەی قوتابخانەسەرەتاییەکانی ولاتە پێشکەوتووەکاندا بەم کارە دەڵێن گرووپبەندی لێهاتووییەکان. لە قوتابخانە ناوەندی و دواناوەندییەکاندا پێی دەڵێن شوێنگیری (tracking). لە ئاوەها سیستەمێکدا تەنانەت قوتابیانی نێو پۆلێکیش دەتوانن بە گرووپی لێکجیاواز دابەش بکرێن. ئەم گرووپبەندییە بە گوێرەی لێهاتووییەکانی قوتابی لە بابەتگەلی جیاوازی وانەییدا (وەکوو حیساب، زمان و ...) ئەنجام دەگرێ. ئەو بیرۆکەی کە لە پشتی «گرووپبەندی لێهاتووییەکان» یا «شوێنگیری»دا بەرپیوارە، بریتیە لە:

١- ئەو قوتابیانەی کە ئاستی لێهاتووییان وەکوو یەکە و دەرۆنە نێو گرووپێکەوە، باشتر و زۆرتر رادێن و فێر دەبن. لە ئاوەها هەلومەرجێکدا ئەو قوتابیانەی کە لێهاتووییان زۆرتر بە بۆنەی ئەوانەوە کە توانیان کەمترە، بەجێ نامێنن و لە پێشکەوتنیان بەرگری ناکرێ. مامۆستایان کات و سەرنجێکی زۆرتر بۆ قوتابیانی کەمتر لێهاتوو تەرخان دەکەن.

٢-ئەو قوتابیانەی کە کەمتر لێهاتوون، ناچار نین لە گەڵ قوتابیانی لێهاتوودا رکەبەری بکەن. بەم بۆنەوە ئەنگیزەیەکی زۆرتریان بۆ پیشان دانی توانایيەکانی خۆیان هەیە.

٣- بۆ مامۆستایانیش باشتر وایە کە بەقوتابیانێک وانە بڵێن کە ئاست و رادەی لێهاتووییان وەکوو یەکە. دەبێ ئەوەمان لە بەر چاو بێ کە ئەنجام و ئاکامی کردەیی ئەم جیاکردنەوانە لە کاری پەروەردەدا لە هەر کۆمەڵگایەکدا جیاوازە. بەم بۆنەوە بەرنامەدارێژانی پەروەردە کە بە نیازن لە «گرووپبەندی

لێهاتووییەکان» بەهرە وەربگرن، دەبێ بەرلە هەستان بەم کارە، کۆمەڵەی ئاماری خۆیان بخەنەبەر لێکدانەوە و وردبوونەوەی کۆمەڵناسانەوە و بە گوێرەی تایبەتمەندییەزەقەکانی ئەو کۆمەڵگایە هەستن بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە (عضدانلو، ۱۳۸۴).

## گرووپی پێگە/ status group

هەرچەند مارکس بە وردی ژمارەی چینەکۆمەلایەتییەکانی دیاری نەکرد، بەلام بە راشکاوی ئاماژەی بەم خاڵە کرد کە بناغەی چینی کۆمەلایەتی تاک، لە سەر پێوەندیەک دامەزراوە کە تاک لە گەڵ ئامرازەکانی بەرهەمهێنان هەیەتی. ماکس ڤیبێریش بە راشکاوی باسێک لە ژمارەی چینە کۆمەلایەتییەکان ناکات، بەلام لە لای ئەو، بناغەی چینی کۆمەلایەتی لە سەر ناوەندگەلی دان و ستان (معامله) دامەزراوە. بەڕای ئەو، شوێنگەی کۆمەلایەتی لە ئەنجامدا هەمان شوێنگەی بازاڕە. بنەمای ئاوەها شوێنگەیەک لە سەر ئەو بەختانەی دامەزراوە کە تاک بۆ بەدەستهێنانی کالا و خزمەتگوزاری و کاری پڕداهات و هاتنەدی ویستە تایبەتەکانی هەیەتی.

بەبڕوای ڤیبێر، شوێنگەی چینایەتی تاکەکان بەستراوە بە توانی خۆنواندن (نواندنی لێهاتوویی کاری و تاکەکەسی)، دەسڕاگەیشتن بە کالا و خزمەتگوزارییەکان، کۆنترۆڵ بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و توان بۆ سەرمایەدانان لە سەر زەوی و کشتوکالی سەرچاوەکانی تری داهات. پۆلێنی چینایەتی تاکەکان زۆر ئاڵۆز و پڕگرفنچکە، چونکە گرووپی پێگەی جۆراوجۆر -کە ژمارەیان زۆرە- ئەم ئاڵۆزیەیان هێناوەتە ئاراوە. ئەو گرووپی پێگە بە ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکان دەزانی کە شێوازی ژیان، خوێندنی بالا، ڕێزی کۆمەلایەتی و رابردووی باب و کالان دەیانبەستێتە یەکەوە (کوزر؛ ۱۳۷۰). ئەم پێناسە ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ کە سامان، داهات و شوێنگە،

تـەنیـا هۆکـاری دیاریکـەری گرووپـی پێگـەی تاکـەکـان نـین. شـوێنگەی چینایەتی ئەفسەرێکی پۆلیس، کارمەندێکی دەوڵەت یا خوێندکارێک ڕەنگـە بەگوێرەی ڕادەی سامانێکەوە کە هەیانە جیاواز بێ، بەڵام ئەمە نابێتـە هـۆی ئەوەی کە پێگەی کۆمەڵایەتیشیان جیـاواز بـێ؛ چونکـە شـێوازی ڕاهـاتن و پەروەدەیان دەتوانێ ببێتە هۆی بەدیهاتنی ژیانێکی هاوچەشـن بۆیـان (وبـر؛ ١٣٨٢).

## گرووپی دووەمین/ secondary group

بە پێچەوانەی گرووپی یەکەمین، گرووپی دووەمین گرووپێکـی گـەورە و ناتایبەت و بەدوور لە هەسـتە و ئـەنـدامانی ئـەو گرووپـە دۆز و ئامـانجێکی تایبەت و ئاشـکرایان هـەیـە. پێـوەنـدی نێـوان ئـەنـدامانی ئـەم گرووپانـە، سنووردارە و هۆی پێوەندییەکەیان ئاشکرایە. هۆی پێکهاتنی ئـەم گرووپانـە گەیشتن بە دۆزێکی تایبەتە. بەواتایـەکـی‌تـر، ئـەم گرووپانـە ئـامرازێکن بـۆ گەیشتن بە ئامانجێک، بەڵام بـەدیهـاتنی خۆیـان ناتوانـێ ئامانجێـک بێـت (بەپێچەوانەی گرووپە یەکەمینەکان). پێوەری هەڵسـەنگانـدن و نرخانـدنی تاکەکان لەم گرووپانەدا، کەسایەتییان نییە، بەڵکوو ئەو کارەیە کە دەتوانن بۆ گرووپی بە ئەنجام بگەینن. پێوەندی ئاخاوتنی نێوان تاکەکانی ئەم گرووپانە، زۆر کورت و بەڕێزو حورمەتەو بابـەتـەکـەشـی زۆرتـر ئـەو کـارەیـە کـە لـە ئەستۆیاندایە. لە زۆر ڕەهەندەوە تایبەتمەندییەکانی گرووپـی دووەمـین، زۆر جیاوازە لە گەڵ تایبەیبەتمـەنـدی گرووپـی یـەکـەمـین. پێـوەنـدی نێـوان ئەندامانی گرووپی دووەمین، بـەدوور لـە هـەسـت و سـۆزە، یـاخۆ سـۆز لـە پێوەندییەکاندا زۆر لاوازە. ئەنـدامانی ئـەم گرووپانـە سـەبـارەت بـە یـەکتـر زانیارییەکی زۆر کەمیان هەیە. ئەم گرووپانـە لـەبـاری دەوام و مانـەوەدا زۆر لێک جیاوازن، بەڵام زۆربەیان تەمەنیان کەمە. سەرهەڵدان و ڕووخـانی ئـەم

گرووپانە بۆ ئەندامەکانی زۆر گرینگ نییە. بۆ وێنە ئەو خوێندکارانەی لە کورسێکدا پێکەوەن، گرووپێکی دووەمینیان پێکهێناوە؛ زۆربەی ئەم خوێندکارانە رەنگە پاش کورسەکەیان یەکتر نەبینن و هیچ پێوەندییەکیان پێکەوە نەبێ. لە گرووپە دووەمینەکاندا ئەمەگداری و سۆز زۆر لاوازە، چونکە بۆ گەیشتن بە دۆزێکی کەمخایەن و سنووردار لە دەوری یەک کۆوە دەبن و وەکوو ئامرازێکی کاتی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان سەیری یەکتر دەکەن.

## گرووپی سەرەتایی/ primary group

ئەم زاراوە، داهێنانی چارلز هۆرتۆن کوولی، کۆمەڵناسی ئەمریکییە. بەڕای ئەو گرووپی سەرەتایی، گرووپێکی کۆمەلایەتی بچووکە و پێوەندییەکی زۆر نزیک و سۆزدار و بەردەوام لەنێو ئەندامانیدایە. ئەندامانی ئەم گرووپانە ماوەیەکی زۆر بۆ پێکەوە بوون تەرخان دەکەن، پێکەوە خەریکی کاروباری کۆمەلایەتی هاوبەش دەبن و پێیان وایە کە بەباشی یەکتر دەناسن. ئەندامانی ئەم گرووپانە زۆرجار نیگەران و پەشێوی بارودۆخی ئابووری و کۆمەلایەتی یەکتری دەبن و هان دەدەن کە کێشەکانی یەکتری چارەسەر بکەن. خێزان لە هەموو جڤاکێکدا بە گرینگترین گرووپی سەرەتایی دەزانرێ. کوولی بۆیە ئەم گرووپە بە گرووپی یەکەمین ناودەبا چونکە ئێمە یەکەمین گرووپێک کە لە ژیاندا تاقی دەکەینەوە و تێیدا گەورە دەبین، گرووپی خێزانە. هەروەها ئەم گرووپە و گرووپی هاوالان یەکەمین گرووپن لە ژیاندا کە ئێمە فێری بەکۆمەلایەتی بوون دەکەن و لە پەروەردەماندا دەوری سەرەکی دەگێرن. پێوەندی نێوان ئەندامانی گرووپی سەرەتایی دەبێتە هۆی هێمنایەتی و ئاسوودەگی و دلەڕاوکێ و خەم و پەژارەنامێنێ. دەبێ ئەم خالەشمان لەبەر چاو بێ کە هەموو کات هۆی یەکیەتی و یەکگرتوویی ئەندامانی گروپی یەکەمین خۆشەویستی و هۆگری یەکتری

نییە، رەنگە هەندێ جار رق و قین لە گرووپێکی‌تر ببێتە هۆی یەکیەتی و یەکگرتوویی ئەم ئەندامانە. بەلام لە هەردوو هەلومەرجدا، ئەو یەکگرتوویییە لە سەر سۆز و هەست بنیات نراوە. رەنگە تاکێک قەد نەتوانێ بگاتە ئامانجی، بەلام هەروا دلی لە گرۆی ئەو ئامانجەیدا بێ. بەم بۆنەوە، گرووپی یەکەمین ئامرازێکی سەرەکی و بنەمایی و پێویستە بۆ گەیشتن بە ئامانجە تاکەکەسییەکان و سروشتی کۆمەلایەتی (گیدنز، ١٣٨٥؛ کوئن، ١٣٨٧).

## گریمانە/ hypothesis

مەبەست لەم واتایە، دەستوورێکی نەچەسپێندراوی پێوەندی نێوان بگۆرەکانە. یەواتایەکی‌تر، گریمانە بریتیە لە گومانێک سەبارەت بە چۆنییەتی دیاردەیەک، هەلس‌وکەوت یاخۆ پێوەندی نێوان هۆ و بەرهۆیەک(علت و معلول) کە دەکرێ دیسان تاقی بکرێتەوە. بۆ وێنە، رەنگە تۆژەرێک وابزانێ کە وت‌ووێژە تەلەفزیۆنییەکانی کاندیدەکانی سەرۆک کۆماری دەورێکی گرینگیان لە بریاردانی خەلکێک کە هەنووکە بریاری خۆیان نەداوە، بۆ هەلبژاردنی هەر یەک لە کاندیدەکان هەیە. لەم گریمانەدا وت‌ووێژی تەلەفزیۆنی بگۆری سەربەخۆیە، واتە بە هۆکارێک دەزانرێ کە دەتوانێ ببێتە هۆی گۆران؛ هەروەها بریاری بینەرانی تەلەفزیۆن بۆ دەنگدان بە کاندیداتۆرەکان، بگۆری بەندیوارە، واتە هۆکارێکە کە وەکوو بەرهۆ(علت) یا ئاکامی دەنگدانەکە سەیری دەکرێ.

لە تۆژینەوەئەزموونییەکاندا، گریمانە بیرو بۆچوونێکە سەبارەت بە تایبەتمەندی ئەو بەش یا توخمانەی کە لە مەلبەندی تۆژینەوەکەدان. راست و ناراست بوونی گریمانە بەستراوە بەوەی کە ئەو بەشانەکە باسیان لە سەر کراوە، دارای هەمان تایبەتمەندین یا نە.

## گشتگیری کولتووری (چاندە گشتییەکان)/ cultural universals

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی توێژینەوەی نێوان کولتوورەکان، دیتنەوەی ئەو تایبەتمەندییە کولتوورییە هاوبەشانەیە کە لە کولتوورە جیاوازەکاندا هەیە. گشتگیری کولتووری بە واتای بەها، پێودان، باوەڕ و هەڵسوکەوتە یەکسانەکانە کە لە نێوان هەموو کولتوورەکاندا دیارە. ڕێبێکا مۆرلی، کۆمەڵناسی بریتانی، لە توێژینەوە ئێسنۆگرافییەکانی خۆیدا بەم ئەنجامە گەیشت کە کێشەی زاڵبوونی پیاوان بە سەر ژناندا تەنیا تایبەت بە چاندێکی تایبەت، وەکوو «سەرەتایی»، پیشەسازی، ئەورووپی یان ئەفریقی نییە؛ بەڵکوو ئەم تایبەتمەندییە لە هەموو کولتوورەکاندا بە راشکاوی دیارە. هەروەها لە توێژینەوەکانی خۆیدا تێگەیشت کە نایەکسانی ژن و پیاو دیاردەیەکی گشتگیرە (عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

## گواستنەوەی کولتووری / cultural transmission

ئەم زاراوە ئەو پرۆسەیە دەگرێتەوە کە کولتووری کۆمابوو بە شێوازی فەرمی و نافەرمی لە ڕێی پەروەردەوە لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی‌تر رادەگوێزێتەوە. بە واتایەکی‌تر رەوتگەلی کار، بیرکردنەوە و هەستەکانی هەرتاکێک، میراتێکە کە لە پێشوونانیەوە بۆی ماوەتەوە.

## گۆڕانە مەزنەکان / great changes

سی ڕایت میلز لە کتێبی *سەرچاوەکانی دەسەلاتی کۆمەلایەتی*دا (۱۹۷۳) ئەم زاراوەیەی هێناوە و مەبەستی ئەو کارەسات و رووداوە گرینگ و مەزنانەیە کە لە مێژووی مرۆڤدا هاتۆتە دی و خەلکی رەمەکی هیچ تىوانی بەرەنگاری و چارەسەری ئەو گۆڕانەیان نییە، کەچی گۆڕانێکی گرینگ لە ژیانیاندا دێنێتە دی. بەبڕوای میلز، هۆی ئەم گۆڕانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو

بڕیارانەی کە بژاردە دەسەلاتدارەکانی کۆمەڵگا داویانە.

### گۆڕانی کۆمەڵایەتی / social change

پێشکەوتن و گەشەی کۆمەڵایەتی، بەرانبەرە لە گەڵ گۆڕانی کۆمەڵایەتی. بەلام خودی گۆڕانی کۆمەڵایەتی، وەکوو زۆربەی زاراوەکانی‌تری زانستە کۆمەڵایەتییەکان، بە چەشنی جۆراوجۆر پێناسە کراون. بۆچوونە ئایدیۆلۆژیکی و پارادایمی و هزریەکان و هەروەها ئاستی لێکدانەوەیەک کە هەریەک لە کۆمەڵناسان بۆ ئەم زاراوەیە رایان ناوە، کاریگەری زۆریان بەسەر رەوتی ئەم واتایەدا بووە. بۆ وێنە: ویلبێرت موور، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە گۆڕانی شێوازەکانی هەڵس‌وکەوت کە بریتین لە نۆرم و بەهاکان، پێناسە دەکا (غفاری؛ ١٣٨٨). بەڕای گیدێنز، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتیە لە گۆڕانی دامەزراوە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا لە ماوەیەکی دیاریکراودا (گیدنز؛ ١٣٨٥). گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتیە لە گۆڕانێکی ئاشکرا لە ماوەیەکی دیاردا کە کاتی و کەم ماوە نەبێ و بە سەر پێکهاتەی رێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایەکدا کاریگەری هەبێ و رەوتی مێژوویی ئەو رێکخراوە بگۆڕێ (روشە؛ ١٣٨٧). گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەندێ جار لە گەڵ گەشەی کۆمەڵایەتی و برێ جار لە بەرانبەریدا هاتووە.

زێتوومکا دەڵێ: گەر ئێمە سەرنج بدەینە ئەو پێناسانەی کە لە پەرتووکەکانی کۆمەڵناسیدا سەبارەت بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی هاتوون، دەبینین کە هەر نووسەرێک، پێناسەیەکی جیاوازی داهێناوە. بەلام زۆربەیان جەخت لە سەر «گۆڕانی پێکهاتەیی» و شێوازی پێوەندی نێوان بەشە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا دەکەن. هەروەها ئاماژە دەکات بە چەن پێناسەیەک کە چەن بیرمەندی کۆمەڵناسی رایان‌ناوە:

مەک یوونیس، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە ئاڵو گۆڕ لە رێکخراوی کۆمەڵگا و

شێوازی بیرو هەڵس‌وکەوت لە کاتێکی دیاریکراودا دەزانێ. پێرسێل، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە چاکسازی یان گۆڕان لە کۆمەڵگادا بە شێوازێکی ڕێکخراو پێناسە دەکات. ریتزێر و هاواکارانی، گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە گۆڕانی پێوەندی نێوان تاک، گرووپ، ڕێکخراو، کولتوور و کۆمەڵگاکان لە درێژایی مێژوودا دەزانن (غفاری؛ ١٣٨٨).

لەو دەمەوە کە کومەڵناسی وەکوو زانستێک هاتۆتە دی، هەموو کۆمەڵناسان دانیان بەم ڕاستییەدا ناوە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە ڕێژەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی‌تر بایەخ و گرینگییەکی زۆرتری هەیە، بەڵام تەنیا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە کەوتۆتە بەر سەرنجی ڕاستەوخۆی کۆمەڵناسان. ئاگۆست کۆنت بۆ یەکەم جار کۆمەڵناسی بە دوو پاژ دابەش کرد: کۆمەڵناسی ستاتیک، کۆمەڵناسی داینامیک. کۆمەڵناسی ستاتیک باس لە سەر نەزمی نێو کۆمەڵگا دەکات؛ واتە شێواز و پێوەرێک کە تاکەکان بۆ دانانی نەزم و یەکگرتوویەک لە نێوان خۆیاندا بەهرەی لێوەردەگرن؛ یەکگرتوویەک کە دەبێتە دەستەبەری مانەوەو بەردەوامی ئەو کومەڵگایە. بە پێچەوانەی کۆمەڵناسی ستاتیک، کۆمەڵناسی داینامیک باس لە سەر پێشکەوتن و گەشەی کۆمەڵگا دەکات؛ واتە توێژینەوە لە سەر گەشەی کۆمەڵگاکان، سەرتر لە مێژووی مرۆڤ (روشە؛ ١٣٨٧).

کەواتە کۆمەڵناسی ستاتیک لە سەر سەقام و نەزمی کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە و کۆمەڵناسی داینامیک لە سەر گۆڕانی کۆمەڵگاکان لە درێژایی مێژوویاندا. کۆنت گەشەی هزری مرۆڤی وەکوو ڕەوتی تەکامولی دەزانی و باوەڕی وابوو کە ئەم تەواوتر بوونە، بناغەی لە سەر سێ یاسای تەکامولدا دانراوە. بە واتایەکی‌تر، گەشەی کۆمەڵگای بە گوێرەی تەکامولی هزر و ئەندیشە زانیوە و بۆچوونێکی ئایدیالیستی سەبارەت بە گەشەی کۆمەڵایەتی بووە. بەم

بۆنەوە، دەگاتە ئەم دەرئەنجامەی کە قۆناغەکانی گەشەی مێژووی مرۆڤ، دەبێ لە گەڵ قۆناغەکانی گەشەی هزری مرۆڤدا یەکسان بن.

بەڕای کۆزێر، هەرچەند کۆنت زۆرتر جەختی لە سەر قۆناغەکانی گەشەو دەربازبوونی هزری مرۆڤ دەکرد، بەڵام لە سەر ئەم خاڵەش پێداگری دەکرد کە هاوڕێ لە گەڵ ئەم قۆناغانەی گۆڕان، ڕێکخراوە و یەکە کۆمەڵایەتییەکان و بارودۆخی مادی ژیانی مرۆڤیش تووشی گۆڕان دێ. کۆنت ڕای وابوو کە نابێ چاوەڕوان بین کە کاتی مردنی سیستەمێک، ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی و هزریدیکە سەرهەڵبێنێ. بوار لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتیەوە بۆ سیستەمێکیتر، قەد ناتوانێ بەردەوام و ڕاستەوخۆ بێ. لە ڕاستیدا مێژووی مرۆڤ بە قۆناغگەلێکی ئۆرگانیک و قەیرانی دیاری دەکرێن. لە سەردەمی ئۆرگانیکدا، سەقامی کۆمەڵایەتی و هاوڕایی هزری بەردەوامە و بەشە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە هاوسەنگیدان. بە پێچەوانە، لە سەردەمی قەیراندا بنەماکانی بڕوای کۆن، سست و لاوازن و سوننەتەکان بێبەها دەبن و ژیانی کۆمەڵایەتی توشی نایەکسانی دەبێ (کوزر؛ ١٣٧٠).

کۆنت لە مەعریفە و بیری مرۆڤدا بۆ گەشەو تەکاموڵی کۆمەڵایەتی دەگەڕا؛ بەڵام مارکس بە پێچەوانەی ئەوە، لە چۆنییەتی پێوەندییەکانی بەرهەمهێناندا بۆی دەگەڕا و پێی وابوو کە هەر خول و چاخێک، خاوەنی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی تایبەت بە خۆیە. پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان، پێکهێنەری پێوەندی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتین و لە ناخی ئەم پێوەندییانەوە ململانێ و ناتەبایی سەرهەڵدەدەن. لە هەر شێوازێکی بەرهەمهێناندا پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان، پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان ئاسان دەکەنەوە؛ بەڵام هەر ئەم پێوەندییانە، دواتر دەبنە کۆسپ و ئاستەنگ لە بەرانبەر ئەم گەشە کردنەدا. ئەم هۆکارە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشگەلی کۆمەڵایەتی؛ لەم شۆڕشانەدا پێوەندییەزاڵەکانی

بەرهەمهێنان تووشی گۆڕان دەبن. هەر گۆڕانێ لە بنەمای ئابووریدا، دێر یان زوو، دەبێتە هۆی گۆڕانی رووبینای کۆمەلایەتی. ئەم میتۆدە سەرجەمی جڤاکەکان —لە کۆمۆنیزمی سەرەتاییەوە تاکوو دەگاتە دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری هاوچەرخ- دەگرێتەوە (استونر؛ ١٣٧٩).

بە بڕوای مارکس، سەرجەمی گۆڕانە رامیاری، یاسایی، فەلسەفی، ئەدەبی و هونەرییەکان بەستراون بە گۆڕانی ئابوورییەوە. بەلام ئەم چەمکانە هەموویان هەم بە سەر یەکتردا و هەم بە سەر بنەمای ئابووریدا کاریگەرییان هەیە. واتای ئەمە، ئەوە ناگەینێ کە بارودۆخی ئابووری، تەنیا هۆکاری بزۆز و ئەکتیڤە و هەم تەوەرەکانی‌تر لە ژێر کاریگەری ئەم ئەم هۆکارەدان. بەلکوو لە چوارچێوەی پێداویستییە ئابوورییەکاندا، ئەم هۆکارە جۆراوجۆرانە، بە سەر یە کدا کاریگەر دەبن (کوزر؛ ١٣٧٠).

دوورکایم لە کتێبی *دابەش کردنی کاری کۆمەلایەتی*دا باس لە چۆنییەتی بواری جڤاکەکان لە قۆناغە سوننەتی و سەرەتاییەکانەوە بۆ قۆناغی پیشەسازی و پێشکەوتوو دەکا و هۆکانی ئەم گۆڕانە راڤە دەکات. رای دوورکایم وایە کە هۆی سەرەکی گۆڕانی کۆمەلگا لە کۆمەلگای سەرەتاییەوە بۆ کۆمەلگای پیشەسازی، سست بوونی پێوەندییە کۆنەکانە کە بنەمای لە سەر یەکگرتوویی میکانیکییەوە داڕێژراوە. لە کۆمەلگا سەرەتاییەکاندا پێوەندییە کۆمەلایەتییەکان شێوازێکی سادە و ساکاریان هەیە؛ چونکە دابەش‌کردنی کار نەگەیشتۆتە قۆناغێکی ئالۆز، تاکەکان بە گوێرەی یەکگرتوویی میکانیکی، پێوەندییان پێکەوە هەیە و نەزم و پێکهاتەی کۆمەلایەتی بە گوێرەی ئەم شێوە یەکگرتووییە هاتۆتە دی. بەلام لە کۆمەلگا پیشەسازی و پیشکەوتووەکاندا، بناغەی کۆمەلگا لە سەر یەکگرتوویی ئۆرگانیکی دامەزراوە و بە هۆی ئالۆز بوونی دابەش‌کردنی کار، پێکهاتەی کۆمەلگاش حالەتێکی ئالۆزتری هەیە. کەواتە جۆری سیستەمی

دابەش‌کردنی کارە کە چۆنییەتی پێکهاتەی کۆمەڵگا دیاری دەکا و ئەمە پێکهاتە و سیستەمی کۆمەڵایەتییە کە چۆنییەتی هەڵس‌وکەوت و کارلێکی کۆمەڵایەتی روون دەکاتەوە (دورکیم؛ ١٣٨١).

روانگەی کۆمەڵناسانە بە پیشاندانی واتا و بیردۆزی جۆراوجۆر، یارمەتیمان دەدات تا باشتر لە واتای گۆڕانی کومەلایەتی بگەین. بۆ دیتنەوەی هۆی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی ناتوانین بە تەنیا یەک هۆکار بە هۆی ئەو گۆڕانە بزانین. گۆڕانەکان زۆرتر دەرەنجامی کۆمەڵەیەک هۆکار و رووداون. بۆ وێنە رەنگە بڵێین دوایی هاتنی جەنگی سارد بۆتە هۆی کۆشەوە بۆ کەمتر کردنی بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی. بەلام ناتوانین بە ئاسانی هۆکارەکانی دوایی هاتنی جەنگی سارد دەسنیشان بکەین. هەروەها دەبێ ئەم خاڵەش لە بەر چاو بگرین کە داگرسانی جەنگی سارد لە سۆنگەی چ هۆکارێکەوە بوو. هەرچەند، هەروەک ئاماژەمان پێکرد، بۆ هەر گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی دەتوانین هۆکاری زۆر دەسنیشان بکەین، بەلام کۆمەڵناسان زۆرتر سەرنج دەدەنە هۆکارە گرینگ و سەرەکییەکان. ئەم هۆکارانە بریتین لە:

١) داهێنان: واتە داهێنانی شتی نوێ. ئەم شتە نوێیە دەتوانی بیر، پرۆسە، کردە، گەلالە یان ئامرازو کەرەسەیەک بێ.

٢) کردەوەی رێبەران: مەبەست کردەوەی ئەو کەسانەیە کە دەسەلاتیان لە دەستدایە؛ رێبەرانی کاریزماتیک یان بژاردەکانی دەسەلات.

٣) ململانێ و ناتەبایی: مارکس رای وابوو کە ململانێ، سەرەکیترین هۆکاری گۆڕانە. ململانێیەکان بریتین لە پێکدادانی گرووپەکان بۆ گەیشتن بە دەسەلات، سامان، قازانج، بەها و هتد.

٤) سەرمایەداری: سەرمایەداری، سیستەمێکی ئابوورییە کە تێیدا خاوەنێتی تایبەت بە سەر سەرچاوەکان، ئامرازەکانی بەرهەمهێنان،

دابەشکردنی کاڵا و خزمەتگوزاریەکاندا زاڵە. بزوێنەری ئەم سیستەمە ئەنگیزەی پێشبڕکی، قازانجخوازی و بازاڕی ئازادە (عضدانلو، ١٣٨٤).

## گوشاری دەور (رۆڵ)/ role strain

هەندێ جار تاک لە جێبەجێ کردنی ئەو ئەرک و دەورەی کە خراوەتە ئەستۆی، تووشی کێشە و گرفت دێت. هۆی ئەم گرفتە بریتیە لە ناتەبایی ئەو دەور و ئەرکانەی کە خراونەتە ئەستۆی و چاوەڕانی دەکرێ کە جێبەجێی بکات. کۆمەڵناسان بەم دۆخە دەڵێن گوشاری دەور. ئەم ناتەبایی و پارادۆکسانە ڕەنگە کاتێک سەرهەڵبدەن کە لایەنە بەرانبەرەکان، چاوەڕوانی جۆراوجۆریان لە خاوەن دەور هەبێ، یاخۆ تاک لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیدا ڕاوەستێ کە ئەرکی جۆراوجۆر و هەندێ جار دژ بە یەکی دەخرێتە ئەستۆ (کوئن؛ ١٣٨٧).

بۆ وێنە لە سەرپەرشت و ڕاهێنەری تیمێکی فووتبۆڵ چاوەڕوانی دەکرێ کە لە گەڵ یاریکەران و ئەندامانی تیم پێوەندییەکی نزیک و دۆستانەی هەبێ، کەچی لە هەمان کاتدا دەبێ بڕیاری توندو بە زەبر بۆ ڕێکوپێک کردن و بەڕێوەبردنی تیم بدات، تەنانەت ڕەنگە هەندێ جار ناچار بێت کە یەکێک لە ئەندامەکانی بگۆڕێ یا جێگای بگۆڕێ تا لەم ڕووەوە بارودۆخی تیمەکەی ڕێکوپێک بکات. کارێکی ئاسان نییە کە ڕاهێنەرێک لە هەمان کاتدا کە خۆی بە یەکێک لە ئەندامان و یاریکەران دەزانێ، هان بدات کە کاروبارەکان ڕێکوپێک بکات. لەم دۆخەدا زۆرجار ڕاهێنەر لە گەڵ گوشاری دەور ڕووبەڕوو دەبێ.

## گۆشەگیری / isolation

واتای سەرەکی ئەم زاراوەیە هەمان «جیایی»یە و ڕەنگە لە بواری

جۆراوجۆری وەکوو پێکهاتەی دەروونی، پێوەندی تاک لە گەڵ گرووپ و پێوەندی گرووپەکان لە گەڵ گرووپەکانیتردا بە کار ببرێ.

لە کۆمەڵناسیدا مەبەست لەم زاراوەیە بەشداری نەکردنی تاکە لە نێو چالاکییەکانی گرووپدا. وادیارە کە لێرەدا گۆشەگیری جۆرێک بیچمبەندی شیکارانەیە. وەکوو کاتێک کە ر.ت. لاپییێر دەڵێ گۆشەگیری بریتییە لە «داماوی تاک بە هۆی بەهێزی، سەرتری یان هەر شتێکیتر لە پێوەندی کردن یاخۆ پاراستنی پێوەندی لە گەڵ تاکەکانی دەورو پشتی». هەروەها سان.ک.دەیڤیس «نەبوونی پێوەندی کۆمەڵایەتی» لە گەڵ «گۆشەگیری» بە یەکسان دەزانێ. لە بوارێکی جیاوازدا گۆشەگیری وەکوو بگۆڕێکی دینامیک لە بێهێزی بۆ بەدەستهێنانی کەسایەتی دێتە ئەژمار و هۆکارێکە کە بوار بۆ نەخۆشی دەروونی، بە تایبەت شیزۆفێڕنی خۆش دەکات.

ئا.ج. جاکۆ لە کۆمەڵناسیدا بە جۆرێکیتر لەم زاراوەیە کەڵک وەردەگرێ و «گۆشەگیری بە دابڕان یاخۆ کەم کردنەوەی ڕادەی پێوەندی لە گەڵ کەسانیتر» دەزانێ و تێدەکۆشێ لە کۆمەڵەکاندا بە هۆی پێوەرگەلێکی وەکوو ون بوون (گومناو بوون)، کۆچ کردن، شوێن و مەکۆی دۆستان، ڕادەی بەشداری لە گرووپەکاندا و شتیتر هەڵیسەنگێنێ. ک. دەیڤیس دەڵێ: «گۆشەگیریەک کە کۆمەڵناسان زۆرترین سەرنجی پێ دەدەن، گۆشەگیریەکە کە ئاوێتەیەکە لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان».

هەروەها کۆمەڵناسان گۆشەگیری بۆ ئاماژە بە جۆری پێوەندی گرووپ یان کۆمەڵگاکان لە گەڵ گرووپ یا کۆمەڵگاکانیتر بەکار دەبەن. لەم ڕەهەندەوە «جڤاکێکی نەتەوەیی، جڤاکێکی گۆشەگیرە... چونکە لە خەڵکێک پێک هاتووە کە پێوەندییەکی کەمیان لە گەڵ خەڵکی کۆمەڵگاکانی دەورو پشتیان هەیە». هـ. بیکێر لە تۆژینەوە لە سەر کۆمەڵگا پیرۆز و دونیاییەکاندا بە «گۆشەگیری» و «دەسپێگەیشتوویی» کۆمەڵگاکان

ئاماژە دەکا و سێ خاڵی جیاواز دەستنیشان دەکات: هاوسایی (جیایی جەستەیی)، کۆمەڵایەتی (خاوەن پێوەندی جەستەیی، بەڵام بە کۆسپ لە سەر ڕێی کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە)، دەروونی (خاوەنی کارلێک، بەڵام بەبێ پێوەندی ڕاستەقینە).

یەکەم کەسێک کە زاراوەی گۆشەگیری بە کار هێنا گ.زیمل بوو و مەبەستی لەم زاراوەیە زۆرتر ئاماژە بە کەسێک بوو کە لە باری جەستەییەوە هەست بە دابڕان و جیایی و تەنیایی دەکات. «واتایەکی راشکاو لەم راستییەدەروونیە بەناوبانگەدا دیارە؛ هەست بە ئاوەها تەنیاییەک بە دەگمەن روودەداو گەریش رووبدات ئەوە کاتێکە کە تاک لە بیانی و نامۆ بوونی خۆی ئاگەدار بێ و لە گەڵ خەلکێکی زۆر کە زۆر لە باری فیزیکییەوە لێی نزیکن، پێوەندی و یەکگرتوویەکی نەبێ» (گولد؛ ١٣٨٤).

## گۆشەگیری خوازی/ isolationism

مەبەست لە گۆشەگیری خوازی، سیاسەت یان لایە نگری لە سیاسەتێکە کە دەڵێ قازانجەکانی وڵات بە دوورەپەرێزی لە پێوەندی نزیک لە گەڵ وڵاتانیتر، بە باشترین جۆر دابین دەبێ. لە هەمان کاتدا کە دەتوانین لایەنگری لە گۆشەگیری سیاسی بکەین یاخۆ پەیدۆزی بین، بە دەگمەن دەتوانین وڵاتێک ببینینەوە کە پێی گەیشتبێ کە ئاوەها سیاسەتێکی بەکار بردبێ. بۆ وێنە ژاپۆن ماوەیەک وای کرد، کەچی بریتانیا و ئەمریکا قەد وایان نەکردووە.

زاراوەی گۆشەگیری لە دەیەی ١٩٨٠دا بە چاوبڕین لە سیاسەتی بریتانیا -کە «گۆشەگیری شکۆدار»یان پێی دەگوت- بوو بە خاوەنی واتای سیاسی. ج. ئیَ. فاستەر کە لە ١٨٩٦دا لە پەرلەمانی کانادادا گوتاری دەخوێندەوە گوتی: «لەم ڕۆژە پڕ ئاژاوانەدا، پادشای ئیمپراتۆری مەزن بە چەشنێکی

شکۆدار خۆی لە ئەورووپا دوورەپەرێز گرتـووە». ئـەم پـەیڤـە دەنگـی زۆری دایەوە. واتاکەشی ئەمە بوو کە بریتانیا لە هەر جۆرە بەڵێن و بڕیارێک کە بـە هۆی یەکیەتی لە گەڵ ولاتانەوە بۆی دێتە دی، ئازادە و خۆی کـلا کـردووە. نە لە یەکیەتی «سێ لایەنـە»دا ئـەندامـە و نـە لـە یـەکیـەتی «فـەرانسـە و رووسیادا». هەرچەن مەبەستی ئەم پەیڤە ئەوە نەبوو کە بریتانیا بـە تـەمایـە خۆی لە سیاسەتی نێونەتەوەیی بکێشێتەوە.

زاراوەی گۆشەگیریخوازی لە سەدەی بیستەمدا پەرەی سەند و مەبەست لەم زاراوەیە هەندێ رەهەند و سیاسەتی دەرەکی ئەمریکا و بـیر و بۆچـوونی هەندێ لە گرووپەکان لە مەڕ سیاسەتی دەرەکی ئـەمریکـا بـوو. لـە شـەڕی جیهانی یەکەمدا ئەمریکا بە چەشنێکی سەرنجڕاکێش لە بەشداری کردن لە سیاسەتی نێو نەتەوەی و گرتنە ئەستۆی هەر جۆرە بەرپرسایەتییـەک خـۆی بوارد. هۆی پەسندکردنی ئەم زاراوەیە زۆرتر بـاس لـە بـیرو بۆچـوونی ئـەو کەسانە دەکات کە بـە نزیـک کـەوتنـەوەی شـەڕی جیهـانی دووەم، زۆرتـر خوازیاری دوورەپەرێزی بەشداری نەکردن لە کـارو بـاری ئـەرووپـادا بـوون. چونکە پانتای ئەو بیرو بۆچوونە زۆر بەرفراوان بـوو، واتـای ئـەم زاراوەیـە تـا رادەیەک لێڵە و تەنیا ئەو مەبەسـتەی کـە بریتانیـەکـان بوویـان، ناگرێتـەوە (نەڕۆیشتنە نێو هیچ یەکیەتییەک، بەلام درێژەدان بە بەشداری لە کاروبـاری نێو نەتەوەییدا)؛ بەڵکوو هەنووکە ئـەم زاراوەیـە بـە تـەواوی گۆشـەگیریـش دەگرێتەوە. لەم سۆنگە ئێستا واباوە کە «یەکلا خوازی» بۆ واتـای «تێکـەڵ نەبوون لە نێو هیچ یەکیەتییەک» بە کار بـبرێ و گۆشـەگـیری خـوازی بـە واتای مەیلەو دوورەپەرێزی(گولد؛ ١٣٨٤).

## گەشەی کۆمەڵایەتی / social promotion

ئەم زاراوەیە ئاماژەیەکە بەبایەخـی بـەڵـگەنامـەی سیسـتەمـە پـەروەردە

ڕەسمییەکان. لایەنگرانی پەروەدەی گشتی (بەلاش) لە ئەمریکادا چاک دەزانن کە ئەنجامی ئەم داخوازەیان -واتە گەشەی پەروەردەو فێرکاری بۆ هەموو توێژەکانی خەڵک تا لە هەل و مەرجی یەکسان بۆ پێشکەوتن لە کۆمەڵگادا بەشدار بن- دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی وانەکانی قوتابخانەکان. بە واتایەکی‌تر، گەر بڕیار وابێ هەموو ئەو کەسانەی لە کۆرسەکانی قوتابخانەدا بەشدار دەبن، سەرکەون، دەبێ ئاستی فێرکاری دابەزێ. گەر ئەم بۆچوونە لە لایەن بڕیاردەرانی بەرنامەکانی پەروەردەوە پەسند بکرێ، ئاکامەکانی ئاشکران: دیپلۆمەکان بایەخی خۆیان لە دەست دەدەن و ئامانجی گەیشتن بە بەرانبەری لە ڕێی دابین کردنی پەروەردەی زۆرەکی و بەلاش دەکەوێتە ژێر پرسیار و ڕەخنەوە.

ئەمریکا یەکێک لەو وڵاتە دەگمەنانەیە کە خوێندکار بێ‌هیچ ئەزموون و بەربەستێک دەتوانێ بڕواتە نێو زانکۆوە، بەو مەرجەی بەڵگەنامەی دیپلۆمی وەرگرتبێ. چونکە پەروەدە بوو بە ئەرکێکی زۆرەکی و بەلاش، هەموو چینەکانی کۆمەڵگا، تەنانەت چینی دەسکورت و نەدار، توانیان بەڵگەنامەی دیپلۆم وەربگرن. لەم سۆنگەوە بایەخی بەڵگەنامەی دیپلۆم دابەزی و بەڵگەنامەی زانکۆ بایەخی زۆرتر بۆوە. بە واتایەکی‌تر، بۆ گەیشتن بە کارێکی چاکتر و بەنرختر، بەڵگەنامەی دیپلۆم بایەخی پێشووی نەما. ئاکامی ئەم دابەزینی بایەخە ئەوەبوو کە ئاستی بەرنامە وانەییەکانی قوتابخانەکان هاتە خوارەوە و قوتابییان تەنیا خوێندن و نووسینی پێویست بۆ ڕۆیشتنە نێو بازاڕی کار فێر دەبوون و هیچی‌تر. بەم بۆنەوە ئاستی بەرنامەوانەییەکانی قوتابخانە سەرەتاییەکان زۆر هاتە خوارەوە و نرخی خۆی لە دەست دا (*Cohen, David K. and Barbara Neufeld, 1983*).

## گەشەی کۆمەڵایەتی-چاندی / sociocultural evolution

خوێندنەوە و توێژینەوە لە سەر ژیانی ئادەمیزاد، زانیاری زۆری سەبارەت

بە جیاوازیگەلی زۆر گەورەی جڤاکەکان کە لە خولی جۆراوجۆری مێژوودا هاتوونەتە دی و لە ئەنجامدا تواونەتەوە و هیچیان لێ نەماوە، داوەتە دەست. گێرهارد لێنسکی و پاتریک نۆلان لە سەر تەوەرێک کۆڵاونەتەوە کە بە ناوی گەشەی کۆمەڵایەتی-کولتووری ناویان لێ بردووە. ئەوان ئەم زاراوەیە بە واتای پرۆسەی گۆڕانێک بەکار دەبەن کە بە هۆی گەیشتن بە زانیاریگەلی نوێ، بەتایبەت تیکنۆلۆجییەوە هاتۆتە دی (نولان و لنسکی؛ ۱۳۸۳). بە هەمان جۆرێ کە بیۆلۆجیستێک گەشەو گۆڕانی گیاندارێک دەخاتە بەر راڤەو لێکدانەوە، کۆمەڵناسیش دەست دەدا بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە چەندوچوونی گەشەی کۆمەڵایەتی-کولتووری کۆمەڵگا مرۆڤیەکان تا چۆنییەتی ئەو گەشەسەندن و بەرەو تەواوتر چوونە لە خولەکانی مێژوودا روون بکاتەوە. کۆنترۆڵ و بەهرەوەرگرتن لە سروشت، لە گرینگترین هۆکارەکانی گەشەی جڤاکەمرۆڤییەکانە. ئەو کۆمەڵگایانەی کە تیکنۆلۆجییەکی سادە و ساکاریان هەیە، تەنیا دەتوانن لە ژمارەیەکی زۆر کەم پێک بێن و ناتوانن شێوازی جۆراوجۆر بۆ ژیانیان هەڵبژێرن. بەڵام ئەو کۆمەڵگایانەی کە بەهرەیەکی زۆریان لە تیکنۆلۆجی بردووە، دەتوانن جەماوەرێکی زۆرتر لە نێو خۆیاندا جێ بکەنەوە و لە شێوەگەلی جۆراوجۆر بۆ ژیان کەڵک وەربگرن. ئەمەی بێژرا، ئەوەناگەیەنێ کە بەهرەی زۆر وەرگرتن لە تیکنۆلۆجی دەتوانێ ژیانێکی خۆشتر و باشتر پێک بێنێ. هەرچەن کۆمەڵگاکان خاوەنی تیکنۆلۆجییەکی ئاڵۆزتر بن، گۆڕان و گەشەیان خێراترە و بە پێچەوانەی ئەمە، هەرچی کۆمەڵگایەک تیکنۆلۆجییەکی ساکارتری بێ، بە هێوری تووشی گۆڕان و گەشەسەندن دەبێ. بە گوێرەی بۆچوونی لێنسکی، مێژووی جڤاکە مرۆییەکان بە پێی ئاستی تیکنۆلۆجییان بە پێنج تیپی لێکجیاواز دابەش دەکرێن: راو و کۆکردنەوەی خۆراک، بێستانکاری، شوانکارەیی، کشتوکاڵ، پیشەسازی و پاش پیشەسازی (نولان و لنسکی؛

.(١٣٨٣

## گەیاندن (پەیوەندی)/ communication

هەرچەن گەیاندن بە گوێرەی چوارچێوەی جۆراوجۆر پێناسە کراوە و هەر بۆچوون لە سەر ڕەهەندێکی تایبەت لەم پرۆسەیە پێداگری دەکا، بەلام لە هەموو ئەم پێناسانەدا پێنج هۆکاری سەرەکی دەسنیشان دەکرێن: ١) دەسپێکەر ٢) وەرگر ٣) شێواز یان ئامرازی ڕاگواستن ٤) پەیغام یان هەوال ٥) ئاکام و ئەنجام. واتە، گەیاندن لە سەرەتایی‌ترین شێوازی خۆیدا بریتیە لەوەی کە دەسپێکەرێک هەوال یان پەیغامێک بە هۆی کەرەسەیەکەوە بۆ کەسێکی‌تر دەنێرێ و ئەمانەش دەبنە هۆی ئاکامێک. زۆربەی پێناسەکان، واتای کارلێکیان لە نێودا حەشار دراوە، واتە لەم پرۆسەیەدا دەکرێ دەسپێکەر بەردەوام یان هاوکات، وەرگریش بێ، یاخۆ وەرگر، دەسپێکەر بێ.

لە زۆربەی پێناسەکاندا دەسپێکەر، وەکوو وەرگر ئۆرگانیسمە. لەو بەرهەمە نوێیانەدا کە سەبارەت بە ئەندازیاری ڕاگەیاندن نووسراون، دەسپێکەر یان وەرگر دەتوانێ کەرەسەو ئامرازێکی نائۆرگانیسم بێ. لە هەندێ پێناسەشدا، گەیاندنی «ڕاستەقینە» تەنیا بە پێوەندی نێوان ئۆرگانیسمەکان دەبێژرێ.

لە سەر چۆنییەتی پەیغام یان هەوال باس و وتووێژی زۆر کراوە، بەلام بنەمایەکی سەرەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئامرازی ڕاگواستنی هەوال دەتوانێ سەرنجی دەسپێکەر و وەرگر بەرەو پانتایەک لەو دیاردانەی کە لە دەوری هەوالدان ڕاکێشێ. بەم بۆنەوە لە کاری گەیاندندا هەمیشە پای دیاردە و سیمبۆل لە ناودایە(گولد؛ ١٣٨٤).

لە دونیای نوێدا گەیاندن ڕەنگ و ڕوویەکی نوێی گرتۆتە خۆ و بە تایبەت لە کۆمەڵناسیدا زۆرتر باس لە چەندایەتی کاریگەری ڕاگەیاندن دەکرێ؛

کۆمەڵناسان لە لێکدانەوەی راگەیاندندا زۆرتر سەرنجیان داوەتە شرۆڤەی زمان و لێکدانەوەی هۆکارەکانی راگوازتنی هەواڵ و پەیغام (دیاردەکان، نیشانەکان و واتاکانیان).

دوو کەس لە بیرمەندانی کاریگەر لە دونیای گەیاندندا بریتین لە هارۆلد ئینس و مارشاڵ مەک لۆهان کە هەردوویان خەڵکی وڵاتی کانادان. بە رای ئینس (*Innis,1950-51*) رێباز و هەڵسوکەوت و بۆچوونی دەزگاگەلی راگەیاندنی کۆمەڵگایەک، کاریگەری راستەوخۆ و زۆر بەهێزیان بە سەر پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگایەدا هەیە. بۆ نموونەش ئاماژە دەکا بەو بەردەنوسانەی کە لە هەندێ شارستانیەتی کەونارادا نوسراون. ئەم بەردەنووسانە بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێننەوە، بەڵام ناکرێ بە ئاسانی بگوازرێنەوە. بۆیە کەرەستەیەکی چاک بۆ پێوەندی لە گەڵ ناوچەگەلی دوور نین. کەواتە، ئەو جڤاکانەی بەم جۆرە پێوەندییانەوە بەندیوارن، ناتوانن زۆر گەورە و مەزن بن.

مەک لۆهان (*McLuhan;1964*) هەندێ لە بیردۆزەکانی ئینسی درێژە پێدا و بۆ لێکدانەوەی دەزگاگەلی راگەیاندنی جڤاکە پێشکەوتووەکان چێژی لێ وەرگرت. مەک لۆهان دەڵێ: «راگەیاندن هەمان پەیغامە». واتە، چۆنییەتی دەزگاگەلی راگەیاندنی کۆمەڵگایەک، زۆرتر لە ناوەرۆکی هەواڵەکان، بە سەر پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگایەدا کاریگەرییان هەیە. بۆ وێنە، تەلەفزیۆن ئامرازێکی راگەیاندنە کە زۆر لە کتێب جیاوازە. تەلەفزیۆن ئامرازێکی راگەیاندنی ئەلکترۆنیکی، دیداری و تێکەڵ لە وێنەگەلی بزۆزە. ئەزموونی رۆژانەی جڤاکێک کە تەلەفزیۆن تێیدا دەور دەگێرێ، جیاوازە لە گەڵ کۆمەڵگایەک کە تەنیا کتێب کەرەسەی راگەیاندنیە. تەلەفزیۆن هەواڵەکان بۆ هەموو کونج و قوژبنی دونیا رادەگوێزێ و بێدرەنگ خەڵکی دونیا لە کارەسات و رووداوی جۆربەجۆر ئاگەدار دەکاتەوە؛ لەم سۆنگەوە، بە وتەی مەک لۆهان راگەیاندنە ئەلکترۆنیکییەکان خەریکی چێ کردنی

گوندی جیهانین (Global Village)؛ خەڵکی دونیا پێکڕا بینەری ڕووداوەگرینگەکانی دونیان، بۆیە پێکەوە دەتوانن بەشداری تێدا بکەن. بۆ نموونە، میلیۆنها کەس پێکەوە لە پێوەندی نێوان بیل‌کلینتۆن سەرۆک کۆماری پێشووی ئەمریکا و سکرتێری پێشووی کۆشکی سپی، موونیکا لوینسکی ئاگادار بوون. پاش یەک ساڵی ڕەبەق کۆشەوەو توێژینەوە و پەردەلادان لە ڕووی نهێنییەکان، کلینتۆن لەو پیلانە دەرباز بوو(گیدنز؛ ١٣٨٦).

## deviance / لادان

هەر جۆرە ئاکارێک کە لە گەڵ چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگا هاوڕێ نەبێ، لادانی پێ دەڵێن. واتە دووری گرتنی تاک لە نۆرم و پێودانەکانی کۆمەڵگا. ئەمەش کاتێک روودەدا کە تاک یان گرووپێک پێودانەکانی کۆمەڵگا لە بەرچاو نەگرێ (کوئن؛ ١٣٨٤). دوورکایم دەڵێ: لادان بریتیە لە هەر جۆرە هەڵسوکەوتێک کە بە پێچەوانەی پێودان یان دامودەستوورەکانی گرووپ بێ (دورکیم؛ ١٣٨٤)

دیارە ئەم پێناسە لە لادان، ناتوانێ ببێتە پێوەرێک بۆ توێژینەوەی کۆمەڵناسانە. چونکە ئەمەی کە کردەوەیەک لادانە یان نە، تەنیا نۆرمەکانی کولتووری ئەو کۆمەڵگان کە دیاری دەکەن. رەنگە کردەوەیەک لە نێو کولتوورێکدا لادان بێ، کەچی هەمان کردەوە لە کۆمەڵگایەکی تردا نۆرم و پێودان بێ. یان بە پێچەوانەی ئەوە، کردەوەیەک لە کۆمەڵگایەکدا بەها بێ، کەچی لە کۆمەڵگایەکی تردا بە لادان بێتە ژمار؛ بۆ وێنە لە چیندا خۆڕازاندنەوەی ئافرەتان، سەردەمێک لادان بوو و دەبوایە سزا بدرێ، کەچی ئێستا بۆتە نۆرم و پێودان و ئیدی بە لادان نازانرێ (عضدانلو، ١٣٨۴).

سەرجەمی ئەو کۆمەڵناسانەی کە پێناسەیەکیان لە لادان داوەتە دەست، دەکرێ لە دوو دەستەدا ریز بکرێن. دەستەی یەکەم ئەوانەن کە لادان بە دیاردەیەکی «واقعی» دەزانن کە خاوەن تایبەتمەندیگەلێکە کە لە رەفتاری نۆرماڵ جیا دەکرێتەوە. ئەمە بۆچوونی پازیتیڤیستانە. دەستەی دووەم یان راڤەخوازان (constructionist approach) ، ئەوانەن کە دەڵێن لادان کردەوەیەکی تەواو «واقیع» نییە؛ زۆرن کەسانێک کە بە هەڵە یان بە هۆی رق و قینەوە تاوانبار دەکرێن و مۆرکی لادانیان لە جەمین دەدرێ. یان زۆرن کەسانێک کە تووشی کردەوەی ناڕەوا و دژ بە رێسای کۆمەڵگا دەبن، بەڵام چونکە کەسیان پێ نازانێ لە مۆرکی لادان بەرین و بە تاوانبار نازانرێن.

کەواتە لە روانگەی ئەم کەسانەوە ئەمە مۆرکنانە کە کەسێک بە تاوانبار پیشان دەدا نە خودی تاوان و لادان (سروستانی؛ ١٣٨٧).

بیردۆزی پۆزیتیڤیستی لە پێناسەی لادانــدا سێ گریمانەی سەرەکی هەیە:

١- لادان کردەیەکی واقیعە، واتە: هەندێ تایبەتمەندی هەیە کە هاوڕێسایی لە گەڵ کۆمەڵگای جیا دەکاتەوە. زیانناسان و تاوانناسانی رابردوو بڕوایان بە هەندێ کەمایەسی بیۆلۆجیکی لە تاوانبارانــدا بــوو، بۆیە تاوانبارانیان بە تاوانباری «زکماک»، «دەروون ئاڵــۆز»، «ژیــان دژواری منداڵــی» و «شیزۆفیڕنی» دەزانێ (آگ برن؛ ١٣٥٢).

٢- لادان کردەوەیەکی ئاشکرایە و لادەر یان تاوانبار بوونەوەرێکی دیار و بەرچاوە و دەتوانین بە هەمان شێوازی زانستە سروشتییەکان بێخەینە بەر راڤە و وردبوونەوە.

٣- بەڕای ئەم تاقمە لادانی کۆمەڵایەتی و تاوان، هۆیەکی سەرتر لە کۆنترۆڵی خودی تاکی هەیە (ئەمە بۆچوونی زانستە سروشتییەکانە).

بیردۆزی راڤەخوازی کە لە دەیەکانی ١٩٦٠وە دەسەڵاتی پۆزیتیڤیستانی تووشی کێشە کرد، سێ گریمانەی گرینگی هەیە:

٤- لادان تەنیا مۆرکێکە و هیچی‌تر و هیچ تایبەتمەندییەکی زاتی نییە. واتە هەر کردەوەیەک تەنیا کاتێ کەسانێک بە لادان و تاوانی دەزانن دەبێتە لادان. لە سەرووی هەموو راڤەخوازانەوە «هاواردبیکێر»ە کە دەڵێ لادان، کردەوەیەکە کە خەڵکی مۆرکی لادانیان لە سەر داناوە و لادەر کەسێکە کە ئەم مۆرکەی لە سەرە (بیکر؛ ١٩٦٣: ١٢).

١- کۆمەڵناسانی راڤەخواز ، لادان بە ئەزموونێکی زەینی دەزانن و تاوانبارییش بە کەسایەتییەکی زانا، خاوەن هەست و بیرو هۆش دەزانن کە لە گەڵ بابەتێکی ئەکتیڤ و شتمەکی بێ‌گیان (بابەتی توێژینەوەی زانستە

سروشتییەکان)، کە وەکوو چەمکێکی مونفەعیلن، زۆر جیاوازە (سروستانی؛ ١٣٨٧).

٢- کۆمەڵناسانی راڤەخواز دەڵێن کە لادان کردەیەکی ئیرادییە و رەنگدانەوەی ویست، ئیرادە و هەڵبژاردنی مرۆڤە. بەڕای ئەمان بە پێچەوانەی ئەوەی کە پۆزیتیڤیستان دەڵێن مرۆڤ وەکوو رۆبووتێکە و هیچ ویست و دەسەڵاتێکی لە خۆی نییە، مرۆڤ خاوەن هەست و ویست و دەسەڵاتە و کارەکانی بە گوێرەی ویستی خۆین.

بیردۆزێکی‌تر کە هانی داوە بە چەشنێکی جیاواز و لە رەهەندێکی‌ترە سەیری چەمکی لادان بکات، بریتیە لە بیردۆزی زەختی کۆمەڵایەتی. وەڵامی ئەم کۆمەڵناسانە بەم پرسیارەی کە خەڵکی بۆچی تاوان دەکەن ئەوەیە کە هەندێ هۆکار لە نێو کۆمەڵگادا خەڵکی دەخەنە ژێر گوشار و ناچاری دەکەن بە تاوان کردن. رەنگە مارکس یەکەم کەس بووبێ کە ئەم بۆچوونەی دەربڕیبێ و هۆکاری ئابووری بە زەختێکی کۆمەڵایەتی زانیوە کە بە سەر کرێکار و خەڵکی هەژاری کۆمەڵگادا دێ و تاک ناچار بە لادان لە رێساکانی کۆمەڵگا دەکات (شیخاوندی؛ ١٣٨٦). دواتر دوورکایم لە کتێبی *سەبارەت بە دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی*دا ئاڵۆزی لە دابەش کردنی کاری کۆمەڵایەتی -کە دەبێتە هۆی زەختێک بە سەر تاکەوە- بە هۆی لادان لە نۆرمەکانی گرووپ دەزانێ. رابێرت مێرتۆن هۆی ئەم گوشارە سەرنەکەوتنی تاک لە ناتوانی لە بەدەست هێنانی دۆزە کۆمەڵایەتییەکانیدا دەزانێ. «لادان، ئاکامی زەختی پێکهاتەیی-کۆمەڵایەتی تایبەتە» (سروستانی؛ ١٣٨٧).

مێرتۆن پێداگری لە سەر ئەم بابەتە دەکات کە کردەوەی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا لە بەرانبەر زەختە کۆمەڵایەتییەکان، بە بۆنەی دەسڕانەگەیشتن بە هەلە رەواکان بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئارمانج، وەکوو

یەک نییە و هەموو هەژارێ بۆ گەیشتن بە دۆزەڕەواکانی لە نۆرمەکانی کۆمەڵگا لانادا. بە رای میرتۆن، هەندێ لە کەمدەسان بۆ هاوڕێ کردنی خۆیان لە گەڵ زەختەکانی کۆمەڵگا لە ئامرازو هۆکاری دژ بە رێسا کەڵک وەردەگرن. هەندێ لە رادیکالیستەکان لە بەرانبەر ئارمانج و هۆکاری رەوای گەیشتن بەم ئارمانجانە —کە زۆر دووره دەستیان پێڕابگا- رادەپەڕن و ئارمانج و ئامرازی نوێ بۆ گەیشتن بەو ئارمانجانە بە کۆمەڵگا دەناسێنن. هەندێکیش بە ناچار واز لەو دۆزە رەوا و هۆکاری گەیشتن بەو دۆزانە دێنن و لە کۆمەڵگا جیا دەکەونەوە. ئەم سێ تاقمە —واتە: داهێنەران، راپەڕیوان و جیاکەوتووان- بۆ سازگاری خۆیان لە گەڵ کۆمەڵگایەک کە ئامرازی گەیشتن بە ئامانجیان بۆ پێک ناهێنێ، رێگای لادان و رێساشکێنییان هەڵبژاردووە (سروستانی؛ ۱۳۸۷).

## juvenile delinquency / لادانی تازەلاوان

ئەم زاروەئاماژە بەو کردەوانە دەکات کە بە گوێرەی یاسا یان داب و نەریتی کۆمەلایەتی قەدەغە کراون. زاراوەی تازەلاو بوون، هەرچەند هەر ناوچەیەکی دادوەری بە چەشنێک راڤەی دەکا، بەلام زۆرتر بریتیە لە تەمەنی منداڵی و تازەلاوی. هەروەها ئەو کردەوانە کە بە لادانی تازەلاوان دەزانرێن، لە ناوچەیەکی دادوەرییەوە بۆ ناوچەیەکی‌تر جیاوازن. سیایی لادانی تازەلاوان، بێجگە لەو کردانەی کە هەرگا گەورە سالان تووشی بن بە گوێرەی یاسا سزا دەدرێن، زۆرتر بریتیە لەو کردانەی کە تایبەت بە خولی تازەلاوی و منداڵین. زاراوەی لادانی تازەلاوان ئەوەندە لە گەڵ واتاگەلی یاسایی، رێسایی و ئاکاری تێکەڵ بووە کە ژمارەیەکی زۆر پێناسە لەم چەمکە تایبەتەدا هاتۆتە ئاراوە.

هەریەک لە بەشەکانی ئەم زاراوەیە، واتایەکی تایبەت دەگەینن کە

بریتین لە:

١) زاراوەی تازەلاو، ئاماژەیە بەو کەسانەی کە لە باری تەقویمییەوە تەمەنیان لە نێوان لانی کەم ١٠-٦ و لانی زۆر ٢١-١٦ ساڵدایە. لە باری کۆمەڵایەتیشەوە تەمەنی نێوان منداڵی و گەورەساڵی دەگرێتەوە کە پێی دەڵێن تازەلاوی. لە باری ئەرکیەوە ئاماژەیە بە تایبەتمەندیگەلی تاکەکەسی، توان و بەرپرسایەتی زۆرتر لە تایبەتمەندی، توان و بەرپرسایەتی سەردەمی ساوایی و کەمتر لە سەردەمی گەورە ساڵی.

٢) زاراوەی لادان هەندێ جار بۆ شرۆڤەی ئەو شتەی کە «تاوان» یان «هەڵە کردن»ی پێ دەڵێن بەکار دەبرێ. کۆنفرانسی کۆشکی سپی سەبارەت بە تەندروستی و پاراستنی منداڵان رادەگەینێ کە «لادان بریتیە لە هەر جۆرە کردەوەیەکی خراپی سەردەمی تازەلاوی کە بکرێ بخرێتە ژێر چاودێری یاساوە» (گولد؛ ١٣٨٤).

بەڕای تراویس هیرچی پچڕانی پێوەندی نێوان تاک و کۆمەڵگا دەبێتە هۆی لادانە کۆمەڵایەتییەکان (*Hirschi, T; 1992: 249*). هیرچی چوار سەرچاوە بۆ چاودێری بە سەر هەڵسوکەوتی تازەلاوان رەچاو دەکا کە بریتین لە: ١) یەکێک لە گرینگترینی ئەم سەرچاوانە، دڵبەستراوی منداڵە بە دایک و بابی. بێگومان دایک و باوکان ناتوانن بەردەوام لە لای منداڵانیان بن و چاودێریان لێ بکەن. گرینگ ئەوەیە منداڵان لە باری دەروونییەوە بەردەوام هەست بەوە بکەن کە دایک و باوکیان لە لایانن و چاودێرییان لێ دەکەن. تازەلاوانی لادەر و تاوانبار، لە باری دەروونییەوە بایەخێکی زۆر کەم بە بەهاکانی دایک و بابیان دەدەن و کەمتر هەست بەچاودێری دایک و بابیان دەکەن.

٢) قوتابخانە یەکێکتر لە سەرچاوە گرینگەکانی چاودێری بە سەر هەڵسوکەوتی تازەلاوانە. تازە لاوانی لادەر، کەمتر لە لاوانیتر بایەخ بە

قوتابخانە دەدەن و زۆرتر رقیـان لێیـە و بـە دەگمـەن کـاری قوتابخانـەیـان جێبەجێ دەکەن و بۆیان گرینگ نییە کە ماموستاکانیان چ بۆچوونێکیان لە سەریان هەیـە. بـەڵام بـۆ ئـەو قوتابیانـەی کـە دەیانـەوێ وانـە بخـوێنن و سەرکەون، قوتابخانە دەتوانێ وەکوو هێزێکی ئاکاری، یارمەتییـەکـی زۆریـان پێ بگەینێ.

٣) سێیەمین سەرچاوەی چاودێری بریتیە لە تاقمی هاوالان. بە گـوێرەی توێژینەوەکانی هیرچی، گەنجانی لادەر، پێوەندییەکی زۆر کەمیان لـە گـەڵ ئەو گەنجانەی کە رێز بۆ یاسا و رێسا کۆمەلایـەتییـەکـان دادەنـێن هـەیـە. هەندێ لە هاوالانی تاک بۆ هاودەنگـی لـە گـەڵ نۆرمـەکـان هـان دەدەن و هەندێکیش لۆمەی ئەو کەسانە دەکەن کە بایەخ بۆ رێساکان دادەنێن.

٤) چوارەمین سەرچاوەی کۆنترۆڵی لادانی تازەلاوان، مەیـل بـە ئـەنجـام دانی کارو باری ئاسایی و رۆژانەیە، بـە تایبـەت خوێنـدن و دیتنـەوەی کـار. ئەگەر تازەلاوان بیانەوێ ژیانێکی لەبار و شیاو بۆ خۆیان دابین بکەن و دڵـنیا بن لەوەی کە کۆمەڵگا ئەو هەلەیان بۆ دەرە خسێنێ، بە هیوایەکی زۆرتـرەوە دەرۆنەوە بۆ قوتابخانە و درێژە بە خوێندن دەدەن. هەروەهـا هـان دەدەن تـا لەو گیروگرفتانەی کە خوێندنیان تووشی گێچەڵ دەکـات، خۆیـان ببـوێرن. ئەو کەسانە نایانەوێ داهاتوویان بۆ چەن کردەی بە رواڵـەت بـەتـام و چێـژ، بفەوتێنن. بە پێچەوانەی ئەمان، لادەران، هیچ بەرنامەیەکیان بۆ داهاتوویـان نییە و تەنیا ئامانجیان چێژ بردنی هەنووکەییە.

## لادانی دووەمین / secondary deviance

لادانی دووەمین بەرهەمی هەڵس‌وکەوتی خەڵکە لەگـەڵ کـەسـێک کـە تووشی لادانی یەکەم هاتووە. یەکێک لەو وێنە کلاسیکانە کە بۆ ئەم بابـەتـە کەڵکی لێ دەگیرێ، توشیارانی مادە سڕکەرەکانە کە بۆ بـە دەسـت هێنـانی

موخەددەراتی زۆرتر (لادانی یەکەمین) تووشی لادانی‌تر دەبن. هەندێ لە تیۆریسیەنەکان رایان وایە کە تاوان و لادانی تووشیارانی مادە سڕکەرەکان، ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو مەوادە نییە، بەڵکوو ئەوە مۆرکێکە کە کۆمەڵگا بە سەر مادە سڕکەرەکاندا، وەک مەوادێکی نائاسایی و دژ بە یاسادا دەینێ.

مۆرکی لادان دەتوانێ ببێتە پاگەی سەرکی تاک. کاتێ خەڵکی لە ئەندام بوونی تاکێک لە نێو لیژیۆنێکی نائاسایی یان لێژنەیەکی مێردبازیدا ئاگادار بن، یاخۆ کاتێک هەڵس‌وکەوتی تاک شیاوی کۆمەڵگا نەبێ و لێی بترسن، زۆربەی خەڵکی هەڵس‌وکەوتی رابردووی ئەو کەسە لادەرە بە گوێرەی پێناسەی نوێی راڤە دەکەن (*Kitsuse, J., 1964: 87-102*).

ئەریک گوود لە بۆچوونی خەڵک سەبارەت بە تاکی لادەر، یان تاکێک کە ئەوان بە تاوانبار و لادەری دەزانن، شەش خاڵی دەسنیشان کردووە:

١- زێدەڕۆیی و زۆربێژی: خەڵکی زۆرتر رادیکالانە سەرنج بە رەفتاری لادەرانە دەدەن و پێیان وایە کە ئەو هەڵس‌وکەوتە تایبەت بە هەموو ئەو کەسانەیە کە لەو بابەتەدا دەگونجێن. بۆ وێنە بۆچوونی گشتی لە مەڕ مێردبازی زۆرتر ئەوەیە کە زۆربەی ئەو پیاوانەی هەڵس‌وکەوتیان ژنانەیە، بێ‌گومان مێردبازن.

٢- بە دامەزراوە کردن: بۆچوونی خەڵکی ئاسایی ئەوەیە کە لادان دەوری سەرەکی لە ژیانی ئەو کەسانەی کە مۆرکی لادانیان لێ دراوە، دەبینێ و ئەم کەسانە هەموو کات و هێزی خۆیان بۆ بیر کردنەوەلە سەر رەفتاری دژ بە رێسا تەرخان دەکەن.

٣- بەردەوامی: خەڵکی ئاسایی پێیان وایە گەر کەسێک بۆ جارێک تووشی تاوانێک هات، بەردەوام خەریکی ئەو لادانە دەبێ. بۆ وێنە کاتێک دەبیسن کەسێک پێشتر مادە سڕکەرەکانی بەکار بردووە، پێیان وایە ئەوە بۆ ماوەیەکی کورت وازی لێ هێناوە و دیسان رووی

تێ دەکاتەوە.

٤- رەش و سپی دیین: خەڵکی ئاسایی پێیان خۆشە رەفتاری لادەرانە رەش یان سپی ببینن: تاک یان تاوانبارە یان بێتاوان، یان مێردبازە یان نییە، یان موخەددەرات بە کار دەبا یان نابا. ناتوانن هەڵسوکەوتێکی ناونجی بۆ تاک لە بەرچاو بگرن، ناتوانن وابیر کەنەوە کە رەنگە کەسێک لە نێوان ئاکاری ئاسایی و لاداندا لە هاتوچۆدا بێ یان هەڵسوکەوتێکی مامناوەندی هەڵبژاردبێ.

٥- چوون یەک بوون: خەڵکی پێیان وایە کە سەرجەمی دز، قوماربـاز، مرۆڤکوژ و لادەرانیتر وەکوو یەکن.

٦- زۆربەی خەڵکی ئاسایی پێیان وایە کە لادان سندووقێکی دەرگا داخراوە. لە لای خەڵکی، لادان وەکوو تایبەتمەندی یان کردەوەیەکی جیاگانە دەژمێردرێ کە تەنیا لە گەڵ برێ لە تایبەتمەندییەکانی خۆی پێوەندی هەیە. بۆ نموونە زۆربەی خەڵکی پێیان وایە گەر کەسێک خانووی نەبێ (لە نێو شەقامەکاندا بخەوێ) یان ئالوودەی موخەددەراتە یان ناکۆکییەکی دەروونی هەیە، یان بێکار و بێبنەماڵەیە (عضدانلو، ١٣٨٤).

## لادانی سەرەتایی/ primary deviance

هەندێ جار تاک تووشی کارێکی لادەرانە دەبێ، بەڵام چونکە ئەم کارەی کاتیە و بەردەوام دووپاتە نابێتەوە، خۆی بە لادەر لە رێساکانی کۆمەڵگا نازانێ (کوئن؛ ١٣٨٤). زۆربەی خەڵکی جاربەجار نۆرمێکی کۆمەڵگاکەیان دەخەنە ژێر پێ و ئاوڕی لێ نادەنەوەو کەچی خۆیان بە تاوانبار و لادەر نازانن. بۆ وێنە کەسایەتییەکی بەناوبانگ رەنگە زۆری حەز لە دیتنی فلیمی سێکسی بێ و هەرگا ژنەکەی لە ماڵ نەبێ، فلیمێک بێنێ و بۆ خۆی سەیری

بکات و کەچی خۆیشی بە لادەر لە پێودانەکان نەزانێ و هەمان کەسایەتی و ڕێز و حورمەتی خۆی لە نێو خەڵکدا بپارێزی. بەڵام گەر ئەو کەسەی کە ئەم فلیمانەی بۆ دێنێ ناوی ئاشکرا کات، بە تاوانبار و لادەر دەناسرێ و ڕێز و حورمەتی دەشکێ و مۆرکی لادەری لە سەر دەنرێ و ڕەنگە پاش ئەوە کاری چەوتی تریشی لێبوەشێتەوە. کۆمەڵناسان پێیان وایە لادانەکانی تر (لادانی دووەمین) بەرهەمی مۆرکێکن کە کۆمەڵگا بە سەر ئەو کەسەیدا دەنێ.

## لۆبی (گرووپی گوشار) / lobby

ئەم زاراوە(گەر وەکوو «ناو» بێ) ئەو کەسایەتی یان ڕێکخراوانە دەگرێتەوە کە لە دەرەوەی هێزی یاسادانەرن (پەڕلەمان) و کاریان گوشار خستنە سەر نوێنەرانی پەڕلەمانە بۆ سەلماندن و چەسپاندن یاخۆ ڕەت کردنەوەی گەڵالەیەک لە پەڕلەماندا. ئەم تاقمە بریتین لە: هەم کەسانێک کە بۆ ئەم مەبەستە (گوشار هێنان) بە چەشنێکی ڕەسمی دامەزراون، هەمیش کەسانێک کە بە پێی بابەتێکی تایبەت هان دەدەن تا بۆ قەبووڵ یان ڕەت کردنەوەی گەڵایەک لە پەڕلەماندا گوشار بخەنە سەر پەڕلەمانتارەکان.

گوشار هێنان بریتیە لە کۆشەوەو کاری کەسانێک کە دەیانەوێ لە پاگەی کۆمەڵایەتی و پێوەندیيان لە گەڵ ئەندامانی پەڕلەمان کەڵک وەربگرن تاکوو یاسایەک ڕەت یان قەبووڵ بکرێ.

زانایانی کۆمەڵناسی لە سەر واتای گرووپی گوشار ڕایان نزیک بە یەکە. گرووپی گوشار بریتیە لەکەس یان کەسانێکی خاوەن قازانج کە مەبەستیان ئەوەیە یاسایەک لە پەڕلەماندا پەسەند بکرێ یان ڕەت بکرێتەوە و یاخۆ نەختێ ئاڵ و گۆڕی بە سەردا بێ؛ گرووپی گوشار دەتوانن جووتیاری، کرێکاری، نەوتی و ... بن. گوشارهێنەر کەسێکە کە بە چەشنی تەواو کات یان نیوە کات لە بەرانبەر وەرگرتنی مووچە، خەریکی ئاوەها کارێکە.

هەروەها بەرپرسانی پارتی و ئەندامانی دەزگا حکوومییەکان کە دەیانەوێ قازانجی خۆیان لە ڕێی گوشار خستنە سەر ئەندامانی پەڕلەمانەوە بە دەست بێنن، بە گشتی گرووپی گوشاریان پێ دەڵێن.

گوشارهێنان بریتیە لە چالاکیگەلی جۆراوجۆر وەکوو پێوەندی کردنی تایبەت بە پەرلەمانتار، شایەتی دان، ڕانانی زانیاریگەلی جۆراوجۆر بۆ پەڕلەمانتاران و کومیتەکانی پەڕلەمان، ناردنی ڕاگەیندراو و نامە بۆ یاسادارێژان، هان دانی کەسانیتر بۆ ئەم کارە، لە کاتی پڕوپاگەندەی پەڕلەماندا یارمەتی دان بەو کاندیداتۆرانەی کە گومان دەکرێ پاش سەرکەوتن لە دەنگداندا لایەنگری لەیارمەتیدەر بکەن. «گوشار هێنانی کۆمەڵایەتی» وەکوو تەکنیکێک بریتیە لە دابین کردنی ئامراز و کەرەسەی ڕابواردن، میوانی گرتن بۆ ئەندامانی پەڕلەمان و بنەماڵەیان بە مەبەستی دامەزراندنی دۆستایەتی نزیک لە گەڵ کەسانێک کە یاسا دادەڕێژن.

گوشارهێنان سەرەتا بریتی بوو لە پێوەندی ڕاستەوخۆی نێوان گوشارهێنەر و یاسادانەر. هاتنە ئارای مافی دەنگدان بۆ هاووڵاتیان و گەشەی زۆری دەزگاگەلی ڕاگەیاندن، گرووپی گوشاری هان دا تا بە چەشنێکی ناڕاستەوخۆ پەڕلەمان بخەنە ژێر گوشار. گرووپی گوشار ڕۆژبەڕۆژ هان دەدەن کە زۆرتر لە ڕەهەندی بیری گشتییەوە لە ناوەندەکانی دەنگدان بەهرە وەربگرن. چونکە گریمانەی ئەم گرووپانە لە سەر ئەوەیە کە بیری گشتی دەنگدەران بۆ ئەندامانی پەڕلەمان رادەگوێزرێتەوە.

یاسای فیدراڵی چاودێری بە سەر گرووپی گوشار لە ساڵی ١٩٤٦ لە نەتەوەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا چەسپێندرا و بە گوێرەی ئەم یاسایە هەر کەس یان ڕێکخراوێک کە بۆ قەبووڵ یان ڕەت کردنی یاسایەک پارە وەردەگرێ، یاخۆ داوای پارە دەکات، یاخۆ هەر کەس یان ڕێکخراوێک کە مەبەستی یارمەتی دان بۆ گەیشتن بە ئاوەها مەبەستێکە، دەبێ ناوی خۆی

له پەرلەماندا بنووسێ.

گوشار هێنان بۆ پەرلەمان جیا لەو واتا رەسمییەی کە هەیەتی، واتایەکی ناحەزیشی لە گەلایە؛ چونکە ئەم کۆشەوانە لە گەڵ کۆشەوەی خۆخوازانەی هەندێ کەس یان رێکخراوە کە بە بێ گوێ دان بە قازانجی گشتی خەڵک لە دووی قازانجە تاکەکەسییەکانی خۆیانن، نزیکییەکی واتایی هەیە، هەندێ کەس بە گرووپی گوشار دەڵێن «حکوومەتی بەرپیوار» یان «پەرلەمانی سێهەم» (پاش پەرلەمانی سێنا و نوێنەرانی خەڵک). لە سەردەمێکدا بەرتیل دان و هەندێ شێوازی نەشیاو و نالەبار، لە شێوازەکانی گوشارهێنان دەهاتنە ئەژمار. بەلام ئەمڕۆ بە دەگمەن ئەم شێوازانە ئەنجام دەدرێن، چونکە هەم گوشارهێنەران و هەمیش یاسادانەران لە ئەنجامی ئەم کارە (واتە: بەرتیل‌دان) دەترسن. زانایانی زانستە کۆمەلایەتییەکان، ئەم بیرەی کە دەڵێت «گوشارهێنان کارێکی خراپە» قەبووڵیان نییە؛ تەنانەت رایان وایە کە ئەم چەشنە لە نوێنەرایەتی گرووپییە دەتوانێ بە کەڵکیش بێ، بە مەرجێک کە خێر و قازانجی گشتی خەڵک نەکەوێتە مەترسییەوە. گوشارهێنان بە چەشنێ کە باسی کرا، تەنیا گوشار خستنە سەر سیستەمی یاسادانان دەگرێتە بەر، نەک سیستەمی حکوومی. بەلام هەندێ کەس یان گرووپ بە هۆی دەست و پێوەندێ کە لە نێو دەزگای حکوومەتدا هەیانە دەتوانن کارو باری خۆیان پێک بێنن. هەندێ جار ئەم شێوازەیان بە «گوشار خستنە سەر حکوومەت» ناوبردووە؛ بەلام لە راستیدا مەبەست لەم زاراوەیە گوشار خستنە سەر حکوومەت و سیستەمی ئیداری نییە (گولد؛ ١٣٨٤).

## ليبراليسم/ liberalism

لیبرالیسم وەکوو زاراوەیەک لە هزری رامیاریدا واتای زۆر و جۆراوجۆری گرتۆتە خۆ، بەلام قەد لە سەرچاوە لاتینییەکەی خۆی(Liber بە مانای

ئازاد) لای نەداوە. ئەم زاراوەیە باس لە روانگە و رەوتی کەسانێک دەکات کە حەزو لایەنگری سەرەتاییان لە سیاسەت و حکوومەتدا، کۆشەوەیە بۆ زۆرتر هاتنەدەر لە ژێر رکێف و چاودێری دەولەت یاخۆ هەر هۆکارێکی تر کە بەربەستێک بێ لە بەرامبەر ویست و ئیرادەی سیاسی و ئابووریيان.

بە گشتی لیبرالیسم وەکوو بیردۆزێکی رامیاری، کۆشەوەیەکە لە سەر رێبازی کورت کردنەوەی دەسەلاتی دەولەت لە نێو کەرتی تایبەتدا. بە گوێرەیبنەماکانی لیبرالیسم، مرۆڤ گیاندارێکی ژیرو خاوەن ئاوەز و فامە و لەم سۆنگەوە سەربەخۆیە و دەتوانێ بە پێی راو بۆچوونەکانی، گەلالە بۆ ژیانی خۆی دابرێژێ؛ ئەم شێوازە دەبێتە هۆی گەشەی تاک و کۆمەلگا. پاراستنخوازان (conservatist) سوننەت بە ئەقلیگشتی دەزانن و پێداگری لە سەر دەکەن، کەچی لیبرالیستەکان بە پێچەوانەی ئەوان پێداگرییان لە سەر تاک و سەربەستییەکانیە. بەلام هەردووکیان – ئازادیخوازی و پاراستنخوازی- لە ریزی ئایدیۆلۆژییەکانی راستی دیمۆکراتیکن و لانی کەم لە چەمکی ئابووریدا خوازیاری سەربەخۆیی و دەستێوەرنەدانی دەولەتن.

حکوومەتە لیبرالەکان لە سۆنگەی قەیرانی نێو حکوومەتە پاراستنخوازەکانە هاتنە دی. گۆرانی پێکهاتەی ئابووری و کۆمەلایەتی، ئاوا بوونی هەتاوی فێئۆدالیزم و گەشەی چینە بازرگان و پیشەسازەکان، هاوکات لە گەل نوێ بوونەوەی کولتووری نەتەوەکان، هەلی بۆ سەرهەلدانی لیبرالیسم رەخساند. لە بریتانیادا چاکسازییەکانی سالی ١٨٣٢ و بەخشینی مافی هەلبژاردن بە چینە پیشەسازەکان، دەسپێکی سەرهەلدانی رژیمی لیبرال لەو ولاتەدا بوو. رژیمە لیبرالەکانی سەدەی نۆزدەهەمی ئەوروپا لە باری روانینیان بە چەمکی ئابووری، جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە گەل پاراستنخوازی نەبوو.

## ليبراليسم

ليبراليسم وەكوو ئايديۆلۆژی رژيمە سياسيەكانی ئەورووپا لە كۆتايی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەی‌سەند. لە راستيدا ليبراليسم رژيمی سياسی چينی بورژوا بوو كە پاش رووخان و ئاوا بوونی فيئۆداليسم و دەوڵەتی تۆتاليتر و حكوومەتی پاراستن‌خوازی ئاغەواتانی زەويدار، سەريان هەڵدا. لە رەهەندی ئاڵو گۆڕی مێژووييەوە، بورژوازی سەرەتا لە بەرانبەر رژيمی كۆندا، تايبەتمەندييەكی شۆڕشگێڕانەی بوو.

لە باری مێژووی هزرەوە، بيرو رای بيرمەندانێک وەكوو جۆن‌لۆک، مۆنتسكيۆ و ئادام سميت بنەمای هزری ليبراليسميان پێک دێنا. شۆڕشی فەرانسە لە گەشەی ليبراليسمدا دەوری سەرەكی هەيە. بە گوێرەی ليبراليسمی بورژوازی هەرچەشنە بەربەستێكی سياسی دەبوايە لە پێش بازرگانی ناوخۆ و دەرەوەيی هەڵبگيرايە. هەروەها دەبوايە هەرجۆرە كۆسپ و تەگەرەيەكی سياسی و فيئۆدالی لە پێش زەويدار بوون هەڵبگيرێ و بە مەبەستی سەربەستی چالاكی تاک لە بواری بازرگانی و پيشەسازيدا، دەبوايە پيشە فيئۆدالييەكان لە ناودا نەمێنن.

لە باری سياسيەوە، ليبراليسم بريتيە لە فەلسەفەی زۆرتر كردنی ئازادييەكانی تاک لە نێو كۆمەڵگادا تا ئەو جێگای كە ئيزنی هەيە و پێی‌دەكرێ. دوژمنی سەرەكی ليبراليسم، كۆمای دەسەڵاتە كە زۆرترين زيان بە ئازادی تاک دەگەينێ. بە پێی ئەم روانگەيە، تاک لە جڤاک و قازانجی تاک لە قازانجی جڤاک سەرتر و لە پێشترە. لە راستيدا ليبراليسم نە تەنيا ئايديۆلۆژييەكی سياسيە، بەڵكوو جۆرێک رێگا و شێوەی ژيانە؛ بەم واتايە ليبراليسم هەر لە سەرەتاوە جمک و لفەدوانەی سێكۆلاريزم، مۆدێرنيسم، ويست‌خوازی، بازاڕی ئازاد، ركەبەرێی تەواو، تاک‌خوازی، بەشداری سياسی، سيستەمی نوێنەرايەتی، ئەقلانييەت، پێشكەوتنخوازی و زانست‌خوازی بووە. ليبراليسم خوازياری جۆراوجۆرييە لە هەموو

ڕەهەندەکانی ژیانداا، بۆیە دژ بە **تاکخوازی** (Monism)، **کۆمابوون** (Centralism)، **پاوانخوازی** (Monopolism) و **دەسەڵاتخوازێتی** (Authority)یە (بشیریە، ۱۳۸۲).

## لێهات/ productivity

لە گشتیترین واتایدا بریتیە لە ڕێژەی قازانج لە بەرانبەر سەرمایەیەک کە بۆ بە دەست هێنانی ئەو قازانجە تەرخان کراوە. سەرمایەی تەرخان کراو و قازانجی بە دەستهاتوو، زۆرتر بە گوێرەی پێوانە فیزیاییەکان دیاری دەکرێن، بەڵام لێهات دەکرێ هەم بە گوێرەی پێوانە فیزیاییەکان و هەمیش بە گوێرەی یەکەی بەهاکان بژمێردرێ (گولد؛ ۱۳۸٤).

**مرۆڤخوازی/ humanism**

یەکێک لە کێشەکانی هەموو لقەکانی زانستە ئینسانییەکان ئەوەیە کە کۆمەڵناسان وفیلسووفانی مەعریفە (epistemologists)، پێناسەیەکی تەواویان لە زانست نییە کە هەموویان دانی پێدا بنێن. بە گشتی بۆ گەیشتن بە ئاوەها پێناسەیەک، یەکێک لەم سێ روانگەیانە هەڵبژاردووە: پازیتیڤیسم، واقیعگەری و مرۆڤ خوازی. ئەم سێ روانگە تا رادەیەک لە گەڵ بیردۆزگەلی ئەرکخوازی، دژایەتی و کارلێک هاوراییان هەیە.

١- پازیتیڤیسم: بریتیە لە شێوازێکی لۆژیکی کە بنەمای زانست لە سەر دیداری راستەوخۆ و سیستماتیک دادەڕێژێ. ئاگۆست کۆنت دەڵێ روانگەی گشتی پازیتیڤیسم بریتیە لە روانینێکی فەلسەفی، شێوازێکی زانستی و ئامانجێکی چاکسازی. لە بیرو راکانی کۆنتدا ئەم رەهەندانە زۆر لێکتر جیاواز نین.

پازیتیڤیسم وەکوو بۆچوونێک لە بەرانبەر فەلسەفەی ئاوەزخوازی هێگڵەوە هاتە دی و شێلینگ فەلسەفەی هێگڵی فەلسەفەی نیگەتیڤ ناو دەبرد و رایگەیاند کە تەوەری سەرەکی فەلسەفەی پۆزیتیڤ دووری لە بیری ئینتزاعی و پەرژانە سەر بوونی دیارە(توسلی؛ ١٣٨٧). پازیتیڤیسم هان دەدا بە گوێرەی شێوازەکانی زانستە سروشتییەکان، پێوەرێک بۆ پێش بینی کردنی هەڵسوکەوتی تاکەکان و کۆمەڵگا ببینێتەوە.

٢- واقیعگەری: سیستەمێکی هزری لە واتاکانە کە دەتوانێ دیاردەیەکی تایبەت رابێنێ و شرۆڤەی بکا(وەکوو ئەمەی کە بەشی ئابووری، زەینی مرۆڤ یان ئەستێرەکان چۆن کاردەکەن). هەرچەند واقیعخوازەکان بۆ شرۆڤەی پرسەکانیان چێژ لە زانیارییە ئەزموونییەکانیش وەردەگرن، بەڵام بەڕای ئەمان ئەم زانیارییانە ئەوەندە راست نین کە بتوانین بە تەواوی متمانەیان پێ بکەین. بەڕای لایەنگرانی

ئەم بۆچوونە، ئێمە پێویستمان بە هۆکارێکی هزری بەهێز هەیە کە بتوانین پرسەکانمانی پێ شرۆڤە بکەین و روونیان کەینەوە. بیرو ڕاکانی مارکس، وەکوو بیردۆزی واقیعگەرا دێنە ژمار. پرسی سەرەکی لە لای مارکس ئەوەبوو کە سەرمایەداری چۆن کار دەکات. بۆ شرۆڤەی ئەم تەوەرە، تیۆری شێوازی بەرهەمهێنانی گەشە پێدا.

٣- مرۆڤ خوازی: مەعریفەناسانی مرۆڤخواز بڕوایان وایە کە توێژینەوەلە سەر جیهانی مرۆڤ زۆر جیاوازە لە گەڵ توێژینەوە لە سەر جیهانی فیزیایی و بیۆلۆجی یان جیهانی مادده. بۆیە زانستە ئینسانییەکان دەبێ شێوازێکی نوێ بۆ بە دەسهێنانی زانست دابێنن؛ شێوازی کە بە دووی دیتنەوەی واتادا بگەڕێ. هەرچەن لە توێژینەوەکانی ئەم شێوازە هزرییەدا سەرنجی زۆر دەدرێتە جیهانی ئەزموونی (وەکوو پازیتیڤیستەکان)، بەلام پێداگری سەرەکی لە سەر بایەخی تێگەیشتن و شرۆڤەیە. لە لای پێڕەوانی ئەم روانگەیە، کومەڵناسی زانستی لە گەڵ کەمایەسی زۆر رووبەڕوویە:

ئا: رەفتاری مرۆڤ ئاڵۆزتر لەوەیە کە ئیزن بداتە کۆمەڵناسان تا کردەوەی تاکەکان بە وردی پێشبینی بکەن. ئەستێرەناسان دەتوانن بە وردی گەڕانی ئەستێرەکان پێشبینی بکەن و بزانن کە -بۆ وێنە- دە ساڵی داهاتوو چ ئەستێرەیەک نزیکترین مەدای لە گەڵ زەوی هەیە. ئەستێرەکان بیرناکەنەوە، کەچی مرۆڤ خاوەنی بیرێکی نیوە سەربەخۆیە.چونکە هیچ دوو مرۆڤێک لە بەرانبەر یەک رووداودا یەک جۆر کاردانەوەیان نییە، چاکترین کار بۆ کۆمەڵناسان ئەوەیە کە پیشان بدەن کاردانەوەی چینێک لە خەڵکی لە گەڵ کاردانەوەی چینێکیتر جیاوازە. ئەمە بە مانای تێکشکانی کۆمەڵناسی نییە، بەڵکوو واتای ئەوەیە کە ئەرکی کۆمەڵناسی جیاوازە لە گەڵ زانستە ئەزموونییەکان.

ب: مرۆڤ لە بەرانبەر گۆڕانکارییەکانی دەورو پشتی خۆی کاردانەوەی هەیە، بوونی توێژەرێک گۆڕانکاریەک دێتە ئەژمار و بە سەر ڕەفتاری مرۆڤەکاندا کاریگەری هەیە و گۆڕانیان تێدا دێنێتە دی. ڕوانینی ئەستێرەناسێک بۆ مانگ نابێتە هۆی هیچ گۆڕانێ، بەڵام خەڵکی گەر بزانن کەسێک بە وردی سەیری هەڵسوکەوتیان دەکات، هەڵسوکەوتیان دەگۆڕن. هەندێ کەس ڕەنگە لەو وردبوونەوە تووڕە بن یاخۆ نیگەران بن، ڕەنگە هەندێ کەسیش بتوانن یاریدەی توێژەر بدەن.

پ: ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام خەریکی گۆڕانن؛ ئەو شتەی پێشتر دروست بووە، ڕەنگە ئێستا دژ بە نۆرم و ڕێسا بێ. بەڵام یاساکانی فیزیا پێشتر هەروا بوون و ئێستاش هەروان و هیچ گۆڕانکاریەکیان تێدا نییە و هیچ پێوەندییەکیان بە کولتوورێکی تایبەتەوە نییە. بەڵام ڕەفتاری مرۆڤەکان ئەوەندە جیاوازن کە کۆمەڵناس ناتوانێ بۆ هەموویان یاسایەکی نەگۆڕ و قایم دابنێ. لە ڕاستیدا هەندێ لە توێژینەوە گرینگەکانی کۆمەڵناسی لە سەر جیاوازی گۆڕانکاری کۆمەڵگاکانە.

ت: چونکە کۆمەڵناسان خۆیان بەشێک لەو جیهانە کۆمەڵایەتیەن کە لە سەری دەکۆڵنەوە، ناتوانن بە ئاسانی باوەڕو بەهاکانی خۆیان لە توێژینەوەکەیاندا بەشداری نەدەن. باوەڕو بەهاکانی کیمیادانێک هیچ کاریگەریەکی بەسەر لێکۆڵینەوەکەیدا نییە، بەڵام کۆمەڵناس خۆی بەشێک لەو بابەتەیە کە لە سەری دەکۆڵێتەوە. باوەڕو بەهاکانی کۆمەڵناسێک کە لە سەر تەوەرێک دەکۆڵێتەوە، دەتوانێ ببێتە هۆی تێکدان و کەم بایەخ کردنی توێژینەوەکەی.

ج: مرۆڤ بوونەوەرێکی سیمبۆلیک و زەینیە، بۆیە هەڵسوکەوتی لە دیاردە سروشتییەکانی‌تر جیاوازە. مرۆڤ بە پێچەوانەی ئەستێرە یان مولکوولەکان، بەردەوام خەریکی داڕشتنی واتاگەلی نوێیە. ئەوەی مرۆڤ لە

دیاردەکانی‌تر دادەبڕێ ئـەوەیـە کـە مـرۆڤ هـەردەم خـەریکـی داهێنـان و پەرەدان بە سیستەمە سیمبۆلیکەکانە. بەم بۆنەوە کۆمـەڵناسـان نـاتوانن بـە ئاسانی کۆمەڵـگاکان وەکـوو شـتێکی دەرەکـی بخـەنـە بـەر لێکۆڵـینەوە و تۆژینەوە؛ بەڵکوو دەبێ بڕۆنە نێو جڤاکەکانەوە و لە گـەڵ جیهـانی واتاکـانی ئەندامانی کۆمەڵگا ئاشنا بن.

ناسینی ئـەم کۆسـپانە بۆتـە هـۆی ئـەوەی کـە کۆمـەڵناسـان بـە دووی ڕێگایەکی جیاواز بۆ شرۆڤەی جڤاکە ئینسانییەکان بن. کۆمەڵناسـان ناڵـێن توێژینەوەکەیان زانستییە (زانستە ماتماتیکییەکان)، بەڵـکوو هـان دەدەن تـا کۆمەڵناسی وەکوو لقێک لە زانستە مرۆڤییەکـان –کـە سـەرنجێکـی زۆرتـر دەداتـە واتـای هـەڵـس‌وکـەوتـەکـانی مـرۆڤ–پـەرە پـێ بـدەن. نیزبێـت نامیلکەیەکـی لـە ژێـر نـاوی «کۆمـەڵناسـی وەکـوو شـێوازێکی هونـەری» بڵاوکردەوە و تێیدا پیشانی دابوو کە «چـۆن پرسـەکـان دەیـانتوانی جیـاواز بن... گەر زانستە کۆمەلایەتییەکان لە کاتێ پێکهـاتنی سیسـتماتێکیاندا لـە سەدەی نۆزدەهەم، هونەرەکانیشیان وەکوو زانستە فیزیاییەکان، بە چەشـنی مۆدێل بکێشایە» (*nisbet, R. A; 1976: 16*).

دەتوانین ئەم کۆمەڵناسییە بە کۆمـەڵناسـی مـرۆڤ‌خـواز ناوبـەیـن. ئـەم کۆمەڵناسییە چوار پێوەری سەرەکی هەیە: یـەکـەم کۆمـەڵـناس دەبـێ لـە توێژینەوەکانیدا زەینی بوون و داهێنەری مرۆڤی لە بەرچـاو بـێ و ڕێـزی بـۆ دانێ. واتە، کۆمەڵناس دەبێ پیشان بدا کە چلۆن مرۆڤ لە بەرانبەر گوشـار و زەختی کۆمەلایەتییـەوە کاردانـەوە لـە خـۆی پیشـان دەدا و لـە پێکهـاتنی جیهانی کۆمەلایەتیدا دەوری هەیە. دووەم: کۆمەڵناس دەبێ خۆی ئاوێتـەی ژیانی ڕاستەقینەی خەڵکی بکات (قسە کردن و هـەسـت و کـردەکانیـان) و تەنیا لە باری دەروونی و بیۆلۆجیکیـەوە سـەرنجیـان پـێ نـەدات، بـەڵـکوو پێوەندییان لە گەڵ ڕێکخراوە کۆمەلایەتییـەکـانیش (بـە تایبـەت ڕێکخـراوە

ئابوورییەکان) بخاتە بەر وردبوونەوە. سێیەم: کۆمەڵناس دەبێ پیشان بدا کە ئاشنایەتییەکی ئاسایی و قووڵی لە گەڵ ئەو ئەزموونانە هەیە. چوارم: کۆمەڵناس دەبێ بە ڕێژەی دەوری ئاکاری و رامیاری خۆی و هەروەها کۆمەڵگای بەر توێژینەوەی ئاگادار بێ و دڵنیا بێ کە لە پرۆسەی توێژینەوەیدا کاریگەرییەک بە سەر کۆمەڵە ئامارییەکەیدا دانانێ. هەرچەن ئەم پێوەرانە ئاڵ و گۆڕ و شرۆڤە و کەم و زۆر دەکرێن، بەڵام ناتوانین کۆمەڵناسییەکی مرۆڤخواز بەبێ بەکارگرتنی لانی کەمی ئەم پێوەرانە لە بەر چاو بگرین.

## ململانێی کولتووری/ cultural conflict

بڕێ جار هەندێ تایبەتمەندی کولتووری وەکوو نەتەوە یا ئایین، دەبێتە هۆی جیایی و دابڕانی خەڵک لە یەکتر. بۆ وێنە یۆگۆسلاوی پێشوو لە باشووری رۆژاوای ئەرووپا: هۆی داگرسانی ئاوری شەڕ و ئاژاوە و توند و تیژی لە سالانی رابردووی ئەم ولاتەدا هەر ئەم ناکۆکی و جیاوازییە کولتووریانە بوو. ئەم ولاتە بچووکە کە پانتای نیوەی بریتانیایە، بەر لە هەڵوەشان، نزیک بە بیست و پێنج میلیۆن دانیشتوو، دوو جۆر رێنووس، سێ ئایین، پێنج نەتەوە و شەش کۆماری رامیاری تێدا بوو و لە لایەن حەوت کولتووری لێک جیاوازەوە گەمارۆ درابوو. ململانێی کولتوورییەک کە ئەم ولاتەی بەرەو شەڕی ناوخۆ برد، پیشاندەری ئەوەیە کە وردە کولتوورەکانی نێو کۆمەڵگایەک، تەنیا سەرچاوەیەک بۆ پێوەندی و گەشەی کولتوورەکان نین، بەڵکوو دەتوانن ببنە سەرچاوەیەک بۆ دژایەتی و ناکۆکی نێوان کولتوورەکان.

## ململانێی کۆمەلایەتی / social conflict

هەندێ لە بیرمەندانی زانستە کۆمەلایەتییەکان رایان وایە کە کۆمەڵگا

بـەردەوام خـەریکـی ململانـێ و پێکدادانـە و هـۆی مانـەوەو بـەردەوامـی کۆمەڵگاش هەر ئـەم پێکدادانـەیـە (کرایـب؛ ١٣٨٤). مـەرج نییـە کـە ئـەم پێکدادانە توندو تیژی تێدابێ؛ لە ڕاستیدا ئەندامانی کۆمەڵگا هەر یەکـەو بـە نیازن کە لە پێوەندی کۆمەڵایەتیدا قازانجی زۆرتریان دەسکەوێ؛ بێشک لە نێو دونیایەکیشدا کە تێیدا دەژین هەندێ لە تاک یان گرووپەکان بـەشـێکی زۆرتر لە بەهرەکانی دونیایان کردۆتە هی خـۆ و کـەڵـکی لـێدەگـرن. ئـەم ململانێیە بۆ گەیشتن بە قازانجی زۆرتر، بەردەوامە (احمدی؛ ١٣٨٥). زیمێل دەڵێ: ململانێ دەبێ بیچمێک لە سەرجەمی ژیان بێ، چونکە لانی کەم دوو کەس پێکەوە دەبەستێتەوە؛ ململانێ، ئاکـامی «هۆکـارە جیاکـەرەوەکـان»ە، وەکوو ڕق و قین و ئێرەیی و هەروەها کۆشەوەیەکە بۆ چارەسەر کـردنی ئـەو ناکۆکییانەی هاتوونەتە ئاراوە و هەروەها پاراستنی یەکەتی؛ هەرچەنـد ببێتـە هۆی لەناوچوونی یەکێک لە دوو لایەنی ناتەبا و نـاکۆک. ململانـێ، لایـەنـە نیگەتیڤ و پازێتیڤەکان تێکەڵ دەکات و دەبێتە هۆی هاتنە دی و بـەردەوام بوونی کۆمەڵگا. هەرچەن ململانێ لە ڕووبەری تاکەکەسیدا زۆر وێرانکـەر و ناحەزە، بەڵام لە ڕووبەری کۆمەڵایەتیدا بە پێچـەوانـەی ئـەمـەیـە (کرایـب؛ ١٣٨٤). بڕوانە: **ڕوانگەی ململانێ؛ ململانێی چینایەتی؛ چینی کۆمەڵایەتی؛ گۆڕانی کۆمەڵایەتی؛ دیالکتیک.**

## ملهۆڕی / despotism

ملـهۆڕی، دەکـرێ وەکـوو جۆرێـک دەسـەڵات پێناسـە بکـرێ کـە ئـەم تایبەتمەندییانەی تێدایە: ١) هیچ دەسەڵاتێکی یاسایی و فـەرمـی نییـە کـە بتوانێ بەربەستی ئەم دەسەڵاتە بێ، ٢) لەم سیستەمەدا دەسەڵاتدار ملهۆڕانە دەبزوێتەوە و کارەکانی پێش‌بینی ناکرێن، ٣) هەروەها یاسا بە مانای مۆدێرن لەم سیستمەدا جێگایەکی نییە و ویستی ملهۆڕ هـەمـان یاسـایە و جێگـای

یاسا دەگرێتەوە. ئەم زاراوەیە، جۆرێک سووکایەتی تێدایە، بەلام هەنووکە بۆی هەیە باس لە ملهۆڕی خێرخوازانە یاخۆ ڕووناکبیرانە بکرێ.

هەرچەن بۆی هەیە بابەتی یەک ببێتە هۆی هاتنە دی بابەتی دوو، بەلام مەرج نییە واش بێ؛ چونکە ڕەنگە حوکمڕان بۆ ڕێک و پێک کردن و بەردەوام بوونی حوکمدارییەکەی، خۆی بەر بە ئارەزووەکانی بگرێ و یاسایەک بۆ شێوازی هەڵسوکەوتی خۆی و دەست و پێوەندی دابڕێژێ و لایەنگری لێ بکات. پرووسی سەردەمی فرێدریکی دووەم، نموونەیەکی تەواو لەم بۆچوونەیە. هەندێ لەو کۆیلەدارانەی کە سامانێکی زۆریان پێکەوە نابوو، لەم شێوازە پێڕەوییان دەکرد. بە گوێرەی ئەو پێناسەی کە لە ملهۆڕی کرا، زۆرجار ملهۆڕی بە ئۆتۆکراسیوە دەچوێنن.

لەم دواییانەدا ک.ئا. ڤیتفۆگڵ لە باسە کۆمەڵناسیەکانیدا جارێکیتر زاراوەی «ملهۆڕی ڕۆژهەلاتی» هێنایە بەر باس. مەبەستی ڤیتفۆگڵ لە ملهۆڕی ڕۆژهەلاتی نە تەنیا جۆرێک دەسەلات، بەلکوو جۆرێک پێکهاتەی کۆمەلایەتییە. ئەم کۆمەڵگایە هەندێ تایبەتمەندی هەیە کە بریتین لە: ا) حکوومەتی دیکتاتۆری؛ ب) حکوومەتی بۆرۆکراتیکی ناوەندی؛ پ) نەبوونی حکوومەتی ئاغەواتانی نەگۆڕ؛ ت) کەم دەستی بازرگانان؛ ج) بێبایەخی کۆیلەداری؛ چ) کشتوکاڵی ئاوی بەستراو بە تۆڕگەلی ئاودێری بەربلاو و مەزن. بە رای ڤیتفۆگڵ ئەم خاڵە دواییانە گرینگتر و پڕبایەختر و کاریگەرترە و دەبێتە هۆی هاتنە دی تایبەتمەندییەکانیتر.

چەن ڕەخنەیەک لەم بۆچوونە گیراوە کە بریتین لە: وشەی «ڕۆژهەلاتی» نەختێ بیری خوێنەر دەشڵەژێنێ، چونکە هەموو سیستەمە حکوومییەکانی ڕۆژهەلات ئەم تایبەتمەندییانەیان نییە؛ هەروەها ڤیتفۆگڵ بۆ خۆی چەن نموونەیەک لەم چەشنە حکوومەتە لە دەرەوەی ئاسیا دەبینێتەوە (وەکوو: ئینکاکان، ئازتەکەکان و ڕووسیای کەونارا). هەروەها گوتنی ئەم پەیڤە کە

ئەم تایبەتمەندییانە پێکەوە بەستراون، هەڵەیە.

بەڵام ئەوەی کە بە دڵنیاییەوە دەتوانین باسی لێ بکەین ئەم خاڵانەیە: ١) بە تەنیا حکوومەتگەلی بە دەسەڵاتی ناوەندییەوە دەتوانن ئاوەها سیستەمێکی گەورەی ئاودێری چێ بکەن و چاودێری لێ بکەن؛ ٢) بەندیوار بوونی جەماوەر بە ئاوەها سیستەمێک دەبێتە هۆی زۆرتر کۆوەکردنی دەسەڵات لە نێو حکوومەتدا، واتە پتر گەشە بە کۆوە بوونی دەسەڵات دەدات؛ ٣) کۆمەڵگا ئاسیاییەکان-تەنانەت ئەوانەش کە کشتوکاڵیان لە رووبەرێکی بەربڵاودا پێویستی بە ئاودێری هەیە- ئاڵوگۆڕێکی زۆریان بە سەردا تێپەڕاوە، بە چەشنێکە ناتوانین لە ریزێکی ستاتیکدا(static) دایانبنێین (گولد؛ ١٣٨٤).

## مووچەی هاوسەنگ / comparable worth

ئەم زاراوەیە بۆ چاکسازی ئەو کرێ و نرخ و مزانەی بە کار دەبرێ کە بناخەیان لە سەر دووچاوەکی رەگەزییەوە دارێژراوە. مەبەستی سەرەکی ئەم زاراوەیە کاری ئەو ژن و پیاوانەیە کە پێویستیان بە توانایی و بەرپرسایەتی و زانیاری و کۆشەوەی یەکسان هەیە، دەبێ مز و مووچەی یەکسانیان پێ بدرێ. بە کورتی ئەم زاراوەیە خوازیاری ئەوەیە بۆ کاری یەکسان مووچەی یەکسان بدرێ. کۆمەڵناسانی هاوچەرخی ئەمریکی زۆر ئەم واتایە بە کار دەبەن. هەرچەن ئەم واتایە لە لایەن یاسای کاری فیدراڵەوە پەسند نەکراوە، بەڵام لە زۆربەی ئەیالەتەکاندا پەسند کراوە و دانی بە سەردا نراوە (عضدانلو، ١٣٨۴).

## مەرگی خۆش (مەرگی دڵسۆزانە) / euthanasia

بریتیە لە هەمان کوشتن بە هۆی بەزەییەوە. ئەم زاراوە لە زمانی

یوونانییەوە سەرچاوە دەگریّ و بە مانای بەشداری کردنە لە مەرگی کەسێک کە بە هۆی نەخۆشییەکی بیّدەرمانەوە ئازار دەبینیّ.

لە سالّی ۱۹۹۰دا لە ئەمریکا، کچێکی بیستو شەش سالان دەکەوێتە ژێر ترۆمبیلەوە و بێهۆش دەبیّ و هەرچەند پزیشکان هان دەدەن پێیان دەرمان ناکریّ. ئەم بابەتە لە گەلّ دایک و بابی باس دەکەن و دایک و بابی کچەکە پاش ئەوەی دلنیا دەبن کە کچەکەیان تەنیا دەتوانیّ بە ژیانی روەکی درێژە بدا (واتە: ژیانی بیّهۆش و جوولە و هەست و نست)، بۆ ئەوەی دوایی بە ژیانی بێنن دەکەونە شوێن دیتنەوەی رێگەچارەیەکی یاسایی. ئەم پرسە دەنێردرێتە دادگای بالای ئەمریکا و دادگا پاش بیستنی بیرو ڕای دایک و بابی کچەکە، ئیزن دەدات تا سرۆمی خۆراکی لە کچەکە جیابکرێتەوە و بەم چەشنە پاش دوازدە رۆژ ژیانی ئەو کچە دوایی دێت ( Mauro, T; 1990:3A).

بیّگومان لە سەرانسەری دونیادا هەزاران کەس بە چارەنووسی ئەم کچە تووش هاتوون. پرسیار ئەمەیە کە ئایا کەسانێک کە ئاوەها کارەساتێکیان بە سەردا دێت، ئیزنیان هەیە لە پزیشک و بنەمالەیان بخوازن کە دوایی بە ژیانیان بێنن؟ وەلامی ئەم پرسیارە هەندیّ کێشەی فەلسەفی، ئاکاری، رامیاری، کۆمەلایەتی و بە تایبەت یاسایی دێنێتە ئاراوە. پاش وتووێژ و باس و لێدوانی زۆر، دادگای فیدرالّی ئەمریکا یاسایەکی چەسپاند کە ئیزن دەدا تا هەرکەس کە دەیەویّ راسپاردەیەک بنووسیّ و لە بنەمالە و پزیشکەکانی داوا بکا کە گەر ئاوەها کارەساتێکی بۆ هاتەدی، دوایی بە ژیانی بێنن. بەگوێرەی ئەم یاسایە کە لە سالّی ۱۹۹۱دا چەسپێندرا، نەخۆشخانەکان و ناوەندە دەرمانییەکان دەبوایە بۆ ئەم راسپاردەیە رێز دابنێن و لە کاتێکدا کە تاک کەوتە ئاوەها هەلومەرجێکەوە و توانی بڕیاردانی نەما، بە پێی ئەو راسپاردەیە ببزوونەوە. هەروەها ئەم یاسا بە تاک ئیزن دەدات کە

کەسێکی‌تر بکاتە بریکاری خۆی تا لە ئاوەها هەل‌ومەرجێکدا بڕیاری بۆ بدات. هەرچەند ئەم یاسایەش وەکوو زۆر یاسای‌تر، لە ئەیالەت و نەخۆشخانەکانی ئەمریکادا بە جیاواز هەڵس‌وکەوتی لە گەڵ دەکرێ، بەڵام بە هەر جۆر کە بێ، ئەو ئیزنە دەداتە تاکەکان کە بۆ ژیان یان مەرگی خۆیان بڕیار بدەن.

ئەمڕۆکە لە ئەمریکادا لایەنگری لە مافی تاکەکان بۆ مردن، کە بەناوی خۆش‌مەرگی‌پاسیڤ بەناوبانگە، رووی لە زۆربوون ناوە. بەڵام هاوکاری و بەشداری لە مردنی کەسێکی‌تردا کە بەناوی خۆش‌مەرگی‌ئەکتیڤ دەناسرێ، هەنووکە باس و شەڕەقسەی زۆری لە سەر دەکرێ و تەنانەت لە هەندێ ئەیالەتی ئەمریکادا بەکارێکی نایاسایی دەزانرێ.

## مەودای کۆمەڵایەتی/ social distance

زاراوەی مەودای کۆمەڵایەتی ئاماژەیە بە ئاستێک لە لێکتر گەیشتن و هاودڵ بوون. هاودڵی و هەڤڕەنگییەک کە یەکێک لە لایەنەکانی پێوەندی کۆمەڵایەتی بەڕێژەی لایەنی‌تر لەخۆیدا هەستی پێدەکات و بەگوێرەی رادەی لەیەک‌گەیشتن هەڵدەسەنگێندرێ. هەرچەند هەست بە هاودڵی لە هەر یەک لە لایەنەکان لەم رادەیەدوورتر بێ، مەودای کۆمەڵایەتی زۆرترە.

رابێرت ئێزرا پارک ئەم زاراوەیەی لە زیمل وەرگرت و هێنایە نێو زاراوەکانی کۆمەڵناسیەوە. ئەو لە باس لە سەر مەیل بە نزیک بوون و دوور بوونەوەدا دەیگوت: «گەر بەجێی ئەوەی کە ئەم دوو زاراوەیە جیاواز لە یەک بزانین، وەکوو دوو وەڵامی دژ بە یەک بۆ شوێنگەیەکی یەکسان سەیریان بکەین کە تێیدا مەیل بە نزیک بوونەوە بە مەیل بە لێک‌دابڕان گۆڕانی بە سەردا دێ و پێکڕا تێکەڵ دەبن، ئەودەم لە گەڵ واتای مەودای کۆمەڵایەتیدا ئاشنا دەبین» (اوتو دالک؛ ١٩٦٤).

هەرچەند پارک هیوادار بوو کە بەڵکوو جیاوازییە ڕەگەزییەکان لە داهاتوویەکی نزیکدا لەڕێی هاوڕەنگی و هاودڵیەوە دوایی بێت، بەڵام بیری نەدەکردەوە کە ئەم پرۆسە پێوەندییەکی زۆری لە گەڵ ڕاڤەی پێوەندییە ڕەگەزیەکان لە ئەمریکادا هەبێ. واتای مەودای کۆمەڵایەتی، بەبڕوای پارک بۆ فام کردنی پێوەندییە ڕەگەزیە هەنووکەییەکان بایەخێکی سەرەکی بوو. ئەم واتایە باس لە ڕادەی نزیکی نێوان گرووپەکان دەکات و «ڕادەی نزیکی، ڕادەی کاریگەری هەرکەس بە سەر کەس یا کەسانی‌تر لە پێوانە دەدات». هەرچەند مەودای کۆمەڵایەتی نێوان تاک و گرووپەکان زۆرتر بێت، ڕادەی کاریگەریان بە سەر یەکدا کەمتر دەبێتەوە. بەڕای پارک، هەندێ زاراوەی وەکوو وشیاری ڕەگەزی یا چینایەتی، باس لە مەودای کۆمەڵایەتی نێوان گرووپەکان دەکات. ئەم زاراوانە «باس لە دۆخێکی زەینی دەکەن کە تێیدا لە گەڵ ئەو مەودایە ئاشنا دەبین کە ئێمە لە گەڵ ئەو چین یا نەتەوانەی کە نایانناسین، جیا دەکەنەوە». بەتایبەت لە وڵاتێک وەکوو ئەمریکادا مەودایەکی سەقامگرتوو و باو دڵنیامان دەکاتەوە کە ڕەش‌پێستێک «بە تەواوی وا لە سەر جێگای خۆیدا». تا ئەو کاتەی کە ئەو کەسە ئاگەداری شوێن و مەودای خۆی بێ و بیپارێزێ و لێی لانەدا، پێوەندییەکی گەرم و گوڕ لە نێوان باڵادەست و ژێردەستدا هەیە. خاتوونی ماڵ دەتوانێ پێوەندییەکی باشی لە گەڵ چێشت‌لێنەرەکەی بێ، بەڵام ئەم پێوەندییە تەنیا کاتێک دەپارێزرێ کە چێشتکەر «مەودای شیاوی» خۆی لە گەڵ خاتوون بپارێزێ (کوزر؛١٣٨٧).

پارک وای بیردەکردەوە کە ئەو شتەی کە پێی دەڵێن دەمارگیری «لە ڕاستیدا هەمان مەیلی کەم تا کورتێک غەریزی و دەروونی تاکەکانە بۆ پاراستنی مەودای کۆمەڵایەتیان». بەبڕوای پارک، ئەم دەمارگیریە بە هیچ جۆرێک نابێ وەکوو نەخۆشی بزانرێ، بەڵکوو ئەمە دیاردەیەکی مرۆییە و

هەموو کەس لە هەموو شوێن و لە هەموو کاتدا هەیەتی. ئەو دەیگوت مرۆڤەکان بە مەیل و حەزی تایبەت بە خۆ لە دایک دەبن و مەیل و حەزی‌تر لە درێژەی ژیانیاندا بەدەست دێنن. «مرۆڤێکی بێ‌دەمارگیری، لە راستیدا مرۆڤێکی بێ‌باوەڕ و بێ‌کەسایەتییە». دۆستایەتی و دوژمنایەتییەکان بۆ مانەوەی یەک پێویستن. «هەروەک چۆن دونیا بەبێ دۆستی لە بیری کەسدا ناگونجێ، لە ئاوەها جیهانێکدا ژیان بەبێ دوژمنایەتیش زۆر دەگمەنە، چونکە ئەم دوو دۆخە بە یەک واتان و تا رادەیەک پێکڕا بەستراون؛ بەلام دەمارگیریەک کە ئێمە سەبارەت بە تایبەتمەندی دۆستەکانمان هەمانە، دەبێتە بەربەستێک بۆ ناسینی هێژایی دوژمنەکانمان». کەواتە، دەمارگیری و مەودای کۆمەلایەتی بە رەهەندگەلی بەردەوام و هەتاهەتایی کۆمەڵگای مرۆڤ دێنە ئەژمار (هەمان سەرچاوە).

لەم روانگەوە، دەمارگیری رەگەزیش وەکوو دەمارگیری چینایەتی و کاستی «تەنیا یەکێک لە رەهەندەکانی یەک جۆرن». دەکرێ ئەم دەمارگیریە وەکوو «جۆرێک دیاردەی پێگەیی» لە بەرچاو بگیرێ.

پارک لە سەر ئەم بابەتەدا پێداگری دەکرد کە نابێ دەمارگیری رەگەزی و مەودای کۆمەلایەتی لە گەڵ ململانێی کۆمەلایەتیدا بە یەکێک بزانرێن. دەمارگیری و مەودای کۆمەلایەتی کاتێکە کە ژێردەست، دان بە پێگەی خۆیدا بنێ، بەلام ململانێ ئەو کاتەیە کە ژێردەست پێگەی نزمی خۆی قبووڵ نەکات و بۆ گۆڕانی تێبکۆشێ. پارک لە ۱۹۲۸دا ئاماژەی بەم خاڵە دووربینانە کردووە: «رەنگە لە ئەمریکادا دەمارگیری رەگەزی کەمتر لە هەر شوێنێکی‌تر بێ، کەچی ململانێی رەگەزی پتر لە هەموو شوێنی‌ترە، چونکە لەم ولاتەدا پێشکەوت و ئاڵوگۆڕی زۆرتر لە ئارادایە. رەش‌پێستان لە ئەمریکادا سەرهەڵدەدەن و رادەی خەباتیان، پیشاندەری ئاستی پێشکەوتیانە» (کوزر؛۱۳۸۷).

## میدیا گشتییەکان/ mass media

بەشی هەرە زۆری کۆمەڵناسان لەم بابەتەدا هاودەنگن کە تیکنۆلۆجی هۆکارێکی گرینگ و سەرەکییە لە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا. تیکنۆلۆجی لەخۆڕا هیچ کارێک ناکا؛ بەڵکوو ئەمە خەڵکن کە بە هۆی بەهرە وەرگرتن لە تێکنۆلۆجیەوە دەبنە هۆی گۆڕانی کۆمەڵایەتی. بەلام بەبێ کەڵکوەرگرتن لە مێدیا گشتییەکان، دەتوانین بڵێین کە کۆمەڵگاکان تووشی گۆڕان نابن. پێوەندی رووبەڕووی تاکەکان لە سۆنگەی مێدیاکانەوە بۆتە پێوەندییەکی گشتی. مێدیا گشتییەکان بریتین لە هەر جۆرە ئامراز و کەرەستەیا پیشەیەک کە بۆ هەڵبژاردن، راگواستن و وەرگرتنی ناوەرۆک و بابەتگەلێک کە زانیارییان پێ دەڵێن، بەکار دەبرێن. یەکێک لە کەرەسەکانی ئەم تیکنۆلۆجییە، ئامرازەکانی پێوەندی کردنە. بە گۆڕانی ئەم ئامرازانە، ژیانی کۆمەڵایەتیش گۆڕانی بەسەردا دێ. گەشەی کولتووی و زانستی مرۆڤ بەستراوە بەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە شێوازی پێوەندی کردندا دێنە دی: تەکامولی وشەکان و شێوازەکانی ئاخافتنی سەرەتایی، بە هۆی نووسین، چاپ کردن و هەنووکەش بە هۆی جیهانی ئەلکترۆنیکەوە (*Ong, 1982*- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ۱۳۸۴).

زاراوەی مێدیا گشتییەکان، لە راستیدا کورتکراوی *مێدیاکانی پێوەندییە گشتییەکانە* (mass communication media). دوو تایبەتمەندی بۆ مێدیا گشتییەکان رەچاو کراوە کە یەکێکیان تایبەتە بە ئامرازە تەکنیکییەکانی گواستنەوەی هەواڵ و ئەویتریان تایبەتە بە وەرگرانی ئەو هەواڵە. بە گوێرەی بیرو بۆچوونی هەندێ لە زانایانی کۆمەڵایەتی، تایبەتمەندی یەکەم بۆ خۆی بەستە. ج. ت. کلاپێر دەڵێت: «ئەم زاراوە ئاماژە دەکات بە سەرجەمی مێدیا گشتییەکان کە تێیاندا مکانیزمێکی بەرهەمهێنانەوەی ناتایبەت لە نێوان بێژەر و بیسەردا دێتە دی. بە گوێرەی ئەم پێوەرە، دەبێ رادیۆ،

سینەما، کتێب و هەرجۆرە میدیایەکی پێوەندی ناتایبەتی‌تر، لە ریزی میدیا گشتییەکانەوە پۆلێن بکرێن». بە گوێرەی ئەم پێناسەیە، تەنیا شێوازگەلێک لە پێوەندی، وەکوو نمایشنامە، وتوویژی تاکەکەسی و تایبەت و راگەیاندنە گشتییەکان لە ریزی میدیا گشتییەکان دەخرێنە دەرەوە.

کاتێک واتای «گشتی» (واتە ئەو کەسانەی کە ئەم پێوەندییە وەردەگرن) لە شرۆڤەدا هات، بازنەی میدیا گشتییەکان بە شێوازی جۆراوجۆر راڤە دەکرێ. ج. د. ڤێب دەڵێ: «دوو دیاردەی سەرەکی میدیا گشتییەکان بریتین لە: ١) بەرهەمەکانیان بە ئاسانی دەخرێتە بەردەست زۆربەی خەڵکەوە لە هەموو ژێرگرووپە گرینگە کۆمەڵایەتییەکاندا؛ ٢) بڕی ئەم بەرهەمانە بە رادەیەک کەمە کە بە گشتی لە باری مادییەوە هەمووان دەتوانن کەڵکی لێ وەربگرن». بە گوێرەی ئەم پێوەرە (واتە: هەرزانی و ئاسانی) بێجگە لە پێوەندییە تاکەکەسی و تایبەتەکان، هەندێ میدیای گشتی وەکوو گۆڤارە پسپۆڕییەکان، کتێبگەلی گالینگوور و فیلمی فێرکاری لە ریزی میدیا گشتییەکان دەخرێنە دەرەوە(گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

سەرهەڵدان و گەشەی میدیا گشتییەکان، بۆتە هۆی گۆڕانێکی زۆر بنەڕەتی لە شێوازەکانی گواستنەوەی کولتوور لە تۆرەمەیەکەوە بۆ تۆرەمەیەکی‌تر. هەروەها چونکە ئەمڕۆکە میدیا گشتییەکان دەتوانن لە یەک کاتدا زانیارییەکی زۆر بخەنە بەر دەست ژمارەیەکی زۆر گوێگر و بەرقسەوە، دەوریان بۆ گواستنەوەی کولتوور بایەخێکی زۆری هەیە. هەر یەک لە میدیاکان (تەلەفزیۆن، رادیۆ، رۆژنامە، گۆڤار، کتێب، سینەما و هتد) پەیغامە کولتوورییەکان لە بیچم و ناوەرۆکی هەواڵی یا سەرگەرمیدا رادەگوێزنەوە. تەلەفزیۆن یەکێک لە کاریگەرترین میدیا گشتییەکانە.

بە گشتی کەس حاشا لە کاریگەری میدیاکان بە سەر کولتوور و بیرو هزر و زۆربەی تەوەرەکانی ژیان ناکات. بەڵام بۆچوونەکان سەبارەت بە چۆنیەتی

ئەو کاریگەرییانە جیاوازن. هەندێ کەس سەرنج دەدەنە ڕەهەندی پازیتیڤی میدیاکان و هەندێ کەس لە ڕەهەندی نیگەتیڤدا وردەبنەوە. ئێمە بۆ بووژاندنەوەی مێشکمان و بۆ پشوودان و ماندوویەتی دەرکردن لە رادیۆ و تەلەفزیۆن بەهرە دەگرین. بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لە ڕۆژنامە و ئینتەرنێت و گۆڤارەکان کەلک وەردەگرین. بۆ ئاشنایەتی لە گەڵ کولتوورگەلی جۆراوجۆر، سەیری فیلم دەکەین؛ لەم فیلمانەدا هەم زانیاری جۆراوجۆر دەقۆزینەوەو هەمیش بۆ پشوودان و حەسانەوە بەهرەی لێ دەبەین. ئە گەر سەد ساڵی لەمەو پێش گواستنەوەی زانیاری و هەواڵێک پێویستی بە ماوەیەکی دوور و درێژ بوو، ئێستا ماوەی گواستنەوەی هەواڵەکان، گەیشتۆتە کەمترین ماوە. هەرکەس دەتوانێ بیر و ڕا بۆچوونی خۆی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە دونیادا بڵاو کاتەوە. پێشتر نەبوونی میدیاگشتییەکان، ببووە هۆی ئەوەی کە کەس لە ژیانی پادشایان هیچ نەزانێ، ئەو ژیانە و ئەو کەسانە وەکوو دیرۆک وابوون؛ بێجگە لەو تاقمەی لە نزیکەوە پێوەندییان لە گەڵیان بوو، کەس نەیدەتوانی تەنانەت بیریان لێ بکاتەوە. کەچی ئێستا بە هۆی میدیا گشتییەکانەوە، ژیانی رامیاران و دەسەلاتداران خراوەتە ژێر چاودێرییەوە؛ بچووکترین گەندەڵی لە کەس پیوار نییە و تەنانەت ئەو کەسانەش کە لە کوێرەدێیەکدا دەژین، بە وردی لە ژیانی رامیاران، ئەکتەرانی سینەما، یاریکەرانی فووتبۆڵ و بە چارەنووس و ژیانی خەڵکی ئەو پەڕی دونیا ئاگەدار دەبنەوە. حکوومەتەکان وەکوو رابردوو ناتوانن زوڵم و زۆری خۆیان بە سەر خەڵکدا داسەپێنن. هەروەها بە هۆی ئەم پێوەندییەوە پێشکەوت و گەشەی تیکنۆلۆجی گەیشتۆتە ئاستێکی ئێجگار بەرز. بەگشتی، وادیارە بەبێ میدیا گشتییەکان، مرۆڤی ئەمڕۆ تەوانی ژیانی نەبێ (دفلور و دنیس؛ ١٣٨٧). ئەمەی کە بێژرا لایەنێکی بیرو بۆچوون بوو سەبارەت بە میدیا گشتییەکان.

ڕەهەندێکی‌تر بریتیە لەو کەسانەی کە دەڵێن میدیا گشتییەکان ئـامرازی دەستی زۆرداران و زلهێزانن و ئـەوەی کـە خۆیـان بیانـەوێ بـە خـەڵـکی رادەگەینن. کارخانە پیشـەسـازییەکـان بـۆ فـرۆتنی بـەرهـەمـەکانیـان بـە چەشنێکی بە دوور لە راستی، پڕوپاگەندە بۆ بەرهەمـەکانیـان دەکـەن. رامیـاران گەندەڵیەکانیان دەشارنەوە و رواڵەتێکی چاک و بێخەوش لـە خۆیـان دەنـوێنن؛ بەتایبەت لەو وڵاتانەی کە میدیاکان لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتـدان. چـاک بـە خراپ و خراپ بە چاک دەنوێنن. ئەو نیشتمان‌پەروەر و ئازادیخوازانەی کە دژ بـە دەسەڵاتیان بن، بەناوی خراپکار و تیرۆریست پیشانیان دەدەن و ئەوانەش کـە تیرۆریست و خراپکـار بـن، بـە نیشـتمان‌پـەروەر و راسـبێژ ناویـان دەبـەن. دەسەڵاتەکان بۆ گەیشتن بە سامان و دەسەڵاتی زۆرتر، هـان دەدەن تـا ئـەو کولتوورەی کە لە بەرژەوەندی خۆیاندایە، رایبنێن و پڕوپاگـندەی بۆ بکـەن. لە باری پێوەندییە تاکەکەسییەکانەوە، بۆتە هۆی دابـڕانی بنـەماڵـەکـان لـە یەکتر. خزم و دۆستان زۆربەی کاتیان بۆ سەیر کردنی میـدیاکان تـەرخـان دەکەن و کەمتر سەردانی یەک دەکەن و تەنیا پێوەندی نێوان تاکەکان، بۆتە پێوەندییەک کە لە شێونی کاردا هەیانە. بە گوێرەی ئامارەکانی ساڵی ١٩٩١، ماوەیەک کە منداڵانی کەمتر لە شازدەساڵی ئەمریکی خەریکی سەیر کردنی تەلەفزیۆن دەبن، پتر لەو کاتەیە کە لـە قوتابخانـەدان ( *U.S. Burea of the Census, 1991*- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨۴). ماوەیەک کە منداڵانی رۆژاوای ئەورووپا بۆ سەیر کردنی تـەلـەفزیـۆنی تـەرخـانی دەکـەن، لـە نێـوان ٥-٦ کاتژمێرە (*Goodhardt, G. J; 1987*- وەرگیراو لە: عضدانلو؛ ١٣٨۴).

بە گشتی دەبێ مـەودایـەک لـەم نێوانـەدا دەسنیشـان بکـرێ؛ واتـە نـە گەش‌بینی تەواو و نە ڕەش‌بینی تەواو. بێگومان کاریگەرییەکـانی میـدیاکان زۆر مەزنن؛ چ چاک یان خراپ. بەڵام ئەمـەمیـدیاکان نـین کـە کاریگـەری چاک و خراپیان هەیە، بەڵکوو ئەمە خودی تاکە کە بە چـاک یـا خـراپ لـە

مێدیاکان دەگات. شێوازی ڕاهێنان و پەروەردەی تاکە کە ئەم کاریگەرییە ئاشکرا دەکا. منداڵ لە نێو خێزاندا فێر دەبێ کە ئەوەی دەیبیسێ یان دەیبینێ، لێکی بداتەوە و ڕاڤەی بکا و ڕاست و ناڕاست بوونی ئاشکرا بکات.

## مێژووگەری / historicism

مێژووگەری لە واتای پووپریدا (پەیدۆزی یاساگەلی گۆڕانی کۆمەڵایەتی یان پەیدۆزی یاساکانی مێژوو) جۆرێک جیهانبینییە کە تەمەنی بە قەدەر تەمەنی بیری مرۆڤە. کەچی بەم پێناسەشەوە لە سەدەی نۆزدەهەم و بە تایبەت لە سەرەتای سەدەی بیستەمدایە کە دەست بە سەر زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەکێشێ. مێژووگەری ناوی چەن کەسی وەکوو هێگڵ، کۆنت، مارکس، ستوارت میل، سپێنسێر زیندوو دەکاتەوەو هەروەها چەن بزاڤی وەکوو مارکسیسم، دارڤینیسمی کۆمەڵایەتی، تەکامۆڵگەری مورگان یان لوی برۆڵ دەخاتەوە یادی خوێنەر.

مێژووگەری لە واتایەکی بەرتەسکدا بریتیە لە تیۆری یا بیردۆزێک کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی یان گەشەی مێژوویی پێڕەوی لە یاسایەکی جەبری دەکا و شوێن و ڕەوتی مێژوو دیاری دەکات. لە واتایەکی بەرفراواندا مێژووگەری لە گەڵ کۆمەڵەیەک لەو بیردۆزانەدا کە هۆی گۆڕانی کۆمەڵایەتی یان یاساکانی تەکامول دەزانن، یان لە یاسا بازنەییەکان (سیکلییەکان) یاخۆ لە یاسای تەکووزی یەکسان یان لە یاسای بەرهەمهێنانەوە پێڕەوی دەکەن، هاودەنگە؛ بۆ وێنەی بەڕای هەندێ لە کۆمەڵناسان، کاتێک کۆمەڵگا تووشی گۆڕان دێ کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئارام و هێمن بووبێ و بۆ ماوەیەکی کورت تووشی قەیران هاتبێ. هەندێ کۆمەڵناسی تر -وەکوو سووروکین- دەڵێن لە گۆڕانی بەها کولتووری و سەقامگرتووەکاندا ڕێکو پێکییەک دیارە: خولەکانی ئاوەزخوازی لە گەڵ

ئەو خولانەی دژبە ئاوەزن، یەک بە دوای یەک دێن. یان باشتر بڵێین: سوروکین گۆڕانی کولتووری بە پرۆسەیەکی سێ قۆناغی دەزانێ: قۆناغی یەکەم «سەروو هەستییە» کە بە بایەخدانان بە بەها «سەروو هەستییەکان» دەناسرێ و پێناسە دەکرێ؛ قۆناغی دووەم «ئارمانخوازانە»یە کە بە بایەخ دان بە واتا ئینتزاعییەکان پێناسە دەکرێ؛ قۆناغی سێیەم «هەستخوازانە» و بنەمای لە سەر ئەوە دانراوە کە واقیعە بەرهەستەکان، راستەقینەن. هەندێ لە کۆمەڵناسان رایان وایە کە لە ژێر پێستی گۆڕاندا، کۆمەڵگاکان بەردەوام خەریکی بەرهەمهێنانەوەی پێکهاتەکانیانن. کەواتە، مێژووگەری لە واتای بەرفراوانیدا بریتیە لە تایبەتمەندی سەرجەمی ئەو بیردۆزانەی کە بە چەشنێک جەخت لە سەر دیتنەوەی یاساکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی یان ئەو نەزموونانەی کە زۆرتر لە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا دیارن، دەکەن. لە واتایەکیتردا مێژووگەری بریتیە لە تیۆرییەک کە بە گوێرەی ئەوە داهاتووی سیستەمی کۆمەڵایەتی، لە هەر بابەتێک کە بێ، بە تەواوی لە بارودۆخی ئێستایدا حەشار دراوە، بە چەشنێ کە توێژەری لێهاتوو بە وردبوونەوەی لە هەل‌ومەرجی سیستەم لە کاتی tدا دەتوانێ رەوتی ئەو گۆڕانە لە کاتی t+kدا پێش‌بینی بکات (بودون و بوریکو؛ ١٣٨٥).

مێژووگەری مارکس زۆر ورد و سەرنجڕاکێشە. لە واتای مارکسی ئەم زاراوەیەدا دوو واتای سەرەکی هەیە:

یەکەم جۆرێک مێژووگەرییە کە لە گەڵ کاری پووپێردا پێوەندی هەیە. بەڕای پووپێر، هێگڵ و مارکس لەبابەتی ئەم روانگەوە تاوانبارن کە مێژوو خاوەنی مێتۆد و واتایەکە گەر لە کاتی ئێستادا تێی‌بگەن، دەتوانێ داهاتوو پێش‌بینی بکات. لەم رەخنەی پووپێرەدا رەنگە لە بۆچوونی هێگڵدا تێکەلاوییەک لە مێتافیزیک و مێژوو هەبێ، بەلام ئەم تایبەتمەندییە بە ناوەرۆکی باسی مارکس نایەتە ئەژمار. بەبڕوای مارکس، مێژوو لە خۆیدا هیچ

واتایەکی نییە، تەنیا ئەوەنەبێ کە مرۆڤەکان لە قۆناغی جۆراوجۆردا ئاماژەی پێدەکەن و بەڵگەی لێ دێننەوە (باتامور و کیرنن؛ ١٣٨٨).

واتای دووەم -کە لە زۆر رەهەندەوە بە پێچەوانەی واتای یەکەمە- لە ڕێژەخوازی مێژوویی «گەڕانەوە بۆ هێگڵ»دایە کە لە بەرهەمەکانی لووکاچ، کۆرش و تا رادەیەکیش گرامشیدا هاتووە. کۆرش بە راشکاوی ئاماژە بە هێگڵ دەکا و دەڵێ: «دەبێ هان بدەین هەرجۆرە ئاڵوگۆڕ و بابەتێکی بیردۆزی مارکسی لە ئاخێزگەیەوە -کە بریتیە لە فەلسەفەی کلاسیکی ئاڵمانیا- وەکوو بەرهەمی پێویست بۆ سەردەمی خۆی، پەیدۆزی بکرێ». رەخنەگری سەرەکی لەم بۆچوونەی مارکسیسم، لوویی ئاڵتۆسێرە کە لە بەشی پێنجەمی «سەرمایە»دا مێژووگەری و ئۆمانیسمی گرتۆتە بەر رەخنە و وردبوونەوە (باتامور و کیرنن؛ ١٣٨٨).

لێرەدا جێی ئەوەهەیە کە باس لە بزاڤێکی هزری بکرێ کە مانهایم نوێنەریە و لە بیرو بۆچوونەکانی هێگڵەوە سەرچاوە دەگرێ و دەکرێ بە مۆرکی «مێژووگەری رەها» دیاری بکەین. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە بیرو بۆچوونی مرۆڤەکان وا لە ژێر کاریگەری ئەو «هەلومەرجە مێژووییەدا» کە دەورەی لێ داون. بەم پێیە ناتوانین مێژوو لە دەرەوە لێک بدەینەوە و دەبێ لە «ناوەوە» لە واتاکەی تێبگەین. مێژوو و دیتنەوەی واتای مێژوو، پرۆسەگەلێکی تێک ئاڵاون. ئاوەها روانینێک بۆ تێگەیشتن و ناسینی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان، ناچار پێویستی بە جۆرێک روانینی دڕدۆنگانە یان عیرفانی هەیە (پین؛ ١٣٨٦).

### مێژووی ژیان / life history

مێژووی ژیان شێوازێکە لە تۆژینەوەدا کە تەنیا تایبەت بە کۆمەڵناسی و زانستە کۆمەڵایەتییەکانیترە. مێژووی ژیان بریتیە لەو زانیاریيانەی کە

سەبارەت بە کەسانێکی تایبەت کۆوەدەکرێن و دەنووسرێن؛ زۆرتر بە هەمان چەشنێ کە ئەو کەسانە خۆیان بیری لێ دەکەنەوە. ئەم توێژینەوە تەنیا پشت بە بیرەوەرییەکانی خەڵک نابەستێ. بەڵکوو سەرچاوەگەلێک وەکوو نامە، راپۆرت و رۆژنامەکانی سەردەمیش دەتوانن بۆ بەرفراوان کردنی زانیارییەکان و هەروەها چاودێری بە سەر دروست بوونیان، بەهرەیان لێ وەربگیرێ. کۆمەڵناسان سەبارەت بە بایەخی شێوازی مێژووی ژیان روانگەی جیاوازیان هەیە: هەندێکیان رایان وایە کە ئەم شێوازە بۆ کۆوەکردنی زانیاریگەلی بەکەڵک زۆر جێی متمانە نییە؛ هەندێکیش رایان وایە کە ئەم شێوازە روانگەیەک دەداتە دەست کە هیچ شێوازێکیتر ئاوەها کارێکی پێی ناکرێ.

مێژووی ژیان لە چەن لێکۆڵینەوەی زۆر گرینگدا سەرکەوتنی بەرچاوی بووە. یەک لەمانە، توێژینەوەیەکی بەناوبانگ بوو کە لە کتێبێکدا بە ناوی *جووتیاری لەهستانی لە ئەورووپا و ئەمریکادا* (The polish Peasant in Europe and America) لە لایەن تووماس و زینانسکیوە (*Thomas, W. I; & F. znaniecki; 1958*) لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٨-١٩٢٠دا لە پێنج بەرگدا بڵاو کرایەوە (گیدنز؛ ٢٠٠٤- نراقی؛ ١٣٧٩).

## نامۆ کەوتن / alienation

نامۆکەوتن هەروەک لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بە کار دەبرێ، بە واتای دابڕان و جیابوونەوەی بەشێک یان سەرجەمی کەسایەتی تاکە لە خۆی یا جیهانی دەورو پشتی. ئەم زاراوەلەم واتا گشتییەیەدا دەتوانێ ئاماژەیەک بێ بۆ چەن شت: ١) دابڕانی ئاشکرا و دیار ٢) نامۆ کەوتنی تاک لە دەورو پشتی ٣) هەروەها دۆخێک کە تاک هەست بە دابڕان و نامۆیی دەکا (گولد؛ ١٣٨٤).

## نامۆ کەوتن

بێ‌گومان یەکەم کەسێک کە لە کۆمەڵناسیدا بڕەوی بەم زاراوەیەدا مارکس بوو کە لە *دەستنووسە‌ئابووری و فەلسەفییەکانی ١٨٤٤* دا بە مەبەستی نامۆ کەوتنی تاک لەو کالایانەی کە خۆی دەیانهێنێتە بەرهەم بەرکاری هێنا (مارکس؛ ١٣٧٧) و پاشان دەروون‌ناسی فرۆید بوو بە پشتوانەیەک بۆ ئەم بیردۆزەی. بەگوێری بیردۆزی نامۆکەوتنی مارکس، هەندێ لە تاکەکان بە بۆنەی هەل‌ومەرجی تایبەتی بەرهەمهێنانی ئابووری و سیستەمی دەسەلاتی چینایەتی، بە راشکاوی لە کار و بەرهەمی خۆیان نامۆ دەکەون. پرۆسەی نامۆ کەوتنی کرێکار لە کار و کەرەسەی کار، بەرەو دابڕان و جیابوونەوە هەم لە سروشت و هەم لە خۆی رایدەکێشێ. هەرچەن فرۆید لەم بابەتەدا بە راشکاوی ناوی ئەم زاراوەیەی نەهێناوە، بەلام ئەم باسە بە تێروتەسەلی لە بەرهەمەکانیدا دیارە. لە روانگەی فرۆیدەوە نامۆکەوتن بریتیە لە بەرهەمی هاوڕەنگ بوونی تاک لە گەڵ داخوازەکانی سیستەم بە گوێرەی ئەو دەورانەی بۆی رەچاو کراون. بە بڕوای ئێریک فرۆم، مرۆڤ کاتێ نامۆ دەکەوێ کە خۆی بە ناوەندی دونیای خۆی و ئافرێنەری کردەکانی خۆی نەزانێ، بەڵکوو ئەم بووبێتە خزمەتکار و گوێڕایەڵی ئەو کردانە، یاخۆ رەنگە تەنانەت کڕنۆشیان بۆ ببا (گولد؛ ١٣٨٤).

بەڕای مارکس، نامۆکەوتن ئاکامی دابەش کردنی کارە لە پرۆسەی بەرهەرمهێناندا. واتە هەر کرێکار بە تەنیا لە بەشێکی زۆر بچووکی پرۆسەی بەرهەمهێناندا کار دەکات و کارێکی ئاسانی لە ئەستۆیە، بۆ وێنە لە کارخانەی چێ کردنی ترۆمبیلدا، ئەو کرێکار کە لە بەشی مۆنتاژدا خەریکی کارە، رەنگە تەنیا ئەرکی توندکردنەوەی پێچێک بێت و بەس. شێوازە نوێکانی بەرهەمهێنان ئەنجامی ماشینیزم و سیستەمی بۆرۆکراتیکن، چونکە ئەم ئاسانکارییە نوێیانە، لە کارگەکاندا مەکینەیان کردۆتە جێگر و جێنشینی هێزی جەستەیی مرۆڤ. بەم بۆنەوە کرێکاران کۆنترۆڵ و چاودێری خۆیان لە

دەست داوە و هاتوونەتە ژێر رکێفی کەرەسەکان. یوونگ دەڵێ: لەم خولەدا کرێکاران نە وەکوو بوونەوەرێکی کۆمەلایەتی، بەڵکوو وەکوو بەشێک لە ئابووری بازاڕ سەیر دەکران (*young, T. R. 1975*).

بە گوێرەی پێناسەیەک کە مارکس لە *دەستنووسە ئابووری و فەلسەفییەکانی ١٨٤٤*دا لەم زاراوەیەی داوەتە دەست، نامۆ کەوتن هەل و مەرجێکی مێژوویی تایبەتە کە تێیدا مرۆڤ ١) جیایی لە سروشت، ٢) لە بوونەوەرانی‌تر ٣) بە تایبەت لە کاری خۆی و کەرەسەگەلی بەرهەمهێنان و هەروەها )٤ جیایی و دابڕان و نامۆ کەوتن لە خۆی تاقی دەکاتەوە (مارکس؛ ١٣٧٧- باتامور؛ ١٣٨٨- کرایب؛ ١٣٨٦).

نامۆکەوتن لە کۆمەڵناسیشدا دەڕواتە ریزی زاراوە سەرەکییەکانی ئەم بەشەوە و زۆرتر لە لایەن ماکس ڤیبێرەوە بە مەبەستی پیشان دانی ناهومێدی تاک لە دونیایەکی ناهومێدکەردا و لە ژێر کاریگەری ناوەندگەلی ئەقلانی و بۆرۆکراتیکدا بە کار براوە (پین؛ ١٣٨٢).

## نامۆکەوتنی بۆرۆکراتیک / bureaucratic alienation

هەرچەند جڤاکە مۆدێڕنەکان بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی خۆیان پێویستیان بە رێکخراوە بۆرۆکراتیکەکان هەیە، بەلام هەندێ لە کۆمەڵناسان رەش‌بینانە سەیری ئەم سیستەمە دەکەن و پێیان وایە کە ئەم رێکخراوانە دەتوانن هەندێ کێشەی وەکوو بەماشینی‌بوونی مرۆڤ، نامۆکەوتنی مرۆڤ لە ژیانی تایبەتی و دیمۆکراسی رامیاری کۆمەڵگا، بەدی بێنن. ماکس ڤیبێر رێکخراوە بۆرۆکراتیکەکان بە شێوازێک بۆ بەرزکردنی ئاستی بەرهەمهێنان دەزانی، بەلام لەم چەمکەش ئاگەدار بوو کە ئەم رێکخراوانە دەتوانن ببنە هۆی بەماشینی‌بوونی هەڵس‌وکەوتی کەسانێک کە نیازی هەیە خزمەتیان پێ‌بگەینێ. واتە: ئەم سیستەمانە بە یاسا و دەستوورەکانی خۆیان،

کەسایەتی و وزە و لێهاتوویی ئەندامانی خۆیان دەخەنە پشت گوێ و هانیان دەدەن تا لە سەر ڕێبازی پێودانە دیاریکراوەکانی ڕێکخراو بڕۆنە پێشەوە. ئەندامان لەگەڵ ئەو کارەی کە دەیکەن، نامۆ دەکەون. بە بڕوای ماکس ڤیبێر، ڕێکخراوە فەرمییەکان، مرۆڤەکان بۆ ئاستی چەرخدەندەی مەکینەیەک دادەبەزێنن (*Weber, M; 1978: 988*). ڕەوتی توێژینەوەکانی ماکس ڤیبێر لە سەر ڕێکخراوە بۆرۆکراتیکەکان، بوو بە هۆی ڕەشبینی ئەو لە سەر داهاتووی مرۆڤ؛ لە درێژەی ئەم لێکۆڵینەوەدا گەیشتبووە ئەم دەرەنجامەی کە هەرچەن ئەم سیستەمانە بۆ چاکسازی ژیانی مرۆڤ گەلالەکراون، بەلام ئەم مەترسییەش هەیە کە لە کۆتاییدا کاری مرۆڤەکان تەنیا گەیاندنی خزمەتگوزاری بە ڕێکخراوەکان بێ.

## ئاميلكەی دينی / catechism

کتێبێکی بچووکە کە تێیدا بنەماکانی دین بە شێوازی پرسین و وەلام هاتووە و بڕواداران بەو دینە لە ڕێی ئەم پرسین و پەرسڤانەوە لە گەڵ بنەماکانی دین ئاشنا دەبن.

## ناوچەگەری / nativism

لە کاتی سەربەخۆیی ئەمریکادا سێ چوارەمی دانیشتوانی لاوەکی لە ئەمریکا، لە کەسانێک پێک دەهات کە لە بریتانیاوە کۆچیان کردبوو، یان بە ڕەسەن بریتانی بوون. ئەم کۆلۆنینشینانە زۆرتر ناوچەگەرا بوون و کەمتر ئاوڕیان لە خەلکی شوێنانیتر دەدایەوە. هەرچەند کەمبوونی هێزی کار ناچاری دەکردن کە «هێزی کاری دەرەکی» بگرن، بەلام بۆ پاراستنی نەریتەکانی ئەنگلۆساکسۆن و میراتی پرۆتستان، زۆرییان پێداگری دەکرد. لەم چوارچێوەدا واتای ناوچگەری بریتیە لە: چاودێری و بەرەنگاری لە دامەزراوە و بەهاکانی تاقمی زۆرینە لە ئاست بەهای تاقمی کۆچەری نوێدا.

بە واتایەکی تر، ناوچەگەری ئەم واتایە دەدات کە «ئەمریکا بۆ ئەمریکییەکانە». لە مێژووی ئەمریکادا ئەم وتەیە چەنای چەن جار دووپاتە کراوەتەوە و هەنووکەش دەیلێنەوە. ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە ئەوانەی ئەم دروشمەیان بۆ ئەمریکا دانا، خۆیان خەڵکی ناوخۆی ئەمریکا نەبوون.

## نەخوێندەواری / illiteracy

نەخوێندەواری بریتیە لە تێنەگەیشتن و بەکار نەهێنانی سیستەمێکی سەمبۆلیک. ئەم سیستەمە دەتوانێ بنەمای لە سەر دەنگ، پیت، ژمارە، خەت یاخۆ دیاردەکانی‌تر دانرابێ. هەرچەند زۆرتر مەبەست لە «نەخوێندەواری» بریتیە لە ناتوانی لە خوێندن یان نووسین، بەڵام نەخوێندەواری چەن جۆرە: نەخوێندەواری کۆمپیوتەر، نەخوێندەواری ژمێریاری، نەخوێندەواری زانستی، نەخوێندەواری کولتووری و هتد.

گەر تەنیا سەرنج بدەینە ژمارەی ئەو زمان و زاراوانەی لە هەموو جیهاندا پێیان قسە دەکەن، تێدەگەین کە ژمارەیان دەگاتە ٣٥٠٠-٩٠٠٠. ئاشکرایە کە بە گوێرەی ئەم هەموو زمان و زاراوانە، فێربوون و خوێندەوار بوون، بێ‌سنوورەو کەس ناتوانێ هەمووی بزانێ و لە سەرلەبەری ئەم سیمبۆلانە ئاگەدار بێ (*Quane, A; 1990: 27-29*). گەر کەسێک تەنیا بە زمانێک بتوانێ بخوێنێ و بنووسێ، بە گوێرەی ئەو پێناسە کە کراوە، دەبێ سەبارەت بە ٨٩٩٩ زمان و زاراوەکەی‌تر بە نەخوێندەوار بزانرێ. کەواتە، ئاوەها پێناسەیەک لە نەخوێندەواری ناتوانی پەرسڤدەری پرسی ئێمە بێ. زۆربەی خەڵکی وایان پێ خۆشە کە زمانی ئەو شوێنەی کە تێیدا دەژین تێبگەن و بتوانن پێی قسە بکەن و پێی بنووسن.

بە سەلماندنی ئەم گریمانەیە، دەتوانین بەم ئاکامە بگەین کە

نەخوێندەواری بەرهەمی کۆمەڵگای تاکە. واتە، کاتێ تاک بە نەخوێندەوار دەزانرێ کە نەتوانێ لە سیستەمی سیمبۆلیکی کۆمەڵگایەک کە تێیدا خەریکی چالاکییە تێبگا و بەکاری ببا. بۆ وێنە گەر کەسێک نەتوانێ بۆ دیتنەوەی شوێنێک نەخشە بخوێنێتەوە، بۆ دیتنەوەی زانیاری زۆرتر لە سەر بابەتێک لە کۆمپیۆتەر کەڵک وەربگرێ، دیاردەکانی هاتوچۆ بخوێنێتەوە، لیستی دیتنەوەی کار پڕبکاتەوە، حسێب و کتێبی موشتەرییەکانی نەتوانێ بنووسێ، یان لەو واتایانە کە خەڵکی لە قسە کردندا بەهرەی لێ دەگرن، تێنەگا، دەتوانین ئاوەها کەسێک بە نەخوێندەوار بزانین. کەواتە، دەبێ نەخوێندەواری لە هەلومەرجی خۆیدا تاقی بکرێتەوە و وەکوو جۆرێک نەخۆشی کە دەبێتە هۆی لەکار کەوتنی سەرجەمی ئۆرگانیسم سەیری نەکرێ. لەم رووەوە، نەخوێندەواری دیاردەیەکی سروشتی نییە، بەڵکوو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە. واتە، گەر زانیاری و توانایییەکانی رابردووی تاک پەرسڤدەری نیازە هەنووکەیییەکانی نەبێ، ئەو تاکە بۆ پێوەندی گرتن لە گەڵ دەورو پشتی بە نەخوێندەوار دەزانرێ.

## نەریتخوازی ئیداری/ bureaucratic ritualism

رابێرت مێرتۆن، کۆمەڵناسی ئەمریکی شێوازی ئارمانی بۆرۆکراسی ڤیبێری خستۆتە بەر لێکدانەوەو وردبوونەوە و روونی کردۆتەوە کە رەنگە هەندێ لە بەشەزاتییەکانی بۆرۆکراسی ببنە هۆی گەیاندنی زیان و خەسار بە رەوتی ئامانجەکانی بۆرۆکراسی (*Merton,1957*). پێداگری زۆر لە سەر بەڕێوەبردن و جێبەجێ کردنی یاسا و پێودانە ئیدارییەکان زۆر جار دەبنە هۆی نارەزایەتی خەڵکی و بەڕێوەنەچوون و چارەسەر نەبوونی کێشەو گیرو گرفتەکانیان. لە راستیدا دۆزە سەرەکییەکانی رێکخراوە کەمتر لە بەر چاو دەگیرێن و سەرنجیان پێ دەدرێت. مێرتۆن بۆ ناساندنی ئەم واتایە،

زاراوەیەکی نوێی داهێنا بە ناوی نەریتخوازی ئیداری (*Merton 1968*).
مەبەست لەم زاراوەیە هۆگری توند و تیژە بە بەڕێوەبردنی یاسا و پێودانە ئیدارییەکان؛ بە چەشنێ کە دۆزە سەرەکییەکانی ڕێکخراوە لە ژێر سای ئەو دەستوور و یاسایانەدا بزر دەبن.

مێرتۆن دەیگوت چونکە لە سەر ڕەوتی فەرمی کارەکان پێداگری زۆر دەکرێ، بۆی هەیە کە «وێنەی گەورەتر» نەبینرێ (واتە هەمان دۆزی سەرەکی کە سیستەمی بۆرۆکراسی بۆ گەیشتن پێی هاتۆتەدی). بۆ وێنە بۆرۆکراتێک کە بەرپرسی وەڵام دانەوەی زیانەکانی بیمەیە، ڕەنگە داوای بیمەکراوێک کە زیانی لێکەوتووەو داواکەشی زۆر بەجێیە، تەنیا لە بەر ئەوەی کە فۆرمێکی بەتەواوی پڕنەکردۆتەوە، جێبەجێ نەکا. بە واتایەکی‌تر ڕەنگە دروست بوونی ڕەوتی ئیداری سەرتر و گرینگتر بێ لە نیازی ئەو بیمەکراوە کە تووشی زیان هاتووە.

ئەم وتەی مێرتۆنە زۆر ئاشکرایە؛ هەموومان بەردەوام لە گەڵ ڕێکخراوەگەلی بۆرۆکراتیک-وەکوو شارەوانی، ئیدارەی باج و پیتاک و...- پێوەندیمان هەیە و زۆرجار دەڵێین جێبەجێ کردنی ڕەوتی ئیداری گرینگتر لە نیازەکانی ئێمەیە. بۆیە مێرتۆن پێش‌بینی دەکات کە لە ئاوەها هەلومەرجێکدا بۆی هەیە نێوان خەڵک و سیستەمی بۆرۆکراتیک تووشی ئاڵۆزی و ناکۆکی بێ و پێش‌بینییەکەشی زۆر بەجێیە (گیدنز؛ ١٣٨٣)، *(Whyt, W.H. 1957; Merton, R. 1968; Coleman, J, S. 1990; Kiser, E. and J,Schneider, 1994)*.

### لاواز راهێنراو/ trained incapacity

گەر ڕێکخراوێک بیەوێ لە هەلومەرجێکی ڕێکوپێک و دڵخۆشکەر و جێی متمانە و بڕوا و لەبار و پێش‌بینی‌کراودا کار بکات، ئەندامەکانی دەبێ لە

یاسا و پێودانگ و ڕێنوێنییەکانی ئەو ڕێکخراوە پێڕەوی بکەن. ڕێکخراوەکان کارمەندەکانی خۆیان واڕادێنن کە بە گوێرەی ویست و داخوازی خاوەن کارەکانیان کار بکەن و هەر بەو پێیەش مووچە و پاداشیان پێ‌دەدرێ. بەلام کاتێک کارمەندەکان بە چەشنێکی میکانیکی و بەگوێرەی ئەو شتانەی پێیان دەڵێن رادێن و کاردەکەن، گەشەو پەرەسەندنی لێهاتووییەکانی خۆیان لە بەرانبەر ئەو شتەیدا تووشی مەترسی دەکەن کە ڤێبلێن ناوی نەگونجاو راهاتووی بە سەردا ناوە. واتای ئەم زاراوەیە بریتییە لە لاوازی لە بەرانبەر هەلومەرج و پێشهاتی نوێ و نائاسایی. ئەمەش کاتێک دێتە ئاراوە کە یاسا و ڕەوتە فەرمییەکان کۆن دەبن و لێهاتوویی خۆیان لە دەست دەدەن (وبلن؛ ١٩٣٣). بە واتایەکی‌تر، کرێکاران و کارمەندان بە جۆرێک راهاتوون و فێرکراون کە تەنیا دەتوانن لە هەلومەرجی ئاساییدا کار بکەن. ئەوان بۆ ئەوەی کە بتوانن لە هەلومەرجی نوێدا لێهاتوویی خۆیان پیشان بدەن یا پێش‌بینی ئەو هەلومەرجە نوێیە بکەن، رانەهاتوون.

دەروون‌ناسی کۆمەلایەتی، شۆشانا ژۆبۆف، لە یەکێک لە توێژینەوەکانی خۆیدا -کە ماوەی یەک دەیەی خایاند- جیاوازییەک لە نێوان دوو جۆرە شوێنی کاردا دادەنێ: ١) ئەو شوێنانەی کە لاوازی راهێنراو پەرە پێ‌دەدەن و ٢) ئەو شوێنانەی کە ئیزنی داهێنان و بڕیاردان و سازگاربوون لە گەڵ هەلومەرجە نوێکانیان بە کارمەندان داوە. ئاکامی کۆڵینەوەکانی ژۆبۆف پیشان دەدەن کە ئەو شوێنانەی کە بنەمایان لە سەر لاواز راهێنراو بنیات نراوە، کارمەند و کرێکاران بۆ وێنە پاش ناساندنی کۆمپیۆتەر، تووشی جۆرێک شۆک دێن (ژوبوف؛ ١٩٨٨).

## نێرمۆک / hermaphrodite

ئەم زاراوە بە کەسانێک دەبێژرێ کە هەم لە پیاو دەکەن و هەمیش لە

ژن. بناوانی ئەم زاراوە دەگەڕێتەوە بۆ هێرمێس (hermes) کوڕی خودا دیرۆکەکانی یوونان و ئافرۆدیت (aphrodite). بە گوێرەی دیرۆکەکانی یوونان، کاتێک هێرمێس لە لای دەریاوە خەریکی خاوێن کردنەوەی خۆی بوو، حوورییەکی دەریایی بە ناوی سالماسیس (salmacis) هاتە دەر و رۆیشتە جەستەیەوە و هەر دوویان بوونە یەک پەیکەر. بەم بۆنەوە، ئەم زاراوە بەو کەسانە دەبێژرێ کە شەرمگای دەرەکی و ناوەوەیی ژن و پیاویان هەیە. چونکە کولتووری هەنووکەی ئێمە زۆر گەشبینانە سەیری ئەوانەی کە گرفتێکی جنسییان هەیە ناکا، زۆر بە گومان و دڕدۆنگی و تەنانەت رق و قینەوە سەیری ئەم کەسانە دەکەین. بەلام بە پێچەوانەی ئێمە هەندێ کۆمەڵگای وەکوو پۆکۆت (pokot) لە رۆژاوای ئەفریقادا زۆر سەرنج بە ئاوەها بابەتێک نادەن و تەنیا بە هەڵەیەکی بایۆلۆجیکی زۆر ساکاری دەزانن. سوورپێستانی هۆزی ناواهۆ لە ئەمریکای باکووردا بایەخێکی زۆر بە کەسانێک کە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییە بن، دەدەن و بە کەسانێکیان دەزانن کە لە هەر دووباری ژن و مێردییەوە گەیشتوونەتە بەرزترین ئاست؛ واتە گەیشتوونەتە تەکامول (*Geertz, H; 1957*– وەرگیراو لە: عضدانلو).

## نیمچەخێزان / quasi household

بەگوێرەی پێناسەی ئیدارەی ئاماری ئەمریکا، ئەم واتایە باس لە تاقمێک لە تاکەکان دەکات کە لە یەکەیەکدا پێکەوەدەژین و ئەو یەکە نەخراوەتە ریزی یەکەی خێزانییەوە. بۆ وێنە، هۆتێلێکی گەورە، کۆمەڵەیەکی برایەتی، خانوویەک کە چەند چاوەی هەیە و لە هەر چاوەیەکدا خێزانێک هەیە، یا لەشکرگا سەربازییەکان دەخرێنە ریزی نیمچەخێزانەکانەوە.

## definition of the situation / واتای شوێنگه

زاراوەی واتای شوێنگه بریتیه لـه ١) تێگـەیشـتن و بۆچـوونی تـاک لـەو هەلومەرج و شوێنگەی کە تێیدایە؛ بۆ وێنە کاتێک کـوڕە خوێنـدکارێک لـە کچێکی هاوپۆلی داوادەکا کە پێکڕا بڕۆنە پـارک و لـەوێـدا وانـەکانیـان دەور کەنەوە، ڕەنگە ئەو کچە بە ڕاشکاوی نەزانێ کە مـەبـەسـتی ئـەو کـوڕە لـەو پێشنیارەی، دامەزراندنی پێوەندییەک جیا لە پێوەندی هاوپۆلی بوونە، یـاخۆ بەڕاستی مەبەستی هەمان وانە خوێندنە. ٢) تێگەیشتن و شرۆڤـەیـەک لـەو شوێنگانەی کە لە سەر بنەمای کولتووری دامەزراوە و لـە کولتـووردا دەنگـی داوەتەوەو لە نێوان ئەندمانی کۆمەڵگادا یەکسـانن و بـە یـەک جـۆر سـەیـر دەکرێن؛ وەکوو ئەوەی کە خەڵکی لە کـاتی جێـژنی ڕەمـەزان، یـان ساڵـی تازەدا کە پێک دەگەن، بە خێرایی دەزانن دەبێ چ بکەن، یـاخۆ چـی بڵـێن، بەم بۆنەوە بێ‌سێ و دوو پیرۆزبایی لە یەک دەکەن.

ئەم زاراوە یەکەم جار لـە لایـەن توومـاس و زینانیکییـەوە بـەکـار بـراوە. زینانیکی دەڵێ: «ئێمە نازانین کێ بۆ یەکەم جار ئـەم زاراوەیـەی داهێنـاوە. تووماس جاربەجار لە کتێبی *جووتیاری لەهستانیدا* و بە چەشنێکی بەربلاوتر لە "لێکدانەوەی بەراوردی میتۆدە نموونەییەکانی ڕەفتاری سەرەتـاییی"دا بـە کاری دەبرد». پاشان زۆر بە خێرایی هاتە نێو کۆمـەڵناسـی و دەروونناسـی کۆمەڵایەتی ئەمریکاوە و بـۆ ئامـاژە بـە دوو ڕەهـەنـدی بـیردۆزی کـارلێکی کۆمەڵایەتی زۆر بڕەوی سەند (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

واتای شوێنگە، پرۆسەیـەکـی گشـتییە: ئـەمـەی کـە لـەو شـوێنانەدا چ هەڵس‌وکەوتێک شـیاوە و دەبـێ لـە چ ڕەفتارێـک خـۆ ببـوێری، دەبـێ لـە کەسانیترەوە فێر بی. گەیشتن بە پێناسەیەکی گشتی، کارێکی ئاسان نییە. بۆ وێنە دوو خوێندکار کە هەردووکیان پێکڕا لـە ژوورێکـدان، هـۆی هـاتنی یەکێکیان بـۆ زانکـۆ ئـەوەیـە کـە لـە بنـەماڵـەی دوور کـەوێتـەوە و ژووره

خوێندکارییەکەی بکاتە مەکۆیەک بۆ کۆوە کردنی دۆستان و هەوالانی و هیچ گوێ بە خوێندن نەدا، ئەویتریان هەر بە مەبەستی خوێندنەوە هاتۆتە زانکۆ و دەیەوێ لە ژوورەکەیدا بە هێمنی و بە دوور لە شەڕ و کێشە و ئاژاوە، بەردەوام بێ لە سەر خوێندنی. دیارە ئەم دوو کەسە کە هەریەکەو واتایەکیان بۆ ئەو شوێنگەنوێیە هەیە، تووشی ناتەبایی دەبن. جا یان دەبێ یەکێکیان بێتە سەر واتای ئەویتر، یان دەبێ خۆیان بۆ شەڕو کێشە و ئاژاوەیەکی درێژخایەن و تفت و تاڵ تەیار کەن.

## وانەی رەسمی / formal curriculum

لە هەموو سیستەمە فێرکارییەکاندا، ماموستایان دوو وانە فێری قوتابیان دەکەن: رەسمی و نادیار. وانەی رەسمی بریتیە لە هەموو ئەو بابەتە ئاکادێمیانەی لە قوتابخانەکاندا فێر دەکرێن؛ وەکوو: زمان، ژمێریاری، زانستە سروشتییەکان، یاری و وەرزش و ... . قوتابیان ئەم وانانە راستەوخۆ و بە راشکاوی دەخوێنن. هاوکات لە گەڵ ئەم وانانە کە دەخوێندرێن، قوتابیان بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ، هەندێ رووداوی لاوەکیش فێر دەبن کە کۆمەڵناسان پێیان دەڵێن، وانەی نادیار.

## وانەی نادیار / hidden curriculum

زاراوەی وانەی نادیار بۆ یەکەم جار لە لایەن جەکسۆنەوە لە کتێبی *ژیان لە قوتابخانەکاندا*، هاتە ئاراوە. مەبەست لەم زاراوەیە ئاماژە بوو بەو وانانەی کە قوتابی لە قوتابخانەدا ناچار بە فێربوونیان بوو؛ وەکوو: هێوربوون و بە کاوەخۆ بوون و دەست هەڵگرتن لە ئارەزووە تاکە کەسیەکان (*Robinson; 1981*).

گرینگترین رەهەندی وانەی نادیار، پێکهاتەی دەسەلاتی نێو

قوتابخانەکانە، پێکهاتەیەک کە واتاگەلی سەرۆک و ژێردەست بە منداڵ فێر دەکا و بۆ کاری داهاتووی رایدێنێ. بەم بۆنەوەبە رای زۆر کەس لە توێژەران، بۆ پاراستنی ئەو بارودۆخەی ئێستا هەیە، بیچم و شێوازی قوتابخانەکان زۆر گرینگتر و بەهێزتر لە ناوەرۆکی وانە رەسمییەکانە.

بێنسۆن شنایدێر لە ١٩٧١دا لە گەشەو پەرەسەندنی وانە نادیارەکان دەوری زۆری گێڕاوە. مەبەستی شنایدێر لە وانەی نادیار، داخوازە لاوەکییەکانە کە لە هەر ناوەندێکی پەروەردەدا هەیە و خوێندکاران ناچارن ئەو داخوازە لاوەکییانە ببیننەوە و وەڵامیان پێ بدەنەوە تا لەم ناوەندە فێرکارییەدا بتوانن بمێننەوە و بەردەوام بن (شارع‌پور؛ ١٣٨٦).

شێوازی وانەگوتنی ماموستایان، چۆنییەتی ئەزموونەکان، دەنگی ماموستایان، بۆچوونی هاوقوتابیان، ژمارەی قوتابیانێک کە لە قوتابخانەدا ئامادە نابن، ئامادە نەبوونی ماموستایان و هەرا و شەڕی قوتابیان لە کلاسدا نموونەگەلێکن کە سەبارەت بە وانە نادیارەکان ئاماژەیان پێ دەکرێ.

## وشیاری چینایەتی/ class-consciousness

نووسەرانی مارکسیست ئەم زاراوەیە بۆرەوتێک بەکار دەبەن کە بە پێی ئەوە ئەندامانی چینێک (بە گشتی چینی پرۆلتەر) لە چارەنووس و پێناسەی خۆیان ئاگادار دەبنەوە؛ هەروەها بۆ پێناسەی ئەنجام و ئاکامی ئەم پرۆسەیە بەکار دەبرێ. بۆیە گومان دەکرێ کە ئەم زاراوەیە لە گەڵ ناتەبایی چینایەتی و ویستی کرێکاران بۆ ناسینی دوژمنی هاوبەشیان (مەبەست سەرمایەدارانە)، بەلەنگازی و دۆزی هاوبەشیان (واتە سەرکەوتنی کرێکاران) پێوەندییەکی نزیکی هەیە (احمدی؛ ١٣٨٥).

بە پێی بۆچوونی ک. ر. پووپێر، ئەم کارە پیشان دەدات کە چلۆن «بارودۆخی ئاشکرای چینایەتی» (کە بریتیە لە قازانج و خەباتی چینایەتی)

بیری ئەندامانی ئەو چینە روون دەکاتەوە. یاخۆ ئەگەر بمانەوێ ئەم بیرە بە چەشنێک راڤە بکەین کە کەمتر بیری هێگلی تێدا دیاربێ، دەبێ بڵێین: وشیاری چینایەتی پیشان دەدا کە چلۆن ئەندامانی چینێک شارەزایی لە بارودۆخی چینی خۆیان بەدەست دێنن (پوپر؛ ١٣٨٣).

بێجگە لە بواری مارکسی دەتوانین ئەم زاراوەیە لە واتایەکی عەمەلیدا بۆ ئاماژە بە ئاست و قۆناغێک لە یەکیەتی لە مەیل بە دوورەپەرێزی، یەکگرتوویی و دوزی هاوبەش لە نێوان ئەندامانی ژێر گرووپێکی نەتەوەییدا بە کار ببەین کە زۆربەیان لە بواری جۆرێک لە پسپۆڕی و شارەزایی لە پێوەندی لە گەڵ ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و شێوازی ژیان لێک نزیکن. بە واتایەکی ساکارتر (و ناپسپۆڕانەتر)، دەکرێ بڵێین وشیاری چینایەتی هەستی گرووپێکە کە دەسکەوتە کۆمەڵایەتییەکان کاتێک دەتوانێ بەرەو بەختەوەری بیانبات کە لە نێو دەستەیەکی هاودۆزدا بن. واتە، دەتوانین بڵێین وشیاری چینایەتی کاتێک هەیە کە کۆمەڵگا گرووپبەندی کرابێ و ئەم گرووپانەش لە رەهەندی تایبەتمەندی ئابوورییەوە، وەکوو یەک بن و لەو ئەزموونانەی کە بۆ تاقیکردنەوەی رادەی شارەزاییان لە ناسینی تایبەتمەندی، نیازو ئامانجە هاوبەشەکانیان لێیان دەگیرێ، لە ئاست و پلەیەکی نزیکدا بن. بەم واتایە دەتوانین وشیاری چینایەتی وەکوو پێوەرێکی دروستکراو بزانین. هەر بەم پێیە دەکرێ لە گەڵ رووداوە مێژووییەکان، تایبەتمەندییە کەسایەتییەکان، بزاڤە کومەڵایەتییەکان ، گۆڕانی بلەزی کومەڵایەتی (وەکوو توندوتیژی سیاسی) وگەلێک بنەماو رووداویتر پێوەندی هەبێ وکاریگەرییان لێ وەربگرێ.

بۆیە ئۆ. گلانتس -کە لە فیلادلفیادا ئەو کەسانەی «وشیاری چینایەتی»یان هەبوو، بەگوێرەی «گوێڕایەڵی» و «لایەنگیری» دەناساند- تێدەکوشا تا لە رێگای لێکۆڵینەوەی پرسیارنامەییەوە «وشیاری چینایەتی»

له گه‌ڵ یه‌کگرتوویی سیاسی پێکه‌وه گرێ بدا (*Grazia, de Alfred*).

**وشیاری درۆینه**/ false consciousness **بڕوانه**: **ئایدیۆلۆژی**

## هاوسەرگری / marriage

لە بەشی هەرە زۆری دونیادا بنەماڵەکان بەرهەمی هاوسەرگرین. هاوسەرگری پێوەندی رەسمی و فەرمی نێوان ژن و مێردە. ڤێستێر مارک دەڵێ: «هاوسەرگری پێوەندییەکی پتەوی نێوان ژن و مێردە کە جیا لە پێوەندی جینسی، تا ماوەیەکی دوور و درێژ درێژەی هەیە». لە پێناسەی ئاساییدا بە دوو جۆر باس لەم زاراوەیە دەکرێ: ١) ژن و پیاو بۆ پێک هێنانی خێزان، ژیانێکی هاوبەش بنیات دەنێن؛ ٢) لە نێوان پێوەندی ژن و مێردی و جۆرەکانی‌تری پێوەندی رەگەزی کە بەناوی «بەر لە هاوسەرگری» و «لەدەرەوەی هاوسەرگری» و «پێوەندی زیناکارانە» پێناسە دەکرێن، جیاوازی دادەنرێ. ئەم جیاوازی دانانە، بۆ پێناسەکردنی هاوسەرگری بە پێویست دەزانرێ. «جاربەجار لە باخەڵی یەکتردا نووستن بە بێ ئەوەی مەبەست ژیانی هاوبەش و بەدونیا هاوردنی منداڵ بێ، قەد بە هاوسەرگری نایەتە ئەژمار» (گولد؛ ١٩٦٤).

هاوسەرگری نۆرمێکی کۆمەڵایەتییە کە ئیزنی جۆرێک لە پێوەندی پتەو و قایم دەداتە ژن و مێرد؛ هەروەها بەڵێنیان لێ دەسێنێ کە بۆ پاراستنی سیستەمی ژیانی خێزان، رێز بۆ مافی یەکتر دانێن (بە گوێرەی نۆرم و رێسا یاساییەکانی کۆمەڵگای خۆیان).

ویلیام ئاگبۆرن، کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەمریکی، بڕوای وایە کە خێزان شەش قازانجی گرینگی هەم بۆ ئەندامانی خێزانو هەمیش بۆ سەرجەمی کۆمەڵگا هەیە:

١- بەرهەمهێنانەوە: کۆمەڵگا بۆ بەردەوامی و درێژەدان بە ژیانی خۆی، پێویستی بە بەدیهێنانی بەرەی نوێ هەیە؛ بۆ ئەم مەبەستە، خێزان لە سۆنگەی منالدار بوونەوە، ئەم نیازەی کۆمەڵگا دابین دەکات.

٢- پارێزگاری و چاودێری: بنەماڵەکان هان دەدەن تا لە هەلومەرجی

دژواردا پارێزگاری و چاودێری لە خێزانی خۆیان بکەن.

٣- بە کۆمەلایەتی‌بوون: منداڵ یەکەم جار لە ناو بنەماڵەدایە کە لە گەڵ بەها، نۆرم و باوەڕە کۆمەلایەتییەکان ئاشنا دەبێ و کەسایەتی خۆی دەناسێ.

٤- چاودێری و کۆنترۆڵی ئاکاری جینسی: پێوەندیەکی جینسی کە بە بۆنەی هاوسەرگریەوە لە نێوان ژن و مێرددا دروست دەبێ، شیاوترین و لەبارترین نۆرمە بۆ پێوەندی جینسی لە هەموو دونیادا.

٥- میهرەبانی و هۆگری و خۆشەویستی: تاک، پتر لە هەر دامەزراوەیەکی‌تری کۆمەلایەتی، لە نێو خێزاندا پێوەندی سۆزدارو خۆشەویستانە تاقی دەکاتەوە.

٦- ئامادەکردنی پاگەی کۆمەلایەتی: خێزان دامەزراوەیەکە کە بۆ ئەندامانی خۆی هەلومەرجی سەرەتایی بۆ رۆیشتنە نێو چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا دابین دەکات (*Ogburn, W.F; 1934: 661-708*).

٧- ئەرکی ئابووری: لە کۆمەڵگا سوننەتی و پێشووەکاندا یەکێک لە ئەرکەکانی بنەماڵە، ئەرکی ئابووری بوو. لە کۆمەڵگای کشتوکالیدا ژن دەورێکی سەرەکی –هەم بۆ کاری مەزرا و هەمیش بۆ بە دونیا هاوردنی منداڵ- دەگێڕا، بۆیە بایەخ و رێزی زۆرتری بوو. لەو کۆمەڵگایانەدا ژمارەی خێزان بەرانبەر بوو لە گەڵ ژمارەی هێزی کار؛ واتە هەر یەک لە ئەندامان لە سەرکەوتوویی ئابووریدا دەوری کاریگەریان دەگێڕا (آگ برن، ١٣٤٧؛ هەروەها: موحسنی، ٢٠٠٦).

لە خێزانە نوێکاندا باوک سەرۆک نییە و دەسەلاتی بنەماڵەی لە ژێر رکێفدا نییە و بەرپرسی کردەوە تایبەتەکانی ژن و منداڵە گەورەکانی نییە. هەموو ئەندامانی گەورە ساڵی خێزان بەشێک لە کۆمەڵگان و مافی کۆمەلایەتی خۆیان هەیە.

ژن لە باری بژیوی ژیانەوە پێویستی بە مێردی نییە، تەنانەت بەر لە

زەماند و لە کاتی ژیانی هاوبەشدا لـە دەرەوە کـار دەکـا و بژیـوی خـۆی دابـین دەکات. هەرچەندە کۆمەڵگایەک زۆرتر ببێتە پیشەسازی، زۆرتر ژنانی لـە دەرەوە کار دەکەن.

گیر و گرفتەکانی دایک و باب لە دەرەوەی ماڵ، بۆتە هۆی ئەوەی کە بنەماڵـە بەشێک لە ئەرکە پەروەردەییەکانی بـە دامـەزراوەکـانی تـر (باخچـەی سـاوایان، باخچەی منداڵان و فێرگەکان) بسپێرێ. بەڵام هێشتا دایک و بـاب زۆر ئـەرکـی گرینگ لە باری پـەروەردەی منداڵـیان لـە ئـەستۆیە. منـداڵان ئێسـتا پتـر لـە منداڵانی رابردوو هەڵس‌وکەوتی دایک و بابیان دەکەنە سـەرمـەشق. دەتـوانین دوو هۆ بۆ ئەم سەرنجدانە دەس نیشان بکەین: یەکەم: بنەماڵـەکـان ئێسـتا بـە بۆنەی بەربەستە ئابوورییەکانەوە ژمارەی منداڵانیان کـەمتـر لـە رابـردووە؛ بۆیـە منداڵ هاوالی کەمتری هەیە و زۆرتر هان دەدا ئاکار و هـەڵـس‌وکـەوتی لـە گەڵ دایک و بابیدا بگونجێنێ. ئەم کارە دەبێتە هـۆی ئـەوەی دایـک و بـاب هان بدەن ئاکاری شیاو و گونجاویان لێ بوەشێتەوە و ئەرکـی پـەروەردەیـان زۆرتر دەبێ؛ دووەم: چونکە لە جڤاکە پیشەسازییەکاندا دایک و بـاب زوو بـە زوو ناچار بە گۆڕان و گواستنەوەی خانوویان دەبن، منداڵان کەمتر خـوو بـە هاوساڵانیان دەگرن و زۆرتر سەرنج بە هەڵس‌وکەوتی دایک و بابیان دەدەن.

خێزانە نوێکان پتر لە بنەماڵە کەونەکان تووشی دابڕان دەبـن؛ چونکـە ژیـانی کۆمەڵگای پیشەسازی خێزانی تووشی ناتـەبـایی زۆر کـردووە. بـۆ نموونـە، ژنی نوێ لە هەمان کاتدا کە باس لە ژیانی سـەربـەسـتی ئـابووری و هاوشـانی ژن و مێرد دەکات، وەکوو ژنانی پێشوو لە ئاست مێردەکەی چـاودێری زۆر دەکـات و لە هەمان روانگـەی ژنی رابـردووەوە سـەیـری مێـردی دەکـات. دیـارە ئـاوەهـا بارودۆخێک رێگا بۆ دابڕان و جیایی خۆش دەکا و بنەماڵـە دەخاتـە مـەترسـیەوە (آگ برن، ١٣٤٧).

جیاوازی نێوان هاوخانوویی و هاوسـەرگـری، هـەروەهـا جیـاوازی نێـوان

منداڵدار بوونی پێش یان پاش زەماوەند بە چەشنێکی سەرنجڕاکێش لێڵ بووە. هەنووکە لە وڵاتانی پێشکەوتوو و پیشەسازیدا واتاگەلێک وەکوو «ژیانی زیناکارانە» (واتە: پێکەوە ژیانی ژن و مێرد بە بێ ئەوەی بووبێتنە ژن و مێردی فەرمی)، یاخۆ «منداڵی حەرامزا» بە دەگمەن دەبیسین. لە کۆمەڵگاگەلی جۆراوجۆردا سەرمەشقگەلی جیاواز بۆ هاوسەرگری هەیە.

## هاوسەرگری بەکۆمەڵ / group marriage

نەریتی هەڵبژاردنی هاوسەر و دامەزراندنی خێزان زۆر کەونە. هیچ بەڵگەیەک لە دەستدا نییە کە بسەلمێنێ لە خولێکی ژیانی مرۆڤدا پێوەندی ژن و پیاو لە سەر هیچ بنەمایەک نەبووە و بە بێ هیچ گرێبەست و رەسم و یاسایەک تێکەڵی یەک بوو بێتن، بەڵام کۆمەڵناسان رایان وایە کە لە خولێکدا لە سەرەتای ژیانی مرۆڤدا، ژن و پیاو بە خۆڕایی پێوەندی سێکسیان لە گەڵ یەکتر بووە. دواتر ئەم تێکەڵاویە رەسم و یاسایەکی بۆ پێناسە کراوەو هاوسەرگیری بەکۆمەڵ -کە لە جزیرەکانی مارکیزدا (Marqueses) بینراوە- هاتۆتە دی (آگ برن، ١٣٤٧).

هاوسەرگیری بە کۆمەڵ بریتیە لە پێوەندی چەن ژن لە گەڵ چەن مێرد، بەو مەرجەی کە هیچ ژن یا پیاوێک هاوسەری ژن یا پیاوێکی تایبەت نەبێ و هەر یەک لە ژنەکان، هاوسەری هەموو پیاوەکان بێ و هەر پیاوێ، هاوسەری هەموو ژنەکان (عضدانلو، ١٣٨۴). بەڵام ئەم جۆرە پێوەندییە، بەندیوارە بە کات و شوێنی تایبەت بە خۆوە و پاش داهاتنی خاوەنێتی تایبەت لە ناودا نەماوە (آگ برن، ١٣٤٧).

## هاوسەرگیری لاوەکی / exogamy

ئەم شێوازە، داب و نەریتێکە کە ئیزن دەدات تاک لە دەرەوەی گرووپی

خۆی هاوسەرێک هەڵبژێرێ. ئەم زاراوەلە گەڵ زاراوەی هاوسەرگیری ناوخۆیی، بە هۆی ج.ف. مەک لینانەوە هاتە نێو بازنەی ئێسنۆگرافیا و کۆمەڵناسیوە.

## هاوسەرگری ناوخۆیی / endogamy

هاوسەرگیری ناوخۆیی بریتیە لە داب و نەریتێک کە بە گوێرەی ئەوە تاک دەبێ هاوسەرەکەی لە نێو ئەو گرووپە رەچەڵەکییانەدا هەڵدەبژێرێ کە پێوەندی راستەوخۆیان لە گەڵی هەیە. لەم گرووپانەدا گەر تاک لە گەڵ کەسێک لە دەرەوەی ئەو گرووپ و تیرە و رەچەڵەکەی کە بۆی رەچاو کراوە، هاوسەر هەڵبژێرێ، لە لایەن گرووپی خۆیەوە دەخرێتە بەر گوشار و تەنانەت رەنگە لە نێو گرووپیش دەر بکرێ. ئەم گرووپانە دەتوانن ئایینی، رەچەڵەکی و یان تەنانەت چینی کۆمەڵایەتی بن. بە گشتی لەم گرووپانەدا ئیزن نادەن کە نە کوڕیان لە دەرەوەی گرووپی خۆیان کچ بخوازێ و نە ئیزن دەدەن کە کچیان بە کوڕێک لە دەرەوەی گرووپیان مێرد بکات.

## هاوسەنگی (هاوکێشی) کۆمەڵایەتی / social equilibrium

هاوکێشی لە واتایەکی بەرفراوانیدا باس لە جۆرێک هاوسەنگی نێوان چەن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات کە پێوەندیان پێکەوە هەیە. ئەو هاوکێشییە رەنگە ئاشکرا یان پیوار بێ؛ رەنگە لە روانگەی عەینییەوە کارێکی واقیعی بێ یاخۆ تەنیا راڤەیی بێتە ئەژمار؛ رەنگە بزۆز و ئەکتیڤ یان بێجوولە و ستاتیک بێ.

هاوسەنگی، زاراوەیەکە کە لە هەموو نووسراوەکانی کۆمەڵناسیدا بە بەردەوامی بوونی هەیە و هەروەها زاراوەیەکە کە لە باری وردیدا ئاستی جۆراوجۆری هەیە. سوروکین بۆ ئەم زاراوەیە پێنج واتای لێک جیاوازی

دەسنیشان کردووە کە بریتین لە: ١) حاڵەت و دۆخێک لە نەگۆڕ (ستاتیک) بوون لە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا، وەکوو بارودۆخێک کە لە سیستەمی سیاسیدا هەیە؛ ٢) هاوسەنگییەکی کاتی لە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا، وەکوو بەرزترین ئاست لە گەشە یا فەوتانی ڕێکخراوێکدا؛ ٣) بەرتەسک کردن یان بەرگری لە بەرانبەر هێزە کۆمەڵایەتییەکاندا، وەکوو ئەوەی لە چاودێری و هاوسەنگییەکانی حکوومەتی دەستووریدا هەیە؛ ٤) تایبەتمەندی هاوسەنگی، سازیان و هارمۆنیکی دیاردەکۆمەڵایەتییەکان، وەکوو گەیشتن بە نیازە تاکەکەسییەکان لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا؛ ٥) «ئەو مەیلەی کە کۆمەڵگا لە کاتێکدا کە تووشی قەیران دێ بۆ گەڕانەوە بۆ باری ئاسایی و پێشووی هەیەتی، یان پاراستنی ڕەوتی ئاسایی خۆی»؛ وەکوو سەقامی کورت ماوەی شێوازگەلی بەرهەمهێنانی کرێکاران لە بەرانبەر داهێنانە تەکنیکییەکان، یان بەڕێوەبەرایەتییەکان.

هەرچەند سپێنسێر یەکەمین کەسێک بوو کە لە سیستەمی هزری خۆیدا جێگای بۆ زاراوەی هاوسەنگی کردەوە، بەڵام زۆربەی پێناسە هەنووکەییەکان لە پارێتتۆوە سەرچاوە دەگرن. بە گوێرەی بۆچوونی پارێتتۆ، کۆمەڵگا کاتێک لە حاڵەتی هاوسەنگیدایە کە ئەگەر «بکەوێتە بەر گۆڕانێکی دەسکرد، گۆڕانێک جیاواز لەو گۆڕانە ئاساییانەی کە لە ئارادان، دەمودەس دژکردەوەیەک ڕوودەدا کە کۆمەڵگا دەگەڕێنێتەوە بۆ بارودۆخی پێشووی خۆی». هۆمنز پێناسەیەکی نوێی داوەتە دەست: «سیستەمی کۆمەڵایەتی کاتێک لە حاڵەتی گۆڕاندایە کە بارودۆخ و کارلێکی ئەو بەشە نوێیانە کە دێنە نێو کۆمەڵگاوە بە چەشنێک بێ کە هەر گۆڕانێکی بچووک کە لە یەکێک لەو بەشە نوێیانەدا دێتە دی، ببێتە هۆی گۆڕان لە بەشەکانی تردا و بەم چەشنە ئەو گۆڕانە کەم بێتەوە» (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## هەژاری/ poverty

نەبوونی سامان و دارایی، لە راستیدا ئەزموونێکی بەناوی نەداری کە هەژاران لە نێو کۆمەڵگادا تاقی دەکەنەوە. هەژاری بریتییە لە نەبوون و نەدارییەک کە بە سەر چەندوچوونی ژیاندا کاریگەری بەرچاوی هەیە و دەبێتە کۆسپێک لە بەرانبەر گەشەو پەرەسەندنی لێهاتووییەکان تاک بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی ژیانی. هەژاری دەبێتە هۆی پووچەڵ کردنەوەی هەر چەشنە بەرنامەداڕێژانێک بۆ داهاتوو. دەکرێ هۆی بەشێکی زۆر لە کێشە کۆمەڵایەتییەکان بە هەژاری بزانرێ. لە راستیدا هەژاری رەهەندێکە لە کۆمەڵگایەکی نابەرانبەر و هۆی بەدیهاتنی ئەوەیە کە هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵگا بە زیانی کەسانیتر سەردەکەون (ملک؛ ١٣٨٧).

زۆربەی کۆمەڵناسان و تۆژەران دوو بۆچوونیان سەبارەت بە هەژاری هەیە: **هەژاری رەها و هەژاری رێژەیی**. هەژاری رەها باس لە نەبوونی پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیان دەکات؛ وەکوو نەبوونی خۆراک، جلوبەرگ و خانوو. ئەوانەی کە ئەم پێداویستانەی ژیانیان نەبێ —وەکوو خۆراکی پێویست، خانوو و پۆشەن- لە هەژاریدا دەژین. وادیارە کە ستانداردەکانی بژیوی مرۆڤ کەم تا کورتێک بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە باری جەستەیی و تەمەنییەوە وەکوو یەکن، بەبێ سەرنجدان بەوەی کە لە کوێ دەژین، یەکسانە. هەرکەس کە لە ژێر ئەم پێوەرەجیهانییەدا بژیت، لە هەر کوێی دونیادا کە بێ، دەتوانین بڵێین کە لە بە هەژاری دەژیت (گیدنز؛ ١٣٨٦).

بەڵام هەموو کۆمەڵناسان پێیان وا نییە کە دەکرێ ئاوەها پێوەرێک دیاری بکرێ. ئەوانەی کە دان بە هەژاری رەهادا نانێن دەڵێن کە دەبێ لە واتای هەژاری رێژەیی بەهرە بگیرێ، کە هەژاری دەبەستێتەوە بە ستانداردێکی گشتی ژیان لە کۆمەڵگایەکی تایبەتدا. لایەنگرانی هەژاری رێژەیی باوەڕیان

## هەژاری

ئەوەیە کە هەژاری پێناسەیەکی کولتووری هەیە و نابێ بە گـوێرەی پێـوەری جیهانی، هەژاری لە پێوانە بدرێ. زۆر هەڵەیە گەر پێمـان وابـێ نیـازەکـانی مرۆڤ لە هەموو شوێندا وەکوو یەکن؛ لە راستیدا ئـەم نیازانـە هـەم لـە نێـو کۆمەڵگایەک و هەمیش لە نێو نەتەوەجۆراوجـۆرەکانـدا جیـاوازن. بـۆ وێنـە رەنگـە ئـەو شـتانەی کـە لـە نێـو کۆمـەگایـەکـدا بـە نیـاز دەزانـرێن، لـە کۆمەڵگایەکی‌تردا بە هۆی رابواردن و خۆشگوزەرانی و تەشریفات بزانرێن. بۆ وێنە لە زۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکاندا ئاوی لوولەکێشـی کـراو، ئـاودەسـتی سیفۆندار و خواردنی بـەردەوامـی میـوە و سـەوزی بـە بـەشـێک لـە نیـازە سەرەکییەکانی ژیان دەزانرێن. کەسانێک کە بەبێ ئەم پێداویسـتانە دەژیـن، بە هەژار دەزانرێن. بەڵام لە زۆربـەی ئـەو وڵاتانـەی کـە خـەریکـی گـەشـە سەندنن، لە نێوان زۆربەی خەڵکیدا ئەم شتانە باو نین، بەم بۆنەوە بێ واتایـە کە هەژاری بە گوێرەی بوون یا نەبوونی ئەو شتانەی بپێوین.

بۆ پێناسەکردنی ورد و بێ‌هـەڵـەی هـەژاری رەهـا و هـەژاری رێـژەیـی، هەندێ کۆسپ و تەگەرە هەیە. یەکێک لە شێوازە باوەکانی پێوانی هـەژاری رەها ئەوەیە کە هێڵی هەژاری دیـاری دەکـەن. هێڵـی هـەژاری بریتیـە لـە توانایی ئەندامانی کۆمەڵگایەک بۆ کـڕین و دابـین کـردنی پێداویسـتەکـانی ژیانیان. بە واتایەکی‌تـر، نرخـی پێداویسـتەکـان و رادەی داهـاتی تـاک بـە چەشنێ کە بتوانێ بەبێ گرفت و کێشە نیازە سەرەکییـەکـانی ژیـان دابـین بکات، هێڵی هەژاری دیاری دەکـات. ئـەو کـەسـانەی کـە رادەی داهاتیـان خوارتر لەم هێڵە بێت، بە هەژار دەزانرێن. بەڵام کەڵک‌وەرگرتن لە پێوەرێکی تاک بۆ هەژاری دەتوانێ خـۆی ببێتـە هـۆی کێشـە و گرفـت؛ چونکـە ئـەم پێناسانەش ناتوانن جۆراوجۆر بوونی نیازەکانی مرۆڤ لەنێو یـەک کۆمـەڵـگا یاخۆ لە نێوان چەن کۆمەڵگای جۆراوجۆردا لەبەر چاو بگرن. بۆ وێنە ژیان لە هەندێ ناوچەی وڵاتێک یا گەڕەکی شارێکدا رەنگە لە شوێنەکانی‌تـر گرانتـر

بێ؛ نرخی پێداویستە سەرەکییەکانی ژیان لە هەر شوێنێکدا جیاوازە. نموونەیەکی‌تر ئەوەیە کە ئەو تاکانەی کە لە بەر تاو و بەفرو باراندا کاری جەستەیی دەکەن، نیازە خۆراکییەکانیان زۆرتر لەو کارمەندانەیە کە زۆرتر لە ژێر سێبەردان و لە سەر کورسی کاردەکەن. کەڵک وەرگرتن لە یەک پێوەر بۆ هەژاری، زۆر جار دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێ کەس کە داهاتیان ناتوانێ بژیوی ژینیان دابین بکات، سەرتر لە هێڵی هەژاری دابنرێن (گیدنز؛ ١٣٨٦).

**هەژاری رەها/ absolute poverty** بڕوانە: **هەژاری**

**هەژاری رێژەیی/ relative poverty** بڕوانە: **هەژاری**

**هەڵاواردن / segregation**

زاراوەی هەڵاواردن لە نێو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بۆ ماوەی چەندین ساڵ باسی لە پرۆسەیەکی ژینگەناسی دەکرد کە بە هۆی ئەو پرۆسەوە، تاکەکان لە شوێنکی کۆمەڵگایەکدا نیشتەجێ دەبوون کە پێشتر لە لایەن کەسانێکەوە کە لە باری تایبەتمەندییەوە زۆر لێک دەچن، داگیر کراوە. رابێرت پارت و بورگس لە کتێبی *دەسپێکێک بۆ کۆمەڵناسی*، هەر بەم چەشنە پێناسەی ئەم زاراوەیانە کردووە. هەروەها لە ئاسەوارە نوێکانیشدا هەر بەم جۆرە پێناسە کراوە. بۆ وێنە لە کتێبی *کۆمەڵناسی* لاندبێرگ و هاوکارانیدا هاتووە کە «کەسانێک کە تایبەتمەندی بایۆلۆجیکی، کۆمەڵایەتی یان هەر جۆرە وێکچوونێکی‌تریان هەیە، یاخۆ کەسانێک کە خەریکی کارێکی هاوچەشنن، لە شوێنێکدا نیشتەجێ دەبن کە تەنیا کەسانێکی تێدا دەژین کە لە باری وێکچوونەوە زۆر لێک نزیکن» (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## هیتری گشتیکراو

لەم ساڵانەی دواییەدا لە سەر بەکار هێنانی ئەو بەشەی ئەم زاراوەیە جەختی زۆرتر کرا کە ئاماژە دەکات بە هەلاواردنی جۆگرافیایی و کەلک وەرگرتنی جیاواز لەو ئامرازانەی کە لە ڕێی یاسا، نەریت یان بڕیارەوە بە سەر هەندێ لە چین و توێژەخوارەکاندا داسەپابێ. ئەم شێوازی بەکاربردنە زۆرتر بۆ چین و گرووپە نەتەوەیی، ئایینی و ڕەگەزیەکان بەهرەی لێ دەگیرا. وێنە ئەم هەلاواردنە گەڕەکی جووەکان بوو لە ئەرووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەڵس و کەوت لە گەڵ چینی و گرووپە پیسەکان لە هێنددا.

بە بەربلاو بوونی واتای ئەم زاراوەیە –بە تایبەت لە ئەمەریکادا- هەلاواردن خرایە خانەی کردە دووچاوەکییەکانەوە؛ وەکوو حاشا کردن لە هەندێ لە کار یان مافی دەنگدان و بەرگری لە تێکەلاوی ڕەگەزی. بەهۆی ئەم چەشنە هەلاواردنەوەچین و گرووپە نەتەوەیی، ئایینی و ڕەگەزییەکان، مافی یەکسان بۆ بزاوتی کۆمەلایەتییان نەبوو. ئەم زاراوە لەم بارەدا لە گەڵ یەکێک لە چەمکەکانی دووچاوەکی هاوواتایە (گولد و کولب؛ ١٣٨٤).

## هیتری گشتیکراو/ generalized other

هیتری گشتیکراو دەور یان ڕۆڵێکە کە تاک لەو کەسانەی وا لە گەڵیان کارلێکی هەیە، فێر دەبێ. هەر لە سۆنگەی ئەم دەورەیە کە تاک وشیاری (خۆئاگایی) لە خۆیدا رادێنێ. ڕوانگەی تاک سەبارەت بە تۆڕی پێوەندییەکانی خود-کەسانیتر پەرە پێدەدا، بۆچوونە یەکسانەکانی کەسانیتر لە ناخی خۆیدا سەقامگیر دەکا و لە نێو بازنەی ئەو نۆرمەی کە پەسندی دەکات، خەریکی خۆگونجاندن دەبێ. وەرگرتنی دەوری هیتری گشتیکراو، یارمەتی دەدات بە گەشەسەندنی کەسایەتیگەلی یەکدەست و ئالۆز.

پێویستە ئەو باسانەی کە لە سەر هیتری گشتیکراو کراون، لە چوار

تەوەردا بخرێنە بەر راڤە و وردبوونەوە:

١- تەوەری یەکەم، هیتری گشتی‌کراو وەکوو رێکخراوێک کە چالاکی کۆمەڵایەتی یا چاوەڕاوانییەکان پێناسە دەکات کە تاک بە هۆی بەشداری لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا لە ناخی خۆیدا سەقامگیری دەکات. ئەم زاراوە بۆچوونی تاکە سەبارەت بە دەوری جۆراوجۆری ئەو کەسانەی کە راستەوخۆ یا لە رەهەندی هزرییەوە لە کارێکی بەکۆمەڵدا بەشداریان لە گەڵ دەکات. هەر بەو چەشنەی کە مید دەڵێ: «گرووپی کۆمەڵایەتی یا جەماوەرێکی رێکخراو کە دەبێتە هۆی یەکیەتی کەسایەتی تاک، پێی دەڵێن هیتری گشتی‌کراو. هەستی هیتری گشتی‌کراو هەمان هەستی سەرجەمی جەماوەرە. بۆ وێنە گرووپێکی کۆمەڵایەتی وەکوو تیمی فووتبۆڵ؛ ئەم تیمە تا ئەو جێگای کە بڕواتە نێو ئەزموونی یەک بە یەکی ئەندامانیەوە، بە هیتری گشتی‌کراو دەناسرێ». هەر بەم چەشنە ئا. رۆز ئاماژە دەکات: «بە بەرفراوان بوونیەوەی گرووپ، چۆنییەتی پێوەندیەکان گۆڕانیان بە سەردا دێ. پێوەندییەکی راستەوخۆ و رووبەڕوو لە رێی یەک یا چەن ناونجییەوە یاخۆ لە رێی کۆمەڵە یاسایەک کە نووسراوە تا هەمووان بیخوێننەوە، یا بە هۆی مامۆستاوە فێری قوتابیان بکرێت، دەبێتە پێوەندییەکی ناڕاستەوخۆ. هیترێک کە دەورەکەی وەردەگیرێ "هیترێکی" جیاواز یا تەنانەت تیمێک لە "کەسانی‌تر" نییە، بەڵکوو هەر بەو جۆرەی کە مید دەڵێ ئەوە هیتری گشتی‌کراوە».

٢- دووەمین تەوەر، هیتری گشتی‌کراو وەکوو پاژێکی سەرەکی لە دوایین قۆناغی تەکامولی خود یا کەسایەتی، پێناسە دەکات. لێرەدا هیتری گشتی‌کراو بۆ پیشان دانی پێوەندی دوو لایەنە لە گەڵ رێکخراوی کۆمەڵایەتی، رێکخستنی **خود** پێناسە دەکات.

٣-سێیەمین رەهەندی هیتری گشتی‌کراو، وەکوو پرۆسەیەک بۆ دەروونی

کردنی بۆچوونەکانی کەسانیتر لە ڕێی وەرگرتن و سەلماندنی دەوری کەسانیترەوە پێناسە دەکرێ، پرۆسەیەک کە هەلی وتووێژی دەروونی بۆ ئەو دیاردانەی کە بە پێکهێنەری بیرو ئەندێشە دەزانرێن، دەڕەخسێنێ. بیرکردنەوە بریتیە لە ڕەهەندێکی زۆر گرینگ لە توانایی تاک بۆ بەشداری لە واتاکاندا لە گەڵ ئەو کەسانەی کە لە گەڵیان کارلێکی هەیە؛ واتە لە ڕەوتی کۆمەڵایەتیدا بەشدارییان لە گەڵ دەکات.

٤- چوارەمین تەوەری هیتری گشتیکراو بۆ پیشاندانی چۆنییەتی پێوەندی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە گەڵ کۆنترۆڵی کەسایەتیدا پێناسە دەکرێ. تاک بە کەڵک وەرگرتن لە نۆرمەکۆمەڵایەتییەکان -کە هیترە گشتیکراوەکان نوێنەرین- هەڵسوکەوتی خۆی دێنێتە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێری خۆیەوە. تاک هان دەدات تا خۆی بەو هیترە گشتیکراوانەوە بچوێنێ و خۆی لە گەڵیان بگونجێنێ کە هەست دەکات بەشێک لەوانەیە. کەواتە، دەتوانێ لە گەڵ ئەو کەسانەشدا کە خۆیان بە ئەندامی ئەو گرووپانە دەزانن هاوکاری بکات، چونکە ئەوانیش بە کەڵکوەرگرتن لە هەمان نۆرم و ڕێسا بە سەر هەڵسوکەوتی خۆیاندا چاودێری دەکەن (گولدو کولب؛ ١٣٨٤).

### هێز/ power

سەبارەت بە واتای هێز، بابەتی زۆر نووسراوە، بەڵام هیچ پێناسەیەک نییە کە بە تەواوی لە لایەن هەمووانەوە دانی پێدانرابێ و بەم بۆنەوە پێناسە کردنی هێز وەکوو بابەتێکی ناتەواو ماوەتەوە. ئەم زاراوە لە میدیا گشتییەکاندا بەزۆری بەکار دەبرێ: وەکوو «بە دەستهێنانی هێز»، «گرتنی هێز» و «شەڕی هێز». مێژوونووسان زۆرتر ئاماژە دەکەن بە «زل هێزەکان» و «هاوسەنگ کردنی هێز». ڕاڤەکارانی سیاسی و کەسانیتر، ئەمریکا (و

پێشتریش یەکیەتی سۆڤییەت) بە «زل‌هێز» نادەبەن. هەموو ئـەمانـەی کـە بێژران لە گەڵ واتای ساکاری هێزدا سازگارە؛ واتە «توانایی ئەنجامـدانی کـار یا کردەیەک»، بەم واتایە کە هێزدار بـوون دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە تـاک بتوانێ ئیرادە و ویستی خۆی جێ‌بەجێ کات. «بە دەستهێنانی هێز»، «هێـز گـرتن» و «شـەڕی هێـز» هـەموویـان بـە راشـکاوی ئامـاژە دەکـەن بـە بەدەستهێنانی توانی ئەنجام دانی کار. وادیارە دەوڵەت و هێـزە گـەورەکـان توانایيەکی زۆرتریان بۆ نواندن و سەلماندنی ویستی خۆیان هەیە تا دەوڵەت و هێزە بچووکترەکان.

بێرترانـد راسـێل(١٩٣٨) دەڵـێ «هێـز بریتیـە لـە بـەرهـەمهێنـانی ئـەو دەرەنجامانەی کە کەسێک دەیـەوێ». ڤـیبێر لـەو شـتەیـدا کـە بێگومـان بەناوبانگترین پێناسەی هێزە، رێگاچارەیەک بۆ ئەم بابەتە پێشـنیار دەکـات: «هێز بریتیە لەو ئەگەرەی کە تاکێک لە پێوەندییـەکـی کۆمـەڵایـەتیـدا لـە شوێنگەیەکدا بێ کە بتوانێ لە سەرینی بەرگری کەسانی‌تردا، ویستی خـۆی بە سەریاندا داسەپێنێ» (وبر؛ ١٩٤٧). بەکار هێنـانی وشـەی «ئـەگـەر» لـە لایەن ڤیبێرەوە، دەوری سەرەکی هـەیـە؛ چونکـە دەیـەوێ ئـەم واتایـە بـە چەشنێکی رێژەیی بەکار ببات نە بە شێوازێکی رەها و موتلـەق. ڤـیبێر هـەر جۆرە بیردۆزێـک کـە هێـز، بـە بـەکارهێنـانی زۆر بزانـێ، رەت دەکاتـەوە و دژایەتی لە گەڵ دەکات و ڕای ئەوەیە کە زۆر هۆکاری‌تر دەبنە هۆی ئـەوەی کـە ویسـتی تـاک یـا گرووپێـک بـە سـەر ویسـتی تـاک یـا گرووپـی‌تـردا داسەپێندرێ (راش؛ ١٣٨٨)؛ وەکوو سـامان، پێگـەی کۆمـەڵایـەتی، زانسـت، کاریزما و دەسەڵات (وبر؛ ١٣٨٢).

هێز، هەندێ جار هاوواتا لە گەڵ «هێزی رامیاری» دەزاندرێ کە بەش بـە حاڵی خۆی بریتیە لە: ئا- دەسـەڵاتـداریّتی رامیـاری بـە واتـای ١) ئیـزن و دەسەڵاتی یاسایی ئۆرگانە دەوڵەتییـەکـان (هـاوڕێ لـە گـەڵ هـەمـوو ئـەو

دەسەلاتە فەرمییانە کە بە دەستی دێنن)، یاخۆ ۲) مافی رامیاری، واتە مـافی یاسایی تاکەکان بۆ دامەزراندنی ئۆرگانە دەولەتییەکان یاخۆ دامەزران لە نێـو ئۆرگانە دەولەتییەکاندا؛ ب) هێزی رامیاری بریتیە لە کاریگەر بوون بـە سـەر بڕیاری ئەو کەسانەی کە خاوەنی دەسەلاتی سیاسین؛ پ) کاریگەر بوون بـە گوێرەی دەسەلاتی رامیاری (براون؛ ١٩٦٤).

## یاری / game

یارییەکان کارگەلێکی رێکخراو و تەکووزن کـە هـەمـوو دەم ژمـارەیـەک زۆرتر لە یەک کەسی تێدا بەشداری دەکەن. یەکـەم جـار جـۆرج هێربێـرت مید لە کتێبی *زەین، خۆ و کۆمەلگادا* ئەم زاراوەیە بۆ راڤەی هەل‌ومەرجی بە کۆمەلایەتی بوون بەکار هێنا کە بە هۆی ئەم کردانەوە **خود** دێتە دی. بەڕای مید، منداڵان بەر لە هەر شتێک بە لاسایی کردنەوەی کردەوەی کـەسانێک کە لە دەور و پشتیاندان، وەکوو بوونەوەرێکـی کۆمـەلایـەتی خۆیـان پێشـان دەدەن. یاری یەکێک لەو رێگایانەی گەیشتن بە دەرەنجامەیە. منـداڵان لـە نێو یارییەکانیاندا زۆرتر لاسایی ئەو کارانەی دەکـەن کـە لـە گـەورەساڵاندا دەیبینن. منداڵێکی ساوا بە قوڕ، کلووچە چێ دەکا، چونکە گەورەساڵێکی لە کاتی کلووچە دروست کردندا بینیوە؛ یاخۆ بە کەوچک زەوی هەڵدەکـەنـێ، چونکە کەسـێکی لـە کـاتی باخـەوانیـدا دیـوە. یـاری کـردنی منـداڵان لـە لاساییەکی ساکارەوە دەڕوا بـەرەو یارییـەکـی ئاڵـۆزتر و دژوارتـر کـە تێیـدا منداڵێکی چوار یان پێنج ساڵە دەوری گەورەساڵێک دەگێڕێ. مید بەم کارە دەڵێ: «وەرگرتنی دەوری کەسیتر». منداڵان بە دیتنی خۆیـان لـە چـاوی کەسانیترەوە، دەگەن بە تێگەیشتنێک لە خۆیـان کـە پێـی دەڵـێن «مـن» (گیدنز؛ ١٣٨٥).

کاتێ منداڵ بۆ یەکەم جار لە (بۆ نموونە) یارییەکی وەرزشیدا بـەشـداری

دەکات، کۆشەوەی، بە کۆشەوەیەکی ئالۆز و ناڕێک دەزاندرێ. بۆ وێنە کاتێ تۆپێ دەخرێتە نێو زەوی یاری کردن، هەموویان هان دەدەن تۆپەکە بگرن و نەهێڵن منداڵانی‌تر دەست بە تۆپەکەوە بدەن. هۆی ئەم ئاژاوە و ناڕێکییە ئەوەیە کە هەنووکە منداڵان بەو فامە نەگەیشتوون کە بزانن دەوری ئەوان لە گەڵ دەوری یاریکەرەکانی‌تردا چ پێوەندییەکی هەیە. بە بێ ئاوەها تێگەیشتنێک یاری ناتوانێ رێک و تەکووز بێ.

## یاسا/ law

یاسا بریتیە لە سیستەمێک لە نۆرمی یەکسان بۆ رێک‌وپێک کردنی هەڵس‌وکەوتی مرۆڤ. مەبەست لە بنیات‌نانی ئاوەها سیستەمێک، دامەزراندنی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییە. یاساکان نە بە هۆی دابونەریتەوە، بەڵکوو بە هۆی فەرماندەرانی کۆمەڵگاوە (بە تایبەت فەرماندەرە سیاسیەکان) شرۆڤە دەکرێ و دادەسەپێندرێ. واتای یاسا یەکێک لە لێڵترین واتاکانی مێژووی مرۆڤە و هێشتا پێناسەیەکی گشتگیری لێ پێشکەش نەکراوە. رەنگە لە راستیدا هیچ وەڵامێک بۆ پرسیاری چییەتی یاسا نەبێ. یەکێک لە کێشەسەرەکییەکانی ئەم واتایە ئەوەیە کە یاسا بۆ هەر تاکێک و لە کات و شوێنی جیاوازدا مانای جۆراوجۆری هەیە. ئەم زاراوە و زاراوەی لەم چەشنە، واتاکانیان زۆر بگۆڕن، لە راستیدا وەکوو پۆشەن دەمێنن کە بە گوێرەی هەل‌ومەرج و گۆڕانکارییەکانی دەوروبەر، رواڵەت و ناوەرۆکیان تووشی گۆڕان دێ. بەڵام هێشتا یاسا یەکێک لە مێژینەترین و باوترینی ئەو واتایانەیە کە لە هەموو شوێندا بەکار دەبرێ. تاک و گرووپە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان، بەگوێرەی شوێنگە و پێگەی کۆمەڵایەتییان، ئەم واتایە بۆ پاراستن و راگرتنی بەها و باوەڕەکانی خۆیان بەکار دەبەن و بەسەرنج دان بەوەی کە گرووپە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان خاوەنی باوەڕ و بەهای جیاوازن، ناکرێ

## یاسا

پێناسەیەکی گشتگیر کە هۆی ڕەزامەندی هەموو چین و گرووپ و توێژێک بێ، پێشکەش بکرێ. خەڵکی زۆربەی شوێنەکانی جیهان، بەتایبەت خەڵکی وڵاتە دیمۆکراتیکەکان، زۆریان ڕق لەو کەسانە هەیە کە بەنیازن یاسا بگرنە ژێر چەتری دەسەڵاتی خۆیان. بە سەرنجدان بەو باسەی کە هاتەگوتن، دەکرێ ئەو بۆچوونانەی کە لە سەر یاسا هەیە، بەشەش پاژ دابەش بکرێن:

١- قوتابخانەی پازیتیڤیزم (positive or inperative school): شۆپی ئەم قوتابخانەیە –کە هەندێ جار بە قوتابخانەی شیکاری ناوی لێ دەبرێ- دەگەڕێتە بۆ نووسراوەکانی بیرمەندی بریتانی، جرێمی بێنتام. بێنتام بێجگە لە پەرژانە سەر بابەت و تەوەری جۆراوجۆر، بنیاتنەری قوتابخانەی قازانجگەری (utilitarian) بووە. بێنتام پەیدۆزی ڕاستەقینەیە و لە زۆربەی نووسراوەکانیدا واتا یاساییەکان شیدەکاتەوە و دەیانخاتە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە، تا بەڵکوو بتوانێ بگاتە پێناسەیەکی کارا و شیاوی پێواندن. هەموو هەوڵ و تێکۆشانی بێنتام بۆ ناسینی مکانیزمەکانی سیستەمە یاساییەکانە. بێجگە ئەمەو وەکوو تاکێکی قازانجخواز، بۆیە بێنتام یاساکان دەخاتە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە، چونکە دەیەوێ بزانێ ئەم یاسایانە زۆرترین قازانجیان بۆ زۆرترین کەس هەیە یا نە (کاپلستون؛ ١٣٨٢). بەم بۆنەوە دەکرێ بێنتام بە یەکەمین بیرمەندێک بزانین کە هەم پرۆسەکان و هەم دۆزە یاساییەکانی خستۆتە بەر ڕاڤە و وردبوونەوە. کەواتە دەکرێ بۆچوونەکەی هەم بە بۆچوونێکی شیکارانە و هەمیش بۆچوونێکی فەلسەفی بزانین.

٢- قوتابخانەی زانستی هزری یاسا (pure science of law): یەکێک لە کارەکانی قوتابخانەی پازیتیڤی لە «قوتابخانەی زانستی هزری یاسا»ی هانس کێلسێن(*Hans Kelsen*) (*1973-1881*)دا بەدی دەکرێ. کێلسێن دانی بە سەر ئەو بەشەلە بۆچوونی پازیتیڤیدا نا کە یاسا وەکوو فەرماندەر

دەبینێ، بەڵام بەجێی سەرنجدان بە فەرمانده‌رێکی ناسراو، سەرچاوەی یاسای لە نۆرم و رێسا بنەماییەکانی کۆمەڵگادا دیبەوە. بەڕای ئەو، هەموو رێسا یاساییەکانی‌تر لەم رێسا بنەماییەوە سەرچاوە دەگرن. زانستی هزری یاسا، خوازیاری ئەوەیە کە یاسا لە هەموو بەشە بیانی ونامۆکان خاوێن بکرێتەوە. یاسا لایەنگری هیچ پێوەرێکی ئاکاری نییە و رۆڵی بەرەنگاری لە هەڵس‌وکەوتێکی تایبەت ناگێڕێ. بەبڕوای کێلسێن، بۆچوونە نوێکانی یاسا بارێکی گران سەبارەت بە دادوەری و یاسایان لە ئەستۆیە و بە تەم و مژێکی سەروسروشتی داپۆشراون کە ئاوێتەیەکە لە بەها ئاکاری و زەینی و کەسییەکان. بۆ دەسڕاگەیشتن بە زانستی هزری یاسا، دەبێ ئەم تەم و مژە سەرووسروشتیانەی لێ بسڕێتەوە. هەروەها کێلسێن باوەڕی ئەوەیە کە یاسا هیچ پێوەندییەکی لە گەڵ مێژوو، کۆمەڵناسی، ئاکار و دۆزەکانی دادوەری نییە. بەڵام بەشێکی زۆر لە توێژەران و بیرمەندان لە گەڵ کێلسێندا هاودەنگ نین و دەڵێن کە یاسا ناتوانێ بێ‌پێوەندی بێ لە گەڵ زانستە مرۆییەکان، بە تایبەت مێژوو و کۆمەڵناسی و هەروەها ئەو پرسیارانەی سەبارەت بە دادوەری و ئاکارن، بێ‌وەڵام بهێڵێتەوە. هەرچەند قوتابخانەی پازیتیڤی و زانستی هزری یاسا، بۆ فام کردنی ئەم واتایە یارمەتی زۆریان داوە، بەڵام ناتوانن وەڵامدەری ئەم پرسە بن کە «یاسا چییە و چ ئامانجێکی هەیە؟»

٣- قوتابخانەی مێژوویی (historical school): ئەم بۆچوونە بە نیازە کە لەنێو لاپەڕەکانی مێژوودا چەندوچوونی بەدیهاتنی یاسا ببینێتەوە. یەکێک لە باسە سەرەکییەکانی لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە ئەوەیە کە یاسا لەخۆیدا پێوەندییەکی نزیکی هەیە لە گەڵ ئەو ئاڵۆزییە کۆمەڵایەتییانەی کە تێیاندا گەشە دەکات. لایەنگرانی قوتابخانەی مێژوویی نە دەیانەوێ یاسا وەکوو فەرماندەر (قوتابخانەی پازیتیڤی) پیشان بدەن و نە دەیانەوێ لە نۆرم و رێسا خاڵی بکەنەوە (بۆچوونی زانستی هزری). ئەم قوتابخانە بە دان نان بە

گرینگی دابونەریتەکاندا، وەکوو ژێربینای بەدیهاتنی یاسای رەسمی و پازیتیڤی، لە سەر ئەم خاڵەدا پێداگری دەکات کە مرۆڤ خاوەنی هەستی فیترییە سەبارەت بە «چاک» و «خراپ»، «دروست» و «نادروست». مرۆڤ لە کات و ساتی جۆراوجۆردا بە گوێرەی هەلومەرجەکانی دەوروپشتی، کاردانەوەی غەریزی لە خۆی پیشان دەدات، چونکە هەستی هەڵبژاردنی «راست و دروست» لەناخیدا هەیە. بەم پێیە، لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە باوەڕیان ئەوەیە کە فەرمان بە کاری نەگونجاو و نەشیاو لە کۆمەڵگایەکی ئاکاریدا، ناتوانێ بە یاسایەکی راستەقینە بزانرێ. بەم بۆنەوە، هەر یاسایەک کە خۆی لە گەڵ پێوەرەراستەقینەکانی کۆمەڵگادا نەگونجێ، ناچار دەبێ بشکێ و برووخێ. ئەم قۆتابخانە، زۆر لە قوتابخانەی فەلسەفی یاسا نزیکە.

٤- قوتابخانەی کۆمەڵناسی (sociological school): ئەم قوتابخانە لە سەر پێوەندی یاسا لە گەڵ نیاز و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان جەخت دەکات. یەکێک لەو کەسانەی کە بە وردی ئەم قوتابخانەیە لێکداوەتەوە، ئۆژێن ئۆریشە (١٨٦٢-١٩٢٢) کە کتێبێکی لەژێر ناوی *بنەما سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی یاسا* بلاوکردۆتەوە. ئەو، یاسا بە رەنگدانەوەی خودی کۆمەڵگا دەزانێ. بەواتایەکی‌تر، لایەنگرانی ئەم قوتابخانە لە سەر ئەم خاڵە پێداگری دەکەن کە یاسای راستەقینە ئەوەیە کە لە لایەن هەمووانەوە دانی پێدا نرابێ. یاسای زیندوو، یاسایەکە کە هەموو چینەکانی خەڵک دانی پێدا بنێن. کۆمەڵناسانی یاسا تا ئەو جێگا کە دابونەریتی کۆمەڵگا لە گەڵ ئەم ئەزموونەدا هاودەنگ بن، بۆچوونەکانی لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە دەسەلمێنن. یەکێک لە رەهەندە لاوازەکانی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە هان دەدات بۆ ئەوەی یاسا و کۆمەڵگا بە بەرانبەر و یەکسان پیشان بدات. دەبێ ئەو خاڵەمان لە بەرچاو بێ کە پانتای یاسا بەرێژەی کۆمەڵگا زۆر بەرتەسکترە. هەرچەند ئەم قوتابخانە یاسا و کۆمەڵگا هاوکات لە گەڵ یەک

و لە پێوەندی لە گەڵ یەکدا شیدەکاتەوە، جەختی زۆر دەکات لە سەر سەرچاوە رەسمییەکانی یاسا؛ وەکوو یاسای سەرەکی، یاسادانان و تیۆرییە یاساییەکان.

٥- قوتابخانەی ئەرکی (fanctional school): راسکۆ پۆند (١٩٦٤-١٨٧٠) یەکێک لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی ئەرکی سەبارەت بە یاسایە (پاند؛ ١٩٥١). ئەو سالەها سەرۆکایەتی کۆلیژی یاسای زانکۆی هارواردی لە ئەستۆ بوو. هۆی ئەم ناولێنانە جەختی زۆری پۆندە لە سەر کار و چۆنییەتی کارکردنی یاسا لە نێو کۆمەڵگادا؛ ئەمەش هەمان شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەرکییە. بەڕای پۆند، یاسا دەبێتە هۆی هاودەنگ کردنی ململانێ و داخوازە ناتەبا کۆمەلایەتییەکان. فورموولی پۆند بەم جۆرە شرۆڤە دەکرێ کە یاسا خاوەنی بەهای سیاسییە و دەیەوێ زۆرترین داخوازەکان بە کەمترین پێکدادان و ناتەباییەوە بێنێتە دی. بەم بۆنەوە یاسا نە سەرچاوەیەکی فەرماندەرانەیە (بۆچوونی پازیتیڤی) و نە هەستێکی فیترییە سەبارەت بە هەلاواردنی «چاک» و «خراپ» (قوتابخانەی مێژوویی). بەپێچەوانەی ئەوانە، یاسا دەرەنجامی هاودەنگ کردنی ئیداری و دادوەرانەی ویست و داخوازە ناتەبا کۆمەلایەتییەکانە. بەم بۆنەوە هەندێ جار قوتابخانەی ئەرکی یاسا بەناوی «ئەندازیاری کۆمەلایەتی» ناودەبرێ.

٦- قوتابخانەی فەلسەفی یا ئەنجامناسانە ( philosophical or teleological school): ئەم قوتابخانە بەر لە هەموو شتێک سەرنج دەداتە راستێتی یاسا و پانتایەک لە ئامانجە ئەقلانییەکانی مرۆڤ کە یاسا دەتوانێ بۆ بەدیهاتنیان یارمەتی بدات. بەم بۆنەوە دەبێ پێوەری هەڵسەنگاندنی یاسا لە فەلسەفەی ژیان لە گەڵ ئایدیالە کۆمەلایەتییەکان پەیدۆزی بکرێ. پێڕەوانی ئەم قوتابخانەیە باوەڕیان ئەوەیە کە یاسا دەبێ هەم وەکوو بەرهەمی کولتوور و هەم وەکوو ئامرازێک بۆ گەشەی کولتوور بخرێتە بەر وردبوونەوە و تۆژینەوە.

بەواتایەکی تر، یاسا بریتییە لە ئامرازێکی کۆمەلایەتی بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی کۆمەلایەتی و لە ئەنجامدا ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە یەکسانی و دادوەری کۆمەلایەتی. لە روانگەی لایەنگرانی ئەم قوتابخانەوە، بەشەکانی فەرماندەری و زۆر دەبێ گوێڕایەڵی دۆزەکانی یاسا بن. هەندێ لە پێڕەوانی ئەم قوتابخانە، یاسا بە جیاواز و سەربەخۆ لە دەوڵەت دەزانن و باوەڕیان ئەوەیە کە یاسا بەر لە دەوڵەتیش هەر بووە. بەم بۆنەوە، بۆ تاقیکردنەوەی یاسا بەجێی یارمەتی خواستن لە سەرچاوەیەکی فەرمی، دەبێ سەرنج بدرێتە هاودەنگی یاسا لە گەڵ هەست و نستی کۆمەڵگا سەبارەت بە «راست و دروست بوون»ی یاسا (کاکر؛ ١٩٣٤).

## یەکگرتوویی ئۆرگانیکی/ organic solidarity

ئەم واتایە لە داهێنانەکانی دوورکایمە کە بۆ لێکدانەوە و راڤەی یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا نوێکان بەکار دەبرێ. ئەم زاراوە لە بەرانبەری **یەکگرتوویی میکانیکییەوە** دەوەستێ کە لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا کۆن و سوننەتییەکانە. یەکگرتوویی ئۆرگانیک جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە بناخەی پەیمانە کۆمەلایەتییەکان لەسەر شارەزایی‌و پسپۆڕییەک دانراوە کە ئەندامانی کۆمەڵگا نوێکان هەیانە. بەواتایەکی تر، بەپێچەوانەی جڤاکەکۆنەکان - کە بنەمای یەکگرتووییان لەسەر وێکچوونەکان دانراوە- لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا یەکگرتوویی لە سەر جیاوازییەکان بنیات نراوە (دورکیم؛ ١٣٨٦). لە کۆمەڵگا نوێکاندا، پسپۆڕی و شارەزایی هەرکەس لە بوارێک‌و هەروەها نیازە جۆراوجۆرەکانی تاکەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەندامانی کۆمەڵگا بۆ پێکهێنانی نیازەکانیان پێویستیان بە یەکتر بێ.

**یەکگرتوویی میکانیکی/ mechanical solidarity** بڕوانە: **یەکگرتوویی ئۆرگانیکی**

## یەک هاوسەری / monogamy

ئەم زاراوە لە زمانی یوونانیوە سەرچاوەی گرتووە و بە واتای «یەک پێوەند»ە. مەبەستی کۆمەڵناسان لەم زاراوەیە، شێوازێک لە هاوسەرگرتنە کە هەر ژن یان پیاوێک تەنیا یەک ژن یان پیاوی‌تر وەکوو هاوسەری خۆی هەڵدەبژێرێ. لە هەندێ لە ولاتانی دونیادا، بەتایبەت لە ولاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا، یەک هاوسەری مەرجێکی یاساییە و کەس ئیزنی نییە بە راشکاوی و رەسمی هاوسەرێکی‌تر هەڵبژێرێ. زۆربەی خەڵکی ئەم ولاتانە، هاوسەرگیری بە هەمان یەک هاوسەری دەزانن (اعزازی: ١٣٨٨).

## یەکیەتی کرێکاران/ trades unions

یەکیەتی کرێکاران بە رێکخراوەیەکی کرێکاری دەڵێن کە ئامانجی بەرزکردنی ئاستی داهاتی کرێکاران و چاکسازی هەل‌و مەرجی کار لە رێی ستراتژیگەلێک وەکوو وت‌و وێژ و مان کردنە (عضدانلو، ١٣٨٤). یەکگرتوویی کرێکاران لە کارو پیشەیەکی تایبەتدا مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە، بەڵام یەکەتی بەچەشنی رێکخراوە، دیاردەیەکی نوێیە و ئاکامی گەشەی سەرمایەدارییە. دەوڵەتەکان، وەکوو رێکخراوەگەلی رووخێنەر و دژ بە یاسا سەیری یەکیەتی کرێکارانیان دەکرد، بۆیە سەرکوت کردنیان لە لایەن دەوڵەتەوە کارێکی ئاسایی و باو بوو (یەکیەتییەکان لە فەرەنسا تا ١٨٨٤ و لە ئاڵمانیادا تا ١٨٩٠ نافەرمی بوون) .(*Bottomore, 1992*)

زاراوەی یەکیەتی کرێکاران ئاخێزگەیەکی نوێی هەیە. تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم زۆرتر زاراوەگەلێک وەکوو«ئاپۆرەی کرێکارانی شارەزا»، «کلووپی کرێکاری»، «ئەنجومەنی کرێکاری»، «ئەنجومەنی دۆستان» و «کلووپی دەردەداران» باو بوون. ئەم رێکخراوانە لە هیچ بارێکەوە –بێجگە

## یەکیەتی کرێکاران

سەرچاوە بوون- لە یەکەتییەکانی ئەمڕۆ نەدەچوون. لە دەیەی ١٨٣٠دا یەکیەتی کرێکارن یاخۆ «یەکیەتی پیشەکان» هاتۆتە دی. لە چارەکەی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا یەکیەتی کرێکاران وەکوو زاراوەیەکی ناسراو دەرهات، کە بریتی بوو لە کۆمەڵەی کرێکارانی پیشەیەکی تایبەت. ئەم زاراوەبە پێی زاراوەکانیتر، واتایەکی روونتری هەیە و مەبەستی کرێکاران لە هاتنە ریزی ئەم یەکیەتیە چاکتر و روونتر پیشان دەدا. هەرچەند ئەم زاراوەیەش لە سەرەتادا وردبینی پێویستی نەبوو. لەو کاتەوەکرێکاران بەگوێرەی چین یان پیشەی تایبەت دەستیان دا بە کۆوەبوون لە نێو رێکخراوەگەلێکی هاوبەشدا. هەر لەو کاتەوە رێکخراوەگەلێک کە بۆ راگەیشتن بە بارودۆخی کرێکارانی پیشەیەک دیاری کراون، هاتوونەتە دی و ئەو پیشانەی کە باڵیان بە سەریاندا راکێشاوە زۆرتر کردووە.

لە باری یاساییەوە پێناسەیەکی جێ‌متمانە لە یەکیەتی کرێکاران لە پانتای نێونەتەوەییدا نییە. لە هەندێ وڵاتاندا یەکیەتی کرێکاری لە لایەن یاساوە پێناسە نەکراوە، لە وڵاتانیتردا پێداگری یاسا بە شێوەگەلی جۆراوجۆر لە سەر پێکهاتەی ئەندامان، شێوازو ئامانجەکانی یەکیەتی کرێکاران بنیات نراوە. یاسای هەندێ لە یەکیەتیەکان، خاوەن کارەکانیش دەگرێتەوە، هەندێکیتر تەنیا بۆ تاقمێکی بچووک لە کرێکاران دامەزراون. ئەم کارە لە رێی تەکووز کردنی چالاکییەکانی یەکیەتی یاخۆ رێنومایی ئەو رێکخراوەوە جێ بە جێ دەکرێ. بە بۆنەی ئەم هۆکارەوە، پێناسەی یاسایی یەکیەتی کرێکاران زۆر جار لە گەڵ دۆزو مەبەستی سەرەکی و هاوبەشی ئەم زاروەیە جیاوازی هەیە(*Gould. J and Kolb.L. William, 1964*).

مارکس و ئەنگلس لە کاتێکدا یەکیەتی کرێکارانیان بە وردی خستە بەر راڤە و وردبوونەکە بە توندی لە ژێر کاریگەری رادیکالیسمی خەباتی کرێکاری بریتانیادا بوون. مارکس «هەژاری فەلسەفە»ی بە

## یەکیەتی کرێکاران

هەڵسەنگاندنێکی چڕو پڕ لە مەڕ خەباتی یەکیەتی کرێکاران لە بریتانیادا دوایی پێ هێنا. ئەم باسەی لە مانیفیستی پارتی کۆمۆنیستیشدا دووپاتەکردەوە.

## فەرهەنگۆک (ئینگلیزی- کوردی)

### A

| | |
|---|---|
| ability grouping | گرووپبەندی لێهاتووییەکان |
| absolute poverty | هەژاری رەها |
| abstraction | ئینتزاعی (رووت) |
| abstract social class | چینی کۆمەلایەتی ئینتزاعی |
| acculturation | کولتوور وەرگری |
| achieved status | پێگەی بەدەستهاتوو |
| acid rain | بارانی ئەسیدی |
| active adaptation | سازگاری ئەکتیڤ |
| advanced market economics | ئابووری بازارە پێشکەوتووەکان |
| agriculture | کشتوکاڵ |
| alienation | نامۆ کەوتن |
| altruistic suicide | خۆکوژی هیترخوازانە |
| amalgamation | تێکەلاوی |
| anomic suicide | خۆکوژی ئانۆمی |
| apartheid | ئاپارتاید |
| ascribed status | پێگەی پێسپێردراو |
| assimilation | ئاسیمیلەبوون |
| authority | دەسەلات |

### B

| | |
|---|---|
| back stage | پشتی شانۆ |
| belief | باوەڕ |
| blended family | خێزانی ئاوێتە |
| blue-collar occupations | پیشەی ئێخە شینەکان |

| | |
|---|---|
| bolshevism | بۆلشیڤیزم |
| bourgeoisy | بورژوازی |
| bureacracy | بۆرۆکراسی |
| bureaucratic alienation | نامۆکەوتنی بۆرۆکراتیک |
| bureaucratic ritualism | نەریتخوازی ئیداری |

C

| | |
|---|---|
| capitalism | سەرمایەداری |
| career | ڕێڕەوی ژیان (پیشە) |
| cast system | سیستەمی کاست |
| catechism | نامیلکەی دینی |
| censorship | سانسۆر |
| class-consciousness | وشیاری چینایەتی |
| class society | کۆمەڵگای چینایەتی |
| closed system | سیستەمی بەسراو |
| collective behavior | ڕەفتاری بەکۆمەڵ |
| colonialism | کۆلۆنیالیسم |
| economy | ئابووری |
| command economy | ئابووری دەستووری |
| communication | گەیاندن (پەیوەندی) |
| communism | کۆمۆنیزم |
| comparable worth | مووچەی هاوسەنگ |
| competition | ڕکەبەریٚ |
| compound family | خێزانی تێکەڵ |
| conflict perspective | ڕوانگەی ململانێ |
| conglomerate | ئامێتە کردن (تێکەڵ کردن) |
| conjugal family | خێزانی ژن و مێردی |

| | |
|---|---|
| consanguine family | خێزانی خوێنی (یان هاوپشت) |
| conservatism | پاراستنخوازی |
| content analysis | راڤەی ناوەرۆک |
| core economy | ئابووری ناوکی |
| corporate crimes | تاوانە کۆمپانیاییەکان |
| corporation | شەریکەی بەشکۆ |
| counterculture | دژە کولتوور |
| craze | شەیدایی |
| crime | تاوان |
| crowd | ئاپۆرە |
| cult | ئایین |
| cultural base | بنەڕەتی کولتووری |
| cultural conflict | ململانێی کولتووری |
| cultural reproduction | بەرهەمهێنانەوەی کولتووری |
| cultural shock | راتەکانی کولتووری |
| cultural transmission | گواستنەوەی کولتووری |
| cultural universals | گشتگیری کولتووری |
| culture | کولتوور |
| culture of poverty | کولتووری هەژاری |
| culture trait | دانستەی کولتووری |

## D

| | |
|---|---|
| definition of the situation | واتای شوێنگە |
| delegation of power | سپاردنی دەسەلات |
| democracy | دیمۆکراسی |
| democratic socialism | سوشیالیزمی دیمۆکراتیک |
| demographic trap | داوی دیمۆگرافیک |

| | |
|---|---|
| descent | رەچەڵەک |
| despotism | ملهوڕی |
| deterrence | بەرگری کردن |
| development | پێشکەوت (گەشە سەندن) |
| deviance | لادان |
| dialectic | دیالکتیک |
| diffusion | پەرەسەندن |
| discrimination | دووچاوەکی |
| division of labor | دابەشکردنی کار |
| divorce | تەلاق (جیابوونەوە) |
| documents of life | دۆکیوومێنتەکانی ژیان |
| dysfunction | دژەئەرک |

## E

| | |
|---|---|
| ecclesia | کۆمەڵگای ئایینی |
| ecology | ژینەوەرناسی |
| education | پەروەردە |
| educational sociology | کۆمەڵناسی پەروەردە |
| egoistic suicide | خۆکوژی خۆخوازانە |
| election | دەنگدان |
| empty nest syndrome | دیاردەکانی هێلانەی خاڵی |
| endogamy | هاوسەرگری ناوخۆیی |
| equalitarian family | خێزانی یەکسانخواز |
| euro centrism | ئەورووپاناوەندی |
| euthanasia | مەرگی خۆش (مەرگی دڵسۆزانە) |
| extended family | خێزانی فراوان |
| exogamy | هاوسەرگیری لاوەکی |

| | |
|---|---|
| experiment | ئەزموون |

**F**

| | |
|---|---|
| false consciousness | وشیاری درۆینە |
| family | خێزان |
| family violence | توندوتیژی خێزانی |
| fascism | فاشیزم |
| fatalistic suicide | خۆکوژی چارەنووس‌خوازانە |
| feminism | فێمینیزم |
| feminization of poverty | ژنانەکردنی هەژاری |
| formal education | پەروەردەی فەرمی (رەسمی) |
| formal curriculum | وانەی رەسمی |
| formal dimension of organization | رەهەندیرەسمی رێکخراوەکان |
| folkway | رێسا |
| formal organization | رێکخراوە رەسمییەکان |
| formal social controls | کۆنترۆڵە فەرمیە کۆمەڵایەتیەکان |
| front stage | سەرشانۆ |
| function | ئەرک |
| functionalism | ئەرکخوازی |
| functional relationship | پێوەندی ئەرکی |
| fundamentalism | بنەماگەری |

**G**

| | |
|---|---|
| game | یاری |
| game stage | شانۆی یاری |
| generalized belief | باوەڕی گشتی‌کراو |
| generalized other | هیتری گشتی‌کراو |

| | |
|---|---|
| gender polarization | دووجەمسەری بوونی جنسییەت |
| gerontology | پیرناسی |
| global perspective | روانگەی گشتگیر |
| global economy | ئابووری جیهانی |
| government | حکوومەت |
| great belt movement | بزاڤی پشتوێنی شین |
| great changes | گۆڕانە مەزنەکان |
| green revolution | شۆڕشی شین |
| group marriage | هاوسەرگری بەکۆمەڵ |

## H

| | |
|---|---|
| hate crimes | تاوانە رقاوییەکان |
| hawthorne effect | ئاسەواری هاوسۆرن |
| head of state | سەرۆکی وڵات |
| health | تەندروستی |
| hegemony | زاڵبوون (هەژمۆنی) |
| hermaphrodite | نێرەمۆک |
| hidden curriculum | وانەی نادیار |
| hidden motive | ئەنگێزەی بەرپیوار |
| hidden rape | دەستدرێژی نامووسی نادیار |
| historicism | مێژووگەری |
| horticulture | بێسانکار |
| hospice | ئاسایشگا |
| humanism | مرۆڤ خوازی |
| hunting and gathering | راو و کۆوەکردنی خۆراک |
| hypothesis | گریمانە |

## فەرهەنگۆک

### I

| | |
|---|---|
| ideal cultural | کولتووری ئارمانجی |
| ideology | ئایدیۆلۆژی |
| illiteracy | نەخوێندەواری |
| imultaneous-independent invention | داهێنانی سەربەخۆی هاوکات |
| incest taboo | تابۆی زینا لە گەڵ مەحرەمەکان |
| individual | تاک |
| individual discrimination | دووچاوەکی تاکەکەسی |
| industrial revolution | شۆڕشی پیشەسازی |
| industrialization | بەپیشەسازی بوون |
| informal dimension of organization | ڕەهەندیناڕەسمیڕێکخراوەکان |
| informal education | پەروەردەی نافەرمی |
| informal social controls | کۆنترۆڵە نافەرمیە کۆمەڵایەتیەکان |
| information | زانیاری |
| information society | کۆمەڵگای زانیاری |
| isolation | گۆشەگیری |
| isolationism | گۆشەگیری خوازی |
| intergenerational mobility | بزاوتی نێوان وەچەکان |
| internalization | بە دەروونیکردن |
| intragenerational mobility | بزاوتی نێو وەچەیی |
| involuntary minorities | کەمینە نائیرادییەکان |

### J-K-L

| | |
|---|---|
| joking relationship | پێوەندی گاڵتەجاڕانە |
| juvenile delinquency | لادانی تازەلاوان |
| kinship | خزمایەتی |

| | |
|---|---|
| language | زمان |
| latent function | ئەرکی پیوار |
| law | یاسا |
| leadership | ڕێبەرایەتی |
| liberalism | لیبرالیسم |
| liberation theology | ئایینی (تیۆلۆجی) ڕزگاریدەر |
| life history | مێژووی ژیان |
| life chanced | بەختەکانی ژیان |
| lobby | لۆبی (گرووپی گوشار) |
| looking-glass self | خودی ئاوێنەئاسا |

**M**

| | |
|---|---|
| majority | زۆرینە |
| manifest function | ئەرکی ئاشکرا |
| marketization | بەبازاڕی بوون |
| marriage | هاوسەرگری |
| matrilineal descent | ڕەچەڵەکی دایکی |
| mass | کۆمەڵ |
| mass behavior | ڕەفتاری گشتی |
| mass communication | ڕاگەیاندنی گشتگیر |
| mass media | مێدیا گشتییەکان |
| master status | پێگەی سەرەکی |
| means of production | ئامرازەکانی بەرهەمهێنان |
| measurement | پێوان |
| mechanical solidarity | یەکگرتوویی میکانیکی |
| medicine | پزیشکی |
| midlife crises | قەیرانی نیوەتەمەن |

| | |
|---|---|
| minimal state | دەوڵەتی لانیکەم |
| minorities | کەمینەکان |
| monarchy | پادشایەتی (مۆنارشی) |
| monogamy | یەک هاوسەری |
| monopoly | قۆرخکردن |
| mores | دام و نەریت |
| mortality crises | قەیرانی مردن |
| multinational corporation | شەریکە فرەنەتەوەییەکان |

N

| | |
|---|---|
| nation-state | دەوڵەتی نەتەوەیی |
| nativism | ناوچەگەری |
| nature | سروشت |
| neocolonialism | کۆلۆنیالیسمی نوێ |
| network | تۆڕ |
| neutralization | پووچەڵ کردنەوە |
| new extended family | خێزانی فراوانی نوێ |
| new religious movements | بزاڤە ئاینییە نوێکان |
| nonverbal communication | ڕاگەیاندنی بێ ئاخاوتن |
| nuclear family | خێزانی ناوکی |

O

| | |
|---|---|
| occupational prestige | پرستیژی کاری |
| oligarchy | ئۆلیگارشی |
| oligopoly | قۆرخی چەن لایەنە |
| open system | سیستەمی کراوە |
| opposition | ئۆپۆزیسیۆن |

| | |
|---|---|
| organic solidarity | یەکگرتوویی ئۆرگانیکی |
| organization | ڕێکخراوە |
| out-migration | کۆچی دەرەکی |

## P

| | |
|---|---|
| party | پارت |
| pastoralism | شوانکارەیی |
| patriarchy | باوکسالاری |
| patrilineal descent | ڕەچەڵەکی باوکی |
| peace | ئاشتی |
| peripheral economy | ئابووریدەڤەری |
| phenomenology | دیاردەناسی |
| polygamy | فرە هاوسەری |
| polysemic | فرە واتایی |
| positivism | پازیتیڤیسم |
| positivistic approach to society | دەسپێکیپازیتیڤی بەکۆمەڵگا |
| postindustrial economy | ئابووری پاش پیشەسازی |
| poverty | هەژاری |
| power elite | بژاردەکانی دەسەڵات |
| power | هێز- دەسەڵات |
| predestination | چارەنووس |
| prediction | پێشبینی |
| prejudice | لایەنگری |
| prestige | ئاوڕوو (کەسایەتی) |
| primary deviance | لادانی سەرەتایی |
| primary economic sector | بەشی یەکەمینی ئابووری |

